# پوختەی تەفسیری قورئان

لەگەل هۆی هاتنە خوارەوەو فەرمووده دەربارەی ئایەتەکان

ئامادەکردنی
محمد ملا صالح

چاپی هەشتەم

# سُورَةُ الفَاتِحَةِ ١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

# ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان ١)

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پەروەردگاری جیهانیان ٢) ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی میهرەبان ٣) ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خاوەنی رۆژی سزا و پاداشت دانەوە ٤) ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ (خوایە) تەنها تۆ دەپەرستین ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتیی دەکەین ٥) ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ رێنموونیمان بکە بۆ رێگای راست ٦) ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ رێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ نەک (رێی) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێ گیراوە(بەهۆی ئەوەوە دەیزانن لایان داوە وەك جولەکەکانو هاوکردارییان) ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ وە نەک (رێی) گومرایان.(بەهۆی لاساریو نەزانینیانەوە وەك گاورەکانو هاوکردارییان) ٧).

**سورەتی (الفاتحة)** : قال رافعُ بنُ المعلى قال لي رسول الله (ﷺ) : (ألا اعلّمُك أعظمَ سورةٍ في القرآن قبلَ أن تخرج من المسجد؟) فأخذ بيدي فلما أردنا أن نخرج قلت: يا رسول الله إنك قلت: لأعلّمنّك أعظم سورة في القرآن ! قال: (الحمد لله رب العالمين هي السبعُ المثاني والقرآنُ العظيم الذي أوتيتُه) (رواه البخاري). رافیعی کوڕی موعەللا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێم (ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێرکەم پێش ئەوەی لەمزگەوت بچیتەدەرەوە؟) ئەدجا دەستی گرتم ، کاتێ کەویستمان بچینەدەرەوە ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت گەورەترین سورەتی قورئانت فێردەکەم، فەرمووی (الحمد لله رب العالمين کە ئەویش حەوت ئایەتی دووبارە بووە و قورئانی گەورەیە کە بەمن بەخشراوە).

عن أبي بن كعب قال: قال رسول الله (ﷺ) : (والذي نفسي بيده ما أُنزلت في التوراة ، ولا في الإنجيل ، ولا في الزبور ، ولا في الفرقان مثلها ،وانها سبع من المثاني والقرآن العظيم الذي أعطيته) (رواه الترمذي والنسائي). ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سوێند بەو خوای گیانی منی بە دەستە ، نەلە تەورات و نەلە ئینجیل و نەلە زەبوور و نەلە قورئاندا وێنەی سورەتی فاتیحە دانەبەزێنراوە، بێگومان فاتیحە حەوت ئایەتی دووبارە بووە و ئەو قورئانە گەورە و پیرۆزەیە کە بە من دراوە).

# سُورَةُ البَقَرَةِ ٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١

الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ
فِيهِۛ هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ
وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ
۝٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ
مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤ أُوْلَٰٓئِكَ
عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

﴿ الٓمٓ ﴾ بە (ئەلیف ، لام ، میم ) دەخوێنرێتەوە * ١) ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ ئەم قورئانە ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ هیچ گومانێکی تێدا نی یە ﴿هُدٗى﴾ ڕێ نیشاندەری ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ بۆ پارێزکاران ٢ ) ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ بەشتە پەنهان و نادیارەکان ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژ دەکەن ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ لەوەی کردوومانە بە ڕۆزی یان دەبەخشن (لەبەر خوا) ٣ ) ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ وە ئەوانەی کەبڕوا دەهێنن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) نێرراوە ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ وە بەو کتێبانەی کە بۆ نێراوانی پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ وە بڕوایان هەیە بەڕۆژی دوایی ٤ ) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ ئەوانە لەسەر ڕێی ڕاستن لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوانن ڕزگارن ٥ ).

**سورەتی (البقرة)**: قال رسول الله (ﷺ): (لا تَجْعَلوا بيوتكم مقابر، إن الشيطان يفرُ من البيتِ الذي تقرَأ فيه سورةُ البقرة) (رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، بێگومان هەر ماڵێک سورەتی (البقرة)ی تێدا بخوێنرێت شەیتان لێ ی رادەکات).

---------

* ئەم پیتانەی لەسەرەتای هەندێ لە سورەتەکانی قورئاندا هاتوون تەنها خوای گەورە دەزانێت مەبەستی پێیان چی یە ئەمە ڕاسترین تەفسیرە بۆ ئەم پیتانە، بەڵام بە چەندجۆری تریش تەفسیرکراوە لەوانە: ئەم پیتانە ناوون بۆ ئەو سورەتانەی لە سەرەتایانەوەن، یان ناوون بۆ خوای گەورە، یان بۆ دەستەوسان کردنی عەرەبە بێ باوەڕەکانە کەدەیان ووت ئەم قورئانە لەخواوە نەهاتووە، پێیان دەڵێت دەی وێنەی قورئان بڵێن کە هەر لەو پیتانە پێک هاتووە ئێوە بەکاری دێنن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾

**ئایەتی (٢٩) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ) : (ما من يومٍ يُصبحُ العبادُ فيه إلا مَلَكان يَنزِلان،فيقولُ أحدُهما:اللّهمَّ اعطِ مُنفقاً خَلَفاً، ويقولُ الآخَرُ: اللّهمَّ أعطِ مُمْسِكاً تَلَفاً)(متفق عليه). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لەهەموو ڕۆژێکدا کەڕۆژ دەبێتەوە دوو فریشتە دادەبەزن یەکێکیان دەڵێت خوایە هەر کەسێک بەخشندەیە شوێنەکەی بۆ پڕبکەرەوە دووهەمەکەشیان دەڵێت خوایە ئەو کەسەی چروکەو نابەخشێت ماڵەکەی لەناو بەرە.

**ئایەتی (٣٤) سورەتی (البقرة) :** قال رسول الله (ﷺ) : (لو كنتُ آمراً أحداً أن يسجدَ لأحدٍ لأمرتُ المرأةَ أن تسجدَ لزوجها) (رواه الترمذي). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەگەر فەرمانم بکردایە یەکێک سوژدە بەرێت بۆ یەکێکی تر، فەرمانم دەدا ئافرەت سوژدە بەرێت بۆ مێردەکەی).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ بۆ ئەوان چوون یەکە ﴿ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ بیانترسێنیت یان نەیان ترسێنیت ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بڕوا ناهێنن. ٦) ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡ﴾ خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێیاندا ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ وەپەردە بەسەر چاویانەوەیە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ وە سزای زۆر گەورەیان بۆ هەیە. ٧) ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ﴾ وەڵە ناو خەڵکیدا هەندێ کەس هەیە کە دەڵێ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بڕوامان هێناوە بەخواو بەڕۆژی دوایی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان بڕوادار نین. ٨) ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ (بەلای خۆیانەوە) خواو ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کەبڕوایان هێناوە! ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ کەس ناخەڵەتێنن تەنیا خۆیان نەبێت ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ﴾ بەڵام هەستی پێ ناکەن. ٩) ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ لە دڵیاندا نەخۆشی (ناپاکی) هەیە ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗا﴾ خواش نەخۆشی یەکەی زۆرتر کردن (بەهاتنی قورئان) ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكۡذِبُونَ﴾ وەسزای سەختیان بۆ هەیە بەهۆی ئەو درۆیانەوە کەدەیانکرد (ودەیان ووت بڕوامان هەیە). ١٠) ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ وە کاتێک پێ یان بووترایە ﴿لَا تُفۡسِدُوا۟ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئاشوب مەنێنەوە لەزەوی دا - ئاژاوە بەرپا مەکەن لە وڵاتدا ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ﴾ دەیان ووت: ئێمە هەر چاکەکارین (ڕێکخەرین). ١١) ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ﴾ ئاگادارین کەبە ڕاستی هەر ئەوانن ئاشوبگێر ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ﴾ بەڵام هەستی پێ ناکەن. ١٢) ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ وە کاتێ پێ یان بووترایە ﴿ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ بڕوا بێنن وەک ئەو خەڵکانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿قَالُوٓا۟ أَنُؤۡمِنُ﴾ دەیان ووت: چۆن ئێمە بڕوا بێنین ﴿كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ وەک ئەو گێل و نەفامانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ بێدارین کەبە ڕاستی هەر خۆیان گێل و نەفامن ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام نازانن. ١٣) ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وە کاتێ (ناپاکان) بگەشتنایە بەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ دەیان ووت: ئێمەش بڕوامان هێناوە ﴿وَإِذَا خَلَوۡا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ کاتێکیش بەتەنیا بوونایە لەگەڵ گەورە فێڵبازەکانیان ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ دەیان ووت: ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ﴾ بێگومان ئێمە هەر گاڵتەکەرین (بەوان). ١٤) ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ خوا گاڵتە بەوان دەکات (لەبەرانبەر گاڵتە کردنەکەیان) ﴿وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ وە ماوەیان دەدات تا لەسەر کەشیی خۆیاندا سەر لێ شێواو بن. ١٥) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ﴾ ئەمانە ئەوانەن کە گومڕاییان کڕی ﴿بِٱلۡهُدَىٰ﴾ بە ڕێنموونیی ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ جا نە بازرگانی یەکەیان قازانجی کردو ﴿وَمَا كَانُوا۟ مُهۡتَدِينَ﴾ نە ڕێبازی ڕاستیان گرت. ١٦)

مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

**ئایەتی (٣٥) سورەتی (البقرة)**: قال رسول الله (ﷺ): (استوصُوا بالنِّساءِ خيراً فإنَّ المرأةَ خُلِقَتْ من ضِلعٍ، وإنَّ أعوجَ ما في الضِّلعِ أعلاهُ، فإن ذهبتَ تُقيمُهُ كسرتَهُ ، و إن تركتَهُ لم يَزَلْ أعوجَ، فاستوصوا بالنِّساء) (متفق عليه). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (چاكە بن لەگەڵ ئافرەتاندا چونكە ئافرەت لەبەشە لارەكەی سەرووی پەراسوو دروست كراوە، ئەگەر بتەوێ راستی بكەیتەوە دەیشكێنیت وەئەگەر وازی لێ بێنیت بەلاری دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوە چاكە بن لەگەڵ ئافرەتاندا).

**ئایەتی (٤٥) سورەتی (البقرة)**: قال رسول الله (ﷺ) :(الصَّلواتُ الخمسُ، والجمعةُ إلى الجُمعةِ، ورمضانُ إلى رمضانَ مُكَفِراتٌ لما بينهنَّ إذا اجتُنِبتِ الكبائرُ)(رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت –

﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ (دوو ڕووەکان) وێنەیان وەک یەکێک وایە کە(لەشەوێکی تاریکدا)ئاگرێک هەڵگیرسێنێت ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ کەلەگەڵ دەوروبەری ڕووناک کردەوە ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ خوا(خێرا) ڕووناکی یەکەیان لێ بکوژێنێتەوە ﴿وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ﴾ وە بییانهێڵێتەوە لەناو چەند تاریکیەکی وادا کەهیچ نەبینن. ١٧)
﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ﴾ کەڕو لاڵ و کوێرن ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾ بۆیە (لە گومڕایی خۆیان) ناگەڕێنەوە. ١٨)﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾یا وەک (کەسانێک لە چۆڵییەکدا) بارانێکی لێزمەو بەخوڕیان (لێ داکات)لە ئاسمانەوە﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ﴾ کەتاریکی زۆرو تریشقەو بروسکەی تێدا بێت ﴿يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ﴾ (بەجۆرێک کە) پەنجەکانیان دەکەن بە گوێیاندا لەبەر گرمەی هەورە تریشقە ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ بۆ خۆ پاراستن لەمردن﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وەخودا دەوری بێ بڕوایانی داوە. ١٩)
﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ﴾ نزیکە بێ ئەو بروسکەیە ﴿يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ (بینایی) چاویان بفڕێنێ ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم﴾ هەر کاتێ ڕووناکیی بۆ بدانایەتەوە ﴿مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ تیایدا بڕۆشتنایە ﴿وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ﴾ وەکاتێ تاریکیشی بکردایە لییان ﴿قَامُواْ﴾ لەجێگەی خۆیان ڕادەمان(دەوەستان)﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەرخودا بی ویستایە﴿لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ﴾(بەو گرمە و بروسکانە)کەڕو کوێری دەکردن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە. ٢٠)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ پەروەردگارتان بپەرستن﴿ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ کەئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن. ٢١)﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ ئەو (خوایەی) کە زەوی بۆ ڕاخستوون ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ﴾ وە ئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشک -ئاسمانی بۆ گێڕاون بەگومەزی ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ وە ئاوی (بارانی) لەئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ﴿فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ﴾ ئینجا دەری هێناوە بەو ئاوە هەموو جۆرە میوەو بەرێک بۆ ڕۆزیی ئێوە﴿فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا﴾ کەواتە هاوتا بۆ خوا پەیدا مەکەن﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ کەئێوە خۆتان دەزانن (بێ هاوتایە). ٢٢)
﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ﴾ وە ئەگەر ئێوە لەگومان دان ﴿مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ لەم (قورئانەی) کەناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (موحەممەد (ﷺ)) ﴿فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ﴾ دەسوڕەتێک بێنن بەوێنەی ئەو﴿وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە بانگی هاوکارەکانتان بکەن (لەڕەوان بێژان و شاعیران) بێجگە لەخوا ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن (بەفەرموودەی خوای نازانن). ٢٣)﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد؟ ﴿وَلَن تَفۡعَلُواْ﴾ وەهەرگیز نایشی کەن (ئیتر بێ بڕوامەبن) ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي﴾ دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ کە سووتەمەنییەکەی خەڵک (ی بەدکار) و بەردە﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ بۆ بێ بڕوایان ساز کراوە(ئامادەکراوە). ٢٤)

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

- (پێنج نوێژە فەرزەكان و نوێژی هەینی تا نوێژی هەینی و ڕەمەزان تا ڕەمەزان مایەی لێ خۆش بوونە بۆ گوناهەكانی نێوانیان ئەگەر لە گوناهە گەورەكان خۆ بپارێزێت).

**ئایەتی (٦٥) سورەتی (البقرة)**: قال رسول الله (ﷺ): (لا ترتكبوا ما ارتكبت اليهود، فتستحلّوا محارمَ الله بأدنى الحِيَل) (رواه أبو عبدالله ابن بطة). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەو خراپانە مەكەن كە جوولەكەكان دەیان كرد، ئەویش ئەوەیە كە بە بچوكترین فێڵ حەرامەكانی خوا حەلاڵ بكەن).

**ئایەتی (٨٣) سورەتی (البقرة)**: جاء رجلٌ إلى رسول الله (ﷺ) فقال: يارسولَ الله، مَنْ أحقُّ الناس بحُسن الصحبة؟ قال: (أمّكَ ثم أمّك ثم أمّك ثم أباكَ ثم أدناكَ فأدناكَ) (متفق عليه) پیاوێك هات بۆ لای -

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) مژدە بدە بەوانەی ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ کە بێگومان بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێک ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا﴾ هەر کاتێ لەوێ خواردەمەنی یەکیان بدرێتێ لە میوەهات ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە لەمەو پێش پێمان درا ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ ئێستا وێنەیان هێناوە ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ وە لەو بەهەشتانەدا بۆ ئەوان هەیە ژنانی پاکیزە ﴿وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ وە ئەوان لەو (بەهەشتانە) دا هەتا هەتایین. ٢٥) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ﴾ بێگومان خوا شەرم ناکات ﴿أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا﴾ بەوەی کە (بۆ تێگەیاندنی خەڵک) هەر نموونەیەک بهێنێتەوە ﴿بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ بە مێشوولە و بچوکتر (یا گەورەتر) لەویش ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئینجا ئەوانەی کەباوەڕدارن ﴿فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوە چاک دەزانن کە ئەو (نموونە هێنانەوەیە) ڕاست و دروستە لە پەروەردگاریانەوە ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەش کە بێ باوەڕن ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾ دەڵێن: خوا چی ویستووەبەم نموونەهێنانەوەیە ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ زۆر کەسی پێ گومڕا دەکات ﴿وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا﴾ وە ڕێنموونی زۆر کەسیشی پێ دەکات ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ وە گومڕاناکات بەو نموونە هێنانەوەیە مەگەر بەدکاران. ٢٦) ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کەپەیمانی خوا دەشکێنن (هەڵدەوەشێننەوە) ﴿مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ پاش بەستنی ﴿وَيَقْطَعُونَ﴾ وە ئەیپچڕێنن ﴿مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ ئەو (پەیوەندیانە)ی کە خوا فەرمانی داوە بە پەیوەستیی کردنی ﴿وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە لە زەویدا خراپە دەکەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانن زەرەرمەند. ٢٧) ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ چۆن پێ باوەڕ دەبن بەخوا! ؟ ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە بێ گیان بوون، و گیانی بەبەردا کردن ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ لە پاشان دەتان مرێنێ دوای ئەوە زیندووتان دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئینجا بۆ لای خۆی دەگەڕێنرێنەوە. ٢٨) ﴿هُوَ ٱلَّذِى﴾ خوا ئەو خوایەیە ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ کە هەرچی لە زەویی دایە دروستی کردووە بۆ ئێوە ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ پاشان ویستی ئاسمان دروست بکات ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ ئینجا ڕێکی خستن بە حەوت ئاسمان ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە ئەو ئاگادارە بە هەموو شتێک. ٢٩)

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً
قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ
نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ
﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟
سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ
﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ
أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا
تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟
لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا
حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾
فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟
بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾
فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ لە هەموو کەسێک شیاوترە بە چاکی هاوڕێیەتی لەگەڵ بکرێ؟ فەرمووی: (دایکت ، پاشان دایکت ، پاشان دایکت ، پاشان باوکت ، پاشان خزمە نزیکەکانت پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن ئینجا دواتر لەوان ).

**ئایەتی (٨٧) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله(ﷺ) : (إنَّ روحَ القدُس نفثَ في روعي أنَّ نفساً لن تموتَ حتى تستكملَ أجلَها و تستوعِبَ رزقَها، فاتقوا الله وأجْملوا في الطلب) (رواه الحاكم وأبو نعيم). (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (جبرییل پێ ی ڕاگەیاندم کە هیچ کەسێک نامرێت تا ماوەی ژیانی تەواو نەکات و هەموو ڕۆزیەکەی (نەخوات و) وەرنەگرێت کەواتە لە خوا بترسن و ڕەمەچن لە پەیدا کردنی دا ).

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ (بیریان بێنەوە) کاتێک کەپەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ووت ﴿إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ بە ڕاستی من جێ نشینێک دروست دەکەم لەسەر زەوی ﴿قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن﴾ (فریشتەکان) ووتیان: ئایا کەسێکی وای تیا دروست دەکەیت ﴿يُفْسِدُ فِيهَا﴾ کە خراپەو بەدیی تێدا بکات ﴿وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ وە خوێنی تیا بڕێژێ؟ ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ لە کاتێکدا کە ئێمە یادت دەکەین بەستایش کردنت ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ وەبەپاک ڕات دەگرین ﴿قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (خوا) فەرمووی: بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن. ٣٠) ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ (خوا) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ لەپاشان ئەو شتانەی نیشانی فریشتەکان دا ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ وە (خوا پێی) فەرموون: ناوی ئەمانەم پێ بڵێن ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن (کە ئێوە لە ئادەمی باشترن). ٣١) ﴿قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ﴾ (هەموو) ووتیان: خوایە تۆ پاکیت لەهەڵە ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ ئێمە هیچ نازانین، مەگەر ئەوەی کە خۆت فێرت کردبین ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر تۆیت زاناو دانا. ٣٢) ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی ئادەم ﴿أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ﴾ ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ﴾ جاکاتێک کە ناوەکانی پێ ووتن ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی پێم نەووتن؟ ﴿إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بێگومان من ئاگادارم بەنهێنیی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ﴾ وە ئاگادارم بەوەی کەئاشکرای دەکەن ﴿وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ بەئەوەش کەدەیشارنەوە. ٣٣) ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ (بێنەوە بیر) کاتێک ووتمان بە فریشتەکان ﴿ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ﴾ سوژدە ببەن بۆ ئادەم ﴿فَسَجَدُوٓا۟﴾ جا (هەموو) سوژدەیان برد ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ﴾ شەیتان نەبێت کە گوێی نەدایەو خۆی بەگەورە زانی ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وەلە بێ بڕوایان بوو. ٣٤) ﴿وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ﴾ وە ووتمان: ئەی ئادەم ﴿ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ خۆت و ژنەکەت نیشتەجێ بن لەم بەهەشتەدا ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا﴾ وە لە هەموو خواردەمەنی یەکی بخۆن بەتێرو تەسەلیی ﴿حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ لەهەر شوێنێک کەحەز دەکەن ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ وە نزیکی ئەم درەختە مەکەوون ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ تا لە ستەمکاران نەژمێردرێن -تا نەبنە ستەمکار-. ٣٥) ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا﴾ ئنجا شەیتان هەڵی خەڵەتاندن لە بەهەشتدا ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ وە لەو خۆشگوزەرانیەی کەتێیدا بوون دەری پەڕاندن ﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟﴾ وە ووتمان: (بەئادەم و حەواو شەیتان) بچنە خوارەوە (بۆ سەرزەوی) ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ **هەندێکتان دوژمن ئەبن لەگەڵ هەندێکتاندا** ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ﴾ **وە بۆتان هەیە جێگیر بوون لەسەر زەوی** ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ **وە بەهرەمەندی (و ئارەزووی دونیا) تا ماوەیەک.** ٣٦) ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ **ئینجا ئادەم چەند ووتەیەکی (پاڕانەوەی) لە پەروەردگارییەوە وەرگرت** ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ﴾ **(ئەویش) لێی گیرا کرد** ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەرئەو گیراکەری میهرەبانە. ٣٧)

قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِىٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُواْ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُواْ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾

**ئایەتی (٩٤) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ) : (مَنْ أحب لقاءَ الله أحبَّ الله لقاءَه ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (هەر کەسێک حەز بکات بەدیدەنی خوا ئەوا خواش حەز بەدیدەنی ئەو دەکات، وەهەر کەسێک حەزی لە دیدەنی خوا نەبێت، خوایش حەزی لە دیدەنی ئەو نی یە).

**ئایەتی (١٠٢) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ) : (اجتنبوا السبعَ الموبقات) قالوا: يارسول الله، وما هنَّ ؟ قال:(الشركُ بالله، والسحرُ، وقتلُ النفسِ التي حرم الله إلا بالحق، وأكلُ الربا، وأكلُ مال اليتيم، والتولّي يومَ الزحفِ وقذفُ المحصناتِ المؤمناتِ الغافلات)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (خۆتان لە حەوت تاوانە فەوتێنەرەکە بپارێزن ) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کامانەن فەرمووی : -

﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا﴾ ووتمان: هەموو بچنە خوارەوە لەبەهەشت ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى﴾ ئنجا ئەگەر لەمنەوە رێ نموونی یەكتان بۆ هات ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ئەوكەسەی دوای رێ نموونیی من كەوت ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە ترسیان لەسەرەو نەخەم دەخۆن . ۳۸ )﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە ئەوانەی كەبێ بڕوابوون و نیشانە و ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئەوانە هاوەڵ و هاودەمی ئاگرن ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ تیایدا ئەمێننەوە بەهەتا هەتایی. ۳۹ )﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل (یەعقوب ) ﴿اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ بیری ئەو چاكانە بكەنەوە كەڕشتوومن بەسەرتاندا ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِي﴾ وە پەیمانی من ببەنە سەر ﴿أُوفِ بِعَهْدِكُمْ﴾ تا منیش پەیمانی ئێوە ببەمەسەر ﴿وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ وەهەر لەمن بترسن. ٤٠ )﴿وَآمِنُوا بِمَا أَنزَلْتُ﴾ هەروەها بڕوا بهێنن بەو قورئانەی كە ناردوومەتە خوارەوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ﴾ كە پشتیوانی پەیامەكەی لای ئێوەیە (تەورات و ئینجیلی دەستكاری نەكراو ) ﴿وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ﴾ وەمەبن بەیەكەمین بێ بڕوا پێی ﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ وە نیشانە و ئایەتەكانی من مەگۆڕنەوە بەشتێكی كەم نرخ ﴿وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ﴾ وەهەر لە(بێ فەرمانی ) من خۆتان بپارێزن ٤١ )﴿وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ وەڕاست و ڕەوا تێكەڵ مەكەن بەناڕەوا و درۆ. ﴿وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ حەق و ڕاستی مەشارنەوە، لە كاتێكدا كە خۆتان ئەمە دەزانن. ٤٢ )﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ نوێژ بكەن و زەكات بدەن ﴿وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ وە لەگەڵ كڕنوش بەراندا كڕنوش بەرن. ٤٣ )﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ﴾ ئایا فەرمان بەسەر خەڵكیدا دەدەن بەچاكە؟ ﴿وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾ وە خۆتان فەرامۆش دەكەن ﴿وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ﴾ (لەگەڵ ئەمەشدا ) كەئێوە دەوری پەڕاوەكە( تەورات ) دەكەنەوە﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایاژیرنابن وتێ ناگەن؟. ٤٤ )﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ﴾ پەنابیەنەبەر ئارام گرتن و نوێژ( بۆ گەیشتن بەمەبەست ) ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ وە بێگومان نوێژ (ئەركێكی ) گەورەو گرانە ﴿إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ مەگەر لای ئەوانە نەبێ كە لەخوا ئەترسن ( خۆیان بەزل نازانن). ٤٥ )﴿الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی دڵنیان بەخزمەت پەروەردگاریان دەگەن ﴿وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ وە ئەوان دڵنیان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. ٤٦ )﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل (یەعقوب ) ﴿اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ یادی ئەو بەخششانە بكەنەوە كەڕشتوومە بەسەرتاندا ﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ وە من (كاتی خۆی ) ڕێزی ئێوەمدا بەسەر هەمواندا . ٤٧ )﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا﴾ وە خۆتان بپارێزن لەڕۆژێك ﴿لَّا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئًا﴾ كە كەس هیچ سوودێك بەكەس ناگەیەنێ ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ﴾ وە هیچ تكایەكی بۆ گیرا ناكرێ ﴿وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ وە بارمتەی لێ وەرناگیرێ ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە ئەمانە یارمەتیی نادرێن. ٤٨ )

وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ
يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ
مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ
وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ
أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ
﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾
وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾
وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم
بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ
خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ
﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً
فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ
بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ
ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا
رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾

=(هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوای، جادوو، کوشتنی کەسێ کە خوا کوشتنی یاساغ کردبێت. مەگەر (لە کاتێکدا) کوشتنی دروست بێ و، ڕیبا و سوو خواردن، خواردنی ماڵی هەتیوو، پشت هەڵکردن (ڕاکردن) لە غەزا، تۆمەتی داوێن پیسی دروست کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی ئیمانداری بێ ئاگا).

ئایەتی (١٠٨) سورەتی (البقرة)؛ قال رسول الله (ﷺ): (ذروني ما تركتكم، فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم على أنبيائهم، فإذا أمرتُكُمْ بأمرٍ فأتوا منه ما استطعتم وإذا نهيتكم عن شيء فاجتنبوه) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (وازم لێ بهێنن لەوەی وازم لێ هێناون، چونکە گەلانی پێش ئێوە لەناوچوون بەهۆی زۆر پرسیار کردنیان و جیاوازی یان سەبارەت بە پێغەمبەرانیان، جا هەرکاتێک فەرمانم پێکردن -.

﴿وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک کەڕزگارمان کردن ﴿مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾ لەدەست و پێوەندی فیرعەون ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ کەسزای سەختیان پێ ئەچەشتن ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ﴾ کوڕەکانتانیان سەر دەبڕین ﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾ وە کچەکانتانیان دەهێشتنەوە ﴿وَفِى ذَٰلِكُم﴾ وەلەمەتاندا (لەم سزا سەختەی بەسەرتاندا درا) ﴿بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ تاقی کردنەوەیەکی گەورە بوو لەپەروەردگارتانەوە. ٤٩) ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک کە دەریامان بۆ لەت کردن ﴿فَأَنجَيْنَٰكُمْ﴾ و ڕزگارمان کردن ﴿وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ﴾ وەدەست و پێوەندی فیرعەونمان خنکاند ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە تەماشاتان دەکردن. ٥٠) ﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک کەبەڵێنی چل شەومان دا بە مووسا ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ لە دوای ئەو (ڕۆشتنی مووسا بۆ کێوی طور) گوێرەکەکەتان کرد بە پەرستراو ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە ستەمکار بوون. ٥١) ﴿ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا دوای ئەو (گوێرەکە پەرستی یەتان) لێتان خۆش بووین ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تا سوپاسی (خوا) بکەن. ٥٢) ﴿وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک تەورات و جیاکەرەوە (لە نێوان دروست و نادروست)مان دا بە مووسا ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕێنموونیی پێ بکەن. ٥٣) ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک کەمووسا بەگەلەکەی ووت ﴿يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم﴾ ئەی گەلەکەم بەڕاستی ئێوە ستەمتان کرد لە خۆتان ﴿بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ﴾ بە گوێرەکە پەرستیەکەتان ﴿فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ﴾ کەواتە بگەڕێنەوە بەپەشیمانیی بۆ لای بەدی هێنەرتان ﴿فَٱقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾ و خۆتان بکوژن (بێ تاوانتان تاوان بارتان بکوژێت) ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ﴿عِندَ بَارِئِكُمْ﴾ لای بەدیهێنەرتان ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ ئینجا (خواش) پەشیمانیەکەی لێ گیرا کردن ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر خوایە گیراکەری پەشیمانی و میهرەبانە. ٥٤) ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێ ووتتان ئەی مووسا ﴿لَن نُّؤْمِنَ﴾ بڕوات پێ ناهێنین ﴿حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ تاخوا نەبینین بەئاشکرا ﴿فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ لەپڕ هەورە تریشقەیەک لێ ی دان ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە تەماشاتان دەکرد. ٥٥) ﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم﴾ لەپاشان زیندوومان کردنەوە ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ﴾ لەدوای مردنتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی (خوا) بکەن. ٥٦) ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ﴾ وە بەهەور سێبەرمان کرد بەسەرتانەوە ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ﴾ وە گەزۆو شیلاقەمان بەسەردا ڕشتن و بۆ ناردن ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ (وە پیمان ووتن) بخۆن لەو خواردنە پاکانەی کە کردمان بەڕۆزیتان ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ (ئەوانەی ناسوپاسی یان کرد) ستەمیان لە ئێمە نەکرد ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکو ستەمیان لەخۆیان کرد. ٥٧)

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا
وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ
وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا
غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ
لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ
ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟
وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾
وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ
يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا
وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ
بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ
وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ
ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ
ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾

**- بەشێتیکە ئەوەندەی دەتوانن جێ بەجێ ی بکەن وە ئەگەر قەدەغەی هەر شتێکم لێ کردن لێ ی دووركەونەوە.**

**ئایەتی (١١٧) سورەتی (البقرة): قال رسول الله (ﷺ): (قال الله تعالى: كذّبني ابنُ آدمَ ولم يكن له ذلك، وشتمني ولم يكن له ذلك: فأمّا تكذيبُهُ إيّايَ فزَعَمَ أنّي لا أقدِرُ أن أعيدهُ كما كانَ وأما شتمُهُ إيّايَ فقولُهُ لي ولد، فسبحاني أن أتخذ صاحبةً أو ولداً) (رواه البخاري).** **پێغەمبەر** (ﷺ) فەرمویەتی: خوای گەورە فەرمویەتی: (ئادەمیزاد درۆی دایە پاڵ من کە **مافی ئەوەی نەبوو، وە جنێوی** پێ دام کە مافی ئەوەشی نەبوو،درۆ دانە پاڵەکەی بۆ من ئەوەیە کە **وادەزانێت من توانای ئەوەم نی یە** زیندووی بکەمەوە بەو شێوەی کە **لە دنیادا بووە**، وە جنێو دانەکەی **بەمن ئەوەیە کە دەڵێت من (خوا) کوڕم هەیە پاکە و بێگەردی بۆ من لەوەی** خێزان یا کوڕم هەبێ).

﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ (بیریکەنەوە) کاتێک کە وتمان: بچنە ئەم شارە (کەقودسە) ﴿فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا﴾ ئینجا لەوێ (هەرچی ئارەزوو دەکەن) بخۆن بەتێرو تەسەلی لەهەر لایەک کە حەز دەکەن ﴿وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا﴾ وەلە دەرگاوە بچنە ژوورەوە بەمل کەچی (بە کڕنوشەوە) ﴿وَقُولُوا حِطَّةٌ﴾ وە بڵێن (خوایە) لە گوناهەکانمان خۆش ببە. ﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ﴾ ئەوسا لەگوناهەکانتان خۆش دەبین ﴿وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ﴾ وەلە ئایندەدا پاداشتی چاکەکەران زۆرتر دەکەین. ٥٨) ﴿فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ کەچی ئەوانەی ستەمکار بوون (ئەوەی پێیان وترا بوو) گۆڕییان ﴿قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ﴾ بە قسەیەک کەپێیان نەوترا بوو ﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئیتر ئێمەش ڕشتمان بەسەر ئەوانەی کەستەمیان کرد ﴿رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾ سزا لە ئاسمانەوە ﴿بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ بەهۆی ئەو نافەرمانی یەی کە کردیان. ٥٩) ﴿وَإِذِ اسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ﴾ (بیریکەنەوە) کاتێک کە مووسا داوای باران بارینی کرد بۆ گەلەکەی ﴿فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ﴾ ئێمەش پێمان وت: گۆچانەکەت بدە بەو (تاشە) بەردەدا ﴿فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا﴾ (کە لێی دا) لەپڕ دوانزە کانیی لێ هەڵقولا ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ بێگومان هەموو تیرەیەک چاوگەی (ئاوە خواردنەوە) خۆی ناسی ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا مِن رِّزْقِ اللَّهِ﴾ (ئینجا وتمان) بخۆن و بخۆنەوە لە ڕۆزی خوا ﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ وەبڵاوەمەبنەوە لەزەویدا بە خراپەکردن. ٦٠) ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ﴾ (بیریکەنەوە) کاتێک کە وتتان: ئەی مووسا ﴿لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ﴾ هەرگیز خۆمان ڕاناگرین لەسەر یەک جۆر خۆراک ﴿فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ کەواتە دواکاریمان بۆ بکە لە پەروەردگارت ﴿يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ﴾ بۆمان دەربهێنێ لەوەی کەزەوی دەیڕوێنێ ﴿مِن بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا﴾ لەسەوزەواتی و ترۆزیی و خەیاری ﴿وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا﴾ و سیریی و نیسکی و پیازی ﴿قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَىٰ بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ﴾ (مووسا) فەرمووی: ئایا داوای ئەو شتە خراپانە دەکەن لە جیاتی شتی باشتر لەوان ﴿اهْبِطُوا مِصْرًا﴾ دابەزن بۆ شارێک (لەم شارانەی فەلەستین) ﴿فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾ ئەوسا بەڕاستی چیتان داوا کردووە دەستتان دەکەوێت ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ﴾ وە درا بەسەریاندا ڕیسوایی و بێ نەوایی (هەژاری) ﴿وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ وە خەشمی خوایان بۆ خۆیان هێنایەوە ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ ئەمە لەبەر ئەوە بوو کەبێ بڕوابوون بە نیشانە و فەرمانەکانی خوا ﴿وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ وە پێغەمبەرانیان دەکوشت بەناڕەوا ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ﴾ ئەمە بەهۆی ئەوەوە بوو کەسەرپێچی و دەست درێژی یان دەکرد. ٦١)

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾

**ئایەتی (١٢٠) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ): **(الرجلُ على دينِ خليلهِ فلينظُرْ أحدكم من يخالِلُ) (رواه الترمذي).** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (مرۆڤ لەسەر دینی هاوەڵەکەیەتی جابا هەریەکێ لە ئێوە سەیر بکات و وورببێتەوە هاوەڵێتی کێ دەکات).

**ئایەتی (١٢٠) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ): **(من تشبَّهَ بقومٍ فهو منهم) (رواه أبوداود وأحمد).** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەر کەسێك خۆی بچوێنێت بە کەسانێك ئەوە لەو کەسانەیە).

**ئایەتی (١٣٢) سورەتی (البقرة):** قال زيد وقف رسول الله (ﷺ) خطيباً، فحمد الله، وأثنى عليه، ووعظ وذكّر، ثم قال: **(أمّا بعدُ،** ألا أيُّها الناسُ، إنما أنا بشرٌ يوشِكُ أن يأتي رسول ربّي فأجيبَ، وأنا تاركٌ فيكم -

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَٱلَّذِينَ هَادُوا ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ئیماندارن (موسڵمانن) وە ئەوانەی جوولەکەن ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ وە گاورو ئستێرە یان فریشتە پەرستەکان﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ هەر کامێک لەمانە بڕوای هێنا بەخواو ڕۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ وە کردەوەی چاکی کرد ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوە پاداشتیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریانەوە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نەترسیان لەبەرەو نەخەفەت دەخۆن. ٦٢) ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ وە (بیربکەنەوە) کاتێک پەیمانمان لێ وەرگرتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ وە (کێوی) طورمان بەرزکردەوە بەسەر سەرتانەوە ﴿خُذُوا مَا ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ (وە پێمان ووتن) ئەوەی پێمان داوون (لەتەورات) باش کاری پێ بکەن ﴿وَٱذْكُرُوا مَا فِيهِ﴾ وەبیر بکەنەوە لەوەی کە تێیدایە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو خۆتان بپارێزن و لەخوابترسن. ٦٣) ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ دیسان پشتتان هەڵکرد دوای پەیمان وەرگرتنەکە ﴿فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئینجا ئەگەر بەخشش و میهرەبانی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە ﴿لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئەوە ئێوە لە زەرەرمەندان دەبوون. ٦٤) ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێوە (دەنگ و باسی) ئەوانەتان زانیبوو ﴿ٱعْتَدَوْا مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ لەخۆتان کەدەست درێژیان کرد لەشەممەدا ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ﴾ ئینجا پێمان ووتن ﴿كُونُوا قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ﴾ ببن بەمەیموونی دوور خراوە لەبەزەیی خوا. ٦٥) ﴿فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا﴾ ئینجا ئەم سزایەمان کردە پەند بۆ خەڵکانی ئەو سەر دەمەو ئەوانەی دوای ئەوان ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وەبەئامۆژگاریی بۆ پارێزکاران. ٦٦) ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ وە (بیربکەنەوە) کاتێک کەمووسا بەگەلەکەی ووت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ﴾ بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات ﴿أَن تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾ کەمانگایەک سەر ببڕن ﴿قَالُوٓا أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا﴾ ووتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەیت؟ ﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ ووتی: پەنا ئەگرم بەخوا کەلە نەفامان بم. ٦٧) ﴿قَالُوا ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ووتیان: داوامان بۆ بکە لەپەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ﴾ پێمان بڵێ ئەو مانگایە کامەیە؟ ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ ووتی: بێگومان خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ﴾ مانگایەک بێ نە زۆر پیرو نەزۆر جوان ﴿عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ مام ناوەندی بێ لەنێوان ئەم دوانەدا ﴿فَٱفْعَلُوا مَا تُؤْمَرُونَ﴾ زوو بیکەن ئەوەی فەرمانتان پێ دراوە. ٦٨) ﴿قَالُوا ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ ووتیان: داوامان بۆ بکە لەپەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا﴾ پێمان بڵێ ڕەنگی مانگاکە چۆن بێ؟ ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ ووتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا﴾ مانگایەکی زەردی تێر بێ ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ دڵی تەماشا کاران خۆش بکات. ٦٩)

قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٧٦﴾

**- ثقلین: اولهما كتابُ الله، فیه الهدی والنورُ، فخذوا بكتاب الله، واستمسكوا به) فحثّ علی كتاب الله: ورغّبَ فیه، ثم قال: (واهلُ بیتي، اذكّركُمُ الله في اهل بیتي)(رواه مسلم).**

**زەید** دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەستایە سەرپێ و **وتارێكی دا جا سوپاسی** خوای كرد **و ئامۆژگاری** كردو **پاشان** فەرمووی: **(پاشان: بێدار بن ئەی خەڵكینە، من مرۆڤێكم نزیكە نێرراوی پەروەردگارم بێت : بۆ لام و بە دەمیەوە بچم (بمرم) وە** من لەناو ئێوەدا دووشتی سەنگینتان بۆ بەجێ دێڵم: یەكەمیان قورئانەكەی **خوایە،** كە ڕێنموونی و ڕووناكی تێدایەو دەست بگرن بە قورئانی خواوەو شوێنی بكەون)، **ئینجا هانی** خەڵكی دا بۆدەست گرتن بە قورئانەوە، پاشان فەرمووی: (دووەمیان **كەس و خزمەكانمە خۆتان** بیردەخەمەوە ئامۆژگاریتان دەكەم چاك بن دەبارەی كەس و كارم).

﴿قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ وتیان: داوامان بۆ بکە لە پەروەردگارت ﴿يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ بۆمان ڕوون بکاتەوە چۆن بێ ئەو مانگایە؟ ﴿إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا﴾ بەڕاستی مانگاکەمان لێ تێک چووە ﴿وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئەگەر خوا بیەوێ ڕێنموونی وەردەگرین. ٧٠) ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ﴾ وتی: خوا ئەفەرموێ ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ﴾ بەڕاستی مانگایەکە بێ ڕانەهێنراوێ نە بە کێلانی زەوی ﴿وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ﴾ وە نە بە ئاودێری کشت وکاڵ ﴿مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ بێ ئەنگ و بێ پەڵەبێ ﴿قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ﴾ وتیان: ئا ئێستا هەواڵی ڕاستت هێنا ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئینجا سەریان بڕی و خەریک بوو ئەو (سەربڕینە) نەکەن. ٧١) ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا﴾ (وەبیربکەنەوە) کاتێک کە یەکێکتان کوشت ﴿فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾ وە هەموو لە خۆتانتان دوور دەخستەوەو ئاژاوەتان بوو ﴿وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ وە خوایش ئاشکرای کرد ئەوەی کەئەتان شاردەوە. ٧٢) ﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا﴾ ئینجا وتمان بە ئەندامێکی (مانگا سەربڕاوەکە) لەکوژراوەکە بدەن ﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ﴾ ئاوا خوا مردووان زیندوو دەکاتەوە ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ﴾ وە نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی تێ بگەن. ٧٣) ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ لە پاشان دڵتان ڕەق بوو دوای ئەم (هەموو) موعجیزانە ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ دڵتان وەک بەردە بەڵکو زۆر ڕەقترە ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ﴾ بەڕاستی بەردی واهەیە لەچەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵ دەقوڵێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾ وەبێگومان هی وایان هەیە کەلەت لەت دەبێ و ئاوی لێ دێتە دەرێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ وە بەڕاستی هی وایان هەیە لەترسی خوا (لەلوتکەی شاخەکان) بەر ئەبێتەوە ﴿وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە خوا بێ ئاگا نیيە لەوەی کەدەیکەن. ٧٤) ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ﴾ جا ئایا بەتەمان (ئەی موسڵمانینە) کە (جوولەکە) بڕوا بێنن بە ئایینەکەتان ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾ لەکاتێک دا کەدەستەیەک لەوان ﴿يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ﴾ فەرموودەی خوایان ئەبیست (لەتەورات) ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾ کەچی لەپاش تێ گەیشتنی دەست کاریيان دەکرد ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ وە ئەوان دەشیان زانی (کە کارێکی نارەوایە). ٧٥) ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا﴾ (جوولەکەکان) کاتێک تووشی موسڵمانەکان ببونایە دەیان ووت: ﴿آمَنَّا﴾ ئێمەش بڕوامان هێناوە (بە پێغەمبەرەکەتان) ﴿وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا﴾ بەڵام کاتێک لەپەنایەکەوە هەندێکیان بەهەندێکیان بگەشتنایە دەیان ووت: ﴿أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەوە ئێوە ئەو شتانە بە موسڵمانەکان دەڵێن کەخوا بۆ ئێوەی باس کردووە (لەتەورات دا)؟ ﴿لِيُحَاجُّوكُم بِهِ﴾ تا بۆڕتان بدەن بەوتەورانە ﴿عِندَ رَبِّكُمْ﴾ لای پەروەردگارتان (لەڕۆژی دوایی دا) ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ ئنجا ئایا ژیر نابن و تێناگەن؟. ٧٦)

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾

**هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی (٧٩) سورەتی (البقرة):** **﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ...﴾** **بوخاری لە عەبدوڵڵای** کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: **ئەم ئایەتە** لەسەر خاوەن **کتێبەکان** هاتە **خوارەوە.**

ئایەتی **(١٣٦) سورەتی (البقرة): عن أبي هريرة (ﷺ) قال كان أهلُ الكتاب يقرؤون التوراةَ بالعبرانية ويفسرونها بالعربية لأهل** الإسلام، فقال رسول الله (ﷺ) : ( لا تصدّقوا أهلَ الكتابِ ولا تكذّبوهم، **وقولوا: آمنا بالله وما أُنزل إلينا ..** الآية)(رواه البخاري). ئەبو **هورەیرە** ( ڕەزای خوای لێ بێت ) دەڵێت: **جوولەکەکان** بەزمانی عیبری تەوراتیان دەخوێندەوە و بەعەرەبی ڕاقەیان دەکرد بۆ موسڵمانەکان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( خاوەن کتێبەکان نە باوەڕیان پێ بکەن و =

﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ﴾ **ئایا ئەوان نازانن** ﴿أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ **کە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی کەپەنهانی ئەکەن و ئەوەی ئاشکرای ئەکەن.** ٧٧) ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ﴾ **وە هەندێکیان نەخوێندەوارن** ﴿لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ﴾ **لەپەڕاوەکە** (تەورات) نازانن، **تەنها ئاوات و هیوای هیچ و پوچ نەبێ** ﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ **وە ئەوان** هەر دوای گومان **دەکەون.** ٧٨) ﴿فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ﴾ **ئینجا هاوار وتیاچوون بۆ ئەوانەی** ﴿يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ﴾ **کە تەوراتە (تێکدراوە) کە بەدەستی خۆیان دەنوسنەوە** ﴿ثُمَّ يَقُولُونَ﴾ **پاشان دەڵێن:** ﴿هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ﴾ **ئەم (نامەیە) لە خواوەیە** ﴿لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ **تا شتێکی کەمی پێ بکڕن** ﴿فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ **سا** هاوار و تیاچوون بو ئەوان لەوە **کە دەستی ئەوان نووسیویێتیەوە** ﴿وَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ﴾ **وە هاوار بۆ ئەوان لەوەی کەپەیدای دەکەن.** ٧٩) ﴿وَقَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ﴾ وە(جوولەکەکان) ووتیان: ئاگری **دۆزەخمان لێ ناکەوێ** ﴿إِلَّا أَيَّامًا مَعْدُودَةً﴾ مەگەر چەند ڕۆژێکی ژمێرراو ﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدًا﴾ **بڵێ: ئایا پەیمانتان لەخواوە** وەرگرتووە؟ ﴿فَلَنْ يُخْلِفَ اللَّهُ عَهْدَهُ﴾ **تا خواش پێچەوانەی پەیمانی خۆی نەکات؟** ﴿أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ **یان شتێکی وا هەڵدەبەستن بەدەم خوداوە** کەنایزانن. ٨٠) ﴿بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً﴾ **نەخێر وانییە: هەر کەسێک خراپە بکات** ﴿وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ﴾ **وە تاوانەکەی خۆی دەوری دابێ و دایگرێتەوە** ﴿فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ **ئا ئەوانە هاودەمی ئاگرن** ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ **تیایدا دەمێننەوە بە ئیجگاری.** ٨١) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ **وە ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوەی** باشیان کرد ﴿أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ﴾ **ئەوانە هاودەمی بەهەشتن** ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ **تیایدا** دەمێننەوە بە ئیجگاری. ٨٢) ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ **(وە بیربکەنەوە)** کاتێک کەپەیمانمان لە جوولەکە وەرگرت ﴿لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ﴾ کە هیچ شتێک نەپەرستن جگە لە خوا ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ وە چاکە بکەن لەگەڵ باوک و دایک ﴿وَذِي الْقُرْبَى﴾ و خزمان ﴿وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ﴾ و **هەتیوان و بێچاران (بەستەزمانان)** ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ وە قسەی جوان بکەن لەگەڵ خەڵکیدا ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ وە نوێژ بکەن ﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ وە **زەکات بدەن** ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْكُمْ﴾ **ئینجا پشتتان هەڵکرد کەمێکتان نەبێت** ﴿وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ﴾ وە ئێوە بەر بەرەکاتێکەرن (پشت هەڵکەرن). ٨٣)

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ
أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾
ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا
مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ
وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ
إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ
بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ
وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ
يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ
بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ
بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ
ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟
قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

- نەبەردڕیان بخەنەوە وە بڵێن (باوەڕمان هەیە بە خواو و بەو (قورئان)ەی نێراوەتە خوارەوە بۆمان تا کۆتایی ئایەتەکە).

**ئایەتی (١٤٣) سورەتی (البقرة)؛** قال رسول الله (ﷺ) (**يدعى** نوح يوم القيامة، فيقول: لبيك وسعديك **يارب،** فيقول هل **بلّغت؟** فيقول: نعم **، فيقال لأمته:هل بلغكم**؟فيقولون:ما **أتانا** من نذير، **فيقول من يشهد لك؟ فيقول محمد و أمته، فيشهدون أنه قد بلّغ، ويكون** الرسول عليكم شهيداً فذلك قوله عزوجل ﴿و كذلك جعلناكم أمة **وسطاً**﴾ (رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی دواییدا نووح بانگ دەكرێت، ئەویش **دەڵێ** ئەی پەروەردگارم بە دەم فەرمانتەوەهاتم، و لە خزمەت دام خوای گەورەش دەفەرموێ ئایا ئەوەی **پیمان سپاردی** گەیاندت؟ نووحیش دەفەرموێ: بەڵێ، ئەنجا بەگەلەكەی دەوترێت:ئایا پێتانی ڕاگەیاند، -

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ وە (بیربکەنەوە) کاتێک پەیمانمان لێ وەرگرتن ﴿لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ﴾ کە خوێنی یەکتری نەڕێژن ﴿وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ﴾ وە خۆتان دەربەدەر نەکەن لە وڵاتتان ﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ پاشان بڕیارتان دا (لەسەر ئەم پەیمانە) وە ئێوە (خۆتان) شایەتی لەسەر ئەدەن. ٨٤) ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئینجا ئێوە هەر ئەوانەن ﴿تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ کە یەکتری دەکوژن ﴿وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ﴾ وە هەندێک لە خۆتان دەربەدەر دەکەن لە وڵاتیان ﴿تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم﴾ پشتیوانی (بێگانە) دەکەن دژی ئەوان ﴿بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ بە بەدی و دەست درێژی ﴿وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ﴾ وە ئەگەر دیلتان بۆ بێنن (لەخۆتان ئەیانکرنەوە و) ﴿تُفَٰدُوهُمْ﴾ بریتی یان بۆ دەدەن ﴿وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ﴾ لەگەڵ ئەمەشدا کە دەربەدەر کردنیان قەدەغە کراوە لێتان (بۆچی کار بەوەیان دەکەن و بەمەیان ناکەن) ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ جا ئایا بڕوا دەهێنن بەهەندێک لە تەورات ، و بێ بڕوا دەبن بەهەندێکی تری ﴿فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ﴾ جاتۆڵەی ئەو کەسانەکەوا بکەن لەئێوە ﴿إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ هەر ڕیسوایی و بەدناوی یە لە ژیانی دونیادا ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وە لەڕۆژی دوایشدا ﴿يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ﴾ دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەخت ترین سزا ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە خوا بێ ئاگانییە لەوەی کەدەیکەن. ٨٥) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەمانە ئەوانەن ﴿ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ کە ژیانی جیهانتیان کڕی بەدوا ڕۆژ ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ ئیتر نە سزایان لەسەر سووک دەکرێت ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە نەیارمەتیی دەدرێن (نەپشتگیریی دەکرێن). ٨٦) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە تەوراتمان دا بەمووسا ﴿وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ﴾ وە دوا بەدوای ئەو پێغەمبەرانمان نارد ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ وەچەند نیشانەیەکی ڕۆشنمان دا بە عیسای کوڕی مەریەم ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ وە پشتیوانیمان کرد بە جوبرەئیل ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ﴾ جا هەر کاتێ پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە ﴿بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ﴾ بە جۆرێک کەڕێکی ئارەزووتان نەبوایە ﴿ٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ لووت بەرزبوون و خۆتان بەگەورە گرتووە ﴿فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ﴾ جا دەستەیەکتان (لە پێغەمبەران) بەدرۆ زانیوە ﴿وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ وە دەستەیەکتان کوشتوون. ٨٧) ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ وە( جوولەکەکان) وتیان (بە پێغەمبەر (ﷺ)) دڵمان داپۆشراوە (لەپۆرگایە قسەی تۆی ناگاتێ) ﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکو خوا نەفرینی لێکردن بەهۆی بێ بڕوایی یانەوە ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ بۆیە کەم جار بڕوا دەهێنن- کەمیان هەیە بڕوا بهێنن. ٨٨)

وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٨٩) سورەتی (البقرة): ﴿وَكَانُوا مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئیبن ئیسحاق لە عاصی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە** ئەویش لە **پیاوێك لە هۆزی خۆیانەوە** دەگێڕێتەوە **کەووتوویانە بەڕاستی** ئەوەی **کەوای لێ کردین موسڵمان ببین جگە لەڕەحمەت و ڕێنموونیی خوای پەروەردگار بۆمان ئەو ووتانە بوو لە کەسانێکی جوولەکەمان دەبیست لەکاتێکدا ئێمە** بت پەرست بووین و ئەوان خاوەنی نامەو زانیاری بوون کە ئێمە نەزان بووین وە بەردەوام لەنێوان ئێمەو ئەواندا ئاژاوەو شەڕ هەبوو جا هەر کاتێك دەستێکمان لێ بوەشاندنایە کەجێگای **دڵ گرانی ئەوان بوایە** پێیان دەوتین بەڕاستی ئێستا سەردەمی ناردنی پێغەمبەرێك نزیك بۆتەوە ئێمە لەگەڵیدا ئێوە دەکوژین بەوێنەی کوشتاری عاد و ئیرەم. ئێمە ئەم ووتەیەمان زۆر لێ دەبیستن ئینجا –

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ﴾ كاتێك كە نامەیەكیان بۆ هات (كە قورئانە)﴿مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ كە پشتیوانی تەوراتەكەی ئەوانە (پەسەندكەری ئەو تەوراتەی كەلایانە) ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ﴾ وە ئەوان (جوولەكەكان) لەوەپێش ﴿يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ داوای زاڵ بوونیان ئەكرد لە خوا بەسەر ئەوانەی كەبێ بڕوابوون ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟﴾ كەچی كاتێك ئەو (پێغەمبەر)ەی دەیان ناسیی بۆیان هات ﴿كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾ بێ بڕوابوون پێی ﴿فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ كەواتە نەفرینی خوا لەبێ بڕوایان بێ. ٨٩)﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ﴾ شتێكی زۆر خراپ بوو كە خۆیانیان پێ فرۆشت ﴿أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ (ئەو خراپەش) بێ بڕوایی یان بوو بەو قورئانەی كە خوا ناردویەتیە خوارەوە﴿بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ﴾ بە هۆی حەسوودیانەوە بوو بەوەی كە خودا بڕێژێ ﴿مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ لە بەخششی خۆی بەسەر هەر كەسێكدا كە خۆی بیەوێ ﴿مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ لە بەندەكانی (كە موحەممەدە (ﷺ)) ﴿فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ﴾ ئینجا تووشی خەشم و رقی یەك لە دوایەكی خوا بوون ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای ریسواكەر. ٩٠)﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟﴾ كاتێك پێ یان بووترایە: بڕوا بهێنن ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بەوەی كە خوا ناردوویەتیە خوارەوە (كە قورئانە) ﴿قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ ئەیان ووت: ئێمە بڕوا بەوە دەهێنین كە بۆ خۆمان نێردراوەتە خوارەوە ﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ﴾ وە بێ بڕوا ئەبوون بە ئەوانەی كە دوای (تەورات) نێراوە (وەك قورئان) ﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ﴾ لە كاتێكدا كە ئەو قورئانە راستەو پشتیوانی تەوراتەكەی ئەوانە و بەراستی دەزانێت ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ﴾ بڵێ: بۆچی لەمەو پێش پێغەمبەرانی خواتان دەكوشت ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕوادار بوون. ٩١)﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ سوێند بە خوا بەراستی مووساتان بۆ هات بەچەند نیشانەیەكی ڕۆشنەوە ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ كەچی لەدوای ئەو گوێرەكەتان پەرست﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ بێگومان ئێوە ستەمكارن. ٩٢)﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ (وەبیربكەنەوە) كاتێك كە پەیمانمان لێ وەرگرتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ وە كێوی طورمان بەرز كردەوە بەسەرتاندا﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ (وە ووتمان) ئەوەی پێماندراوون (تەورات) باش كاری پێ بكەن (توند دەستی پێوە بگرن)﴿وَٱسْمَعُوا۟﴾ وە گوێ بگرن ﴿قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ (بەزیان) ووتیان: بیستمان و (بە كردەوە) بێ فەرمانیمان كرد﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾ وە بەهۆی بێ بڕوایی یانەوە دڵیان ئاودرا بوو بەخۆشەویستی گوێرەكە كە ﴿قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ﴾ بڵێ: بڕواكەتان چ فەرمانێكی بەدتان پێ دەدات﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئەمەتان داناوە بە بڕوا. ٩٣)

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا عَهْدًا نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾

**- کاتێ خوای گەورە پێغەمبەر (ﷺ) ی نارد کە بانگی کردین بۆ لای خوا ئێمەش باوەڕمان پێ هێناو ئەو هەڕەشانەی جوولەکەکان بەهاتنی ئەم پێغەمبەرە لێیان دەکردین زانیبومان بۆیە بەپەلە پێشتین بەپیریەوەو باوەڕمان پێ هێناو ئەوان (جوولەکەکان) باوەڕیان پێ نەهێنا جا دەربارەی ئێمە و ئەوان ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە**

**﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ﴾.**

**هۆی هاتنە خوارەوەی** ئایەتی (٩٧) سورەتی (البقرة): ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ...﴾ ئیمامی ئەحمەد و بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی دەستەیەك لە جوولەکە هاتنە لای-

﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ﴾ (ئـەی موحەممـەد (ﷺ)) بلـێ: ئەگـەر مـاڵی دوایی (بەهەشت) بۆ ئێوەیە لای خوا (وەک خۆتـان دەڵـێن) ﴿خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ﴾ بەتایبەتی بێ ئەوەی کەس ببێ بە هاوبەشتان ﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ کەواتە داوای مردن بکەن ئەگەر راست کۆن. ٩٤) ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا﴾ وە هەرگیز داوای مردن ناکـەن ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بـەهۆی ئـەو (گوناهانـە) کـە بەدەسـتی خۆیـان پێشیان خستووە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە خوا ئاگادارە بە ستەمکاران. ٩٥) ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ﴾ سـوێند بێت ئەو (جوولەکە)انە دەبینیت ﴿أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ﴾ لە هـەموو کـەس زیـاتر حـەز لەژیان دەکەن ﴿وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ وە لەوانەش کە هاوبـەش بۆ خـوا پـەیدا دەکـەن ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ﴾ (لەبەر ئەوە) هەر یەکێکیان ئاوات دەخوازێ ﴿لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ کە هەزار ساڵ بژیایە ﴿وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ﴾ وە ئەو تەمەنـە (کەبەسـەری دەبـات) ڕزگاری ناکات لە سزا ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ وە خـوا بینایـە بـەوەی کـە دەیکـەن. ٩٦) ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: هەر کەسێک دوژمنـی جوبرەئیل بێت (ئـەوە دوژمنـی خوایـە) ﴿فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ چونکـە ئـەو بـە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵـی تـۆ ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بـە پشتیوانیی نامەکانی پێش خۆی ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە بەڕێنموونیی کەرو مژدە دەر بـۆ بـڕواداران. ٩٧) ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ﴾ هـەر کەسـێک دوژمنـی خـوا و فریشتەکانی خوا ﴿وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ﴾ و پێغەمبەرانی و جوبرەئیل و میکائیل بێت (ئەوە بێ بڕوایە) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ﴾ وەبێگومان خـواش دوژمنـی بێ بڕوایانـە. ٩٨) ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ﴾ سـوێند بەخوا بێگومان بۆمـان نـاردوویت ﴿آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ چـەند نیشـانەیەکی ڕوون و ئاشـکرا (کـە قورئانە) ﴿وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ﴾ وە کـەس بێ بڕوا نابێت پێ یان، مەگـەر بەدکاران. ٩٩) ﴿أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا عَهْدًا﴾ ئایا (بێ بڕوا ئـەبن بـە ئایەتانی ئێمـە) هـەر جارێک پەیمانێک ببەستن (لـەگەڵ پێغـەمبەردا) ﴿نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم﴾ دەستەیەک لـەوانە پەیمانەکـەیان هەڵوەشـاندۆتەوە؟ ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڵکـو زۆربـەیان هـەر بـڕوا نـاهێنن. ١٠٠) ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾ کاتێـک کـە پـێغەمبەرێکیان بـۆ هـات لەلایـەن خـواوە ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ بـە پـشتیوانی تەوراتەکەیان ﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ﴾ دەستەیەک لەوانەی کـە خـاوەن نامـە بـوون نامەکـەی خوایـان فـڕێ دایـە ﴿وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ﴾ پـشت خۆیـان (پـشت گوێیان خست) ﴿كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەک نەزانن (کەئەوە نامەی خودایە). ١٠١)

وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامان بدەرەوە دەربارەی چەند پرسیارێك لێت دەکەین کە هیچ کەس وەڵامەکانیان نازانێت کەسێك نەبێت کە پێغەمبەر بێت ئەویش فەرمووی: هەر پرسیارێکتان هەیە لێم بکەن ئینجا پرسیارەکانیان لێ کردوو وەڵامی دانەوە پاشان ووتیان کێ دۆست و خۆشەویستی تۆیە لە فریشتەکاندا لەم حاڵەدا لەگەڵتدا دەبین یان لێت جیادەبینەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی دۆست و خۆشەویستی من جوبرەئیلە وە خوا هەر پێغەمبەرێکی نارد بێت تەنها هەر جوبرەئیل دۆست و خۆشەویستی بووە ووتیان کەواتە ئێمە لێت جیادەبینەوە ئەگەر فریشتەیەکی تر جگە لە جوبرەئیل خۆشەویستت بوایە شوێنت دەکەوتین و باوەڕمان پێ دەهێنای، پێغەمبەر فەرمووی: چ شتێك بەرگری کردوون لەوەی-

﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ﴾ (جووله‌كه‌كان) دوای ئه‌و (شتانه) كه‌وتن كه‌شه‌یتانه‌كان ده‌یان خوێنده‌وه‌(بۆ خه‌ڵكی) ﴿عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ﴾ له‌ سه‌رده‌می پاشایه‌تی سوله‌یمان دا، وه‌ سوله‌یمان بێ بڕوا نه‌بوو ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟﴾ به‌ڵام شه‌یتانه‌كان بێ بڕوابوون ﴿يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾ خه‌ڵكیان فێری جادوو ده‌كرد ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ﴾ هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ی نێردراوه‌ته‌ خواره‌وه‌ له‌ بابل بۆ سه‌ر هارووت و مارووت (دوو فریشته‌ بوون) ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ﴾ وه‌ (ئه‌مانه) كه‌سیان فێرنه‌ده‌كرد تا پێیان نه‌وتایه‌ ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ﴾ ئێمه‌ هه‌ر تاقی كه‌ره‌وه‌ی (ئاده‌میزاد)ین كه‌واته‌ بێ بڕوا مه‌به‌ ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ﴾ ئینجا فێری جادووی وا ده‌بوون لێیانه‌وه‌ كه‌ ژن و مێردی پێ له‌یه‌ك بكه‌ن ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئه‌وان به‌م جادووه‌ ناتوانن زیان به‌ كه‌س بگه‌یه‌نن ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾ مه‌گه‌ر به‌ویستی خوا ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ﴾ وه‌ فێری شتێك ده‌بن كه‌ زیانیان پێ ده‌گه‌یه‌نێ نه‌ك قازانج ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ﴾ بێگومان زانیان هه‌ر كه‌سێ جادو بكڕێ ﴿مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ﴾ (به‌ فه‌رمووده‌ی ته‌ورات) له‌ڕۆژی دواییدا بێ به‌ش ده‌بێ ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ﴾ به‌ ڕاستی زۆر به‌ده‌ ئه‌و شته‌ی كه‌(بڕوای) خۆیانیان پێ فرۆشت﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئه‌گه‌ربیانزانیایه‌.١٠٢) ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟﴾ ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی ئه‌وان بڕوایان بهێنایه‌ و پارێزكار بونایه‌ ﴿لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ﴾ ئه‌وا پاداشتێكی چاكتر له‌لایه‌ن خواوه‌ بۆ ئه‌وان ده‌بوو ﴿لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئه‌گه‌ر بیانزانیایه‌. ١٠٣) ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئه‌ی ئه‌وانه‌ی كه‌ بڕواتان هێناوه‌ ﴿لَا تَقُولُوا۟﴾ مه‌ڵێن ﴿رَٰعِنَا﴾ ووشه‌ی جوێن و بێ ڕێزییه‌ به‌لای جوله‌كه‌وه‌﴿وَقُولُوا۟﴾، وه‌ بڵێن ﴿ٱنظُرْنَا﴾ په‌له‌مان لێ مه‌كه‌ و چاوه‌ڕوانیمان له‌سه‌ر بكه‌ ﴿وَٱسْمَعُوا۟ ۗ﴾ و ببیستن ﴿وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وه‌ بۆ بێ بڕوایان هه‌یه‌ سزای سه‌خت. ١٠٤) ﴿مَّا يَوَدُّ﴾ حه‌زناكه‌ن ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ ئه‌وانه‌ی كه‌ بێ بڕوان له‌ خاوه‌ن نامه‌ و هاوبه‌ش په‌یدا كه‌ره‌كان ﴿أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ﴾ كه‌ هیچ شتێكی باشتان له‌خواوه‌ بۆ بنێردرێته‌ خواره‌وه‌ ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ﴾ به‌ڵام خواش به‌خششی خۆی بۆ كه‌سێك كه‌ بیه‌وێ ته‌رخان ده‌كات ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ و خوا خاوه‌نی چاكه‌ی گه‌وره‌یه‌. ١٠٥)

۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾

- **باوەڕ بە** جوبرەئیل بێنن؟ **وتیان: ئەو دوژمنی ئێمەیە لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ...﴾.**

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی** (١٠٩) سورەتی (البقرة): ﴿فَاعْفُوا۟ وَاصْفَحُوا۟ حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ....﴾ ابو الشیخ لە کتێبی(الأخلاق)دا لە ئوسامەی کوڕی **زەیدەوە دەگێڕێتەوە کەوتویەتی:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواری گوێ درێژێك **بوو بوو** فەرمووی بە سەعد: (ئەت بیستووە ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وتوویەتی؟ ئەوەو ئەوەی وتووە سەعدیش وتی:ئەی پێغەمبەری خوا چاوپۆشی لێ بکەو لێ ی ببورە پێغەمبەریش (ﷺ) چاوپۆشی لێ کردوو وازی لێ هێنا، وە پێغەمبەرو هاوەڵانی لێ بوردنیان هەبوو بەرامبەر بەخاوەن نامەکان و هاویەش بڕیاردەرەکان خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە﴿فَاعْفُوا۟ وَاصْفَحُوا۟ حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ....﴾.

﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ ئەگەر ئایەتێک (لە ئایەتەکانی قورئان) بسڕینەوە یان پشتگوێی بخەین ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ﴾ یەکێکی تری باشتر لەو ، یان وەک ئەو دەهێنین ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئایا نازانییت خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەلاتە. ١٠٦) ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئایا نازانیت کە مولکی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خوایە؟ ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ وە هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێکتان نی یە ، خوا نەبێت. ١٠٧) ﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ﴾ یا ئێوەش دەتانەوێ داوا (ی شتی ناقۆلا) بکەن لە پێغەمبەرەکەتان؟ ﴿كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾ وەک لەمەو پێش داواکرا لە مووسا ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ وە هەر کەسێک بێ بڕوایی بگۆڕێتەوە بە بڕوا ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ئەوە بێگومان ڕێی ڕاستی وون کردووە. ١٠٨) ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ زۆر لە خاوەن نامەکان ئاواتە خوازن ﴿لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا﴾ کە بتانکەنەوە بە بێ بڕوا، دوای بڕواهێنانتان ﴿حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ لەبەر حەسوودییەک کە لە سرووشتیانەوەیە ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ (ئەمەش) دوای ئەوەی کەڕاستیەکەیان بۆ ڕوون بۆتەوە ﴿فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟﴾ بەلام ئێوە لێیان خۆش بن و چاو پۆشیان لێ بکەن ﴿حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ﴾ تا خوا فەرمانی خۆیتان بۆ دەنێرێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەدەسەلاتە بەسەر هەموو شتێکدا. ١٠٩) ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بکەن وزەکات بدەن ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ وە هەرچی پێشبخەن لەچاکە بۆ خۆتان ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ لای خوا دەستتان دەکەوێتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خوا بینایە بەوەی کەدەیکەن. ١١٠) ﴿وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ﴾ (جوولەکە و گاورەکان) ووتیان: کەس ناچێتە بەهەشتەوە ﴿إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ مەگەر یەکێک کە جوولەکە یا گاور بێت ﴿تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ﴾ ئەمە ئاواتیانە ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ﴾ پێیان بلێ: بەلگەتان بهێنن ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن. ١١١) ﴿بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ﴾ (نەء وانییە) بەلکو هەرکەسێک بەڕاستی ڕوو بکاتە خوا ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ و لە هەمان کاتدا چاکەکار بێت ﴿فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ ئەوە بۆی هەیە پاداشت لەلای پەروەردگاریەوە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نەترسیان لەبەرەو نە خەمیش دەخۆن. ١١٢)

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١١٥) سورەتی (البقرة): ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟...﴾ ئیمامی موسلیم لە عبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەوە دەهات بۆ مەدینە بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی دەکرد ڕووی لە هەر کوێ بوایە لەوەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ...﴾.

- ئەوانیش دەڵێن: هیچ پێغەمبەرێکمان بۆ نەهاتووە، جا خوا دەفەرمووێ: کێ گەواهیت بۆ دەدات؟ (نووح) دەفەرمووێ: موحەممەد و ئوممەتەکەی، ئنجا ئەوانیش گەواهی ئەدەن کە ڕاسپاردەکەی گەیاندووە، وە پێغەمبەریش شایەتە بەسەریانەوە، ئەمە فەرموودەکەی خوایە -

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ جوولەکە ئەڵێن: گاوور لەسەر هیچ (ئایینێک) نین ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ وە گاوور دەڵێن: جوولەکە لەسەر هیچ (ئایینێک) نین ﴿وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لە کاتێکدا ئەوان دەوری نامەکان (یان) دەکەنەوە، (یەکێکیان تەورات و ئەوی تریش ئینجیل) ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ هەر بەم رەنگەیان دەووت، ئەوانەی کە نەزانن (لە بت پەرستەکان) ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئینجا خوا لەرۆژی دوایی دا لە نێوانیاندا بڕیار دەدات ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەو شتانەی کەتیایدا جیاواز و ناکۆکن. ١١٣) ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن﴾ کێ ستەمکارترە لەو کەسەی ﴿مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ کە قەدەغەی مزگەوتانی خوا دەکات ﴿أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾ لەوەی کە ناوی خوایان تێدا ببرێ ﴿وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ﴾ وەهەوڵ دەدات بۆ وێران کردنیان ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە (کەقەدەغەی خواپەرستی دەکەن لەمزگەوتەکاندا) ﴿مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ﴾ بۆیان نی یە بچنەمزگەوتەکانەوەمەگەریە ترسەوە ﴿لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ هەیە بۆ ئەوان لە دنیادا ریسوایی ﴿وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وە لەرۆژی دواییدا سزای گەورە. ١١٤) ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ رۆژهەلات و رۆژئاوا هەر بۆ خوایە ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ کەواتە روویکەنە هەر لایەک (لە نوێژکردندا) ئەوە رووگەی خوا لەوێیە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا (بەزەیی و میهرەبانی) فراوانەو زانایە. ١١٥) ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾ (گاوور و جوولەکە و بت پەرستەکان) ووتیان: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە ﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾ ئەو (خوا) پاک و بەدوورە لەوە ﴿بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بەڵکو هەرچی هەیە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هی ئەوە ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموو فەرمان بەری ئەون. ١١٦) ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (خوا) بەدی هێنەری ئاسمانان و زەوی یە ﴿وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾ وە کاتێ کەویستی شتێ بکات ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر ئەوەندەی پێ ئەوێ کە پێ ی بڵێ: ببە ئیتر ئەبێ. ١١٧) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ﴾ نەزانەکان ووتیان: بۆچی خوا خۆی قسەمان لەگەڵ ناکات ﴿أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ﴾ یا نیشانەیەکمان بۆ نایەت ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ ئەوانەی کە لەپێش ئەمانیش دا بوون هەمان شتیان دەووت ﴿تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دل و دەروونیان لە یەک دەچێت ﴿قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بێ گومان نیشانەی زۆرمان باس کردووە بۆ کەسانێک بە شوێن دڵنیایی دا دەگەرێن. ١١٨) ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان نارد بە ئاینێکی راست و دروستەوە بە مژدەدەر و ترسێنەر ﴿وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ﴾ وە تۆ بەر پرسیار نیت لە یارانی دۆزەخ. ١١٩)

وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾

هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایـەتی (١٢٠) سـورەتی (البقـرة): ﴿وَلَـن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى...﴾ ئـەعلـەبی لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: جوولەکـەکانی مەدینـە و گاوورەکـانی نـەجران بـە ئاواتەوە بـوون کە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕووبکاتـە قیبلەکـەیان ، کاتێك کـە خوای گـەورە ڕووگـەی گۆڕی بۆ (کەعبـە) بەمـە زۆر ناڕەحەت بوون و دڵگرانی کـردن ، وە بێ ئومێد بوون لەوەی کە دینەکەی پێغەمبـەر (ﷺ) لەگەڵ دینەکەیان یەك بگرێتەوە و یەکانگیربن ، خوای گەورەش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿وَلَـن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى... ﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٢٥) سورەتی (البقرة): ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى...﴾ -

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ هەرگیز نەجوولەکە و نەگاوور لێت رازی نابن ﴿حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ تا دوای ئایینیان نەکەویت ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾ (پێ یان) بڵێ: هەر ڕێنموونیی خوایە ڕێنموونی ڕاست ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ وە ئەگەر دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ دوای ئەو زانینەی کە (لەخواوە) بۆت هاتووە ﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هیچ سەرپەرشتی کەرو یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن خواوە. ١٢٠)﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانە کەنامەمان پێداوون ﴿يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ بەڕاستی دەوری دەکەنەوە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ ئەوانە بڕوا ئەهێنن بەڕێ نموونیی خوا (کە ئیسلامە) ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ﴾ وەئەوانەی بێ بڕوابن پێ ی ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانن زەرەر مەند. ١٢١)﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی نەوەی یەعقوب بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کەڕشتوومن بەسەرتاندا ﴿وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وەبێگومان من (پێشتر) ڕێزی ئێوەم دا بەسەر هەمووان‌دا. ١٢٢)﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا﴾ وە خۆتان بپارێزن لەڕۆژێک ﴿لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا﴾ کەکەس لەبری کەس تۆڵەو پاداشت نادرێتەوە ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ وەبارمتەی لێ وەرناگیرێت ﴿وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ﴾ وەهیچ تکایەک کەڵکی ناگرێ ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وەیارمەتیی نادرێن و سەرناخرێن. ١٢٣)﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک خوا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بەچەند بڕیار و فەرمایشتێک ﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ کە ئەویش بەجێ ی هێنان ﴿قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ (خوا) فەرمووی: بێگومان من تۆ دەکەم بە پێشەوای خەڵکی ﴿قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى﴾ (ئیبراهیم) ووتی: لەنەوەشم ئەکەیت؟ (بەپێشەوا) ﴿قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ فەرمووی: پێغەمبەریەتیی من ناگات بەستەمکاران. ١٢٤)﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا﴾ (بیربکەنەوە) کاتێک کە کەعبەمان گێڕا بەپەناگای خەڵکی و جێ ی ئاسایش ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِۦمَ مُصَلًّى﴾ (پێمان ووتن) شوێنی نوێژی لەبەردەی ئیبراهیم (علیه السلام) لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ وَإِسْمَٰعِيلَ﴾ وە سپاردمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ﴾ کە ماڵەکەم پاک بکەنەوە بۆ ئەوانەی کە بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە ﴿وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ وئەوانەی کە تیایدا ئەمێننەوە هەروەها کڕنوش بەران و سووژدە بەران. ١٢٥)﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِۦمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا﴾ (وە بیربکەنەوە) کاتێک کەئیبراهیم ووتی: خوایە ئەم شوێنە (کەمەککەیە) بکە بەشارێکی پڕ لەئاسایش ﴿وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وەڕۆزی دانیشتووانی بدە لەمیوەهات ﴿مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ئەوانەیان کەبڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا﴾ (خوا) فەرمووی: ئەوەش بێ بڕوا بێ ڕۆزی پێ ئەدەم بۆ چەند ڕۆژێکی کەم ﴿ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ لە پاشان ناچاری دەکەم بە سزای ئاگری دۆزەخ کە خراپترین سەر ئەنجامە. ١٢٦)

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ
مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ
لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ
إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا
مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ
وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرْغَبُ عَن
مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ
وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ
قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ
وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا
وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ
ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ
إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا
وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا
مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

-بوخاری لەعومەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ووتەم لەسێ شوێندا دەقاو دەق بووە لەگەڵ ووتەی خوای گەورەدا، ووم ئەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆزگە(مقام ابراهیم)ت بکردایە بە شوێنی نوێژ (مصلی)، ئایەتی ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى..﴾ هاتە خوارەوە. وە ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاك و خراپ سەر دەکات بە ماڵت داو دێتە ماڵەکەتەوە. خۆزگە فەرمانت بەخێزانەکانت بکردایە بەحیجاب کردن ئیتر، ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە وە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لای پێغەمبەر کۆبونەوە هەریەکەیان دەیویست خێزانەکانی تری طەلاق بدات و تەنها خۆی هاوسەری بێت و منیش پێم ووت: (عسى ربه إن طلقكن ان يبدله ازواجا خيرا منكن) هەمان قسەی من بەئایەت هاتە خوارەوە.

﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ﴾ (بیریکەرەوە) کاتێک کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەکانی کەعبەیان بەرز دەکردەوە ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (دەیان ووت) خوایە ئەم کردەوەیەمان لێ گیرابکە بەراستی هەرتۆی بیسەری زانا. ١٢٧) ﴿رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ﴾ خوایە هەردووکمان بکە بەفەرمانبەری خۆت ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾ وە لەنەوەشمان گەلێک بکە بەفەرمان بەری خۆت ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا﴾ وە ڕێگاکانی خوا پەرستیمان نیشان بدە ﴿وَتُبْ عَلَيْنَا﴾ وە پەشیمانی مان گیرا بکە ﴿إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ بەراستی هەر تۆی گیراکەری پەشیمانی و میهرەبان. ١٢٨) ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ خوایە لەناو نەوەکانماندا پێغەمبەرێک بنێرە لەخۆیان ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ﴾ ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ﴾ قورئان و دانایی یان فێر بکات وپاکیان بکاتەوە (لە هەموو گوناهێک) ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ بێ گومان هەر تۆی بەتوانای دانا. ١٢٩) ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ﴾ کێ ڕوو وەرئەگێرێ لەئایینی ئیبراهیم؟ ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ﴾ مەگەر کەسێک کە خۆی هەرزە کردبێت؟ ﴿وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا﴾ سوێندبێ بێ گومان ئیبراهیم مان هەڵبژارد لە دونیادا ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ وە بێ گومان ئەو لە ڕۆژی دوایی دا لەچاکانە. ١٣٠) ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ﴾ (هەڵی بژارد) لەکاتێک دا خوا پێ ی ووت: فەرمانبەردار بە ﴿قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (ئیبراهیمیش) ووتی: واخۆم سپارد بە پەروەردگاری جیهانیان. ١٣١) ﴿وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ﴾ ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کرد بە ئیسلامی یەت ﴿يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ﴾ (وە هەر یەکەیان پێ یان ووتن) ڕۆڵەکانم: خوا ئایینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون ﴿فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ کەواتە مەمرن بەموسڵمانێتی نەبێت. ١٣٢) ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ﴾ (ئەی خاوەن نامەکان) ئایا ئێوە ئامادەبوون کاتێ کەیەعقوب لە سەرەمەرگدا بوو ﴿إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي﴾ کاتێ بەکوڕەکانی ووت دوای من کێ دەپەرستن؟ ﴿قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ﴾ (ئەوانیش) ووتیان: خوای تۆو خوای باوو باپیرانت دەپەرستین ﴿إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا﴾ کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقە کەتاقە خوایە ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ وە ئێمە فەرمانبەرداری ئەوین. ١٣٣) ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾ ئەو پێغەمبەرانە دەستەیەک بوون تێ پەڕیین ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ هەرچی یان کرد بۆ خۆیانیان کردوە (ئێوەش) هەرچی بکەن بۆ خۆتانی دەکەن ﴿وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ وە ئێوە بەرپرسیار نین لە کردەوەی ئەوان. ١٣٤)

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ ٱللَّهِۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةًۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾

- کە دەفەرموێت: ﴿وكذلك جعلناكم أمة وسطاً...﴾ واتە: ئێوەمان کردە گەلێکی مام ناوەندی هەڵبژاردە ). ئایەتی (١٤٨) سورەتی (البقرة)؛ وقال رسول الله (ﷺ) (ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايا و يرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: إسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا إلى المساجد، و انتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط). (رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئایا پێتان نیشان دەم ئەوەی کە خوا تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوەو پلەکانی پێ بەرزدەکاتەوە؟ ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی: دەست نوێژ گرتن لە کاتی ناڕەحەتی دا ، زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوتەکان و دوای کردنی نوێژێک چاوەڕوان کردنی نوێژێکی تر، ئەوەیە ئێشک گرتن).-

﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْ﴾ (جوولەکـــە و گاوورەکـــان) ووتیـــان: (بەموسڵمانەکان) ببن بەجوولەکەیان گاوور تابکەونە سەرڕێ ی ڕاست ﴿قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا﴾ بڵێ: بەڵکو پەیڕەوی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ کە لە هاوبەش پەیدا کەران نەبووە. ١٣٥) ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بڵێن: (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خوا و ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ بەو قورئانەی کەبۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ﴾ وە بەو نامەیەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ وە بەوەی کەدراوە بەمووسا وعیسا ﴿وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ﴾ وە بەوەی کەدراوە بەهەموو پێغەمبەران لە لایەن پەروەردگاریانەوە ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیان دا ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ﴾ وە ئێمە فەرمانبەری خواین. ١٣٦) ﴿فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ﴾ ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو وێنەیەی کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە ﴿فَقَدِ ٱهْتَدَواْ﴾ ئەوا بێ گومـان ڕێ ی راستیـان دۆزی یەوە ﴿وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا ئەوان لە دوو بەرەکیی دان ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا ئاگاداریی تۆ ئەکات لەوان ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە هەر خوایە بیسەری زانا. ١٣٧) ﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ﴾ خوا ڕەنگی کردیین بەڕەنگی خۆی (کە ئیسلامە) ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً﴾ و کێ باشترە لە خوا لەڕەنگ ڕشتن دا ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ﴾ وە ئێمە پەرستش هەر بۆ ئەو دەکەین. ١٣٨) ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ﴾ بڵێ: ئایا دەمەوەریمان لەگەڵ ئەکەن لە کاری خوادا ﴿وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ لە کاتێکدا ئەو پەروەردگاری ئێمەو ئێوەیە ﴿وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ وە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ﴾ وە ئێمە تەنها دڵسۆزی ئەو خوایەین. ١٣٩) ﴿أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ﴾ یاخود ئێوە ئەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل ﴿وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ﴾ و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب ﴿كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ جوولەکە بوون یا گاوور؟ ﴿قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن یاخوا؟ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ﴾ کێ ستەم کارترە ﴿مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ لەو کەسەی کە شایەتیەکی لە خوا وەرگرتبێ و بی شاریتەوە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ خودا بێ ئاگا نی یە لەوەی کە ئێوە دەیکەن. ١٤٠) ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾ ئەو پێغەمبەرانە دەستەیەک بوون تێپەڕین و ڕۆشتن ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ هەرچی یان کرد بۆ خۆیانیان کرد، وە ئێوەش هەرچی بکەن بۆ خۆتانی دەکەن ﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ وە ئێوە بەرپرسیار نیین لە کردەوەی ئەوان. ١٤١)

۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًاۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾

**هۆی هاتنە** خوارەوەی ئایەتی (١٤٢) سورەتی (البقرة): ﴿سَيَقُولُ السُّفَهَاء مِنَ النَّاسِ.....﴾ ئیبن و **ئیسحاق** دەڵێت **ئیسماعیلی** كوڕی ئەبی خالیدی كوڕی ئیسحاق پێ ی ڕاگەیاندم كە بەڕاء ووتی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕووبە قودس نوێژی دەكرد، وە زۆر سەیری ئاسمانی دەكرد و چاوەڕوانی فەرمانی خوای دەكرد، ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە:

﴿قد نرى تقلب وجهك فى السماء فلنولينك قبلة ترضاها فول وجهك شطر المسجد الحرام﴾ هەندێ لە موسڵمانەكان ووتیان: حەزمان دەكرد هەواڵی مردوەكانمان بزانیایە پێش ئەوەی ڕوگە (قبلة) بگوڕێت،وە نوێژەكانی پێش ڕوو لە قودس كردنمان چۆن بێت؟! خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:﴿وما كان الله ليضيع إيمانكم﴾ كەم عەقڵەكان ووتیان:﴿ماولاهم عن قبلتهم التي كانوا عليها﴾-

﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ هەندێ نەزان و بێ ئاوەزا لەخەڵک دەڵێن ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا﴾ چی موسڵمانەکانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیان کەجاران لەسەری بوون ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ بڵێ: ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا هی خوایە ﴿يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ کێ ی بوێ ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێبازی ڕاست. ١٤٢ )﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ هەروەها کردمانن بەگەلێکی میانەڕەو ( ی هەڵبژاردە )﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ تا ببنە چاودێر بەسەر خەڵکەوە، وە پێغەمبەریش ( ﷺ ) چاودێر بێت بەسەر ئێوەوە ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ﴾ ئەو ڕووگەیەی کەجاران لەسەری بوویت نەمانگێڕا ( بە ڕووگەو لەپاشان کۆڕیمان بەکەعبە )﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ﴾ تەنها بۆ ئەوەی دەربکەوێت کێ شوێن پێغەمبەر ( ﷺ ) دەکەوێت ( وەجیا دەبێتەوە )﴿مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ لەوانەی کەپاشگەز دەبنەوە﴿وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً﴾ وەبەڕاستی ( ئەم گۆڕینە ) کارێکی زۆر گەورە و گران بوو﴿إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ﴾ مەگەر لای ئەوانەی کە خوا ڕێنموونیی کردوون﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾ وەخوای گەورە بڕوا ( و نوێژەکانی جاران )تانی بەزایە نەداوە﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ خەڵکیدا ﴿لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵسۆزی میهرەبانە. ١٤٣ )﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ﴾ دەی سوێند بەخوا ڕووت دەکەینە ﴿قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا﴾ ڕوگەیەک کەپەسەندت بێ ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە ( مسجد الحرام ) ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾ ئێوەش ئەی موسوڵمانان لەهەر لایەک بوون ﴿فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ ( لەنوێژدا ) ڕووتان بکەنە ئەوێوە ( مسجد الحرام ) ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی پەڕاویان پێدراوە﴿لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ چاک ئەزانن کەئەمە هەقێکی ڕاستە لەپەروەردگاریانەوە﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ وەخودا بێ ئاگا نی یە لەوەی کە دەیکەن. ١٤٤ )﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ﴾ سوێند بێت ئەگەر هەرچی بەڵگەو نیشانە هەیە بی هێنیتەوە بۆ ئەم خاوەن نامانە ﴿مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ﴾ دوای ڕووگەی تۆ ناکەوون ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ﴾ وەتۆش دوای ڕووگەی ئەوان ناکەوویت ﴿وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ﴾ وەئەوان دوای ڕووگەی یەکتری ناکەوون ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ سوێند بێت ئەگەر تۆ دوای ئارەزوەکانی ئەوان بکەوێت ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ دوای ئەو زانینەی کە ( بەسرووش ) بۆت هاتووە ﴿إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئەو کاتە تۆ لە ستەمکاران دەبیت. ١٤٥ )

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾

- چی موسڵمانەکانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیەی کە جاران لەسەری بوون؟! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿سَيَقُولُ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٤٣) سورەتی (البقره):** ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾ بوخاری لە بەڕائەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) شازدەیان حەڤدە مانگ ڕوو بە (بيت المقدس) نوێژی کرد حەزی کرد کەعبە ڕووگەی بێت وە یەکەم نوێژێک کەڕوو بە کەعبە کردی نوێژی عەسر بوو کۆمەڵێک موسڵمان لەگەڵیدا نوێژیان دەکرد ئینجا پیاوێک لەو ئیماندارانەی لەگەڵی نوێژی کرد بوو لە مزگەوت هاتە دەرەوە و دای بەلای کۆمەڵێک ئیمانداردا لە مزگەوتێکدا کە ڕوو بە (بيت المقدس) نوێژیان دەکرد و لە (رکوع) دا بوون پێی ووتن: شایەتی دەدەم بە-

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانەی کە پەراومان پێ داوون ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ پێغەمبەر (ﷺ) دەناسن وەک چۆن کوڕانی خۆیان دەناسن ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ﴾ بێگومان کۆمەڵێک لەوان ﴿لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ﴾ ئەو ڕاستی یە دەشارنەوە ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان دەزانن (موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرە). ١٤٦) ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ڕاست ئەوەیە (کە بۆت هاتووە) لەپەروەردگارتەوە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتە لە گوماندارن مەبە. ١٤٧) ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ﴾ وە هەموو کەلێک ڕووگەیەکی هەیە ﴿هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ کە ڕووی تێ دەکات ﴿فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ دەی دەست پێشکەری بکەن لە کردارەچاکەکاندا ﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟﴾ لەهەر کوێ بن ﴿يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾ خودا هەمووتان کۆدەکاتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا. ١٤٨) ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ﴾ لە هەر کوێ چوویتە دەرەوە (بەسەفەر) ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ ڕووت وەربگێڕە بۆ لای کەعبەی پیرۆز ﴿وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەم ڕووکردنەت ڕاستەو لە پەروەردگارتەوەیە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە خودا بێ ئاگا نی یە لەوەی کە دەیکەن. ١٤٩) ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ﴾ لە هەر کوێ چوویتە دەرێ ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ (لەکاتی نوێژ کردندا) ڕووت وەربگێڕە بۆ لای کەعبەی پیرۆز ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾ وە ئێوەش (ئەی موسڵمانینە) لە هەر کوێ بوون ﴿فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ ڕوو وەرگێڕن بۆلای ئەو (کەعبە) ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ تا بیانوی خەڵکتان نەیەتەسەر ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾ مەگەر ستەم کارەکانیان ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ جا لێیان مەترسن ﴿وَٱخْشَوْنِى﴾ و لە من بترسن ﴿وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بەخششی خۆمتان بەتەواوی بەسەردا بڕژم ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ وە بەڵکو ڕێبازی ڕاست بگرن. ١٥٠) ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا﴾ وەک ڕەوانەمان کرد ﴿فِيكُمْ﴾ لە ناوتاندا ﴿رَسُولًا مِّنكُمْ﴾ پێغەمبەرێک لە خۆتان ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا﴾ کەئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا بخوێنێتەوە ﴿وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ﴾ وە پاکتان بکاتەوە وە فێرتان کات ﴿ٱلْكِتَٰبَ﴾ قورئان ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ و دانایی (فەرموودەی خۆی) ﴿وَيُعَلِّمُكُم﴾ وە فێرتان کات ﴿مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ﴾ ئەو شتانەی کەنەتان دەزانی. ١٥١) ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ﴾ کەواتە یادم بکەن ﴿أَذْكُرْكُمْ﴾ تامنیش لەبیرتان نەکەم ﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِى﴾ وە سوپاسم بکەن ﴿وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ پێ نەزان و ناسوپاسیم مەکەن. ١٥٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱسْتَعِينُوا۟﴾ پشت ببەستن ﴿بِٱلصَّبْرِ﴾ بە خۆڕاگرتن ﴿وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ و نوێژ (کردن) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە. ١٥٣)

وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ۞ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَٰئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾

- خوا کە لەگەل پێغەمبەر (ﷺ) نوێژمان کرد رووبە کەعبە ئەنجا نوێژ کەرەکانیش سورانەوە و روویان وەرچەرخان بەرەو کەعبە وە ئەو کەسانەی کە شەهید بوو بوون و مرد بوون پێش گۆڕینی رووگە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبە ئەمان دەزانی دەربارەیان چی بڵێین خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٤٤) سورەتی (البقرة): ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ.....﴾

ئیمامی بوخاری لە بەرائەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) شازدە تا حەڤدە مانگ رووبە (بیت المقدس) نوێژی کرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) حەزی دەکرد روبکاتە کەعبەی پیرۆز خوای گەورەش =

﴿ وَلَا تَقُولُوا ﴾ هەرگیز مەڵێن ﴿لِمَن يُقْتَلُ﴾ بەو کەسانەی دەکوژرێن ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەڕێگەی خوادا ﴿أَمْوَاتٌ﴾ مردوون ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ﴾ بەڵکو زیندوون ﴿وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ﴾ بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن. ١٥٤)﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم﴾ سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە ﴿بِشَيْءٍ﴾ بە هەندێک ﴿مِّنَ الْخَوْفِ﴾ لەترس ﴿وَالْجُوعِ﴾ و برسیتی ﴿وَنَقْصٍ﴾ و کەم بوونی ﴿مِّنَ الْأَمْوَالِ﴾ ماڵ و دارایی ﴿وَالْأَنفُسِ﴾ و خەڵکی (کەس و کارتان) ﴿وَالثَّمَرَاتِ﴾ و بەرووبووم ﴿وَبَشِّرِ﴾ جا مژدەبدە ﴿الصَّابِرِينَ﴾ بە خۆڕا گران ١٥٥)﴿الَّذِينَ﴾ ئەوانەی ﴿إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ﴾ کە لەگەڵ دووچاری سەختی یەک بوون ﴿قَالُوا﴾ دەڵێن ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە١٥٦)﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ﴾ درودوو بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾ و ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیانە وەرگرتووە. ١٥٧)﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ﴾ بەڕاستی صەفا و مەروە ﴿مِن شَعَائِرِ اللَّهِ﴾ لە دروشمەکانی (دینی) خوان ﴿فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ﴾ جا هەر کەسێک حەجی ماڵی خوای کرد ﴿أَوِ اعْتَمَرَ﴾ یا عومرەی کرد ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ﴾ هیچ تاوانی ناگات ﴿أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ کە تەوافی ئەو دووانەش بکات ﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ وە هەر کەسێک بە ئارەزووی خۆی چاکەیەکی کرد ﴿فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ ئەوە بێ گومان خودا سوپاسگوزارێکی زانایە. ١٥٨)﴿إِنَّ الَّذِينَ﴾ بێ گومان ئەوانەی ﴿يَكْتُمُونَ﴾ دەیشارنەوە ﴿مَا أَنزَلْنَا﴾ ئەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە ﴿مِنَ الْبَيِّنَاتِ﴾ لە ئایەتانی ڕۆشن و ﴿وَالْهُدَىٰ﴾ ڕێنمایی ﴿مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ﴾ دوای ئەوەی کە روونمان کردۆتەوە ﴿لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەڵکی ﴿فِي الْكِتَابِ﴾ لە نامە(ی تەورات و ئینجیل) دا ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوانە ﴿يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ﴾ خودا نە فرەتیان لێ دەکات ﴿وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ وە نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لێ دەکەن. ١٥٩)﴿إِلَّا الَّذِينَ﴾ مەگەر ئەوانەی ﴿تَابُوا﴾ کە پەشیمان بووبنەوە ﴿وَأَصْلَحُوا﴾ وە کردەوەی چاکیان کردبێ و﴿وَبَيَّنُوا﴾ (ئەوەی شاردبویانەوە) ئاشکرایان کردبێ ﴿فَأُولَٰئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿أَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ پەشیمانیان لێ گیرادەکەم ﴿وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ وە هەر منم گیرا کەری میهرەبان. ١٦٠)﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوا بوون ﴿وَمَاتُوا﴾ و مردوون ﴿وَهُمْ كُفَّارٌ﴾ و بێ بڕوا بوون ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوانە ﴿عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ﴾ لەسەریانە نەفرینی خوا ﴿وَالْمَلَائِكَةِ﴾ و فریشتەکان ﴿وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ خەڵکی بە تێکڕایی. ١٦١)﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ﴾ سزایان لەسەر سووک ناکرێتەوە ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ وە دوا ناخرێن لەسزا. ١٦٢)﴿وَإِلَٰهُكُمْ﴾ پەرستراوی ئێوە ﴿إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ پەرستراوێکی تاک و تەنهایە ﴿لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە تەنیا ئەو نەبێت ﴿الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾ کە بەخشندەی میهرەبانە. ١٦٣)

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

- ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕووی کردە کەعبە کەساتێکی بێ ئاوەزاو نەزان کە جوولەکە بوون وتیان چ شتێک موسلمانانی وەرگێرا لەو ڕووگەیان کەجاران لەسەری بوون﴿قل لله المشرق و المغرب یهدي من یشاء الی صراط مستقیم﴾ئەنجا پیاوێک لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد پاش ئەوەی نوێژی کرد لەمزگەوت چووە دەرەوە ڕۆشت بەلای چەند کەسێکی ئەنصاری دا کە ڕوویە (بیت المقدس) لەنوێژی عەسردا بوون، پێی وتن : من شایەتی دەدەم نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دڵنیابن کەڕووی کردە کەعبە ئەنجا ئەوانیش (ئەنصاریەکان) سوڕانەوە هەتا ڕوویان کردە لای کەعبە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٥٨) سورەتی (البقرة): ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ...﴾ بوخاری و موسلیم -

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ﴾ بەڕاستی هەیە لەدروستکردنی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئاسمانەکان ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾ و زەوی ﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ وجیاوازی شەو و ڕۆژ (بەکورتی و درێژیی) ﴿وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي﴾ و ئەو کەشتیانەی ﴿تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ﴾ کەدێن و دەچن لەدەریادا ﴿بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ﴾ بەوشتانەکە قازانج دەگەیەنن بەخەڵکی ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وە ئەوەی کە خوا لە ئاسمانەوە باراندی ﴿مِن مَّآءٍ﴾ لەئاو (باران) ﴿فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە (پێ بوژاندەوە) ﴿بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ پاش مردنی ﴿وَبَثَّ﴾ وەبڵاوی کردەوە ﴿فِيهَا﴾ تێیدا ﴿مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ لەهەموو جۆرە زیندەوەرێک ﴿وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ وەگێڕانی بایەکان (بەهەموو لایەکدا) ﴿وَٱلسَّحَابِ﴾ وە ئەو هەورانەی ﴿ٱلْمُسَخَّرِ﴾ ڕام کراون ﴿بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەناوەندی ئاسمان ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾ و زەویدا ﴿لَأَيَٰتٍ﴾ چەند بەڵگەن ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بۆ کەسانێک کەتێبگەن. ١٦٤) ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن﴾ وە کەسانی وا هەیە لەخەڵکی ﴿يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا﴾ کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن ﴿يُحِبُّونَهُمْ﴾ خۆشیان دەوێن ﴿كَحُبِّ ٱللَّهِ﴾ وەک خۆشەویستی (ئیمانداران بۆ) خوا ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت ﴿وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾ ئەگەر ببینن ئەوانەی ستەمیان کردووە (بەهاوبەشی پەیدا کردن بۆخوا) ﴿إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ﴾ کاتێک کە چاویان دەکەوێت بەسزا (ی خوا دەزانن) ﴿أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ کە هەرچی دەسەڵات هەیە هەمووی بۆ خوایە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ﴾ وەبێگومان سزای خوا زۆر سەختە. ١٦٥) ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟﴾ کاتێک کەپێشەواکان یەخە هەڵتەتەکێنن ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟﴾ لەوانەی (لە دنیادا) دوایان کەوتوون ﴿وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ وە سزایان (بەچاوی خۆیان) بینی ﴿وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾ وەهەموو پەیوەندی یەکیان بچڕایەوە. ١٦٦) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟﴾ وە ئەوانەی کەدوایان کەوتبوون وتیان ﴿لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً﴾ خۆزگە ئێمە بگەڕاینایەتەوە (بۆ دنیا) ﴿فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ﴾ تایەخەمان لێ هەڵ بتەکاندنایە ﴿كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا﴾ هەروەک (ئەوان) یەخەیان لەئێمە هەڵتەکاند ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئاوا ﴿يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ خوا کردەوەکانیان نیشان ئەدات ﴿حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ﴾ بەداخ لەسەر دڵیان ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ﴾ وەئەوان دەرچوونیان نی یە ﴿مِنَ ٱلنَّارِ﴾ لەئاگر. ١٦٧) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿كُلُوا۟﴾ بخۆن ﴿مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەوەی کەلە زەویی دایە ﴿حَلَٰلًا﴾ بەحەڵاڵی و ﴿طَيِّبًا﴾ پاکی ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ وە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەوون ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە. ١٦٨) ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُم﴾ بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێ دەدات ﴿بِٱلسُّوٓءِ﴾ بەتاوان ﴿وَٱلْفَحْشَآءِ﴾ و خراپە ﴿وَأَن تَقُولُوا۟﴾ لەگەڵ هەڵبەستنی شتی وا ﴿عَلَى ٱللَّهِ﴾ بەدەم خواوە ﴿مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ کە نازانن. ١٦٩)

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ ءَابَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً صُمٌّ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا كُلُوا مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُوا لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُولَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

- گێڕاویانەتەوە لە عوروەوە دەڵێت: پرسیارم لە عائیشە کرد و ووتم: ئایا نەت بینیوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الصَّفَا.... أن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ پێم وایە ئەو کەسە(ی حەج دەکات) تاوانی لەسەر نی یە لە نێوان صەفاو مەروە دا هات و چۆ نەکات عائشە ووتی: ئەی خوشکەزای خۆم شتێکی زۆر خراپت ووت، ئەگەر وابوایە تۆ مانات کرد دەبوو بەم جۆرە بێت ﴿فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أن لا يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ بەڵام ئەم ئایەتە بۆیە هاتە خوارەوە، چونکە یاریدەدەرەکان (الأنصار) پێش ئەوەی موسڵمان ببن حەج و تەلبیەیان لای (مناة)ی گومراکەر دا بوو، جا هەر کەسێک ئەم کارەی کرد بێت پێ ی ناخۆش بوو لەنێوان صەفا ومەروەدابێت و بچێت، وەپرسیاری ئەوەیان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەکاتی نەفامیدا -

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ کاتێک، پێتان بووترێت ﴿اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ شوێن ئەو (قورئان)ە بکەون کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ﴿قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا﴾ دەڵێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین ﴿أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ کە باو و باپیرانمان لەسەری بوون﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ﴾ ئەگەرچی باو و باپیرانیشیان ﴿لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا﴾ هیچ تێ نەگەیشتبن ﴿وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ و گومڕا بووبن (ڕێنمایش وەرنەگرن). ١٧٠)﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە نموونەی ئەو بێ بڕوایانە ﴿كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ﴾ وەک یەکێک وایە کە دەنگ لە ئاژەڵێک بکات ﴿بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً﴾ تەنیا دەنگ و هاوارەکە نەبێ هیچ نابیستێ ﴿صُمٌّ﴾ ئەمانە کەڕن ﴿بُكْمٌ﴾ لاڵن، (لە ووتنی قسەی دروست) ﴿عُمْيٌ﴾ کوێرن (لە بینینی ڕێ ی ڕاست) ﴿فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بۆیە تێ ناگەن و ژیر نین. ١٧١)﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوکەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿كُلُوا﴾ بخۆن ﴿مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ لەو خواردەمەنی یە پاکانەی کردومانە بەڕۆزیتان ﴿وَاشْكُرُوا لِلَّهِ﴾ وە سوپاسی خوا بکەن ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن. ١٧٢)﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ﴾ ئەوەی (کەخوا) قەدەغەی کردووە لێ تان تەنها ﴿الْمَيْتَةَ﴾ مردارەوە بوو ﴿وَالدَّمَ﴾ و خوێن (ی ڕەوان) ﴿وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ و گۆشتی بەراز ﴿وَمَا أُهِلَّ بِهِ﴾ و ئەوەی کەسەر بڕابێ ﴿لِغَيْرِ اللَّهِ﴾ بەناوی غەیری خواوە ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ﴾ ئینجا هەر کەسێک ناچار بوو (بەخواردنی یەکێک لەمانە) ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ بەبێ یاخی بوون ﴿وَلَا عَادٍ﴾ و دەرچوون لەسنوور ﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نی یە ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە ١٧٣)﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ بێگومان ئەوانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە کەخودا ناردونیەتە خوارەوە ﴿مِنَ الْكِتَابِ﴾ لەتەورات ﴿وَيَشْتَرُونَ﴾ و دەیگۆڕنەوە ﴿بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ بەنرخێکی کەم ﴿أُولَٰئِكَ﴾ ئەوانە ﴿مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ﴾ ئاگر نەبێت هیچی تر ناچێتە سکیانەوە ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ وە خوا لە ڕۆژی دوایی دا قسەیان لەگەڵ ناکات ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمْ﴾ و پاکیان ناکاتەوە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ و سزای سەختیان دەبێت. ١٧٤)﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن کە گومڕایی یان کڕی ﴿بِالْهُدَىٰ﴾ بەڕێنموونیی ﴿وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ﴾ وە سزا (یان کڕی) بەلێ خۆشبوون ﴿فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ﴾ ئای چەند خۆڕاگرن لەسەر ئاگر. ١٧٥)﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەمە (هەمووی) بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا کتێبە (پیرۆزە)کانی ناردۆتە خوارەوە بەڕاستی ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا﴾ وە بێگومان ئەوانەی دووبەرەکی کەوتن ﴿فِي الْكِتَابِ﴾ لە تەوراتدا ﴿لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ لە دووبەرەکی یەکی (وادان) کە دوورن (لەیەک کەوتن). ١٧٦)

۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾

- پەیمان گران بوو لەنێوان صەفا و مەروەدا بێین و بچین، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿إِنَّ الصَّفَا ... هەتا... يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾، بوخاری لە عاصمی کوڕی سولەیمانەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیارم دەربارەی صەفاو مەروە کرد لەئەنەس ووتی: ئێمە بە کارێکی نەفامیمان دەزانی، وەکاتێک ئیسلام هات وازمان لێ هێنان، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ﴾، حاکیم لە ئیبن عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەسەردەمی نەفامیدا شەیتانەکان بەدرێژایی شەو ئەهاتن و ئەچوون لەنێوان صەفا و مەروەدا بتیان لەنێواندا هەبووە .کاتێک دینی ئیسلام هات موسڵمانەکان ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتو چۆی نێوان (صەفا و مەروە) ناکەین چونکە شتێک بوو -

﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ چاکە ئەوە نی یە کەڕوو بکەنە ﴿قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ بەرەو ڕۆژ هەلات و ڕۆژ ئاوا ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ﴾ بەلکو چاکە ئەوەیە ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ کە مرۆڤ بڕوای بیێ بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ و ڕۆژی دوایی ﴿وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ و فریشتەکان ﴿وَٱلْكِتَـٰبِ﴾ و کتێبەکان ﴿وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ و پێغەمبەران ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ﴾ و دارایی خۆی ببەخشێ ﴿عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ لەگەل ئەوەی کەخۆشی دەوێت ﴿ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ بەخزمان ﴿وَٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾ و هەتیوان ﴿وَٱلْمَسَـٰكِينَ﴾ وبێ ئەوایان (هەژاران) ﴿وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێبوارانی کەم دەست ﴿وَٱلسَّآئِلِينَ﴾ وسوالکەران ﴿وَفِى ٱلرِّقَابِ﴾ ولەڕێ ی ئازاد کردنی کۆیلەکاندا ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وەنوێژی بەچاکی کردبێت ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وزەکاتی دابێت ﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ﴾ و پەیمان بەجێ هێنەران ﴿إِذَا عَـٰهَدُوا۟﴾ کاتێک کەپەیمانیان دابێت ﴿وَٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ وخۆڕاگران ﴿فِى ٱلْبَأْسَآءِ﴾ لەکاتی تەنگدەستی ﴿وَٱلضَّرَّآءِ﴾ ونەخۆشی ﴿وَحِينَ ٱلْبَأْسِ﴾ ولەکاتی جەنگدا ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟﴾ ئائەوانەن کەراستیان کرد ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ وەهەر ئەوانەن پارێزکاران. ١٧٧) ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوکەسانەی کەبڕواتان هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ﴾ پێویست کراوە لەسەرتان تۆ لەسەندن ﴿فِى ٱلْقَتْلَى﴾ لە کوژراواندا (بەیەکسانی) ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ﴾ ئازاد بەئازاد ﴿وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ﴾ وبەندە بە بەندە ﴿وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ وژن بەژن (مێینە بە مێینە) ﴿فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ﴾ ئینجا هەرکەسێک بەخشرا ﴿مِنْ أَخِيهِ﴾ لەلایەن برایەکی دینی یەوە ﴿شَىْءٌ﴾ بەبەشێک (لەخوێنەکە) ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ئەبێ (خزمەکانی تر) پەیرەوی بکەن بەباشی ﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَـٰنٍ﴾ (بکوژیش) بەچاکی خوێنەکە بدات ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ﴾ ئەمە سووککردنە ﴿مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ لەپەروەردگارتانەوەو میهرەبانی یە ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەرکەسێک دوای ئەمە دەست درێژیی کرد ﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆئەو هەیە سزای بەسوێ (بەئازار). ١٧٨) ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ﴾ لە کوشتنەوە دا ژیان بۆ ئێوە هەیە ﴿يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ ئەی هۆشمەندان ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەلکو خۆتان بپارێزن. ١٧٩) ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ﴾ پێویست کراوە لەسەرتان ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ کاتێک یەکێکتان لەسەرەمەرگدا بوو ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا﴾ ئەگەر مالی لەپاش بەجێ ما ﴿ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ﴾ وەسیەتکردن بەباشی بۆ دایک وباوک ﴿وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ و خزمان (یک کە کەلەپوریان بەرنەکەوێ) بەجوانی و ڕێک وپێکی؟ ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾ پێوست کراوە لەسەر پارێزکاران. ١٨٠) ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ﴾ ئینجا هەرکەسێک وەسیەتەکەی گۆڕی ﴿بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ﴾ دوای بیستنی ﴿فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ﴾ ئەوە گوناهی (تاوانی) ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ﴾ هەر لە ملی ئەو کەسانەدایە کە دەیگۆڕن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خواش بیسەری زانایە. ١٨١)

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

- لە نەفامی دا دەمان کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: **﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ﴾**.

**ئایەتی (١٥٢) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ) :(يقول الله تعالى: أنا عند ظن عبدي بي، و أنا معه إذا ذكرني، فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، و إن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم) (متفق عليه). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێ (من لەگەڵ گومانی بەندەکەی خۆم دام وەمن لەگەڵی دام هەر کاتێک یادم بکات جائەگەر لەدەروونی دا یادی کردم منیش لەدەروونی خۆمدا باسی دەکەم ، وەئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا باسم بکات ئەوە من لەناو کۆمەڵێکی لەوان باشتردا باسی دەکەم).

﴿فَمَنْ خَافَ﴾ ئینجا هەر کەسێک ترسا ﴿مِن مُّوصٍ﴾ لەوەسیەتکار ﴿جَنَفًا أَوْ إِثْمًا﴾ کەمەڵە یان گوناهێک بکات ﴿فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ﴾ جا (ئەو کەسە) میراتگرانی پێک بێنێ ﴿فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نی یە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خودا لێخۆش بوو بەبەزەیی یە. ١٨٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ هەروەک نووسراوە لەسەر ئەوانەی لەپێش ئێوە دابوون ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن. ١٨٣) ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ﴾ (ڕۆژووتان لەسەر دانرا بۆ) چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی ژمێراو ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ جا هەر کەسێک لەئێوە نەخۆش بوو ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یان لەسەفەردا بوو (وە بەڕۆژوو نەبوو) ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەوە پێویستە بە ئەندازە ئەو ڕۆژانە (بەڕۆژوو نەبووە) قەزای بکاتەوە لە ڕۆژانی تردا ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ وەپێویستە لەسەر ئەوانە کە زۆر بەناڕەحەتی ئەتوانن بەڕۆژووبن (و بەڕۆژوو نابن) ﴿فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ بریتی (یان لەسەرە)، کەخۆراکی هەژارێکە ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ﴾ ئینجا هەر کەسێک زۆرتر بریتی بدات ئەوە باشترە بۆی ﴿وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ و ئەگەر بەڕۆژووبن بۆ خۆتان باشترە ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بزانن. ١٨٤) ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ﴾ مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارەوە ﴿هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ﴾ بەڕێنما بۆ خەڵکی وە بەڵگەیانی ڕۆشن ﴿مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ﴾ بۆ ڕێنموونیی و جیاکردنەوە(ی دروست و نادروست) ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ﴾ ئنجا هەر کەسێک لەئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی ﴿فَلْيَصُمْهُ﴾ بابە ڕۆژوو بێت ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا﴾ وە هەر کەسێک نەخۆش بوو ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یان لەسەفەردا بوو ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ بابە ئەندازەی ئەو ڕۆژانە قەزای بکاتەوە لەچەند ڕۆژێکی ترد ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ﴾ خوا ئاسانی ئەوێ بۆ ئێوە ﴿وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ وە گرانی ناوێت بۆتان ﴿وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ﴾ (قەزای ڕەمەزانتان لەسەر دانرا) تا مانگەکە (بگرن) بەتەواوی ﴿وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾ وەبەگەورە ناوی خوابەرن لەسەر ئەو ڕێنموونی یەی کە کردوونی ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ وەتا سوپاسی (خوا) بکەن. ١٨٥) ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى﴾ هەر دەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ﴿فَإِنِّى قَرِيبٌ﴾ ئەوە بێگومان من لێیانەوە نزیکم ﴿أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ﴾ گیرا دەکەم نزای نزاکاران ﴿إِذَا دَعَانِ﴾ هەر کاتێک هاوارو نزام لێ بکەن ﴿فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى﴾ دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن ﴿وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى﴾ وە بڕوام پێ بهێنن ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕێ ی ڕاست بدۆزنەوە. ١٨٦)

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾

**ئایەتی (١٥٥) سورەتی (البقرة):**
**عن أنس قال: مر النبي على امرأة تبكي عند قبر، فقال:(اتقي الله و اصبري) فقالت:إليك عني، فإنك لم تصب بمصيبتي –ولم تعرفه– فقيل لها إنه النبي (ﷺ) " فأتت النبي (ﷺ) فلم تجد عنده بوابين، فقالت: لم أعرفك، فقال (إنما الصبر عند الصدمة الأولى) (متفق عليه).**

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دای بەلای ئافرەتێکدا دەگریا بەسەر قەبرێکدا، فەرمووی: (لەخوا بترسە و ئارام بگرە) ، ووتی وازم لێ بێنە، تۆ وەکو منت لێ نەقەوماوە پێغەمبەری (ﷺ) نەناسی پێیان ووت: ئەوە پێغەمبەربوو (ﷺ) ئەویش هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کەکەس لەبەر دەرگای دا پاسەوان نەبوو و ووتی: ئەم ناسیت. ئەویش فەرمووی (بە ڕاستی ئارام گرتن دەبێت هەر لەسەرەتای بەسەرهاتە کتوپڕیەکەدا بێت).

﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ﴾ ڕێتان پێ دراوە لەشەوانی ڕۆژوو(ی ڕەمەزان) دا ﴿ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ درووست بوون لەگەڵ ژنەکانتان ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ﴾ ئەوان بۆ ئێوە پۆشاکن ﴿ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ وە ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ خوا دەیزانی کەئێوە ناپاکیتان لەخۆتان دەکرد ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ بۆیە پەشیمانی لێ گیرا کردن ﴿وَعَفَا عَنكُمْ﴾ وەلێتان خۆش بوو ﴿فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ﴾ ئیتر لەئێستاوە (بە شەودا) بچنە لایان ﴿وَٱبْتَغُوا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ وە بەدڵ بخوازن ئەوی کە خوا بۆی نوسیوون (لە منداڵ) ﴿وَكُلُوا وَٱشْرَبُوا﴾ وە بخۆن و بخۆنەوە ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ﴾ هەتا بۆتان جیا دەبێتەوە ﴿ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ﴾ ڕوشتەی سپی (ڕۆژ) ﴿مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾ لەڕوشتەی ڕەش (ی شەو) ﴿مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ لەشەبەقدا ﴿ثُمَّ أَتِمُّوا ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ لەپاشان ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن تاشەوی دوایی ﴿وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ﴾ وەمەچنەلای ژنەکانتان ﴿وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ﴾ لەکاتێکدا کە لەمزگەوتدا مابنەوە بۆ خواپەرستی ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەمانەسنوورانی خودان و ﴿فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ نزیکیان مەکەونەوە ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ﴾ ئاوا خوا باسی فرمانی خۆی دەکات بۆ خەڵکی ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ تا خۆیان بپارێزن. ١٨٧) ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓا أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ ماڵی یەکتری مەخۆن لەناو خۆتاندا بەناڕەوا ﴿وَتُدْلُوا بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ﴾ وە بە(بەرتیل) مەیدەن بەفەرمانداران ﴿لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ﴾ بۆئەوەی بەشێک لەماڵی خەڵکی بخۆن بەگوناه ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوەش دەزانن. ١٨٨) ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نوێ بونەوەی مانگە نوێکان ﴿ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴾ بڵێ ئەمانە نیشانەی کاتەکانن بۆ خەڵکی و بۆ حەج ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ﴾ وەچاکە ئەوە نی یە ﴿بِأَن تَأْتُوا ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ کەلەپشتی خانووەکانەوە بچنە ژوورەوە ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ بەڵکو چاکە ئەوەیە ئەو کەسە پارێزکار و لە خوا ترس بێت ﴿وَأْتُوا ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾ وەبچنە ماڵەکان لەدەرگاکانیەوە ﴿وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ وە لەخوا بترسن تا ڕزگار ببن. ١٨٩) ﴿وَقَـٰتِلُوا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگ بکەن لەڕێ ی خوادا ﴿ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ﴾ لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓا﴾ وەدەست درێژی مەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت. ١٩٠)

وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٨٧) سورەتی (البقرة): ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ...﴾ بوخاری لەبەرائەوە دەگێڕێتەوەو دەلێت: هاوەلانی پێغەمبەر ئەگەر یەکێکیان بەرۆژوو بوایەو پێش بەربانگ بخەوتایە ئەوا ئەو شەوە و رۆژەکەیشی هیچی نەدەخوارد هەتا ئێوارە، قەیسی کوڕی صیرمەی ئەنصاری بەرۆژوو بوو کاتی بەربانگ بەژنەکەی ووت: هیچ خواردنێکت لایە؟ ووتی: نەخێر، بەلام دەچم بۆت پەیدا دەکەم، ئەویش رۆژەکەی ئیشی کردبوو ماندوو بوو خەوی لێ کەوت ژنەکەی هاتەوەو بینی خەوی لێ کەوتووە ووتی: بەختت نەبوو، ئەنجا (رۆژی داهاتوو) کە رۆژ نیوە بوو لە هۆشخۆی چوویەوە هەواڵیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ...﴾ زۆر پێ ی دلخۆش بوون، هەروەها ئایەتی: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ...﴾ هاتە خوارەوە -

﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ بیان کوژن (کافران) لەهەر شوێنێ دەستتان کەوتن و زاڵ بوون بەسەریاندا ﴿وَأَخْرِجُوهُم﴾ وە دەریان بکەن ﴿مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ لەو شوێنانەی کە ئێوەیان لێ دەرکردوە ﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ﴾ لادان لە ڕێ ی ئاین (ڕێی ئایین گرتن) لە کوشتن سەخت ترە ﴿وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ﴾ جەنگیان لەگەڵ مەکەن ﴿عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لەلای مزگەوتی کەعبەدا ﴿حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ﴾ تا ئەوان لەوێدا نەجەنگن لەگەڵتاندا ﴿فَإِن قَاتَلُوكُمْ﴾ ئینجا ئەگەر جەنگین لەگەڵتاندا ﴿فَاقْتُلُوهُمْ﴾ ئێوەش بجەنگن لەگەڵیاندا ﴿كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ ئەمەیە تۆڵەی بێ بڕوایان. ١٩١) ﴿فَإِنِ انتَهَوْا﴾ بەڵام ئەگەر دەستیان هەڵگرت (لە جەنگ) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوا خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە. ١٩٢) ﴿وَقَاتِلُوهُمْ﴾ جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ تا دوژمنایەتی ئاین نەمێنێ ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ وە ئاین و ملکەچی هەر بۆ خوا دەبێت ﴿فَإِنِ انتَهَوْا﴾ ئینجا ئەگەر دەستیان هەڵگرت ﴿فَلَا عُدْوَانَ﴾ ئیتر دەست درێژیی نی یە ﴿إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ مەگەر لەسەر ستەمکاران. ١٩٣) ﴿الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ﴾ ڕێزی حەرام بەرانبەر بەڕێزگرتنی ئەوان بۆمانگی حەرام ﴿وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ﴾ شکاندنی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ جا هەر کەسێک دەست درێژی کردە سەرتان ﴿فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ﴾ ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری ﴿بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ بە وێنەی دەست درێژ کردنەکەی ئەو بۆ ئێوە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە لە خوا بترسن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ﴾ وە بزانن کەخوا ﴿مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ لەگەڵ پارێزکارانە. ١٩٤) ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ وە دارایی خۆتان بەخت بکەن لە ڕێ ی خوادا ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە ﴿وَأَحْسِنُوا﴾ وە چاکە بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ بە ڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت. ١٩٥) ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ حەج و عومرە(تان کە دەست پێ کرد) تەنها بۆ خوا بە تەواوی بیکەن ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ﴾ ئینجا ئەگەر هەر ڕێگە نەدران (قەدەغەکران) ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەوسا چیتان بۆ هەڵسوڕا لەقوربانی (سەری بڕن) ﴿وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ﴾ وە سەرتان مەتاشن ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ تا قوربانیەکە دەگاتە جێ ی دیاری کراوی خۆی ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ ئینجا هەر کامێک لە ئێوە نەخۆش بوو ﴿أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ﴾ یان ئازارێک لەسەریدا بوو ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ﴾ (ئەگەر سەری تاشی) بریتی یەک بدات کە ڕۆژوو(ی سێ ڕۆژە) ﴿أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ یان خێرێک یان قوربانیەک بکات ﴿فَإِذَا أَمِنتُمْ﴾ جا کاتێک دڵنیا بوون (ترس نەبوو) ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ﴾ ئینجا ئەو کەسەی بەهرەمەند بوو بە بەجێهێنانی عومرە ﴿إِلَى الْحَجِّ﴾ تا کاتی حەج ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەوە چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی (بیکات) ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ وە ئەگەر یەکێک نەیبوو ﴿فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ﴾ با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە کاتی حەجدا ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ وە حەوت ڕۆژ کاتێ گەڕانەوە ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ ئەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەس و کاری دانیشتووی دەوروبەری (مسجد الحرام) نەبێت ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە لە خوا بترسن ﴿وَاعْلَمُوا﴾ وە بزانن ﴿أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ کە بە ڕاستی خوا خاوەنی تۆڵە و سزای سەختە. ١٩٦)

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

- بوخـــاری لەبەرانـــەوە دەگێڕێتـــەوە و دەڵێت: کاتێک کە ڕۆژووی مـــانگی ڕەمەزان فـەرز بـوو بەدرێژایی ئەو مانگە نەدەچوونـــە لای خێزانەکانیان، بەڵام هەندێک پیاو خۆیان نەدەگرت وە خیانەتیان لە خۆیان دەکرد، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـــەی نـــاردەخوارەوە: ﴿عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ﴾. بوخـاری دەگێڕێتـەوە لـە ســەهلی کــوڕی سەعدەوە دەڵێت:

کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ﴾ وشـەی ﴿مِنَ الْفَجْرِ﴾ نەهاتبویە خوارەوە ، کەسانێ هەبوون گەر بیان ویستایە بەڕۆژوو بن هەبوو دەزوویەکی ڕەش و دەزوویەکی سپی دەبەست بەقاچی یەوە، دەستی دەکرد بەخواردن و خواردنەوە هەتا بۆی ڕوون دەبویەوە و لەیەکی جیادەکردنەوە، وەئەم وشەیە ﴿مِنَ الْفَجْرِ﴾ هاتە خوارەوە ئەوکاتە زانییان مەبەست شەو و ڕۆژە.

﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ (کاتی ) حەج لەچەند مانگێکی دیاری کراودایە ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ﴾ ئینجا هەرکەسێک لەم مانگانەدا حەجی لەسەر خۆی پێویست کرد ﴿فَلَا رَفَثَ﴾ بائیتر نەچێتە لای ژن ﴿وَلَا فُسُوقَ﴾ وە بەدکاری نەکات ﴿وَلَا جِدَالَ﴾ وە دەمەقاڵە نەکات ﴿فِى ٱلْحَجِّ﴾ لەحەجدا ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ﴾ وە هەرچی بکەن لەچاکە ﴿يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ﴾ خوا پێ ی دەزانێ ﴿وَتَزَوَّدُوا۟﴾ وە توێشوو(ی پارێزکاری) هەڵبگرن ﴿فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ کەباشترین توێشوو لەخوا ترسانە ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ وەلە من بترسن ئەی هۆشمەندان. ۱۹۷ )﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ گوناهتان لەسەر نی یە ﴿أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ کەداوای ڕۆزی پەروەردگارتان بکەون ﴿فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ﴾ ئینجا کاتێک گەڕانەوە لەعەرەفات ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ ناوی خوا بێنن ﴿عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ﴾ لەلای ( مشعر الحرام ) دا ﴿وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ﴾ وەیادی خودا بکەن کەڕێ نموونی کردن ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾با لەپێش ئەوەشا ئێوە لە گومڕایان بووبن. ۱۹۸ )﴿ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ لە پاشان بگەڕێنەوە لەوشوێنەی خەڵکی لێ ی دەگەڕێتەوە ﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ وەداوای لێ خۆشبوون بکەن لەخوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خوا لێ خۆشبوو میهرەبانە. ۱۹۹ )﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ﴾ ئینجا کاتێک کردەوەکانی حەجتان تەواوکرد ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ یادی خوا بکەن ﴿كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ﴾ وەک ناوبردنتان بۆ باوو باپیرانتان ﴿أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ یان زیاتر لەناوی ئەوان ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ﴾ ئینجا هی وا هەیە لەخەڵکی (هەر داوای دنیا دەکات و) دەڵێت ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا﴾ خوایە بماندەرێ لە دنیادا ﴿وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ﴾ وە (ئەوانە) هیچ بەشێکیان نی یە لەڕۆژی دوایی دا. ۲۰۰ )﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ﴾ وەهی واش هەیە دەڵێت ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً﴾ خوایە هەم لەدنیا و هەم لە ڕۆژی دواییدا خێرو خۆشیمان پێ بدە ﴿وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ وە بمان پارێزە لەسزای ئاگر. ۲۰۱ ) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿لَهُمْ نَصِيبٌ﴾ بەشێکیان هەیە ﴿مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾ لەوەی کە کردوویانە ﴿وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ وە خوا لێ پرسینەوە بەزوویی دەکات ۲۰۲ )

۞ وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلْتُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾

**هــۆی هاتنــە خــوارەوەی ئایەتی (١٨٩) ســورەتی (البقــرة): ﴿وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا﴾** بوخاری **لە بەرائەوە** دەگێرێتــــەوە و دەڵێت: **عەرەبەکان** لــە دەرگــای خــانووەوە نەدەچوونە ژوورەوە بەڵکو لە پشتەوە دەچوونە ژوورەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتــەی نــاردە خوارەوە: **﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا...﴾** ئیبن ئەبی حاتیم و حاکیم لـە جابرەوە دەگێرنـەوە، کـە دەڵێت: سەردەمێک قــورەیش پــێیان دەوترا **﴿الحمس﴾** کە لە ئیحرام دا لە دەرگای خانوەوە دەچوونـە ژورەوە بـەڵام یاریـدەدەرەکان و هـەموو عەرەبەکانی تر کە ئیحرامیان ببەستایە لە دەرگای خانووە وە نەدەچوونە ژورەوە، لە ناوماندا پێغەمبەر (ﷺ) لەباخێکدا بوو لە دەرگاکەیەوە هاتەدەرەوەو قوتبەی کوڕی عامیری ئە نصاری لەگەڵیدا هاتە دەرەوە ، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەراستی قوتبەی کوڕی عامیر پیاوێکی خراپە ئەو لەگەڵ تۆدا لە دەرگاوە =

﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ﴾ ناوی خوا بەرن (الله اكبر بكەن) ﴿فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ﴾ لە چەند رۆژێکی دیاری کراودا ﴿فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ هەرکەسێک پەلە بکات لەدوو رۆژدا (شەیتان رەجم بکات) ﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ گوناهی ناگات ﴿وَمَنْ تَأَخَّرَ﴾ وە هەر کەسێکیش دوا بکەوێت (سێ رۆژ رەجم بکات) ﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَىٰ﴾ گوناهی لەسەر نی یە بۆکەسێک پارێزکاری بکات﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لە(سزای) خوا خۆتان بپارێزن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ﴾ وەبزانن کە ئێوە ﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ بۆلای ئەو (ئەگەڕێنەوە و) کۆدەکرێنەوە. ٢٠٣)﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ﴾ وەهی وا هەیە لەخەڵکی﴿يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ﴾ کە بە قسە سەرسامت دەکات ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ لەم ژیانی دنیادا ﴿وَيُشْهِدُ اللَّهَ﴾ وە خوا دەکات بەشاهید ﴿عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِ﴾ لەسەر (راستیی) ئەوەی لە دڵیایەتی ﴿وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ﴾ کەچی ئەو دوژمنێکی سەر سەختە. ٢٠٤)﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ﴾ وەکاتێک پشتی هەڵکرد ﴿سَعَىٰ﴾ هەوڵ دەدات ﴿فِي الْأَرْضِ﴾ لە زەوی دا (لەووڵاتدا) ﴿لِيُفْسِدَ فِيهَا﴾ بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکات ﴿وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ﴾ وەکشت وکاڵ و وەچە و نەوە لەناو ببات ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾ وەخوا خراپەکاری خۆش ناوێت. ٢٠٥)﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ﴾ وە کاتێک پێ ی بووترێت ﴿اتَّقِ اللَّهَ﴾ لەخوا بترسە ﴿أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ﴾ دەمار دەیگرێ بۆ بەد کرداریی ﴿فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ﴾ جا ئەو دۆزەخی بەسە ﴿وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ کە بەدترین جێگایە. ٢٠٦)﴿وَمِنَ النَّاسِ﴾ وەهی واش هەیە لە خەڵکی ﴿مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ﴾ کە گیانی خۆی دەفرۆشێت ﴿ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ﴾ بۆ رەزامەندی خوا ﴿وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ وەخوا میهرەبانە بەبەندەکان. ٢٠٧)﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی بڕواداران ﴿ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً﴾ هەموو بچنە ناو ئیسلامەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ وەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە. ٢٠٨)﴿فَإِنْ زَلَلْتُمْ﴾ ئینجا ئەگەر لاتاندا (هەڵخلیسکان) ﴿مِنْ بَعْدِ مَا﴾ دوای ئەوەی ﴿جَاءَتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ کە نیشانە ئاشکراکانتان بۆ هات ﴿فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ﴾ ئەوە چاک بزانن کە خوا ﴿عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ زاڵ و کار دروستە. ٢٠٩)﴿هَلْ يَنْظُرُونَ﴾ ئایا ئەوانە چاوەڕوانن ﴿إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ﴾ خوایان بۆ بێت ﴿فِي ظُلَلٍ﴾ لە ناو چەند پارچە ﴿مِنَ الْغَمَامِ﴾ هەورێکی سپی دا ﴿وَالْمَلَائِكَةُ﴾ هەروەها فریشتەکان (یان بۆیێ) ﴿وَقُضِيَ الْأَمْرُ﴾ وە کارەکە کۆتایی پێ بێت ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ وە هەموو کارێک هەربۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. ٢١٠)

سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّۦنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾

= هاتە دەرەوە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: بۆچی وات کرد؟ ووتی: بینیم تۆ وات کرد منیش وەکە تۆم کرد. فەرمووی: من (احمس)یم، ئەویش ووتی: ئایینەکەی من هەر ئایینەکەی تۆیە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا...﴾.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٩٥) سورەتی (البقرة)؛** بوخاری لە حوزەیفەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ماڵ بەخشین هاتەخوارەوە. ئەبو داوود و تورمزی و ئیبن حیببان و حاکیم دەگێڕنەوە لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری وە دەڵێت: ئەم ئایەتە لە ئێمەی یاریدەدەر (أنصار)دا هاتە خوارەوە، کاتێک کە ئیسلام سەرکەوت و پەرەی سەند، هەندێکمان بە پەنهانی بە هەندێکمان دەووت: ماڵ و سامانمان لەدەست دا و خوای ئیسلامی سەربەرز و شکۆدار کردووە، با لەسەر ماڵ و سامان بمێنینەوە و لە دەستی =

﴿سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لەنەوەی یعقوب بپرسە ﴿كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ﴾ چەند بەلگەو نیشانەی ڕۆشنمان داوە بەوان ﴿وَمَن يُبَدِّلْ﴾ وەهەر کەسیک بیگۆڕیت ﴿نِعْمَةَ ٱللَّهِ﴾ بەهرەی (ڕینموونی) خوا ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ﴾ دوای ئەوەی کەدەستی کەوت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ ئەوە بێگومان خودا تۆلەی زۆر سەختە. ٢١١) ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جوان کراوە بۆ بێ بڕوایان (ناسوپاس کەران) ﴿ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ژیانی دنیا (بە جۆرێک) ﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ کە گالتەدەکەن بە بڕواداران ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟﴾ (بەلام پایەی) ئەوانەی لەخوا ترسن ﴿فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ گەلێ بەرزترە لەوان لە ڕۆژی دواییدا ﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ﴾ وە خودا رزق و ڕۆزی دەدات ﴿مَن يَشَآءُ﴾ بە هەر کەسیک کەبیەوێت ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەبێ شومار. ٢١٢) ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ ئادەمی یەک کۆمەل بوون (بە سرووشت) ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّۦنَ﴾ ئینجا خودا پیغەمبەرانی نارد ﴿مُبَشِّرِينَ﴾ بە مژدەدەر ﴿وَمُنذِرِينَ﴾ و ترسینەر ﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ وەکتیبی راستی و دروستی لەگەلدا ناردونە خوارەوە ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ تا بڕیار بدات لەناو خەلکی دا ﴿فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ﴾ لەو شتانەی کە دووبەرەکی بوون تیایدا ﴿وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ﴾ وە کەس دووبەرەکی نەکرد لە کتیبی ئاسمانیدا ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ﴾ مەگەر ئەوانەی کە کتیبیان پێ درا بوو ﴿مِنۢ بَعْدِ﴾ دوای ئەوەی ﴿مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ نیشانە و بەلگەی ڕۆشنیان بۆ هات ﴿بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ بە هۆی حەسادەتی ناو خۆیانەوە ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئینجا خوا خۆی ڕینموونی بڕوادارانی کرد ﴿لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ﴾ بۆ ئەو ڕیگا ڕاستەی کە دووبەرەکیان تیادا دەکرد ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ وە خوا کێ ی بوێ ڕینموونی دەکات ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بۆ ڕیبازی راست. ٢١٣) ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ﴾ ئایا واتان زانییوە ﴿أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ﴾ کە دەچنە بەهەشت ﴿وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم﴾ کەچی هیشتا نەهاتۆتە ڕێتان ئەوەی تووشی ئەوانە بوون کە لە پیش ئیوەدا تیپەڕین ﴿مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ﴾ (کە لە ڕیی خوادا) دووچاری سەختی و زەرەر و زیان بوون ﴿وَزُلْزِلُوا۟﴾ وە زۆر بە توندی تەکان دران ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ بەرەنگیک کە پیغەمبەر و ئەوانەی کەبڕوایان هینا بوو لەگەلیدا دەیان ووت ﴿مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ﴾ سەرکەوتنی خوا کەی دێت ﴿أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾ ئاگادارین و دلنیابن بە ڕاستی سەرکەوتنی خوا نزیکە. ٢١٤) ﴿يَسْـَٔلُونَكَ﴾ پرسیارت لێ دەکەن ﴿مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ چی ببەخشن (لە ڕێ ی خوادا) ﴿قُلْ مَآ أَنفَقْتُم﴾ بلێ: ئەوی دەیبەخشن ﴿مِّنْ خَيْرٍ﴾ لە مالی پاک و حەلال ﴿فَلِلْوَٰلِدَيْنِ﴾ با بۆ باوک و دایک ﴿وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ و خزمانی نزیک ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ و هەتیوان ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ و هەژاران ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ و ڕیبوارانی کەم دەست ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ﴾ وە هەرچی بکەن لە چاکە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا ئاگادارە لێ ی. ٢١٥)

كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾

**- نەدەین ئەگەر** مال و سامانمان رابگرینەوە دەتوانین قەرەبووی ئەوە **بکەین کە لە** دەستمان داوە، خوای گەورەش بەرپەرچی ئەم ووتەیەمانی دایەوە و ئەم **ئایەتەی** ناردە خوارەوە ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾، تیاچوونەکە (التهلكة) ئەوە بوو کەلە ناو مال و سامانەکەمان دانیشتینایەو چاکمان کردایە و وازمان لەغەزا کردن بهینایە )، طەبەرانی دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی صحیح لە (أبي جبيرة)ی کوڕی ضە حاکەوە دەڵێت: ئەنصاری یەکان ماڵ بەخشین و خێریان زۆر دەکرد، تووشی حاڵێکی نەبوونی و گرانی هاتن، ئیتر خێریان نەدەکرد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ( ١٩٦ ) سورەتی ( البقرة )**: ئیمامی ئەحمەد لە کەعبەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٢٢) سورەتی (ال عمران) : ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا ....﴾** بوخاری و موسلیم لە جابیری کوڕی عەبدوللاوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئێمە لە (بەنی سەلەمە و بەنی حارثە) هاتەخوارەوە: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا ....﴾.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٢٨) سورەتی (ال عمران): ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ....﴾** ئیمامی ئەحمەد و موسلیم لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ددانێکی شکا لەغەزای ئوحود دا و دەم و چاوی بریندار بوو هەتا خوێن بەدەم و چاویدا هاتە خوارەوە فەرمووی: چۆن گەل و نەوەیەك ڕزگاریان دەبێت کە ئاوا بکەن بەپێغەمبەرەکەیان، لەکاتێکدا کەئەو بانگیان بکات بۆلای پەروەردگاریان؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ ...﴾ -

﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ﴾ لەو کاتەدا کە دوو کۆمەڵ لەئێوە خەریک بوون ﴿أَن تَفْشَلَا﴾ سست بن ( بگەڕێنەوە ) ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ بەڵام خوا دۆست و یارمەتی دەریان بوو ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ وە بڕوا داران پاپشت تەنها بەخوا ببەستن . ١٢٢ )﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ سوێند بەخوا بێگومان خوا ئێوەی سەرخست ﴿بِبَدْرٍ﴾ لە ( جەنگی ) بەدردا﴿وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ لە کاتێکدا ئێوە کەم و لاواز بوون ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ دەی لەخوا بترسن ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بەڵکو سوپاس گوزاری بن. ١٢٣ )﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ( بیریان بخەرەوە ) ئەو کاتەی دەت ووت بەبڕوادارەکان ﴿أَلَن يَكْفِيَكُمْ﴾ ئایا بەستان نی یە ﴿أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم﴾ پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات ﴿بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ﴾ بە سێ هەزار ﴿مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ لە فریشتە دابەزێنراوەکان. ١٢٤ )﴿بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟﴾ بەڵێ ئەگەر ئارام بگرن ﴿وَتَتَّقُوا۟﴾ وەلە خوا بترسن ﴿وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا﴾ پەلامارتان بدەن لەم کاتانەدا ﴿يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم﴾ پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات﴿بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ﴾ بەپێنج هەزار ﴿مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ لەفریشتە نیشانەدارەکان. ١٢٥ )﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ﴾ وە خوا تەنها ئەو (کۆمەکی )ی کرد ﴿إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ﴾ بە مژدە بۆتان ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ﴾ وە بۆ ئەوەی دڵەکانتانی پێ ئارام ببێ ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ سەرکەوتنیش تەنها لەلایەن خوای ﴿ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ بالادەستی داناوەیە. ١٢٦ )﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا﴾ (وە ناردنی فریشتەکان) بۆ ئەوە بوو دابڕێت (لەناوی بات) بەشێک ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ لەوانەی کە بێ بڕوان ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ﴾ یان خەفەت باریان بکات (بە تێشکانیان) ﴿فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ﴾ ئنجا بگەڕێنەوە بەنائومێدی. ١٢٧ ) ﴿لَيْسَ لَكَ﴾ (دەربارەی هەڵهاتووەکانی شەڕی ئوحود) بەڕاستی بەدەست تۆ نی یە (ئەی موحەممەد (ﷺ) )﴿مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ هیچ شتێک لەو کارەدا ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ چ (خوا) تەوبەیان لێ وەرگرێ ﴿أَوْ يُعَذِّبَهُمْ﴾ یان سزایان بدات ﴿فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ چونکە بەراستی ئەوانە ستەمکارن. ١٢٨ )﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هەر بۆ خوایە هەرچی لەئاسمانەکاندایە﴿وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە هەرچی لە زەوی دایە﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ﴾ خۆش ئەبێ لە هەرکەس خۆی بیەوێ وەسزای هەر کەسیش ئەدات خۆی بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وەخوا لێ بوردەی میهرەبانە. ١٢٩ )﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە ﴿لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟﴾ سوود مەخۆن ﴿أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً﴾ چەند بەرامبەر ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ و لەخوا بترسن ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی رزگارین. ١٣٠ )﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ﴾ وەخۆتان بپارێزن لەوئاگرەی﴿ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ کەئامادە کراوە بۆ بێ بڕواکان. ١٣١)﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ وەگوێ ڕایەڵی خودا و پێغەمبەر بن ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بێ گومان میهرەبانیتان لەگەڵ ئەکرێت. ١٣٢)

۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾

- هەروەها ئیمامی ئەحمەد و بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەگێڕنەوە کە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: خوایە نەفرەت بکە لەفڵان کەس، خوای گەورە نەفرەت بکە لە حارثی کوڕی هیشام خوای گەورە نەفرەت بکە لە سوهەیلی کوڕی عەمر خوای گەورە نەفرەت بکە لە صەفوانی کوڕی ئومەییە جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە، جا (ئیمانیان هێناو) خوای گەورە لە هەموویان خۆش بوو.

-بەئەو و ئەو، وەئەگەر چاکەکانی تەواو بوو پێش ئەوەی ئەو ماڧانەی لەسەریەتی بیداتەوە، لەخراپەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێت بەسەریدا و پاشان فڕێ دەدرێتە ناوئاگری دۆزەخەوە).

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ﴾ پێشبڕكێ بكەن بۆ لێ بوردنێكی گەورە ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا﴾ وە بۆ بەهەشتێك كە پانییەكەی (بەئەندازەی) ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾ ئاسمانەكان و زەوی یە ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ كە ئامادە كراوە بۆ لە خوا ترسان. ١٣٣) ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ﴾ ئەوانەی ماڵ دەبەخشن (لەڕێ ی خوادا) ﴿فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ لەكاتی خۆشی (دەوڵەمەندی) و ناخۆشی دا ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ و ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ دەبوورن لەخەڵكی ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ خواش چاكەكارانی خۆش دەوێت. ١٣٤) ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً﴾ وە ئەوانەی كە كاتێ كردەوەیەكی ناشیرین دەكەن ﴿أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ یاستەم لەخۆیان دەكەن ﴿ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾ كە یادی خوایان كردەوە ﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ﴾ ئینجا داوای لێ بووردن دەكەن بۆ گوناهەكانیان ﴿وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ﴾ ئایا كێ دەبووری لە گوناهەكان ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ بێجگە لە خوا؟ ﴿وَلَمۡ يُصِرُّواْ﴾ وە بەردەوام نابن ﴿عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ﴾ لەسەر ئەوەی كە كردوویانە ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لە كاتێكدا بزانن (گوناهە). ١٣٥) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ﴾ پاداشتیان لێ بووردنە ﴿مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿وَجَنَّٰتٞ﴾ و چەند باخاتێك (بەهەشتێك) ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ كە ڕووبارەكان دەڕۆن بەژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ ئەمیننەوە لەو بەهەشتانەدا بەهەمیشەیی ﴿وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ چەند چاكە پاداشتی چاكەكاران. ١٣٦) ﴿قَدۡ خَلَتۡ﴾ بێگومان رابورد ﴿مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ﴾ لە پێش ئێوەوە چەند رێ و یاسایەك (باوێك) ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئینجا ئێوە بگەڕێن بەزەویدا ﴿فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ﴾ و سەرنج بدەن ئایا چۆن بوو ﴿عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ سەرئەنجامی بێ بڕواكان. ١٣٧) ﴿هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ﴾ ئەمە ڕوون كردنەوەیە بۆ هەموو خەڵكی ﴿وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ﴾ و ڕێنموونیی و ئامۆژگاری یە ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ بۆ لە خوا ترسان. ١٣٨) ﴿وَلَا تَهِنُواْ﴾ سست و دڵ لاواز مەبن ﴿وَلَا تَحۡزَنُواْ﴾ وە غەمبار مەبن ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ﴾ هەر ئێوە بەرز و بڵند ترن ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕوادار بن. ١٣٩) ﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ﴾ ئەگەر ئێوە (لە ئوحوددا) زام و برینتان تووش بووە ﴿فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ﴾ ئەوە بێگومان ئەو هۆزە (لە بەدردا) زام و برینیان تووش بووە ﴿مِّثۡلُهُۥ﴾ بە وێنەی زامی ئێوە ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ﴾ ئەو چەرخ و ڕۆژانەی (زاڵبوون و سەركەوتنانە) ﴿نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ دەیگێڕین لە ناو خەڵكیدا ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ﴾ لەبەر ئەوەی (لەدنیادا) خوا دەری بخات ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ﴾ و لە ناو ئێوەدا هەڵبژێرێت ﴿شُهَدَآءَ﴾ چەند كەسێك بە شەهید ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ستەم كارانی خۆش ناوێ. ١٤٠)

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

-بەئەو و ئەو، وەئەگەر چاكەكانی تەواو بوو پێش ئەوەی ئەو ماڤانەی لەسەریەتی بیداتەوە، لەخراپەكانیان وەردەگیرێت و دەدرێت بەسەریدا و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

**ئایەتی (٢٣٣) سورەتی (البقرة):** قال رسول الله (ﷺ): (دینار **أنفقته** في سبيل **الله**، ودینار أنفقته **في رقبة** ودینار **تصدقت به** على مسكين، ودینار أنفقته على أهلك، أعظمها أجراً الذي أنفقته على أهلك)(رواه مسلم) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (دینارێكت بەخشیبێ لەڕێی خوادا وەدینارێكت بەخشیبێ لەئازاد **كردنی** بەندەیەكدا وە دینارێكت كردبێت بەخێر بۆ هەژارێك وە دینارێكت خەرج كردبێت بۆخێزان وماڵی خۆت ئەوەیان پاداشتی گەورەترە كەخەرجت كردبێت بۆ خێزان و ماڵی خۆت).

﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ﴾ وە تا خوا (لەتاوان) پاک بکاتەوە﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی کەبڕوادارن﴿وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وەبێ باوەڕان بنەبڕ بکات. ١٤١)﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ﴾ ئایا ئێوە وا گومانتان دەبرد﴿أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ﴾ کەدەچنە بەهەشت﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ﴾ لە کاتێکدا هێشتا خوا دەری نەخستوە﴿ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ﴾ ئەوانەی تێ دەکۆشن لەئێوە﴿وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وهێشتا دەری نەخستوە خۆڕاگران. ١٤٢)﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ﴾ سوێند بێ بێگومان ئێوە﴿تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ﴾ ئاواتی (شەهیدی و) مردنتان ئەخواست﴿مِن قَبۡلِ﴾ لەپێش ئەوەی ﴿أَن تَلۡقَوۡهُ﴾ پێ ی بگەن ﴿فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ﴾ خۆ بەڕاستی مردنتان بینی﴿وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە زەق سەیرتان دەکرد. ١٤٣)﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ﴾ موحەممەد (ﷺ) تەنها پێغەمبەرێکە (نەمر نی یە) ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر رابوردون﴿أَفَإِيْن مَّاتَ﴾ جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد ﴿أَوۡ قُتِلَ﴾ یان کوژرا﴿ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ﴾ دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان (پاشگەز دەبنەوە) ﴿وَمَن يَنقَلِبۡ﴾ هەرکەس هەڵگەڕێتەوە﴿عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ﴾ بۆ دواوەی خۆی (بت پەرستی)﴿فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾ ئەوە هەرگیز (ئەو کەسە) هیچ زیانێک ناگەیەنێت بەخوا ﴿وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ﴾ وەبەزوویی خوا پاداشتی﴿ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ سوپاس گوزاران دەداتەوە. ١٤٤)﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ﴾ هیچ کەسێک نەبووە ﴿أَن تَمُوتَ﴾ کەبمرێت ﴿إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بەفەرمانی خوا ﴿كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗا﴾ نوسراوێکی کات دیاری کراوە ﴿وَمَن يُرِدۡ﴾ هەر کەسێک دەیەوێت ﴿ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا﴾ پاداشت و دەستکەوتی دنیایی ﴿نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا﴾ لەو (پاداشتی دنیا) هەندیکی پێ دەدەین ﴿وَمَن يُرِدۡ﴾ وەهەرکەسێک دەیەوێت ﴿ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ پاداشتی پاشەڕۆژ ﴿نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا﴾ لەو (پاداشتی پاشەڕۆژە) هەندیکی پێ دەبەخشین﴿وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ وەبەزووی پاداشتی سوپاس گوزاران دەدەینەوە. ١٤٥)﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ﴾ زۆر لەپێغەمبەران ﴿قَٰتَلَ مَعَهُۥ﴾ جەنگ و کوشتاریان کردووە لەگەڵیاندا ﴿رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ﴾ زۆر لەزانایان و خوا ناسان ﴿فَمَا وَهَنُواْ﴾ جا سست و دەستە پاچە نەبوون ﴿لِمَآ أَصَابَهُمۡ﴾ بەهۆی ئەوەی کەدووچاریان بووە ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خوادا ﴿وَمَا ضَعُفُواْ﴾ وەبێ هێزو لاواز نەبوون ﴿وَمَا ٱسۡتَكَانُواْ﴾ وەسەریان شۆڕ نەکرد بۆ دوژمن ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وەخوا خۆڕاگرانی خۆش دەوێت . ١٤٦)﴿وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ﴾ هەر ئەمە وتەی ئەوان بوو﴿إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ کەدەیان ووت ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان لێمان ببورە ﴿ذُنُوبَنَا﴾ گوناهەکانمان﴿وَإِسۡرَافَنَا﴾ وەزیادە ڕەویمان﴿فِيٓ أَمۡرِنَا﴾ لەکاروبارماندا ﴿وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا﴾ وپێکانمان جێ گیر بکە (لە جەنگدا)﴿وَٱنصُرۡنَا﴾ وسەرمان بخە﴿عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بەسەر کۆمەڵی بێ بڕوایاندا. ١٤٧)﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا پێ ی بەخشین ﴿ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا﴾ پاداشتی دنیا ﴿وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وە پاداشتی چاك و شیرینی ڕۆژی دوایی ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت. ١٤٨)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾

**ئایەتی (٢٣٤) سورەتی (البقرة): قال** رسول الله (ﷺ) **(لایحل لامرأة تؤمن بالله والیوم الأخر أن تحد علی میت فوق ثلاث لیال إلاّ علی زوج أربعة أشهر وعشراً)(رواه البخاري ومسلم)،** پێغەمبەر (ﷺ) **دەفەرمووێ: (هەر ئافرەتێك باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت دروست نی یە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیەبار بێت بۆ مردوو، مەگەر مێردی بێت دروستە چوار مانگ و دە ڕۆژ بۆی** تەعزیەبار بێت).

**ئایەتی (٢٣٨) سورەتی (البقرة): قال** رسول الله (ﷺ): (بني **الإسلام** علی خمس: شهادة أن لاإلە إلاالله **وأن محمداً رسول الله**، وإقام الصلاة وإیتاء الزکاة، وحج البیت، وصوم رمضان) (متفق علیه). وقال(ﷺ): **إن بین الرجل وبین الشرك** والکفر ترك الصلاة) (رواه مسلم)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: –

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە﴿إِن تُطِيعُواْ﴾ ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی بکەن﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بۆ ئەوانەی بێ بڕوان ﴿يَرُدُّوكُمْ﴾ ئەتان گێڕنەوە﴿عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ بۆ دواوەی خۆتان (بت پەرستی)﴿فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾ ئینجا ئەگەڕێنەوە بە زیانباری. ١٤٩)﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ﴾(ئەوانە دۆستتان نین) بەڵکو خوا یارمەتی دەر و دۆستی ئێوەیە﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ﴾وەخوا باشترینی هەموو یارمەتی دەرانە. ١٥٠)﴿سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ﴾بەزوویی دەخەینە دڵی﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی بێ بڕوان ﴿ٱلرُّعْبَ﴾ ترس و بیمی بەتین﴿بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەی کرد بوویانە هاوبەشی خوا﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ شتانێ کە خوا هیچ بەڵگەی نەناردۆتە خوارەوە لەسەری﴿وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ کە جێ و شوێنی ئەوان ئاگرە ﴿وَبِئْسَ مَثْوَى﴾ وەچەند نیشتە جێیە کێ خراپە ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (جێگەی) ستەمکاران. ١٥١)﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ سوێندبێ بێ گومان خوا بەجێ هێنا بۆتان﴿وَعْدَهُۥٓ﴾ بەڵێنەکەی﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم﴾ کاتێك (سەرەتای جەنگی ئوحود) هەستتان لێ بڕین (دەتان کوشتن)﴿بِإِذْنِهِۦ﴾بەفەرمانی خوا﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾هەتا کاتێ (لە ناکاو) سست بوون﴿وَتَنَٰزَعْتُمْ﴾ ناژاوە و دووبەرەکیتان کرد﴿فِى ٱلْأَمْرِ﴾ لەکاری جەنگدا ﴿وَعَصَيْتُم﴾وەبێ فەرمانیتان کرد ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم﴾ لەپاش ئەوەی کەخوا نیشانی دان ﴿مَّا تُحِبُّونَ﴾ ئەوەی (لە جەنگەکەدا) پێتان خۆش بوو (کەسەرکەوتن لەسەرەتایی جەنگەکەدا) ﴿مِنكُم﴾ هەندێك لە ئێوە ﴿مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾ (دەسکەوتی)دنیایی دەویست﴿وَمِنكُم مَّن﴾وە هەندێکتان ﴿يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ پاداشتی ڕۆژی دوایی دەویست﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ﴾ پاشان (خوا) ئێوەی گێڕایەوە لە(جەنگی) ئەوان( و تێ شکان)﴿لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ تاتاقیتان بکاتەوە (لەخۆڕاگرتندا) ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾ سوێندبێ بێگومان خوا لێتان بوورا ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ﴾ و خوا خاوەنی بەهرەو چاکەیە ﴿عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەسەر بڕوادارانەوە. ١٥٢) ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ﴾ کاتێ دووردەکەوتنەوە(سەردەکەوتن بەکێوی ئوحوددا) ﴿وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ﴾ وەبەڕێ ی کەس نەئەوەستان ولاتان نەدەکردەوە بەلایدا ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ﴾ لەکاتێکدا پێغەمبەر بانگی لێ دەکردن ﴿فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾ لە دواتانەوە ﴿فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ﴾ جا (خوا) پاداشتی غەم و خەفەتی هەر بە غەم و خەفەت دانەوە ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ﴾ بۆ ئەوەی غەمبار نەبن ﴿عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾ لەسەر ئەوەی لە دەستتان چووە ﴿وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ﴾ وە (غەمبار نەبن بە) ئەوەی دووچارتان بووە ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ﴾ خواش ئاگادارە ﴿بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بەوەی کەدەیکەن. ١٥٣)

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ
مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ
ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ
قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ
يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ
فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ
وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ
وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا
كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٥٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا
ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا
قُتِلُواْ لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿١٥٧﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ( ١٥٤ ) سورەتی ( ال عمران ): ﴿ثُمَّ أنزَلَ عَلَيْكُم ....﴾** ئیسحاقی کوڕی راهەویەی لە زوبەیرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: بیرم دێت لە ڕۆژی جەنگی ئوحود دا ترس و بیم تێدی بۆ هێنابووین ، خوای گەورە خەوی لێ خستین ، هەر کەسێك لە ئێمە چەناکەی لەسەر سنگی بوو، سوێند بە خوا وەك خەو ببینم گوێم لە ووتەی موعەتیبی کوڕی قوشەیر بوو کە دەیووت ﴿لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾ منیش لەوەوە لەبەرم کرد، خوای گەورەش دوای ئەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ثُمَّ أنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أمَنَةً نُّعَاساً...﴾ هەتا گەیشتە ﴿...وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾.

- (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە شایەتی دان بەوەی کەهیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە خوا -

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم﴾ پاشان دایبەزاند بە سەرتاندا (بۆی ناردن)﴿مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ﴾ لەپاش ئەو غەمە(ی کەچەشتتان) ﴿أَمَنَةً﴾ ئارامیی ﴿نُّعَاسًا﴾ کە وەنەوزێک بوو ﴿يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ بەسەر دەستەیەکێ لە ئێوە داهات ﴿وَطَآئِفَةٌ﴾ بەڵام دەستە و تاقمێکی دیکەتان ﴿قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ بەڕاستی هەرخۆیان مەبەست بوو ﴿يَظُنُّونَ﴾ گومانی ﴿بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ ناراست و ناهەقیان بەخوا دەبرد ﴿ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ وەکێ گومانی نەفامێتی ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەیان ووت ﴿هَل لَّنَا﴾ ئایا بۆمان هەیە (بە دەستمانە)﴿مِنَ ٱلْأَمْرِ﴾ لەم کارەدا (زاڵ بوون) ﴿مِن شَيْءٍ﴾ هیچ شتێک ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ﴾ بڵێ بێگومان کاروبار ﴿كُلَّهُۥ لِلَّهِ﴾ هەمووی بەدەست خوایە ﴿يُخْفُونَ﴾ دەیشارنەوە ﴿فِىٓ أَنفُسِهِم﴾ لە دەروونیاندا ﴿مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾ ئەوەی کە دەری نابڕن بۆت ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا﴾ دەڵێن ئەگەر بەدەست ئێمە بوایە ﴿مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ لەم کارەدا شتێک (لە سەرکەوتن) ﴿مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ ئێمە لێرەدا نەدەکوژراین ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ﴾ بڵێ ئەگەر ئێوە ﴿فِى بُيُوتِكُمْ﴾ لە ماڵەکانی خۆشتاندا بوونایە ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ﴾ هەر دەردەچوون ئەوانەی ﴿كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ﴾ کە کوژرانیان لەسەر نووسرا بوو ﴿إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾ بۆ جێگای کوژرانیان (ڕاکشانیان)﴿وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی خوا تاقی بکاتەوە﴿مَا فِى صُدُورِكُمْ﴾ ئەوەی کەلە سنگتاندایە ﴿وَلِيُمَحِّصَ﴾ وە بۆ ئەوەی پاڵفتەو پاکی بکاتەوە ﴿مَا فِى قُلُوبِكُمْ﴾ ئەو (بڕوایە)ی کەلە دڵتاندایە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ﴾ وە خوا زانایە ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەوەی لە سینەو دەرونەکاندایە. ١٥٤)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ﴿تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ﴾ پشتیان هەڵکرد لەناو تاندا ﴿يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ﴾ لەو ڕۆژەی کەهەردوو کۆمەڵ گەیشتن بەیەک (لە ئوحود دا) ﴿إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ بێگومان تەنها شەیتان هەڵی خلیسکاندن ﴿بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟﴾ بەهۆی هەندێ لەو گوناهانەی کەلەوەبەر کردبوویان ﴿وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ سوێند بێ بێگومان خوا لێ یان خۆشبوو ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ چونکە بەڕاستی خوا ﴿غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ لێبووردەی پەلە نەکەرە (لە تۆڵە سەندن دا). ١٥٥)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وەکێ ئەوانە مەبن کە بڕوایان نەهێناوە ﴿وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾ وە دەیان ووت دەربارەی براکانیان ﴿إِذَا ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کاتێ سەفەریان بکردایە ﴿أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى﴾ یان غەزا یان بکردایە ﴿لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا﴾ ئەگەر لای ئێمە (نیشتەجێ) بوونایە ﴿مَا مَاتُوا۟﴾ نە دەمردن ﴿وَمَا قُتِلُوا۟﴾ و نە دەکوژران ﴿لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ﴾ تا خوا ئەوە بکات ﴿حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ﴾ بە داخ و مەراق لە دڵیاندا ﴿وَٱللَّهُ يُحْىِۦ﴾ وە خوا (مرۆڤ) دەژێنێ ﴿وَيُمِيتُ﴾ و دەمرێنێ ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خودا بینایە بەهەر کردەوەیەکێ کەئێوە دەیکەن. ١٥٦)﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ﴾ سوێند بێ ئەگەر ئێوە بکوژرێن ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێ ی خوادا ﴿أَوْ مُتُّمْ﴾ یان بمرن ﴿لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ﴾ ئەوە بەڕاستی لێبووردن و میهرەبانی لەلایەن خواوە ﴿خَيْرٌ﴾ چاکترە ﴿مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ لەوەی کەکۆی دەکەنەوە. ١٥٧)

وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى اللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ ۗ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٦١) سورەتی (آل عمران): ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ....﴾ ئەبو داوود و تیرمیزی دەگێڕنەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە دەربارەی قوماشێکی مەخمەلی سوور هاتە خوارەوە کەلە ڕۆژی غەزای بەدردا ون بوو هەندێک کەس دەیان ووت لەوەدەچێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵی گرتبێ، جا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ...﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. هەروەها طەبەرانی لە (معجم الكبير)دا دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی نارد و تاڵاکەی گەڕایەوە پاشان ناردی و گەڕایەوە پاشان ناردی و گەڕایەوە ( واتە سێ جار هێرشیان کرد و سەرنەکەوتن ) بەهۆی بزینی سەرە ئاسکێکی- ئاڵتوونەوە جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾.

﴿وَلَئِن مُّتُّمْ﴾ سوێند بێ ئەگەر ئێوە بمرن ﴿أَوْ قُتِلْتُمْ﴾ یان بکوژرێن ﴿لَإِلَى اللَّهِ﴾ هەر لای خوا ﴿تُحْشَرُونَ﴾ کۆدەکرێنەوە. ١٥٨)﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ بەهۆی بەزەیی خوایەوە ﴿لِنتَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەوان نەرم و نیانی بووی ﴿وَلَوْ كُنتَ﴾ ئەگەر تۆ ﴿فَظًّا﴾ بەدخوو قسە ڕەق و ﴿غَلِيظَ الْقَلْبِ﴾ دڵ ڕەق بوویتایە ﴿لَانفَضُّوا﴾ ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد ﴿مِنْ حَوْلِكَ﴾ لەدەورت ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ﴾ کەواتە لێ یان ببورە ﴿وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ و داوای لێبوردنیان بۆ بکە لەخوا ﴿وَشَاوِرْهُمْ﴾ و ڕاوێژیان پێ بکە ﴿فِي الْأَمْرِ﴾ لە کاروباردا ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ﴾ جا کاتێ (دوا ڕاوێژکردن) بڕیارت دا ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەوە پشت بە خوا ببەستە﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کەپشت بەخوا دەبەستن. ١٥٩)﴿إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ﴾ ئەگەر خوا سەرتان بخات ﴿فَلَا غَالِبَ لَكُمْ﴾ ئەوە هیچ کەس زاڵ نابێ بەسەرتاندا ﴿وَإِن يَخْذُلْكُمْ﴾ وە ئەگەر یارمەتیتان نەدا (پشتتان بەردات)﴿فَمَن ذَا الَّذِي﴾ کێیە ئەو کەسەی؟ ﴿يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ﴾ لەپاش خوا سەرتان دەخات ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ وە با بڕوادارا‌ن پشت هەر بەخوا ببەستن. ١٦٠)﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ﴾ وە بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبوو ﴿أَن يَغُلَّ﴾ کەخیانەت بکات ﴿وَمَن يَغْلُلْ﴾ وە هەر کەس خیانەت بکات ﴿يَأْتِ بِمَا غَلَّ﴾ بەو خیانەتەوەی کردویەتی دێت (بەکۆڵیەوەیە)﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لە پاشەڕۆژدا (ڕۆژی هەستانەوە) ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ﴾ پاشان پاداشت دەدرێتەوە ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ هەموو کەسێك ﴿مَّا كَسَبَتْ﴾ هەرچی کردبێت ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت. ١٦١)﴿أَفَمَنِ اتَّبَعَ﴾ دەی ئایا کەسێ کەشوێنی ﴿رِضْوَانَ اللَّهِ﴾ ڕەزامەندی خوا کەوتبێت ﴿كَمَن بَاءَ﴾ وەك کەسێك وایە بگەڕێتەوە ﴿بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ بەخەشمێکەوە لەلایەن خواوە ﴿وَمَأْوَاهُ﴾ وە جێ و شوێنی ئەو ﴿جَهَنَّمُ﴾ دۆزەخ بێت ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ کە سەرئەنجامێکی چەند خراپە؟ ١٦٢)﴿هُمْ دَرَجَاتٌ﴾ (چاکە کاران و خراپە کاران) خاوەنی چەند پلەی جیاوازن ﴿عِندَ اللَّهِ﴾ لای خوا ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ﴾ وە خوا بینایە ﴿بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ بە ئەوەی کەدەیکەن. ١٦٣)﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ﴾ سوێندبێ بێ گومان خوا چاکە و منەتی نا﴿عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ بەسەر بڕواداراندا﴿إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ﴾ کاتێ کەڕەوانەی کرد لەناویاندا﴿رَسُولًا﴾ پێغەمبەرو نێرراوێك﴿مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ لەخۆیان ﴿يَتْلُوا عَلَيْهِمْ﴾ کە دەیخوێنێتەوە بەسەریاندا ﴿آيَاتِهِ﴾ بەڵگەکانی ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ و پاك و خاوێنیان دەکاتەوە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ وە قورئان و فەرموودەیان فێردەکات ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ﴾ ئەگەر چی ئەوان لەپێشدا ﴿لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ لەگومڕایی یەکی ڕوون و ئاشکرادا بوون. ١٦٤)﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم﴾ ئایا بۆچی کاتێك تووشتان بوو ﴿مُّصِيبَةٌ﴾ ناخۆشیەك (لەئوحود دا) ﴿قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا﴾ بێگومان ئێوە دووقاتی ئەوەتان تووشی ئەوان کرد (لەبەدردا) ﴿قُلْتُمْ﴾ ووتتان ﴿أَنَّىٰ هَٰذَا﴾ ئەمە لە کوێوە هات ﴿قُلْ﴾ بڵێ ﴿هُوَ مِنْ عِندِ﴾ ئەوە لەلایەن ﴿أَنفُسِكُمْ﴾ خۆتانەوە بوو (کە فەرمانی پێغەمبەرتان شکاند) ﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ١٦٥)

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٦٥) سورەتی (آل عمران): ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ.....﴾ ئیبن ئەبی حاتیم لەعومەری کوڕی خەططابەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: هاوەڵان سزادران لەجەنگی ئوحوددا – بەهۆی وەرگرتنی فیدیەوە لەدیل گراوەکانی بەدردا– ئەوەبوو لەجەنگی ئوحوددا حەفتا کەسیان لێ شەهیدکرا و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵهاتن و ڕایان کردو ددانی پێشەوەی شکاو ئەو کڵاوە ئاسنەی لەسەری کردبوو شکاو خوێن بەسەر دەموچاویدا هاتەخوارەوە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ ...﴾.

– شایەتی دان کە موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە، وەنوێژ کردن وەزەکات دان وەحەج کردن وە وە بەڕێوە بوونی مانگی ڕەمەزان) وە دەفەرمووێت: (بەڕاستی ئەوەی لە نێوان مرۆڤ و هاوبەش دانان بۆ خوا و بێ باوەڕی دانیە نوێژ نەکردنە).

﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ﴾ ئەوەی کەتووشتان بوو ﴿يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ لەو ڕۆژەدا کە هەردوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن (لەئوحوددا) ﴿فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بەویستی خودا بوو ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ ئەوەی بڕواداران دەرخات. ١٦٦) ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ﴾ وَ بۆ ئەوەی دووڕووەکان ئاشکرا بکات ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ﴾ وپێیان ووترا ﴿تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ﴾ وەرن بجەنگن ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێ ی خوادا ﴿أَوِ ٱدۡفَعُواْ﴾ یابەرگری (لە وڵاتی خۆتان) بکەن ﴿قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا﴾ ووتیان: ئەگەر بمانزانیایە جەنگ دەبێ ﴿لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡ﴾ شوێنتان دەکەوتین ﴿هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ﴾ ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە بێ بڕواییەوە ﴿أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ﴾ نزیك تر بوون تا بڕواو ئیمان ﴿يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم﴾ ئەوانە بەدەمیان شتێك ئەڵێن ﴿مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ کەلەدڵیاندا نی یە ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ﴾ وەخوا (لەهەموو کەس) زاناترە ﴿بِمَا يَكۡتُمُونَ﴾ بەوەی کە دەیشارنەوە. ١٦٧) ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ﴾ ئەوانەی کەووتیان ﴿لِإِخۡوَٰنِهِمۡ﴾ دەربارەی برادەرەکانیان ﴿وَقَعَدُواْ﴾ لە کاتێکدا خۆیان دانیشتن و دەرنەچوون ﴿لَوۡ أَطَاعُونَا﴾ ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی ئێمە بوونایە ﴿مَا قُتِلُواْ﴾ نەدەکوژران ﴿قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ﴾ بڵێ کەواتە بەرگری ﴿عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ﴾ مردن لە خۆتان بکەن ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. ١٦٨) ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ﴾ هەرگیز وا گومان مەبەن ﴿ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ﴾ ئەوانەی کە کوژران ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێ ی خوادا ﴿أَمۡوَٰتَۢا﴾ مردوون ﴿بَلۡ أَحۡيَآءٌ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون ﴿عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ لای پەروەردگاریان ﴿يُرۡزَقُونَ﴾ ڕۆزی دەدرێن. ١٦٩) ﴿فَرِحِينَ بِمَآ﴾ شادمان و دڵخۆشن بەوەی ﴿ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ کە خوا پێ ی بەخشیوون ﴿مِن فَضۡلِهِۦ﴾ لەبەهرە و فەزڵی خۆی ﴿وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ﴾ شادمانن بەوانەی -برا تێکۆشەرەکانیان- ﴿لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم﴾ کە هێشتا نەگەیشتوون پێیان ﴿مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ لەدوای (شەهیدبوونی) ئەمان ﴿أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ نەهیچ ترسێکیان لەسەرە ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ و نە ئەوانە هیچ غەم و خەفەتێك دەخۆن. ١٧٠) ﴿يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ شادمان و دڵخۆشن ﴿بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ﴾ بەو بەهرەو زیادە فەزڵەی لەلایەن خواوە (پێیان دراوە) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بەڕاستی خوا ﴿لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ پاداشتی بڕواداران وون ناکات. ١٧١) ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەی ﴿ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ کە وەڵامی خواو پێغەمبەریان داوەتەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ﴾ لەپاش ئەوەی کە ﴿مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُ﴾ (لەئوحوددا) تووشی برینداری بوون ﴿لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ﴾ بۆ ئەوانەیان هەیە کەکردەوەی چاکیان کردوە ﴿وَٱتَّقَوۡاْ﴾ وەخۆیان پاراستووە ﴿أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ پاداشتێکی گەورە. ١٧٢) ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ﴾ ئەوانەی کەخەڵکی پێیان دەووتن ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ﴾ بە ڕاستی خەڵکی (بێ باوەڕ) ﴿قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ﴾ لەشکر و کۆمەڵی زۆریان کۆکردوەتەوە لە دژتان ﴿فَٱخۡشَوۡهُمۡ﴾ کەواتە بترسن لێ یان ﴿فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ کەچی ئەوان (ئیمانداران) بەمە باوەڕیان زیاد بوو ﴿وَقَالُواْ﴾ وە ووتیان ﴿حَسۡبُنَا ٱللَّهُ﴾ هەر خوامان بەسە ﴿وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ﴾ چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە. ١٧٣)

فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٦٩ و١٧٠ و ١٧١) سورەتی (ال عمران): ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ .....﴾ ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داوود و حاکیم لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (کاتێک کەبراکانتان ئەوەیان بەسەرهات لەشەڕی ئوحودا خوای گەورە گیانیانی خستنە ناو سنگی باڵندەی سەوزەوە کە بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتەوە دێن و دەچن، وەلەبەروبوومی باخی بەهەشت دەخۆن و لەکۆشکە بەئاڵتوون دروست کراوەکانی بەر سێبەری عەرش دا دەحەسێنەوە، کاتێک دەبینن خۆشی وتامی ئەو خواردنەی کەدەیخۆن و دەیخۆنەوە لەگەڵ ئەو سەر ئەنجام و پاشەڕۆژە چاکەیان دا، دەڵێن: خۆزگە براکانمان دەیانزانی کەخوای گەورە چی بۆ ئامادە کردووین و ڕێزێکی لێ گرتووین، بۆ ئەوەی –

﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ﴾ ئینجا گەڕانەوە(بۆ مەدینە) بە بەهرەی گەورەوە (کەسەلامەتی یە) ﴿مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ﴾ وفەزڵ و پاداشت لەلایەن خواوە ﴿لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾ هیچ زیان و ناخۆشیەکیان تووش نەبوو﴿وَٱتَّبَعُواْ﴾ ئەوانە شوێنی﴿رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ﴾ ڕەزامەندی خوا کەوتن﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ﴾ وەخوا خاوەنی بەهرەی گەورەیە. ١٧٤)﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ﴾ بەڕاستی ئەوەی ئێوە (سارد دەکاتەوە) تەنها﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ شەیتانە﴿يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ﴾ کەدۆست و (برادەرانی) خۆی دەترسێنێ ﴿فَلَا تَخَافُوهُمۡ﴾ جائێوە لێیان مەترسن﴿وَخَافُونِ﴾ وەلەمن بترسن﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن. ١٧٥)﴿وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ﴾ بادڵ غەمگینت نەکەن ئەوانەی﴿يُسَٰرِعُونَ﴾ پێشبڕکێ و پەلە دەکەن ﴿فِي ٱلۡكُفۡرِۚ﴾ لەبێ بڕواییدا ﴿إِنَّهُمۡ﴾ بێگومان ئەوانە﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ﴾ هەرگیز هیچ زیانێك ناگەیەنن بەخوا ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ خوا دەیەوێت﴿أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا﴾ کەهیچ بەشێکیان بۆ دانەنێ ﴿فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ لەڕۆژی دوایی دا ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وەبۆ ئەوان سزایەکی گەورە هەیە. ١٧٦) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ﴿ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ﴾ کەبێ بڕواییان کڕی (لەم جیهانەدا) ﴿بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ بەبڕواو ئیمان ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾ هەرگیز هیچ جۆرە زیانێك ناگەیەنن بەخوا﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ﴾ بۆئەوانە سزایەکی ﴿أَلِيمٞ﴾ بەئێش و ئازار. ١٧٧)﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ﴾ هەرگیز واگومان نەبەن﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی کەبێ باوەڕن ﴿أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ﴾ ئەو مۆڵەت دانی ئێمە بۆ ئەوان﴿خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ﴾ چاکە بۆ خۆیان ﴿إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ﴾ بەڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان ئەدەین﴿لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ﴾ بۆ ئەوەی گوناهی زیاتر بکەن ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ وە بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ڕیسواکەر. ١٧٨)﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ خوا واز لەبڕواداران ناهێنێ ﴿عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ﴾ لەسەر ئەو بارەی کەئێوەی لەسەرن (کەجیا نەبوونەوەی موسڵمان و دووڕوو و کافرە) ﴿حَتَّىٰ يَمِيزَ﴾ هەتا جیا دەکاتەوە ﴿ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ﴾ پیس لەپاك ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ﴾ وەخوای گەورە ئێوە ئاگادار ناکات ﴿عَلَى ٱلۡغَيۡبِ﴾ بەسەر نهێنی (غەیب)دا ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڵام خوا ﴿يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ﴾ هەڵی ئەبژێرێ لە نێرراوەکانی دا ﴿مَن يَشَآءُۖ﴾ هەرکەسێکی بوێت ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ جا بڕوای ڕاستەقینە بێنن بەخوا ﴿وَرُسُلِهِۦۚ﴾ وەبەنێرراوەکانی ﴿وَإِن تُؤۡمِنُواْ﴾ وە ئەگەر بەو جۆرە بڕوا بێنن ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ وخۆتان بپارێزن﴿فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾ ئەوە پاداشتێکی زۆر گەورەتان بۆ هەیە. ١٧٩)﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ﴾ هەرگیز واگومان نەبەن ئەوکەسانەی ﴿يَبۡخَلُونَ﴾ کەچرووکی دەکەن ﴿بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ بەوەی کە خوا پێی بەخشیوون ﴿مِن فَضۡلِهِۦ﴾ لەڕێز و بەهرەی خۆی ﴿هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ﴾ کەئەو (چرووکی ی)ە چاکترە بۆیان ﴿بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوە خراپە بۆیان﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ﴾ بە زوویی ئەوەی چرووکیان پێ دەکرد وەك تەوق دەکرێتە ملیان﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ لەپاشە ڕۆژدا (ڕۆژی هەستانەوە) ﴿وَلِلَّهِ﴾ وە هەر بۆخوایە ﴿مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ کەلەپوور و میراتی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ وە خوا ئاگادارە بە هەرچی کە ئێوە دەیکەن. ١٨٠)

لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ
سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَنَقُولُ
ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ
وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ
ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ
تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾
فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ
وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ
عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ
إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ
وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ
وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

- وازیان لە جیهادو تێکۆشانەکەیان نەهێنایە لەڕێگەی خوداو هەرگیز پشتیان لەجەنگ نەکردایە، خوای گەورەش فەرمووی: من ئەمەی ئێوەیان پێ ڕادەگەیەنم، بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتە ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ..﴾ و دوو ئایەتە کەی دوای ئەویشی ناردە خوارەوە.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٧٢ و ١٧٣ و ١٧٤)**

سورەتی (آل عمران): ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ....﴾ تەبەرانی لە عبداللەی کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێك کە ئەبو سوفیان و بێ باوەڕەکان لە غەزای ئوحود گەڕانەوە وگەشتنە ڕەوحاء لەناوخۆیان دا ووتیان: نە موحەممەدتان کوشتو نەکیژۆڵە قولاپە خۆشەکانیشتان لەپاشکۆی خۆتانەوە سوار کرد کارێکی زۆر خراپتان کرد، پێغەمبەری خوا کەئەمەی بیست، خێرا موسڵمانەکانی -

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی خوا بیستی ﴿قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟﴾ ووتەی ئەو(جوولەکـ)انـەی کــەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ﴾ بــێ گومـــان خـــوا هـــەژارە ﴿وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ وئێمـــە دەوڵەمەندین(چونکە داوای قەرزمان لێ دەکات) ﴿سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟﴾ ئەوەی کەووتیان دەینووسین ﴿وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ﴾(وە دەینووسین) کوشتنی ئەوانە بۆ پێغەمبەرەکان ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەناڕەوا ﴿وَنَقُولُ ذُوقُوا۟﴾ وە(پێیان) دەڵێین بچەژن ﴿عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ سزای ئاگری سووتێنەر. ١٨١) ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو (سزا سەختە) ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ بەهۆی کردەوەی (خراپی خۆتانەوەیە) کەپێشتان خستووە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ هیچ جۆرە ستەمێک ناکات لەبەندەکان. ١٨٢) ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟﴾ ئەو(جوولەکانە)ی کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا ﴿عَهِدَ إِلَيْنَآ﴾ پەیمانی داوە بەئێمە ﴿أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ﴾ کە بڕوا نەهێنین بەهیچ نێردراوێک ﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ﴾ هەتا قوربانی و خێرێکمان بۆ نەهێنێت ﴿تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾ کە ئاگر (بێتە خوارەوەو) بیسووتێنێت ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ﴾ بڵێ بێ گومان هاتن بۆلاتان ﴿رُسُلٌ مِّن قَبْلِى﴾ چەند پێغەمبەرێک لەپێش منەوە ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ﴾ و بە ئەو(موعجیزەیە)ی کەووتتان ﴿فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ﴾ دەی بۆچی ئەو(پێغەمبەر)انەتان کوشت ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. ١٨٣) ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی ﴿فَقَدْ كُذِّبَ﴾ ئەوە بێگومان بڕوا نەکراوە ﴿رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ بەپێغەمبەرانی لەپێش تۆوە ﴿جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ هێناویانە بەڵگە ڕوونەکان ﴿وَٱلزُّبُرِ﴾ ونامەی ئاسمانی(نامەی پەندو تەمێ کەر) ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ ونامەی ڕوون کەرەوە. ١٨٤) ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ هەموو(خاوەن) گیانێک ﴿ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ مردن دەچێژێت ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ﴾ وە بەڕاستی بەتەواوی پێتان دەدرێت ﴿أُجُورَكُمْ﴾ پاداشتەکانتان ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی کۆتایی (هەستانەوەدا) ﴿فَمَن زُحْزِحَ﴾ ئینجا هەر کەس دوور خرێتەوە ﴿عَنِ ٱلنَّارِ﴾ لەئاگری دۆزەخ ﴿وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ﴾ وبخرێتە بەهەشتەوە ﴿فَقَدْ فَازَ﴾ ئەوە بەڕاستی ئەوکەسە سەرکەووتوە ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ﴾ ژیانی دنیاش هیچ شتێک نیە ﴿إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾ بێجگە لەبەهرەو ئارەزوویەکی فریودەر. ١٨٥) ﴿لَتُبْلَوُنَّ﴾ سوێندبێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە ﴿فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ لەسامان و داوایی و گیانی خۆتاندا ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ﴾ سوێندبێت بێگومان دەبیستن ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لەوانەی کەنامەیان پێ دراوە ﴿مِن قَبْلِكُمْ﴾ لەپێش ئێوە ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ وە لەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە ﴿أَذًى كَثِيرًا﴾ (ئازار و) قسەی ناخۆشی زۆر ﴿وَإِن تَصْبِرُوا۟﴾ جا ئەگەر ئێوە ئارام بگرن ﴿وَتَتَّقُوا۟﴾ و پارێزکاربن ﴿فَإِنَّ ذَٰلِكَ﴾ ئەوە بێگومان ئەوە ﴿مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ لەکارە بەهێز و گەورەکانە (لەو کارانەیە لێ بڕانی دەوێ). ١٨٦)

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾

- بانگ کرد و ئەوانیش هاتن هەتا گەیشتنە (حمراء الأسد)یان بیری ئەبی عوبەیدە جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ...﴾. وە ئەبو سوفیان ووتی بە پێغەمبەر(ﷺ): کاتی دیاری کراو (موعد)تان سالی داهاتوو، ڕووبەڕووی بەدرە کەهاوەڵانی ئێمەتان تێدا کوشت، ئینجا ئەوەی ترسنۆک بوو لەموسڵمانان گەڕایەوە و پاشگەز بوویەوە لەئامادە بوون، ئەوەشی کە ئازا و چاو نەترس بوو پێداویستی جەنگ و بازرگانیان لەگەڵ خۆیان هێنا و لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) هاتنە شوێنە بڕیاردراوەکە، کەسیان نەبینی لەدوژمنان، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ...﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٨٦) سوورەتی (آل عمران): ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ....﴾ -

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ﴾ (بێنەوە بیریان) کاتێك کەخوا وەری گرت ﴿مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ﴾ پەیمان لەوانەی ﴿أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ کەنامەیان پێ بەخشرا بوو ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ﴾ دەبێ ئەو نامەیە ڕوون بکەنەوە بۆ خەڵکی ﴿وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾ وە نەیشارنەوە ﴿فَنَبَذُوهُ﴾ بەڵام ئەو (پەیمانەیـ)ان فڕێ دایە ﴿وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ﴾ پشت خۆیانەوە ﴿وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ﴾ و کڕییان بەو نامەیە ﴿ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ نرخێکی کەم ﴿فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ ئای چەند خراپە ئەوەی کڕییان. ١٨٧) ﴿لَا تَحْسَبَنَّ﴾ وەگومان مەبە ﴿ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ﴾ ئەوانەی کەشادمانن ﴿بِمَآ أَتَوا۟﴾ بەوەی کەکردیان ﴿وَّيُحِبُّونَ﴾ و پێیان خۆشە ﴿أَن يُحْمَدُوا۟﴾ کەسوپاس بکرێن ﴿بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ بەشتێك کە نەیان کردووە ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّهُم﴾ ئەوە هەرگیز گومانیان پێ مەبە ﴿بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ﴾ بەڕزگار بوو لەسزا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ﴾ و بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ﴿أَلِيمٌ﴾ ئازاردەر. ١٨٨) ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ﴾ هەر بۆخوایە پادشایەتی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا ﴿قَدِيرٌ﴾ دەسەڵات دارە. ١٨٩) ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ﴾ بەڕاستی لەدرووست کردنی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَٱخْتِلَٰفِ﴾ و لەجیاوازی و گۆڕانی ﴿ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ شەو و ڕۆژدا ﴿لَءَايَٰتٍ﴾ چەندەها بەڵگە هەیە ﴿لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بۆ خاوەن ژیری یەکان. ١٩٠) ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ﴾ ئەوانەی کەیادی خوا دەکەن ﴿قِيَٰمًا وَقُعُودًا﴾ بەپێوەو بەدانیشتنەوە ﴿وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ﴾ بەڕاکشانەوە ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ﴾ وەبیر دەکەنەوە لەدروست کردنی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿رَبَّنَا﴾ (ئەڵێن) ئەی پەروەردگارمان ﴿مَا خَلَقْتَ هَٰذَا﴾ ئەمە(جیهان)ت دروست نەکردووە ﴿بَٰطِلًا﴾ بەبێ هودە ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ پاك و بێگەردی بۆ تۆ ﴿فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ دەسا تۆش بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. ١٩١) ﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ﴾ هەرکەس تۆ بیخەیتە ئاگری دۆزەخەوە ﴿فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ﴾ ئەوە بێگومان ڕیسوات کردووە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ وە هیچ پشتیوانێك نیە بۆ ستەمکاران. ١٩٢) ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە ﴿سَمِعْنَا مُنَادِيًا﴾ گوێمان لە بانگخوازێك بوو ﴿يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ﴾ بانگی ئەکرد بۆ بڕواهێنان ﴿أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ﴾ (دەی ووت) بڕوا بێنن بە پەروەردگارتان ﴿فَـَٔامَنَّا﴾ دەست بەجێ بڕوامان هێنا ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ دەی لە گوناهەکانمان خۆش ببە ﴿وَكَفِّرْ عَنَّا﴾ وبسڕەوە لێمان ﴿سَيِّـَٔاتِنَا﴾ خراپەکانمان ﴿وَتَوَفَّنَا﴾ و بمان مرێنە ﴿مَعَ ٱلْأَبْرَارِ﴾ لەگەڵ چاکاندا. ١٩٣) ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان پێمان ببەخشە (لەپاش مردن) ﴿مَا وَعَدتَّنَا﴾ ئەوەی بەڵێنت پێ داین ﴿عَلَىٰ رُسُلِكَ﴾ لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانت ﴿وَلَا تُخْزِنَا﴾ و ڕیسوامان مەکە ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا (هەستانەوە) ﴿إِنَّكَ﴾ بێگومان تۆ ﴿لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ﴾ بەڵێن ناشکێنیت. ١٩٤)

فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾




- ئیبن ئەبی حاتیم و ئیبن مونذر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە ئەم ئایەتە بە هۆی ئەوەوە هاتە خوارەوە کێشەیەک ڕووی دا لەنێوان ئەبو بەکر و فەنحاصی جولەکەدا لەسەر ئەوە ووتبوی ﴿إن الله فقير ونحن أغنياء﴾ ئەبو بەکریش لێی تووڕە بوو. هەروەها ئەبو داوود عەبدوڕەزاق دەگێڕنەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی مالیکەوە دەڵێت ئەم ئایەتە لەسەر کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتە خوارەوە کاتێک کە بە شیعر جنێوی دەدا و گاڵتەی دەکرد بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٨٨) سورەتی (ال عمران): ﴿لا تحسبن الذين يفرحون....﴾

بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە کە مەروان ووتی -

﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾ ئینجا پەروەردگاریان وەلامی (نزاکانی) دانەوە ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ﴾ (فەرمووی) بێگومان من زایە ناکەم ﴿عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم﴾ کردەوەی (هیچ) خاوەن کردەوەیەک لە ئێوە ﴿مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ لە نێر یان مێ ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ﴾ هەندێکتان لە هەندێکی ترتان بوون ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ جا ئەوانەی کە کۆچیان کرد ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ و دەرکران لە جێ و شوێنی خۆیان ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ و ئەشکەنجە و ئازار دران لەرێی مندا ﴿وَقَٰتَلُواْ﴾ و جەنگیان کرد ﴿وَقُتِلُواْ﴾ و کوژران ﴿لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ﴾ سوێند بەخوا دەسڕمەوە لێ یان ﴿سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ خراپەکانیان ﴿وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ﴾ وە بێ گومان دەیان خەمە بەهەشتانێکەوە ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بە ژێریاندا ﴿ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەمە پاداشت دانەوەیەکە لەلای خواوە ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ﴾ وە لای خوایە ﴿حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ﴾ جوانترین (چاکترین) پاداشت. ١٩٥) ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ﴾ لەخشتەت نەبات (فریوت نەدا) ﴿تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ هات و چۆی ئەوانەی بێ بڕوان (بەخۆشی و ئاسوودەیی یەوە) ﴿فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ لە وولاتدا. ١٩٦) ﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ﴾ (ئەو ئاسوودەییەی ئەوان) خۆشییەکی کەمە ﴿ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ﴾ پاشان جێ و شوێنیان دۆزەخە ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ ئای چ شوێنێکی بەدە. ١٩٧) ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ﴾ بەلام ئەوانەی ﴿ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ﴾ لە پەروەردگاریان دەترسن ﴿لَهُمۡ جَنَّٰتٞ﴾ بۆ یان هەیە بەهەشتانێک ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بە ژێریان دا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئامادەکراوە لەلایەن خواوە ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ وە ئەوەی کە لای خوایە ﴿خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ﴾ چاکترە بۆ پیاوچاکان. ١٩٨) ﴿وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ بێ گومان لەناو نامەدارەکاندا هەیە ﴿لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ﴾ کەسانێک کە بڕوا دەهێنن بەخوا ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ و ئەو نامەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ وە بەو نامەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ خۆیان ﴿خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾ مل کەچن بۆ خوا ﴿لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەلگەکانی خوا نافرۆشن ﴿ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ﴾ بەنرخێکی کەم ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەو نامە دارانە ﴿لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ﴾ بۆیان هەیە پاداشتی خۆیان ﴿عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ لە لای پەروەردگاریانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خوا ﴿سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ لێپرسینەوەی خێرایە. ١٩٩) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱصۡبِرُواْ﴾ خۆ گرین ﴿وَصَابِرُواْ﴾ و (لەخۆگری دوژمن) خۆگر ترین ﴿وَرَابِطُواْ﴾ و لەسەنگەردا ئێشک بگرن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ و لە خوا بترسن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕزگاربین. ٢٠٠)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ﴿٢﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴿٣﴾ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٥﴾ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴿٦﴾

- بە دەرگەوانەکەی: ڕافیع بڕۆ بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و پێی بڵێ: ئەگەر هەرکەس لەئێمە دڵی خۆش بێ بەوەی کردویەتی و حەزی کرد سوپاس بکرێت لەسەرکارێك کە نەیکردبێ و ئازار و سزا بدرێت ، ئەوە بێگومان هەموومان سزای توند دەدرێین بەگشتی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس وتی: ئێوە چیتان داوە لەمە؟ (واتە لەگەڵ ئێوەی نی یە) ئەم ئایەتە لەسەر خاوەن کتێبەکان هاتۆتە خوارەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری شتێکی لێ کردن ئەوانیش ڕاستی یەکەیان لێ شاردەوە و وەڵامێکی تریان دایەوە، دوایی هەستان و هاتنەدەرەوە وایان نیشانی پێغەمبەر (ﷺ) دا کەوەڵامی ڕاستیان داوەتەوە لەو پرسیارەی لێ ی کردوون وەخۆیان بەشایستەی سوپاس و ڕێزدانا لای پێغەمبەر (ﷺ)، و دڵخۆش بوون کەوا وەڵامەڕاستەکەیان -

## سورەتی ﴿ النساء ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿اتَّقُوا رَبَّكُمُ﴾ خۆتان بپارێزن لە( سزای ) پەروەردگارتان ﴿الَّذِي خَلَقَكُم﴾ ئەوەی کە دروستی کردوون ﴿مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ لەیەک کەسەوە (کە ئادەمە ) ﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ وە هەر لەئەویش هاوسەرەکەی دروست کردووە ﴿وَبَثَّ مِنْهُمَا﴾ و بڵاوی کردۆتەوە لەو دووانە ﴿رِجَالًا كَثِيرًا﴾ پیاوانی زۆر ﴿وَنِسَاءً﴾ هەروەها ئافرەتان ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي﴾ خۆتان بپارێزن لەو خوایەی کە ﴿تَسَاءَلُونَ بِهِ﴾ بەناوی ئەوەوە داوادەکەن لەیەکتر ﴿وَالْأَرْحَامَ﴾ وە (خۆتان بپارێزن لەبچڕاندنی ) خزمایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ﴿عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ چاودێرە بەسەرتانەوە. ١ )﴿وَآتُوا﴾ بیدەنەوە ﴿الْيَتَامَىٰ﴾ بە هەتیوان (دوای بالغ بونیان ) ﴿أَمْوَالَهُمْ﴾ ماڵ و سامانیان ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ﴾ وە پیس (لەماڵی خۆتان) مەگۆڕنەوە بەپاک (لەماڵی ئەوان )﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَهُمْ﴾ وە ماڵەکانیان مەخۆن ﴿إِلَىٰ أَمْوَالِكُمْ﴾ لەگەڵ ماڵەکانی خۆتان ﴿إِنَّهُ كَانَ﴾ بێگومان ئەو خواردنە ﴿حُوبًا كَبِيرًا﴾ گوناهێکی گەورەیە. ٢ )﴿وَإِنْ خِفْتُمْ﴾ وە ئەگەر ترسان ﴿أَلَّا تُقْسِطُوا﴾ دادپەروەر نەبن ﴿فِي الْيَتَامَىٰ﴾ لە (مارەیی ) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن ) ﴿فَانكِحُوا﴾ ئەوە مارەبکەن ﴿مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ﴾ لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان ﴿مَثْنَىٰ﴾ دوو دوو ﴿وَثُلَاثَ﴾ یا سیان سیان ﴿وَرُبَاعَ﴾ یا چوار چوار ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ﴾ جا ئەگەر ترسان ﴿أَلَّا تَعْدِلُوا﴾ دادگەر نەبن ﴿فَوَاحِدَةً﴾ ئەوە یەک ئافرەت( مارەبکەن لەئازادان ) ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ یان ئەو کەنیزەکانەی کەموڵکتانن ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ﴾ ئەوە نزیک ترە ﴿أَلَّا تَعُولُوا﴾ کەستەم نەکەن (یامەزار نەکەون). ٣ )﴿وَآتُوا النِّسَاءَ﴾ بیدەن بە ئافرەتان (نەک کەس و کاریان ) ﴿صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ مارەییەکانیان وەکو بەخشین (نەک وەک کرێ) ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا﴾ ئینجا ئەگەر بەدڵ پێ یان خۆش بوو بەخشینی شتێک لەو (مارەیی یە ) بەئێوە ﴿فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا﴾ ئەوە ئێوە بیخۆن بەخۆشی و حەڵاڵی (نۆشی گیانتان بێ). ٤ )﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ﴾ مەیدەنە گێل و کەم عەقڵەکان ﴿أَمْوَالَكُمُ﴾ ماڵەکانتان ﴿الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ لە حاڵەتێکدا خوا ئەو( ماڵانە )ی بۆ کردوون ﴿قِيَامًا﴾ بەهۆی راوەستانی ژیانتان ﴿وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا﴾ وە(بێ ئەقڵەکان) رۆزی و خۆراکیان بدەنێ لەوماڵە ﴿وَاكْسُوهُمْ﴾ و پۆشاکیان بۆ بکەن ﴿وَقُولُوا لَهُمْ﴾ و گفت و گۆیان لەگەڵ بکەن ﴿قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ بەگفت و گۆیەکی باش. ٥ )﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَىٰ﴾ هەتیوان تاقی بکەنەوە ﴿حَتَّىٰ إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ﴾ هەر کاتێک گەیشتنە (تەمەنی ) ژن هێنان و شوو کردن ﴿فَإِنْ آنَسْتُم﴾ ئینجا ئەگەر هەستان کرد ﴿مِّنْهُمْ رُشْدًا﴾ لەواندا ژیری (و پێ گەیشتن ) ﴿فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ ئەوە سامان و ماڵەکانیان پێ بدەنەوە ﴿وَلَا تَأْكُلُوهَا﴾ و ماڵەکانیان مەخۆن ﴿إِسْرَافًا﴾ بەزیادەڕەوی ﴿وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا﴾ و بەپەلە نەوەک گەورە ببن (و لێتان وەرگرنەوە ) ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا﴾ وە هەر کەس (لە سەرپەرشتیاری هەتیوان) دەوڵەمەند بوو ﴿فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾ باخۆی بگرێتەوە (لەخواردنی ماڵیان ) ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا﴾ وە هەر کەس لەوان هەژار بوو ﴿فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ با (لێ ی ) بخوات بەئەندازەی پێویست ﴿فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ ئینجا هەر کات ماڵی هەتیوەکانتان دایەوە پێیان ﴿فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ﴾ ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ بەسە خوا بۆ لێپرسینەوە (بەسەر ئاگاوە). ٦ )

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ
مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا
مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا
﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا
خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى
بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ
فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَآءً
فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا
ٱلنِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن
كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ
فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى
بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ
نَفْعًا فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

-ڵێ هـاردەوە و نـەیان دركانـد، هەروەها بوخاری و موسـلیم لەڕێگـەی ئـەبو سەعیدی خودری یەوە دەگێڕنەوە، کە چەند کەسێکی دوو ڕوو عادەتیان وابـوو کاتێـك پێغەمبـەری خـوا بڕۆشتایە بۆ غەزا خۆیان دەدزیـەوە و نەدەچـوون و دڵخـۆش دەبـوون بـەم نەچوونەیان لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) بـۆ جیهاد و غەزاکردن کاتێـك کەدەهاتەوە خێرا دەچـوونە لای و عوزری بەشداری نەکردنیان بۆ دەهێنایەوە و سوێندی درۆیـان بـۆ دەخـوارد وە حـەزیان دەکرد سوپاس بکرێن بەکارێك کەنەیان کردووە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا....﴾. هەروەها عەبدوڕەزاق لە تەفسیرەکەیدا لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێڕێتەوە کە ڕافیعی کوڕی خودیج و زەیدی کوڕی ثابت لای مەروان بوون، مەروان ووتی:-

﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ﴾ بۆ پیاوان هەیە بەشێک ﴿مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ﴾ لەئەو (میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایک و باوک ﴿وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ و خزمە نزیکەکان ﴿وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ﴾ وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەشێک﴿مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ﴾ لەئەو (میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایک و باوک ﴿وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ و خزمە نزیکەکان ﴿مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾ لە ئەوەی(بەجێ ی دێڵن) کەم بێت یان زۆر ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ بەبەشێکی بڕیار دراو. ٧ )﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ﴾ جا ئەگەر کاتی دابەش کردنی(کەلە پوورەکە ) ئامادەبوون ﴿أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ﴾ خزمە نزیکەکان (کەمیرات ناگرن لەمردوو) ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ﴾ و هەتیوو و هەژارە( بێگانە )کان ﴿فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ﴾ ئەو لەو کەلەپوورە بەشیان بدەن (ئەم بەش دانە سوننەتە نەک واجب) ﴿وَقُولُوا۟ لَهُمْ﴾ وە قسەیان لەگەڵ بکەن ﴿قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ بەقسەکردنێکی جوان و چاک. ٨ )﴿وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەی (سەرپەرشتیارن) با بترسن ﴿لَوْ تَرَكُوا۟﴾ ئەگەر بەجێ ی بهێڵن ﴿مِنْ خَلْفِهِمْ﴾ لەپاش خۆیانەوە( پاش مردن ) ﴿ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا﴾ مندالانی لاواز (بچوک) ﴿خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ﴾ دەترسن لێیان (بفەوتێن) ﴿فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ دەبا لەخوا بترسن ﴿وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴾ و قسەی ڕاست و ڕەوا بکەن. ٩ )﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی ﴿يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ کەماڵی هەتیوەکان دەخۆن ﴿ظُلْمًا﴾ بەستەم و ناڕەوا ﴿إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ بەڕاستی ئەوانە بەس لەسکی خۆیان ئاگر دەخۆن ﴿وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ وە لەمەو پاش دەچنە ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە. ١٠ ) ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا ئامۆژگاریتان دەکات ﴿فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ﴾ دەربارەی (کەلە پووری) ڕۆڵەکانتان ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ بۆ نێرێک هەیە(لەمیرات) بەوێنەی بەشی دوو مێ ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً﴾ خۆ ئەگەر( منداڵەکانتان) تەنها ئافرەت بوون﴿فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ﴾ (دووان و) زیاد لەدوان ﴿فَلَهُنَّ﴾ ئەوا بۆیان هەیە ﴿ثُلُثَا﴾ دووبەش لە سێ بەشی ﴿مَا تَرَكَ﴾ ئەوەی (مردوەکە) بەجێ ی هێشتووە﴿وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً﴾ بەڵام ئەگەر یەک ئافرەت بوو﴿فَلَهَا ٱلنِّصْفُ﴾ ئەوە نیوەی (میراتەکەی) بۆ هەیە ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا﴾ وە بۆ هەرکام لەدایک و باوکی مردووەکە هەیە ﴿ٱلسُّدُسُ﴾ شەش یەک ﴿مِمَّا تَرَكَ﴾ لەوەی کە بەجێ ی هێشتووە ﴿إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ﴾ بەڵام ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو ﴿وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ﴾ و دایک و باوکی میرات گری بوون ﴿فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾ ئەوە سێ یەک بۆ دایکەکەیەتی ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ﴾ بەڵام ئەگەر (مردووەکە ) چەند برایەکی هەبوو ﴿فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ﴾ ئەوا شەش یەک بۆ دایکەکەیەتی ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ﴾ لەپاش (دەرکردنی) **وەصیەتێک** ﴿يُوصِى بِهَآ﴾ وەسێتی پێ کرا بێ (لەلایەن **مردووەکەوە**) ﴿أَوْ دَيْنٍ﴾ یان دانەوەی قەرزێک (کەلەسەری بێت) ﴿ءَابَآؤُكُمْ﴾ **باوکەکانتان** ﴿وَأَبْنَآؤُكُمْ﴾ و کوڕەکانتان ﴿لَا تَدْرُونَ﴾ نازانن ﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا﴾ کامەیان بەسوودترن بۆتان﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ (ئەو دابەش کردنە) لەلایەن خواوە پێویست کراوە﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ﴿عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ زانای دانایە. ١١ )

﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ (١٢) تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٣) وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ (١٤)﴾

- ئەی ڕافیع لەسەر چ شتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا ....﴾؟ ڕافیع ووتی: لەسەر كۆمەڵێك خەڵكی دووڕوو هاتە خوارەوە كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرپچوایە بۆ غەزا بڕوبیانوویان دەهێنایەوە و دەیان ووت: تەنها ئیش و كاری پێویست ئێمەی دواخست لەنێوە، بەخوا حەزمان دەكرد لەگەڵتان بوونایە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەر ناردە خوارەوە مەروان ئەوەی تەسەلماند و ووتی: (وانی یە ڕافیعیش پێی ناخۆش بوو و ڕووی كردە زەید و ووتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئایا هیچ دەزانی و گوێت لێ بووە لەوەی كەدەیڵێم؟ ووتی بەڵێ ڕاست دەكەی) ئیبن حەجەر دەڵێت: دەتوانین ئەم فەرموودە و فەرموودەكەی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس كۆبكەینەوە و بڵێین:-

﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ﴾ بۆ ئێوە هەیە نیوەی ﴿مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ﴾ ئەو (میراتەی) کەژنەکانتان بەجێ یان هێشتووە ﴿إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞ﴾ ئەگەر ئەو ژنانە منداڵیان نەبوو ﴿فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ﴾ جا ئەگەر منداڵیان هەبوو ﴿فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ﴾ بۆ ئێوە هەیە چوار یەك ﴿مِمَّا تَرَكۡنَ﴾ لەوەی (ژنەکانتان) بەجێیان هێشتووە ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ﴾ لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێك ﴿يُوصِينَ بِهَآ﴾ کەکردبێتیان ﴿أَوۡ دَيۡنٖ﴾ یان قەرزێك (کەلەسەریان بێت) ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ﴾ بۆ (ژنەکانتان) هەیە چوار یەك ﴿مِمَّا تَرَكۡتُمۡ﴾ لەوەی بەجێتان هێشتووە ﴿إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞ﴾ ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبوو ﴿فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ﴾ جا ئەگەر منداڵتان هەبوو ﴿فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ﴾ ئەوەبۆ ئەوان هەیە هەشت یەك ﴿مِمَّا تَرَكۡتُمۚ﴾ لەوەی بەجێتان هێشتووە ﴿مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ﴾ لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێك ﴿تُوصُونَ بِهَآ﴾ کەکردبێتتان ﴿أَوۡ دَيۡنٖ﴾ یان دانەوەی قەرزێك (کەلەسەرتان بێت) ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ﴾ وە ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك کەمیراتی لێ ئەگیرا (مردبوو) نەباوانی هەبوو نەمنداڵ ﴿وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ﴾ وە تەنها برایەك یان خوشکێکی (لەدایکەوە) هەبوو ﴿فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ﴾ ئەوە بۆ هەر یەك ﴿مِّنۡهُمَا﴾ لەو دووانە هەیە ﴿ٱلسُّدُسُۚ﴾ شەش یەك ﴿فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ﴾ بەڵام ئەگەر ئەوان زیاتر بوون ﴿مِن ذَٰلِكَ﴾ لەبرایەك یان خوشکێك(ی دایکی) ﴿فَهُمۡ شُرَكَآءُ﴾ ئەو کاتە ئەوانە هەموویان هاوبەشن ﴿فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ لەسێ یەك(ی میراتەکە)دا ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ﴾ لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێك ﴿يُوصَىٰ بِهَآ﴾ کەکرابێت ﴿أَوۡ دَيۡنٍ﴾ یان قەرزێك ﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ﴾ کە(وەسێتەکە یاقەرزەکە بۆ میراتگران) بێزیان بێ ﴿وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ ئەمە بڕیارە لەلایەن خواوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾ خواش زانای لەسەرخۆیە. ١٢) ﴿تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ﴾ ئەو (یاسایانە) سنوورەکانی خودان ﴿وَمَن يُطِعِ﴾ هەر کەسێك گوێ ڕایەڵی ﴿ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ﴿يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ﴾ (خوا) دەیخاتە ناو بەهەشتانێك ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کەڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ وەئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە. ١٣) ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ **هەر کەسێکیش سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات** ﴿وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ﴾ و سنورەکانی (خوا) **ببەزێنێت** ﴿يُدۡخِلۡهُ نَارًا﴾ دەیخاتە ئاگرێکەوە ﴿خَٰلِدٗا فِيهَا﴾ هەمیشە **دەمێنێتەوە تیایدا** ﴿وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ وەسزایەکی ڕیسواکەری بۆ هەیە. ١٤)

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾

**- دەكرێت لەسەر هەردوو كۆمەڵەكە ئەم ئایەتە هاتبێتە خوارەوە.**

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٩٥) سورەتی (ال عمران): ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ....﴾ تورمزی و حاكیم لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕنەوە كە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نابیستم خوای گەورە باسی ئافرەتانی كردبێت بەهیچ شێوەیەك لەكۆچ كردن (هیجرەت) دا، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ...﴾ هەتا كۆتایی ئایەتەكە.**

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٩٩) سورەتی (ال عمران): ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ...﴾ نەسائی و حاكیم لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، دەڵێت: كاتێك هەواڵی مردنی نەجاشی هات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی نوێژی لەسەر بكەن، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژ بكەین لەسەر -**

﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ﴾ ئەوانەی کەکاری زۆر پیس و ناشیرین (زینا) دەکەن ﴿مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾ لەئافرەتان(ی بڕوادار)تان ﴿فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ﴾ ئەوە چوار شایەت لەخۆتان لەسەریان بگرن ﴿فَإِن شَهِدُواْ﴾ ئینجا ئەگەر شایەتییاندا ﴿فَأَمۡسِكُوهُنَّ﴾ ئەوە ئەو (ژنە زیناکار)انە بەند بکەن ﴿فِي ٱلۡبُيُوتِ﴾ لەماڵەکانتاندا ﴿حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ﴾ هەتا (فریشتەی) مەرگ گیانیان دەکێشێت ﴿أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا﴾ یان خوا ڕێگایەک(ی ڕزگار بوون) یان بۆ دائەنێ. ١٥) ﴿وَٱلَّذَانِ﴾ وەئەو دووانەی (کوڕو کچەی) ﴿يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ﴾ ئەو کارە پیسە(زینا) دەکەن لەئێوە ﴿فَـَٔاذُوهُمَاۖ﴾ ئەوە ئازاریان بدەن ﴿فَإِن تَابَا﴾ جا ئەگەر گەڕانەوەو تەوبەیان لێکرد ﴿وَأَصۡلَحَا﴾ وە چاک بوون ﴿فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ﴾ ئەوا وازیان لێ بێنن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ﴾ چونکە بەڕاستی خوا هەمیشە ﴿تَوَّابٗا رَّحِيمًا﴾ لێبوردەی میهرەبانە. ١٦) ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ﴾ بێگومان وەرگرتنی تەوبە ﴿عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ﴾ لای خوا تەنها بۆ ئەوانەیە کە گوناە دەکەن بەنەفامی ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ﴾ پاشان پەشیمان دەبنەوە ﴿مِن قَرِيبٖ﴾ بەزوویی (پێش مردن) ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئا ئەوانە ﴿يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ﴾ خوا گەڕانەوەیان لێ وەردەگرێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ﴾ خواش هەمیشە ﴿عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ زانای دانایە. ١٧) ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ﴾ پەشیمانی (وەرگرتن) نی یە ﴿لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ بۆ ئەوانەی تاوانی زۆر دەکەن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ هەتا کاتی سەرەمەرگی یەکێکیان دێ ﴿قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾ دەڵێت: بەڕاستی من ئیستا تەوبەم کرد ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ﴾ وە بۆ ئەوانەش نی یە ﴿يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ﴾ کەدەمرن بەبێ بڕوایی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ﴾ ئەوانەی (باس کران) ئامادەمان کردوە بۆیان ﴿عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ سزایەکی ئازاردەر. ١٨) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هیناوە ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمۡ﴾ حەلاڵ نی یە بۆتان ﴿أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ﴾ کەئافرەتان بەزۆر (بەناچاری) بەمیراتی بەرن (بۆ خۆتان) ﴿وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾ وەبەرگری شووکردنیان لێ مەکەن ﴿لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ﴾ بۆ ئەوەی هەندێ لەو (مارەیی یەی) کەپێتان داون بیبەن (بۆ خۆتان) ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ﴾ مەگەر کاتێ کەکردەوەیەکی زۆر ناشیرین (زینا) بەئاشکرا بکەن ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ وەڕەفتاریان لەگەڵ بکەن بەچاکی (و ژیانیان لەگەڵ ببەنە سەر) ﴿فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ﴾ جا ئەگەر حەزتان لێیان نەبوو (طەلاقیان مەدەن) ﴿فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا﴾ چونکە لەوانەیە ئێوە حەزنەکەن لەشتێک ﴿وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ﴾ و خوا لەودا داینابێ ﴿خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ چاکەیەکی زۆر. ١٩)

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ
إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ
بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ
بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا
غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ
ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا
وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ
وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ
ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ
وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ
ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ
فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ
مِنْ أَصْلَـٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ
إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

-بەندەیەکی حەبەشی؟پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ....﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣) سورەتی (النساء):** ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى...﴾ بوخاری و موسلیم لەعائیشەوە (خوا لێ ی ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە فەرمووی: پیاوێك کچێکی بێ باوك (خزمی بوو) لە ماڵی ئەودا بوو کچەکەی مارە کرد، کچەکە چەند دارخورمایەکی هەبوو پیاوەکە لەبەر ئەو دارخورمایانە مارەی کردبوو بەڵام کچەکە هیچ مافێکی هاوسەرێتی نەبوو لەگەڵیدا بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وإن خفتم ألا تقسطوا ...﴾.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦) سورەتی (النساء):** ﴿وَمَن كَانَ فَقِيراً فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ ....﴾-

﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ﴾ ئەگەر ویستتان ﴿ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ﴾ گۆرینی ژنێك ﴿مَّكَانَ زَوْجٍ﴾ لەشوێن ژنێك (کەحەزی لێ ناکەن)﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ﴾ و دابێتتان بەیەکێکیان ﴿قِنطَارًا﴾ ماڵێکی زۆر (بەمارەیی) ﴿فَلَا تَأْخُذُوا۟﴾ ئەوە مەی سەنننەوە ﴿مِنْهُ شَيْـًٔا﴾ لێی هیچ شتێك (لەوماڵە زۆرە)﴿أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا﴾ ئایا ئەو(مارەیی یە)یان لێ ئەسەنننەوە بەبوختان کردن﴿وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ و تاوانێکی ئاشکرا(بەرامبەری ئافرەتەکە). ٢٠)﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ﴾ جا چۆنی وەری دەگرنەوە؟ ﴿وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ لەکاتێکدا چوونەتەلای یەکتری (تێکەڵاوی ژن و مێردایەتیتان لەگەڵ یەك کردووە) ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم﴾ وەئەو ئافرەتانە وەریان گرتووە لێتان ﴿مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا﴾ پەیمانێکی پتەو بەهێز (کەوا بەستنی نیکاحە). ٢١)﴿وَلَا تَنكِحُوا۟﴾ (پیاوەکان) مارە مەکەن ﴿مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ ئەو ئافرەتانەی کەباوکەکانتان مارەیان کردوون ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ مەگەر ئەوەی پێش لەم(حەرام کردنە) کرابێت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ﴾ بەڕاستی ئەو مارەکردنە ﴿فَـٰحِشَةً﴾ کردەوەیەکی زۆر پیس و چەپەڵە ﴿وَمَقْتًا﴾ زۆر بێزراو ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ وڕێبازێکی زۆر خراپ و بەدە (کەگیراوەتە بەر). ٢٢)﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ﴾ قەدەغە کراوە لەسەرتان ﴿أُمَّهَـٰتُكُمْ﴾(مارەکردنی) دایکانتان﴿وَبَنَاتُكُمْ﴾ و کچەکانتان ﴿وَأَخَوَٰتُكُمْ﴾ و خوشکەکانتان ﴿وَعَمَّـٰتُكُمْ﴾ و پورەکانتان (کەخوشکی باوکتانن)﴿وَخَـٰلَـٰتُكُمْ﴾ و پورەکانتان (کەخوشکی دایکتانن)﴿وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ﴾ و کچانی برا ﴿وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ﴾ و کچانی خوشك ﴿وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ﴾ ئەو دایکانەتان کەشیریان پێ داوون ﴿وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ﴾ وخوشکەکانتان لەشیرەوە ﴿وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ﴾ و دایکی ژنەکانتان (خەسوو) ﴿وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ﴾ و کچانی ژنانتان کە لەمێردی تریان بن ﴿ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم﴾ ئەوانەی کەلە ماڵی ئێوەدا دەژین ﴿مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى﴾ لەو ژنانەتانن ﴿دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ کەچوونەتە لایان ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ جا ئەگەر نەچوویونە لایان (دایکی کچەکان) ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە (لەمارە کردنی کچەکانیاندا) ﴿وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ﴾ وە (حەرامە بۆتان) هاوسەری کوڕەکانتان(بووك) ﴿ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَـٰبِكُمْ﴾ ئەوانەی کەلە پشتی خۆتانن ﴿وَأَن تَجْمَعُوا۟﴾ وە (قەدەغەکراوە لەسەرتان) کۆکردنەوەتان ﴿بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ﴾ لە نێوان دووخوشك (لەمارەکردندا) ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ مەگەر ئەوەی پێش ئەم (حوکمە لەنەفامیدا) کرابێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ﴾ بێگومان خوا هەمیشە ﴿غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ لێبوردەی میهرەبانە. ٢٣)

۞ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلًا أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُمْ بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَانْكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ وَأَنْ تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٢٥﴾ يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾

- **بوخاری** گێڕاویەتیەوە لەعائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی ئەم ئایەتە ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ دەربارەی ماڵ و سامانی هەتیو هاتووەتە خوارەوە جانەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات ئەگەر هەژار بوو دروستە لەماڵی هەتیوەکە بخوات لەجیاتی سەرپەرشتی کردنی هەتیوەکە بە پێ ی عادەت و بێ زیادەڕەوی.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١١) سورەتی (النساء): ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ....﴾** هەر شەش پێشەواکەی فەرمووده دەگێڕنەوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو بەکر بەپێ هاتن بەناو بەنی سەلەمەدا بۆ لام لەکاتێکدا نەخۆش بووم، پێغەمبەر (ﷺ) بینیمی کەبێ هۆشم ، جا داوای ئاوی کرد و دەست نوێژی پێ گرد، پاشان پرژاندی بەسەرم دا -

﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ﴾ (هەروەها حەرام کراوەلێتان) ئەوانەی کەمێردیان هەیە ﴿مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ لە ئافرەتان ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ﴾ جگە لەوانەی کە بوونەتە مولکتان (کەنیزەك) ﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ (ئەو حوکمانە باسکران)پێویست کراوو نوسراوی خوایە لەسەرتان ﴿وَأُحِلَّ لَكُم﴾ وە بۆتان حەلاڵ کراوە ﴿مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ﴾ بێجگە لەوانە (کە باسکران هەمووی حەلاڵە بۆتان تا چوار) ﴿أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم﴾ کە بەماڵەکانتان خوازبێنی (ئافرەتان) بکەن ﴿مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ﴾ (بەمەرجێ ) کە داوێن پاك بن و داوێن پیس نەبن ﴿فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ﴾ جا ئەوەی کە لەزەتتان لێ وەرگرت لەو ئافرەتانە(ی حەلاڵن) ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ﴾ ئەوا مارەیی یەکەیان پێ بدەن کەفەرزکراوە لەسەرتان ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ تاوانتان لەسەر نی یە ﴿فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ﴾ لەوەی کە لەسەری پێك هاتن (لەگەڵ ژنەکانتان دا لەکەمکردنەوەی مارەیی)﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ﴾ لە پاش دیاریکردنی مارەیی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ بەڕاستی خودا هەمیشە زانای کاردروستە. ٢٤)﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا﴾ وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هەژاری ﴿أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ کە ئافرەتانی ئازادی ئیماندار مارەبکات ﴿فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم﴾ئەوە با لەوانە مارە بکات کەبوونەتە مولکتان ﴿مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ﴾ لە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ﴾ وە خوا زاناترە بەباوەڕەکەتان ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ﴾ هەندێکتان لەهەندێکی ترتانن (هەمووتان نەوەی ئادەمن) ﴿فَٱنكِحُوهُنَّ﴾ لەبەرئەوە مارەیان بکەن ﴿بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ﴾ بەڕەزامەندی خاوەنەکانیان ﴿وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ و مارەیی یەکەیان پێ بدەن ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ بەشێوازێکی چاك ﴿مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ﴾ لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانە پاك داوێن بن داوێن پیس (و زیناکاری بەئاشکرا) نەبن ﴿وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ﴾ و دۆستیان نەبێ (بەنهێنی بۆ زینا کردن) ﴿فَإِذَآ أُحۡصِنَّ﴾ جا ئەگەر ئەو (کەنیزەکانە) شوویان کرد ﴿فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ﴾ پاشان خراپەیەکی ئاشکرایان کرد (زینا) ﴿فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ﴾ ئەوە نیوەی سزای ئافرەتە ئازادەکانیان لەسەرە(لێیان درێ کە ٥٠ جەڵدە) ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ﴾ ئەو (مارەکردنی کەنیزەکە) بۆ کەسێکە لەئێوە لە تاوان کردن (زینا) بترسێ ﴿وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ﴾ بەڵام ئەگەر ئارام بگرن (و کەنیزەك مارە نەکەن) چاکترە بۆتان ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە. ٢٥)﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ خوا دەیەوێت ﴿لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ﴾ بۆتان ڕوون بکاتەوە ﴿وَيَهۡدِيَكُمۡ﴾ وە ڕێنموونیتان بکات ﴿سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ بۆ ڕێ و شوێنی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون (لەخواناسان) ﴿وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ﴾ و لێتان خۆش ببێت ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ وە خوا زانای کاردروستە. ٢٦)

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ
عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن
تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا
وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ
يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾
وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ
نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ
وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ
وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ
نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾

**- و هۆشم هاتەوە** سەر خۆم و ووتم: دەربارەی **ماڵ و** سامانەکەم چ فەرمانێکم پێ دەکەیت، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ ......﴾. هەروەها ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داوود و تیرمزی و حاکیم لە جابیرەوە دەگێڕنەوە، دەڵێت خێزانی سەعدی کوڕی ڕەبیع هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانە دووکچەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیعن، کەباوکیان لەگەڵ تۆ لەشەڕی ئوحود دا شەهید بوو، مامەکەیان هەموو ماڵەکەیانی بردووە، ئەوانیش مارە ناکرێن ئەگەر ماڵیان نەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە دەربارەی ئەمە بڕیار دەدات ... ئیتر ئایەتی (میرات) دابەزی و پێغەمبەر (ﷺ) ناردنی بەدوای مامەکەیان داو هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دوو لەسەر سێ ی ماڵەکەی سەعد بدەبە -

﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ﴾ وەخوا دەیەوێت ﴿أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ﴾ کەلێتان ببورێت ﴿وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ﴾ بەڵام ئەیانەوێ ئەوانەش ﴿يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾ کەشوێن ئارەزووات کەوتوون ﴿أَن تَمِيلُواْ﴾ کە لاتان بدەن ﴿مَيۡلًا عَظِيمٗا﴾ بەلادانێکی گەورە. ٢٧)﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ خوا دەیەوێت ﴿أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡ﴾ کەئەرکتان لەسەر سووك بکات ﴿وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا﴾ چونکەئادەمی بە لاوازی دروست کراوە. ٢٨)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم﴾ سامانی یەکتری مەخۆن ﴿بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ لەنێوانتاندا بەناڕەوا ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً﴾ مەگەر بازرگانی یەك بێت ﴿عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡ﴾ بەڕەزامەندی لەنێوان خۆتان دا ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ وە خۆتان مەکوژن(یان خۆتان مەفەوتێنن بەتاوان)﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە بەبەزەیی یە پێتان. ٢٩)﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ﴾ وە هەرکەسێك ئەوە بکات(واتە یەکێك بکوژێت)﴿عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا﴾ بەدەست درێژی و ستەم ﴿فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗا﴾ ئەو لەمەودوا دەیخەینە ناو ئاگرەوە﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾وە ئەوەش هەمیشە بۆ خوا ئاسانە. ٣٠)﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ﴾ ئەگەر دوور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی کەلێتان قەدەغەکراوە﴿نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ ئەوە تاوانە بچووکەکانتان بۆ دەپۆشین ﴿وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا﴾ وە دەتانخەینە شوێنێکی چاك و ڕێزدارەوە. ٣١) ﴿وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ﴾ وە ئاوات مەخوازن﴿مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾بۆ ئەو پلەیەی کە خوا باوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکی ترتاندا ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ﴾ بۆ پیاوان بەش هەیە ﴿مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْ﴾لەوەی بەدەستی ئەهێنن ﴿وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ﴾ وە بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە ﴿مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَ﴾ لەوەی بەدەستی ئەهێنن ﴿وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ﴾ وە داوا لەخوا بکەن ﴿مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾ لەبەهرەو بەخششی خۆی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە بەهەموو شتێك زانایە. ٣٢)﴿وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا﴾ وە دامان ناوە بۆ هەموو (مردوویەك یان میراتێك) ﴿مَوَٰلِيَ﴾ چەند میرات گرێك(کە بەشی ئەگرن) ﴿مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ﴾ لەوەی کە دایك و باوك و خزمانیان بەجێیان هێشتووە﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ وە ئەوانەش کەپەیمانتان لەگەڵ گرێ داوە (کە میرات لەیەکتری بەرن) ﴿فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ﴾ ئەوە بەشی خۆیانیان بدەنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارو چاودێرە. ٣٣)

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾

- **نووکـــــچەکەی** سەعد یەك لەسـەر هەشـــتی بــــدە بـــــــەدایکیان و ئـــەوەش مایـــەوە بۆ تۆ).

**هـــۆی هاتنـــە خوارەوەی ئایـەتی (١٩) ســـــورەتی (النســاء)**: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً...﴾ بوخـــاری و ئــــەبو داوودو نەســــائی لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباســــــــەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: ئەگـــەر پیاوێـــك بمردایـــە خزمـــانی مردوەکە لەپێشتر بــــوون بـــــە خێزانەکەی، ئەگەر هەندێکیان ویستیان لەسەر بوایە مارەیان دەکرد لەیەکێك لەخۆیان، خۆ ئەگەر بیـان ویستایە بەشوویان دەدا چونکە ئەوان لـــە پێشتر بوون بە ژنەکـــە لە کەس و کاری ژنەکە بـــەم هۆیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ ....﴾.هەروەها ئیبن جەریر و ئیبن ئەبی حاتیم لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیفەوە دەگێڕنەوە،دەڵێت: کاتێك ئەبوو قەیسی کوڕی ئەسلەت-

﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ پیاوان سەرپەرشتیارن(کاربەدەستن) بەسەر ئافرەتانەوە ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا باوی هەندێکیانی داوە ﴿عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ بەسەر هەندێکیانـدا ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ هـەروەها بـەهۆی ئـەوەی کـە (پیـاوان) لەسامانەکانیان خەرج دەکەن ﴿فَٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾ جا ئافرەتە چاکەکان (ئەوانەن)﴿ قَٰنِتَٰتٌ﴾ گوێڕایەڵنی بەردەوام (بۆ خـواو پاشـان مێردەکانیـان)﴿حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ﴾ پـارێزەرانی (داوێنی خۆیان وسامانی مێردەکانیانن) کە مێردەکانیان لەماڵەوە نـەبن ﴿بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ﴾ بەهۆی ئەوەی خوا فەرمانی پاراستنی داوە﴿وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ﴾ وەئەو ئافرەتانـەش کەئێوە دەترسن ﴿نُشُوزَهُنَّ﴾ سەرپێچیتان بکـەن ﴿فَعِظُوهُنَّ﴾ ئـەوە ئامۆژگاریـان بکـەن ﴿وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ﴾ و جێگـەیان لـێ جیابکەنـەوە (و لەگەڵیان مەخـەون) ﴿وَٱضْرِبُوهُنَّ﴾ و لێیان بدەن (لێدانێك کەلەشی عەیب دار نـەکات) ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ﴾ جا ئەگەر گوێڕایـەڵیان کـردن ﴿فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ ئـەوە ئیتر هیچ رێگەیەك لـەژیان مەگرنەبەر ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ بەڕاستی خـوا هەمیـشە بـەرز وبڵنـدی گەورەیـە. ٣٤)﴿وَإِنْ خِفْتُمْ﴾ وە ئەگەر ترسان ﴿شِقَاقَ بَيْنِهِمَا﴾ لە تێکچوونی نێوانیان (ژن و مێرد)﴿ فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ﴾ ئەوە ناوبژیوانێك بنێرن لەخزمی پیاوەکە ﴿وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ﴾ و ناو بژیوانێك لە خزمی ئافرەتەکە ﴿إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا﴾ ئەگەر (دوو ناوبژیوانەکە) ئاشتییان بویێ ﴿يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ﴾ خوا نێوان ژن و مێردەکە چاك دەکاتـەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زانای ئاگادارە. ٣٥)﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ بەس خـوا بپەرستن، ﴿وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ و هیچ شتێك مەکـەن بەهاوبەشـی ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ هـەروەها لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن ﴿وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ وە لەگەڵ خزم و نزیکان ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ و هەتیوان ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ و هـەژاران ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ وهاوسـێی خـزم ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾ و هاوسـێی بێگانە یـا دوور ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ﴾ و هـاوڕێی هەمیـشەیی یـا هـاوڕێی سـەفەر ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ و ڕێبوار ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ و ئەوانەی بوون بەموڵکتان (چاك بن لەگەڵیاندا) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ناوێت ﴿مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ ئەو کەسەی کە خۆ بەزل زان و شانازی کەر بێ. ٣٦)﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ ئەوانەی کە چرووکن ﴿وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ﴾ فـەرمانیش دەکـەن بەخـەڵکی بەچـرووکی ﴿وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ وە دەیشارنەوە ئەوەی خوا پێ ی بەخشیوون ﴿مِن فَضْلِهِۦ﴾ لە بەخششی خۆی ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ وە ئامادەمان کردوە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی ریسواکەر. ٣٧)

وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ
بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ
قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟
مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ
وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ
ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى
سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ
أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً
فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ
ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾

- مرد کوڕەکەی ویستی ژنەکەی مارەبکاتەوە کەلەسەردەمی نەفامی دا باوبووە و بڕیان هەبوو کاری وابکەن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً ...﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٢) سوورەتی (النساء): ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم...﴾ ئیبن جەریر لە عەبدوللای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت خەڵکی سەردەمی نەفامی لایان حەرام بوو خوازبێنی هەموو ئەو ئافرەتانەی لە ئیسلامدا حەرام کراوە جگەلەخوا ژنێنی باوەژنو دوو خوشک بۆ پیاوێک (هەردووکیان پێکەوە خێزانی بن) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ..... وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ﴾.

﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ وە ئەوانەی ماڵەکانیان دەبەخشن ﴿رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ لەبەر ڕوپامایی خەڵکی ﴿وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ باوەڕیش نامێنن نەبەخوا ﴿وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ و نەبەڕۆژی دوایی ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا﴾ وە هەرکەس شەیتان هاوڕێی بێت ﴿فَسَآءَ قَرِينًا﴾ ئەوە (شەیتان)هاوڕێیەکی زۆر خراپە. ٣٨)﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ﴾وە ئەوانە چ زیانێکیان دەکەوتە سەر؟﴿ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ﴾ ئەگەر باوەڕیان بهێنایە بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ وە بەڕۆژی دوایی﴿وَأَنفَقُوا۟﴾ وەبیان بەخشی بایە ﴿مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ لەوەی کەخوا پێی بەخشیبوون﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە زانایە پێیان. ٣٩)﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ بەڕاستی خوا بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەم ناكات ﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةً﴾ وە ئەگەر چاکەیەك هەبێت ﴿يُضَٰعِفْهَا﴾(خودا) چەندانەی دەکاتەوە ﴿وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ﴾ و دەیبەخشێت لەلایەن خۆیەوە ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی گەورە. ٤٠)﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا﴾ ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان﴿مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ﴾ لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە) ﴿وَجِئْنَا بِكَ﴾ تۆیشمان هێنا(ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ بەشایەت بەسەر ئائەوانەوە. ٤١) ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ لەو ڕۆژەدا﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ﴾ ئاوات دەخوازن ئەوانەی کافر بوون و سەرپێچی پێغەمبەریان کرد﴿لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ﴾ کە زەویان بەسەردا تەخت بکرێ (واتە بخرێنە ژێر زەوی و نەهێنرێنە دەرەوە) ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ وە(لەو ڕۆژەدا) هیچ قسەو باسێك لەخوا ناشارنەوە. ٤٢)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سەرخۆش بن ﴿حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ﴾ هەتا بزانن چی دەڵێن ﴿وَلَا جُنُبًا﴾ وەهەروەها نزیکی (جێگای) نوێژ مەبنەوە لەکاتێکدا لەشتان بێ نوێژە (لەشتان پیسە) ﴿إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ﴾ مەگەر تێپەڕبن (بە مزگەوتدا) ﴿حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟﴾ هەتا خۆتان دەشۆن ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یان لەسەفەردا بوون﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم﴾ یان کەسێك لەئێوە هاتەوە﴿مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾ لەشوێنی دەست بەئاو گەیاندنەوە ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ یان جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا (یاله یەك کەوتن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا) ﴿فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً﴾ ئینجا ئاوتان دەست نەکەوت ﴿فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئەوە بەخۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن ﴿فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ جا بەو تۆزو خۆڵە ڕووخسار و دەستەکانتان تەیەموم بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە سڕەرەوەی تاوانە و لێبووردەیە. ٤٣) ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە ﴿أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ کە بەشێك لەنامەکەیان پێ دراوە (کە تەوراتە) ﴿يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ﴾ گومڕایی هەڵدەبژێرن (دەکڕن) ﴿وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ﴾ وە دەیانەوێت ئێوەش لەڕێبازی ڕاست گومڕابن. ٤٤)

وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٤) سورەتی (النساء): ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودری یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت لەکاتی ڕوودانی جەنگی ئەوطاس دا چەند ژنێک گیران و بەشکران و کەوتنە بەشی جەنگاوەرەکانەوە، ئەو ژنانە مێردی کافریان هەبوو وەپێمان ناخۆش بوو بڕۆینە لایان لەبەر ئەوە کە مێردیان هەیە بۆیە پرسیارمان لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد پاش پرسیارەکەمان ئایەتی ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ دابەزی دەڵێت ﴿إلا ماافاء الله عليكم﴾ واتە ژنە مێرددارەکانتان لێ حەرامە مەگەر ئەوانەی بکەونە دەستتان لەجەنگی دژ بەکافران دا ئەوسا لەگەڵیان دروست بوون. طەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە لەغەزوەی حونەین دا هاتەخوارەوە کاتێک خوای گەورە سەرکەوتنی لە -

﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَائِكُمْ﴾ وەتەنها خوا چاك ئاگاداره بەدوژمنەكانتان﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَلِيًّا﴾ وه تەنها خوا بەسە دۆست بێت ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ نَصِيرًا﴾ تەنها خواش بەسە یاریدەدەر بێت. ٤٥)﴿مِنَ الَّذِينَ هَادُوا﴾ هەندێك لە جوولەكەكان﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ فەرموودەكانی خوا دەگۆڕن لەشوێن و مەبەستی خۆی﴿وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ وه دەڵێن: بیستمان و سەرپێچیمان كرد!! ﴿وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾ گوێ بگره قەت گوێت لێ نەبێ!! ﴿وَرَاعِنَا﴾ وه دەڵێن (راعنا) چاك گوێمان بۆ بگره (بەڵام بەزمانی جوولەكه واته تۆ خراپترینمانی ئەوان ئەم مانایان مەبەست بوو) ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ﴾ دەمیان لاردەكردەوه (بۆ ئەوەی مەبەسته خراپەكه بگەیەنێت) ﴿وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾ وه بۆتانەو تەشەردان لەئایینی (ئیسلام)﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا﴾ وه ئەگەر ئەوان بیان ووتایه ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ بیستمان و گوێڕایەڵین ﴿وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا﴾ و (قسەمان) ببیستەو پەلەمان لێ مەكه ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ﴾ ئەوه چاكترو ڕاست تر بوو بۆیان ﴿وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ﴾ بەڵام خوا نەفرینی لێ كردن ﴿بِكُفْرِهِمْ﴾ بەهۆی بێ باوەڕییەكەیانەوه ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ بۆیه بڕوا ناهێنن كەمێكیان نەبێ. ٤٦)﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ﴾ ئەی ئەوانەی ﴿أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ كەنامەتان پێ بەخشراوه ﴿آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا﴾ بڕوا بهێنن بەو (قورئانه)ی ناردوومانەته خوارەوه ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم﴾ كه بەڕاست دانەری ئەو(تەوراته)ی ئێوەیه ﴿مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا﴾ پێش ئەوەی ڕوخسارانێك ساف بكەین (لەپێشەوه) ﴿فَنَرُدَّهَا عَلَىٰ أَدْبَارِهَا﴾ ئینجا بیبەینه پشت سەریان ﴿أَوْ نَلْعَنَهُمْ﴾ یان نەفرەتیان لێ بكەین ﴿كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ﴾ وەك چۆن نەفرەتمان كرد لە خەڵكانی شەممه ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾ وەبڕیاری خوا هەمیشه بەدی دێت. ٤٧)﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەڕاستی خوا﴿لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ, بێجگە لەوه خۆش نەبێت لەهەر گوناهێكی تر﴿لِمَن يَشَاءُ﴾ بۆ هەركەسێك كه بیەوێت، ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ﴾ وه هەركەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت﴿فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ ئەوه بێگومان گوناهێكی زۆر گەورەی هەڵبەستووه. ٤٨)﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ﴾ ئایا سەیری ئەوانەت نەكردووه﴿يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ كەخۆیان بەپاك و چاك دەزانن ﴿بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ﴾ (وانی یه) بەڵكو خوا هەر كەسێكی بوێت پاك و خاوێنی دەكات ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ و كەمترین ستەمیان لێ ناكرێت (بابەئەندازەی ئەو دەزوه باریكەی ناوكی خورماش بێت). ٤٩)﴿انظُرْ كَيْفَ﴾ سەیری بكەن چۆن ﴿يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ بەدەم خواوه درۆ هەڵدەبەستن﴿وَكَفَىٰ بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا﴾ وه بەسه ئەو درۆیەكه گوناهێكی ڕوون و ئاشكرایه. ٥٠)﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ﴾ ئایا ئاوڕێكت نەداوەتەوه لەوانەی﴿أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ﴾ بەشێك لەنامەی خواییان پێدراوه ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ بڕوا ئەهێنن بەشتی بێ نرخ و بەرنامەی غەیری خوا (به جادووگەران و بەشەیتان) ﴿وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وه ئەڵێن بەوانەی كەبێ بڕوان﴿هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ﴾ ئەوانه ڕێبازیان ڕاستره﴿مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا﴾ لەوانەی كەباوەڕیان هێناوه. ٥١)

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾

- حونەینی بەدی هێنا لەئەنجامی شەڕەکەدا مسوڵمانەکان چەند ژنێکی خاوەن کتێبەکانیان گرت کە مێردیان هەبوو، هەرکاتێ مسوڵمانێک بیویستایە بچێتە لای ژنێک ژنەکە دەیووت:من مێردم هەیە،جا لەوبارەیەوە پرسیاریان لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد بەو هۆیەوە ئایەتی ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ دابەزی.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥١) سورەتی (النساء): ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ﴾ ئیمامی ئەحمەد و ئیبن ئەبی حاتیم لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: کەعبی کوڕی ئەشرەف هات بۆ مەککە، قورەیشییەکان ووتیان تۆ چاکترین کەسی لە مەدینەدا و گەورەمیان. ووتی بەڵێ ووتیان. ئایینی ئەو دوابڕاوە لەگەلەکەی وادەزانێت ئەو لەئێمە باشترە، لەکاتێکدا ئێمە میواندلوی حاجی یان و دەرگاوانی کەعبەو ئاوگێڕی حاجی یانین -

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا نەفرینی لێ کردوون ﴿وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ﴾ هەرکەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا﴾ ئەوە هەرگیز دەست ناکەوێت بۆی هیچ یارمەتی دەرێ. ٥٢)﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ﴾ ئایا ئەوانە (جوولەکەکان) بەشیان هەیە ﴿مِّنَ ٱلْمُلْكِ﴾ لە دەسەڵاتی پاشایەتی (خاوەنێتی بوونەوەر)؟ ﴿فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا﴾ (جا ئەگەر بیانبوایە) ئەو کاتە بەخەڵکی یان نەدەبەخشی (بە ئەندازەی) تووێکڵی دەنکە خورمایەك. ٥٣)﴿أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ﴾ یان ئێرەیی (حەسوودی) دەبەن بەخەڵکی؟ ﴿عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ لەسەر ئەوەی خوا پێ ی بەخشیوون (کە پێغەمبەرێتی یە) ﴿مِن فَضْلِهِۦ﴾ لە فەزڵ و بەهرەی خۆی ﴿فَقَدْ ءَاتَيْنَآ﴾ ئەوەبێ گومان داومانە ﴿ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ بەنەوەی ئیبراهیم کتێب ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ و پێغەمبەرێتی ﴿وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ هەروەها پێمان بەخشین دەسەڵاتێکی گەورە. ٥٤)﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ جالەو خەڵکەدا هەبوو بڕوایان بە (موحەممەد (ﷺ)) هێنا ﴿وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ هەشیان بوو بەرگری لێ کردووە ﴿وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾وە دۆزەخ بەسە(بۆیان) کە ئاگرێکی هەڵگیرساوە. ٥٥)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوا بوون ﴿بِـَٔايَٰتِنَا﴾ بە ئایەتەکانی ئێمە ﴿سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا﴾ لەمەولا دەیانخەینە ناو ئاگرێك ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾ هەر کاتێك کە پێستیان سووتا (برژا) ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ بۆیان دەگۆڕین بە پێستێکی تر ﴿لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ﴾ بۆ ئەوەی سزاکە بچێژن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە. ٥٦) ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێنا ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کاری چاکەیان کرد ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ لەمەولا دەیانخەینە چەند بەهەشتێ ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە ڕووبارەکان دەچن بەژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ دەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی ﴿لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ بۆیان هەیە تیایدا هاوسەرانی پاك وخاوێن﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾وە دەیانخەینەژێر سێبەری چڕو بەردەوامەوە. ٥٧)﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ﴾ بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات﴿أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ﴾ بەدانەوەی گشت سپاردەکان ﴿إِلَىٰٓ أَهْلِهَا﴾ بۆ خاوەنەکانیان ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ وە کاتێك دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا ﴿أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ﴾ بەداد حوکم بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ﴾ بەڕاستی خوا بە چاکی ئامۆژگاریتان دەکات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە بیسەری بینایە. ٥٨)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێك کەباوەڕتان هێناوە ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن ﴿وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ وە پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە (عادیلە)کانی خۆتان بن ﴿فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ﴾ جا ئەگەر دوویەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (ﷺ) ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ و بەڕۆژی دوایی ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ ئەوە باشترە ﴿وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ وە ئاکام و ئەنجامی چاکترە. ٥٩)

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴿٦١﴾ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴿٦٥﴾

- **کەعب وتی: ئێوە** باشترن، **ئیتر** دەربارەیان ئایەتی ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ و ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ... نَصِيرًا﴾ دابەزی.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥٩) سورەتی (النساء):** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ ...﴾ بوخاری لە عەبدوللای کوڕی عەبباسەوە ڕیوایەتی کردووە کە وتویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوللای کوڕی حوزافەی کوڕی قەیس دابەزیوە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سریەیەکدا ناردبووی بۆ جەنگ.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦٠) سورەتی (النساء):** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ﴾ ئیبن ئەبی حاتیم و طەبەرانی دەیگێڕنەوە لە عەبدوللای کوڕی عەبباسەوە دەڵێت: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی کاهینێك بوو نێوان جوولەکەی ڕێك دەخست و دادگایی دەکردن لەکاتێکدا کە دووبەرەکی بکەوتایەتە نێوانیان، هەندێ لە مسوڵمانە کانیش چوونە لای -

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی ﴿يَزۡعُمُونَ﴾ وا خۆ نیشان دەدەن ﴿أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ﴾ کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە ﴿بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ بەوەی دابەزیوە بۆتۆ (کە قورئانە) ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە (کە تەوراتە) ﴿يُرِيدُونَ أَن﴾ دەیانەوێت کە ﴿يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ داد بەرن بۆلای یەکێك کە حوکم بەبەرنامەی خوا ناکات ﴿وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ﴾ لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە ﴿أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ﴾ کە بڕوایان پێی نەبێت ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ وە شەیتان دەیەوێت ﴿أَن يُضِلَّهُمۡ﴾ کە گومرایان بکات ﴿ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ بە گومراییی یەکی دوور لە ڕاستی. ٦٠) ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ﴾ وە ئەگەر پێ یان بوترێ: وەرن ﴿إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بۆلای ئەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە ﴿وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ وە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ﴿رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ دەبینی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) دووڕووەکان﴿يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا﴾ڕووت لێ وەردەگێڕن بەوەرگەڕانێکی تەواو. ٦١) ﴿فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ﴾ ئایا حاڵیان چۆن ئەبێت کاتێك بەسەرهاتێکی ناخۆشیان تووش بێت؟ ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾بەهۆی ئەوەی دەسیان پێشی خستووە (کردوویانە)﴿ثُمَّ جَآءُوكَ﴾پاشان دێنەوە بۆ لات ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ و سوێند دەخۆن بەخوا﴿إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾ تەنها نیازی چاکە و یەك خستنەوەمان بووە (کاتێك کە حوکم دەبەین بۆلای غەیری خوا). ٦٢) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵیاندا هەیە﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾کەواتە ڕوویان لێ وەرگێڕە﴿وَعِظۡهُمۡ﴾ وە ئامۆژگارییان بکە ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾وە بڵێ پێیان دەربارەی خۆیان ﴿قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ ووتەیەکی ڕەوان و کاریگەر ٦٣)﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ﴾وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە ﴿إِلَّا لِيُطَاعَ﴾ تەنها بۆ ئەوە نەبێت گوێڕایەڵی بکرێت﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بەفەرمانی خوا﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ﴾ وە بێگومان ئەگەر ئەوان ﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ کاتێ ستەمیان لەنەفسی خۆیان کرد﴿جَآءُوكَ﴾ بهاتنایە بۆلات ﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ﴾ و داوای لێ بوردنیان بکردایە لە خوا ﴿وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ﴾پێغەمبەریش داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکردنایە﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا﴾ بێ گومان دەیان بینی خوا پەشیمانی وەرگری بەبەزەیی یە. ٦٤) ﴿فَلَا وَرَبِّكَ﴾ نەخێر (وانی یە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن) **سوێند بەپەروەردگارت** ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ﴾ بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە **داوەر**﴿فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ **لەهەر** ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ لە پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا ﴿حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ﴾ بەهیچ بێزاری یەك **لەو بڕیارەی تۆ داوتە** ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ و مل کەچ نەکەن بەملکەچی یەکی تەواو. ٦٥)

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

- بۆ ڕێکخستنی تێوانینیان، خوای گەورەش دەربارەیان ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا﴾ تا دەگاتە ﴿إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا﴾ ی دابەزاند.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦٥) سورەتی (النساء): ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ..﴾ هەرشەش زانای فەرموودە دەگێڕنەوە لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە ووتی: زوبەیری کوڕی عەوام گێڕایەوە کە لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاری کە بەشداری غەزای بەدری کردبوو ناکۆکی و کێشەی هەبوو لەگەڵیدا، لەسەر ئاوی شیوێ کە هەردووکیان ئاوی باخیان پێ دەدێرا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (زوبەیر ئاوی باخەکەت بدێرە پاشان بەرەڵای بکە بۆ دراوسێکەت)، پیاوە ئەنصارییەکە (لەم حوکمە) ڕقی هەستا و ووتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەبەر ئەوەیە کە پوورزای خۆتە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) ڕەنگی گۆڕا و فەرمووی: -

﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ﴾ وە بێگومان ئەگەر ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان﴿أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ کە یەکتری بکوژن (واتە باوەڕداران بێ باوەڕان بکوژن)﴿أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم﴾یان لەماڵەکانتان دەربچن﴿مَّا فَعَلُوهُ﴾ ئەوەیان نەدەکرد ﴿إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ کەمێکیان نەبێت﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا﴾وە ئەگەر بەڕاستی ئەوان کاریان بکردایە﴿مَا يُوعَظُونَ بِهِ﴾ بە پێی ئەو ئامۆژگارییانەی دەکران ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئەوە باشتر بوو بۆیان ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ وە دامەزراوتر دەبوون (لەسەر ئایینەکەیان). ٦٦)﴿وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم﴾ جا ئەو کاتە بێگومان پێمان دەبەخشین ﴿مِّن لَّدُنَّا﴾ لەلایەن خۆمانەوە ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی گەورە. ٦٧)﴿وَلَهَدَيْنَاهُمْ﴾وە ڕێنموونیمان دەکردن ﴿صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾بۆ ڕێگای ڕاست. ٦٨)﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ﴾ وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات ﴿فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ﴾ جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن ﴿أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم﴾ کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا ﴿مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ﴾ لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان﴿وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ﴾ و شەهیدان و پیاوچاکان ﴿وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾ وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن. ٦٩)﴿ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ﴾ ئەو بەهرەیە تەنها لەلایەن خواوەیە ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا﴾ وە بەسە کە خوا زانایە (بەهەموو شتێك). ٧٠)﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە ﴿خُذُوا حِذْرَكُمْ﴾ ئاگاداریی خۆتان وەرگرن ﴿فَانفِرُوا ثُبَاتٍ﴾ ئەوسا تاقم تاقم هێرش بەرن (دەرچن بۆ جیهاد) ﴿أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا﴾ یان هەموو پێکەوە هێرش بەرن (دەرچن بۆ جیهاد). ٧١)﴿وَإِنَّ مِنكُمْ﴾ وە بێگومان لە ناوتاندایە ﴿لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ کەسی وا بەڕاستی خۆی دوا دەخات ﴿فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ جا ئەگەر تووشی بەسەرهاتێکی خراپ هاتن ﴿قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ﴾ دەڵێ بەڕاستی خوا بەهرەی ڕشت بەسەرمدا ﴿إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ کە لەگەڵیاندا ئامادە نەبووم. ٧٢)﴿ وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ وە ئەگەر تووشی بەهرەیەك بوون لەخواوە﴿لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ﴾ بێگومان دەڵێت وەك لەنێوان ئێوە و ئەوا هیچ دۆستایەتی یەك نەبوو بێت ﴿يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ﴾ ئەی خۆزگە لەگەڵ ئەواندا بوومایە ﴿فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ تا قازانجێکی زۆر گەورەم بکردایە. ٧٣)

﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ کەواتە با **بجەنگێت لەڕێی** خوادا ﴿الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ﴾ **کەسانێك کە ژیانی دنیا دەفرۆشن بەڕۆژی دوایی** ﴿وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ جا هەرکەسێك بجەنگێت لەڕێی خوادا ﴿فَيُقْتَلْ﴾ ئینجا بکوژرێ (شەهیدببێ) ﴿أَوْ يَغْلِبْ﴾ یان زاڵ ببێ ﴿فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ﴾ ئەوە دواتر پێی دەدەین ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی گەورە. ٧٤)

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾

- (زوبەیر ئاوەکەت بدێرە **پاشان ئاوەکە** بگرە تا جۆگەکان پڕ لە ئاو دەبێت)، پێغەمبەر (ﷺ) **مافی** تەواوی **ئاودێرانی** بەزوبەیر بەخشی بەلام پێشتر رایەکی نیشان زوبەیر دا کە بۆ **زوبەیر** و ئەنصاریەکەش باش بوو. **جا کاتێ** ئەنصاریەکە دەستی لەمافی هەڵنەگرت، پێغەمبەریش مافی تەواوی ئاودێرانی دا بە زوبەیر بەبڕیارێکی ڕوون و بێ پێچ و پەنا ئینجا عورووە دەڵێ: زوبەیر دەڵێت: وا دەزانم ئەم ئایەتە لەسەر من و ئەو ئەنصاریە دابەزی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ..﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦٩) سورەتی (النساء): ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ ...﴾**

طەبەرانی دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخۆم و لەکوڕەکەم و ماڵ ومندالّم زیاتر تۆم خۆش دەوێت، هەندێ جار -

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە چیتانە (بەچ بیانوویەك) جەنگ ناكەن لەپێناوی خـوادا ﴿وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ و لـەپێناوی چەوساوەكان لـەپیاوان و ئافرەتان و مندالان ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەوانەی كە دەڵێن ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ﴾ ئـەی پەروەردگارمان ڕزگارمان كەی لەم شـارە ﴿ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾ كە خەڵكەكەی ستەمكارن ﴿وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ وە لەلایەن خۆتەوە دڵسۆزێكمان بۆ بەدی بهێنە ﴿وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ﴾ وە لەلایەن خۆتەوە بەدی بهێنە بۆمان ﴿نَصِيرًا﴾یارمـەتی دەرێك. ٧٥)﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەو كەسانەی باوەڕیان هێناوە ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەپێناوی خوادا دەجەنگێن ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕن ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ﴾ لە پێناوی نـارەوا (یـان شەیتان) دا دەجەنگێن ﴿فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ كەواتـە شـەڕیكەن لەگەڵ دۆستەكانی شەیتاندا ﴿إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە. ٧٦)﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ﴾ ئایا سەیری ئەو كەسانەت نـەكردووە كـەپێیان ووتـرا ﴿كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ﴾ دەستان بگێڕنەوە (لەجەنگ و كوشتار) ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و نوێژ بكەن ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ و زەكات بدەن؟﴿ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ﴾ كەچی كاتێك جەنگیان لەسەر پێویسـت كـرا ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ﴾ یەكسەر دەستەیەكیان لـە خـەلكی دەترسان ﴿كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ وەك ترسان لەخودا ﴿أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾ بگرە زیاتریش دەترسان ﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَا﴾ دەیان ووت ئـەی پەروەردگاری ئێمە ﴿لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ﴾ بۆچی جەنگت لەسـەرمان پێویست كـردوە. ﴿ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ خۆزگە دوات دەخستین (لەجەنگ كردن) بۆ ماوەیەكی كـەم ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ﴾ بڵێ خۆشی و لەزەتی دنیا زۆر كەمە ﴿وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ﴾ و ڕۆژی دوایـی باشترە ﴿لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ بۆ كەسێك لەخوا بترسێت ﴿وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ وەستەمتان لێ ناكرێت بە(ئەندازەی) تـاڵی ناوكـە خورمایـەك. ٧٧)﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟﴾لەهەرشـوێنێك بـن ﴿يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ﴾ مـردن پێتـان دەگـات ﴿وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ بالـەناو قـەڵاو كۆشـكی بـەرزو قایمشدابن ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ﴾ وە ئەگەر (ناپاكان) خۆشی و چاكە هاتە ڕێیـان ﴿يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ دەڵێن ئەمـە لەلایـەن خواوەیـە ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ وە ئەگـەر تووشـی نـا خۆشـی و خراپەیـەك هـاتن ﴿يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ﴾ دەڵێن ئەمـە لەلایـەن تۆوەیـە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ بڵێ: هەمووی لەلایەن خواوەیە ﴿فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ﴾ ئەوە ئەو خەڵكە چی یانـە؟ ﴿لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ وەكـو لـە هـیچ قـسەیەك تـێ نەگــەن وایـــە. ٧٨)﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ﴾ هــەر چـاكەیەكت تــووش بــوو ئــەوە لەخواوەیــە ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ﴾ وە هــەر خراپەیــەكت تــووش بــوو ﴿فَمِن نَّفْسِكَ﴾ ئــەوە لــە خۆتەوەیــە ﴿وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا﴾ و ئێمــە تۆمــان نــاردووە بەپێغەمبەر بۆخەڵكی ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ وە خوا بەسە شایەتی ئەوە بدات. ٧٩)

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ۖ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ۖ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

- لەماڵی خۆمدا بیرت دەکەم و ئارام ناگرم تا دێم سەیرت دەکەم و کاتێکیش بیر لە مردنی خۆم و تۆ دەکەمەوە دەزانم کە تۆ چوویتە بەهەشت پلەو جێگەت بەرز دەکرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەراندا، منیش ئەگەر بچمە بەهەشت دەترسم نەتبینم، پێغەمبەریش (ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە تا جوبرەئیل بەم ئایەتەوە دابەزی بۆلای﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ ....﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٧٧) سورەتی (النساء): ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ....﴾ نەسائی و حاکیم دەگێڕنەوە لەعەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ووتی عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و هەندێ لەهاوەڵانی هاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە سەربەرزو خاوەن عیزەت بووین کاتێ کە بێ بڕوا بووین، بەڵام کەبڕوامان هێنا سەرشۆڕ بووین پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (من فەرمانم پێ کراوە بەلێبوردن وەنابێ شەڕو کوشتار بەرپا بکەن لەگەڵ هۆزەکانتان) -

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ﴾ هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بکات ﴿فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ ئەوە بەراستی گوێڕایەڵی خوای کردووە ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ﴾ هەرکەسێکیش پشت هەڵبکات ﴿فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ ئەوە ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە ﴿عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا﴾ بە چاودێر و پارێزەر بەسەریانەوە. ٨٠)﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ﴾ (دووڕووەکان) دەڵێن گوێڕایەڵین (مل کەچ و فەرمانبەرداریین)﴿فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ﴾ بەڵام کاتێك لەلای تۆ دەرچوون ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ کۆمەڵێك لەوان شەو دەکەنەوە بەپیلان گێران ﴿غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُ﴾ بەپێچەوانەی قسەکانی تۆ ﴿وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ﴾ وەخوا دەینووسێت ئەو (پیلانانەی) شەو کردویانە ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ کەواتە وازیان لێ بێنە ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ و پشت بەخوا ببەستە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ خوا بەسە پشتیوانت بێ. ٨١)﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئەوەبۆ بیر ناکەنەوە لەقورئان؟ ﴿وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ﴾ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا ﴿لَوَجَدُواْ فِيهِ﴾بێ گومان دەیانبینی تیایدا ﴿ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾ جیاوازیی زۆر. ٨٢)﴿وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ﴾ وە کاتێك هەواڵێکیان پێ بگات ﴿مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ﴾ دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی﴿أَوِ ٱلۡخَوۡفِ﴾ یان لەبارەی ترسەوە ﴿أَذَاعُواْ بِهِۦ﴾ بڵاوی دەکەنەوە ﴿وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ بەڵام ئەگەر بیانگەڕانایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ﴾ و بۆ لای کاربەدەستانی خۆیان ﴿لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾ ئەوە ئەوانەی ڕاستی هەواڵەکان دەردەهێنن دەزانن هەواڵەکە (ڕاستە یان درۆیە)﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ وە ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبوایە بەرامبەر بەئێوە﴿لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ بێ گومان شوێن شەیتان دەکەوتن کەمێکتان نەبێت. ٨٣)﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لەپێناوی خوادا بجەنگێ ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾تۆ تەنها ئەرکی خۆت لێ داوا کراوە (یا تۆ تەنها ئەرکی خۆت لەسەرە) ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ هانی بڕوادارانیش بدە(بۆ جیهاد) ﴿عَسَى ٱللَّهُ﴾ ئومێدە خوا ﴿أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەرگری هێزی بێ باوەڕان بکات ﴿وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا﴾ وە خوا بەهێزترە﴿وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا﴾ و تۆڵەی بەتین ترە. ٨٤)﴿مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ﴾ هەرکەسێ تکایەکی چاکە بکات ﴿يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٞ مِّنۡهَا﴾ بەشێکی لە(پاداشتی) ئەو چاکەیە بۆ هەیە ﴿وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ﴾ وە هەرکەسێ تکایەکی خراپە بکات ﴿يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَا﴾ ئەویش بەشێکی دەبێت لە(سزای) ئەو خراپەیە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ﴾ وەخوا هەمیشە ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا﴾ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە (چاودێرە). ٨٥)﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ﴾ هەر کاتێك سڵاوێکتان لێ کرا ﴿فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ﴾ ئەوە بەچاکتر لەو سڵاوە سڵاو بکەن ﴿أَوۡ رُدُّوهَآ﴾ یان وەکو خۆی بیسەننەوە﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا﴾ بێ گومان خوا هەمیشە پرساو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا. ٨٦)

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾

**- کاتێـک خـوای** گـەورە پێغەمبـەری ئێمەی گوێزایەوە **بۆ** مەدینـە **فـەرمانی** جەنگی پێ **کردین و** بەڵام ئەوان جیهادیان نـەکرد ئـیتر ئایـەتی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ ....﴾ دابەزی.

**هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی (٨٣) سـورەتی (النـساء): ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ ...﴾** موسلیم لـە عومـەری کوڕی خـەطـابـەوە ڕیوایـەتی کـردووە وتویـەتی: کاتێـک پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) جێگـای جیـاکردەوە لـە خێزانەکانی، ڕۆیشتمە مزگەوت دەبینم هەندێ کەس یاری بەبەردە ووردە دەکەن و دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) خێزانەکانی تەڵاق داوە، بۆیە منیش لەبەر دەرگای مزگەوت دا وەستام و بەدەنگی بەرز هاوارم کرد: نەخێر پێغەمبەر (ﷺ) خێزانەکانی تەڵاق نەداوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی، ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ..﴾ ئەوە من بووم ناراستی ئەو هەواڵەم دۆزییەوە.

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەخوا ﴿ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾ سوێند بەخوا بێگومان کۆتان دەکاتەوە بۆ (لێپرسینەوەی) ئەو ڕۆژی دواییەی ﴿ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾ کە هیچ گومانی تێدا نیە ﴿ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا ﴾ جا کێ لە خوا قسە(و بەڵێنی) ڕاست ترە. ٨٧) ﴿ فَمَا لَكُمْ ﴾ ئەوە چیتانە ﴿ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ ﴾ دەربارەی دوو ڕووەکان بوونەتە دوو دەستە ﴿ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ﴾ لەکاتێکدا خوا ئەوانەی گەڕاندۆتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی کردەوەکانیانەوە ﴿ أَتُرِيدُونَ ﴾ ئایا دەتانەوێت ﴿ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ﴾ ڕێنموونی کەسێك بکەن کە خوا گومڕای کردووە؟ ﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ ﴾ وە هەرکەسێ خوا گومڕای بکات ﴿ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴾ ئەوە هەرگیز ناتوانی ڕێگای ڕاستی بۆ بدۆزیتەوە. ٨٨) ﴿ وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ﴾ ئەوان ئاواتە خوازن ئێوەش بێ باوەڕبن ﴿ كَمَا كَفَرُوا ﴾ وەك چۆن خۆیان بێ باوەڕ بوون ﴿ فَتَكُونُونَ سَوَاءً ﴾ تا ئێوەو ئەوان یەکسان بن ﴿ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ ﴾ کەواتە ئەوان بە دۆست و یارمەتی دەر هەڵمەبژێرن ﴿ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ هەتا (پەشیمان دەبنەوەو) کۆچ دەکەن لەڕێ ی خوادا ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا ﴾ ئینجا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان هەڵکرد ﴿ فَخُذُوهُمْ ﴾ ئەوە(بەدیل) بیانگرن ﴿ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾ و بیانکوژن لەهەر شوێنێك تووشیان بوون ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ وە هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك لەوان هەڵمەبژێرن. ٨٩) ﴿ إِلَّا الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ ﴾ جگە لەوانەی پەیوەندی دەکەن بە کەسانێکەوە ﴿ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ ﴾ کە لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان هەیە ﴿ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ ﴾ یان هاتوون بۆ لاتان لەسەر دڵیان نارەحەتە (حەزناکەن) ﴿ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ ﴾ لەوەی کە جەنگتان لەدژ بکەن یاجەنگ لەدژی خزمەکانیان بکەن ﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە ﴿ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ ﴾ زاڵی دەکردن بەسەرتاندا ﴿ فَلَقَاتَلُوكُمْ ﴾ و جەنگیان دژتان دەکرد ﴿ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ ﴾ جا ئەگەر ئەوان کەنارگیر بوون لە ئێوە ﴿ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ ﴾ و جەنگیان لە دژتان نەدەکرد ﴿ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ ﴾ و پێشنیاری ئاشتیان کرد بۆتان (مل کەچ بوون) ﴿ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾ ئەوە خوا ڕێگەی نەداوون کە دەستیان بۆ بەرن و (نابێ شەڕیان لەدژ بکەن). ٩٠) ﴿ سَتَجِدُونَ آخَرِينَ ﴾ لە مەولا کەسانێکی تر دەبینن ﴿ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ ﴾ دەیانەوێت لەئێوە ئەمین بن ﴿ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ ﴾ وە لە هۆزەکەی خۆشیان ئەمین بن ﴿ كُلَّ مَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ ﴾ هەر کاتێك بانگ کراین بۆ بێ باوەڕی و بت پەرستی ﴿ أُرْكِسُوا فِيهَا ﴾ گەڕاونەتەوە بۆی ﴿ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ ﴾ جا ئەگەر کەنارگیر نەبوون لێتان ﴿ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ ﴾ وە جلەوی ئاشتیان نەدایە دەستتان ﴿ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ ﴾ وە دەستیان نەکێشایەوە (لەجەنگ کردن) ﴿ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ ﴾ ئەوە بەدیل بیانگرن و بیانکوژن ﴿ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ﴾ لەهەر شوێنێك کە بەردەستتان کەوتن ﴿ وَأُولَٰئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ ﴾ ئەوانەی (باسمان کرد) داومانەبە ئێوە ﴿ عَلَيْهِمْ ﴾ لەدژیان ﴿ سُلْطَانًا مُّبِينًا ﴾ دەسەڵاتی ئاشکرا. ٩١)

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٨٨) سورەتی (النساء): ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ...﴾ بوخاری و موسلیم لە زەیدی کوڕی ثابتەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو بۆ ئوحود بۆ جیهاد و چەند کەسێک کەلە گەڵیدا دەرچوو بوون گەڕانەوە، جا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەوانە بوون بە دووکۆمەڵ، کۆمەڵێکیان دەیان ووت دەمێ بجەنگێن لەگەڵیان، و کۆمەڵێکی تریان دەیان ووت: نەخێر ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ ..﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٩٤) سورەتی (النساء): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ ....﴾

بوخاری و تورمزی و حاکیم لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە ووتویەتی: پیاوێکی ئایەفەی بەنی سولەیم هەندێ مەڕو ماڵاتی خۆی دەبووە بەر بەلای چەند کەسێک لەهاوەڵانی پێغەمبەردا-

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا﴾ بۆ هیچ باوەڕدارێك ڕەوانی یە باوەڕدارێك بكوژێت ﴿إِلَّا خَطَئًا﴾ مەگەر بەهەڵە ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا﴾ وە هەر كەسێك ئیماندارێك بە هەڵە بكوژێت ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەوە(لەسەریەتی) ئازادكردنی كۆیلەیەكی باوەڕدار ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ﴾ و (نرخی) خوێنێكیش بدات بە كەس و كاری كوژراوەكە ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟﴾ مەگەر بیبەخشن (لە خوێنەكە بەخێری خۆیان) ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ﴾ بەڵام ئەگەر كوژراوەكە لەگەڵێك بوو كە دوژمنتان بوون (كافری شەڕ كەر بوون) ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ وە كوژراوەكە ئیمانداربوو ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەوە (هەر لەسەریەتی) ئازادكردنی بەندەیەكی ئیماندار ﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ﴾ وە ئەگەر (كوژراوەكە) لەگەڵێك بوو ﴿بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ كە لەنێوان ئێوە وئەواندا پەیمان هەبوو ﴿فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ﴾ ئەوا(نرخی)خوێنێك بدەنەكەسی كوژراوەكە ﴿وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ لەگەڵ ئازادكردنی كۆیلەیەكی ئیماندار ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ جا ئەو (بكوژ)ەی دەستی نەكەوت(یان نەی بوو) ﴿فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ﴾ ئەوە (لەسەریەتی) ڕۆژووگرتنی دوو مانگ ﴿مُتَتَابِعَيْنِ﴾ لەسەریەك ﴿تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ (ئەم بڕیارە) لێ بووردنە لەلایەن خواوە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە زانای كاردروستە. ٩٢)﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ وەهەركەسێك ئیماندارێك بەدەس ئەنقەس بكوژێت ﴿فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾ ئەوە تۆڵەی ئەو كەسە دۆزەخە ﴿خَٰلِدًا فِيهَا﴾ بە هەمیشەیی تیایدا ئەبێت ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾ وخوا خەشمی لێگرتووە ﴿وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ و نەفرینی لێ كردووەو سزایەكی گەورەی بۆئامادە كردووە. ٩٣)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی كەسانێك كەبڕواتان هێناوە ﴿إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ كاتێك دەرچوون (بۆ جیهاد كردن)لەڕێگەی خوادا ﴿فَتَبَيَّنُوا۟﴾ هەموو شتێك ڕوون بكەنەوە ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ﴾ وە نەڵێن بەو كەسانەی﴿أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ﴾ كە سڵاو(ی موسڵمانانە)تان لێ دەكەن ﴿لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ تۆ بڕوادار نیت؟ ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بەدوای شتومەك و سامانی دنیایىدا بگەڕێن ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ ئەوە لای خوا دەسكەوتی زۆر هەیە ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئێوەش لەمەو پێش هەروەها بوون (ئیمانەكەتان دەشاردەوە) ﴿فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئینجا خوا منەتی نا بەسەرتاندا (بە هێز و زاڵی كردن) ﴿فَتَبَيَّنُوٓا۟﴾ دەی كەواتە هەموو شتێك ڕوون بكەنەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگادارە بەوەی ئێوە دەیكەن. ٩٤)

لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ
ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً
وَرَحْمَةًۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِۚ
قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ
جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ
وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾
فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾
۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةًۚ
وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ
فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ
فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ
أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

- ئێپەڕی و سلاوی لێ کردن ئەوانیش ووتیان تەنها لەبەرئەوە سلاوی لێ کردین تا هیچی لێ نەکەین، پارێزراو بێت بۆیە پەلاماریان داو و کوشتیان و مەڕو مالاتەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) جا ئەم ئایەتە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ ..﴾ ئیمامی ئەحمەد و طەبەرانی دەگێرنەوە: لە عەبدوللای کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمیەوە ئەویش لەباوکی یەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمەی لەگەڵ هەندێ لە مسوڵمانانا ندا بەکارێك نارد کە ئەبو قەتادە و مولحیمی کوڕی جوثامەیان تێدا بوو عامیری ئەشجەعی دای بەلاماندا و سلاوی لێ کردین یەکسەر مولحیم پەلاماری داو کوشتی، کاتێك گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵەکەمان پێ گەیاند، ئەم ئایەتە دەربارەمان دابەزی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾.

﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَـٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران ﴿غَيْرُ أُولِى ٱلضَّرَرِ﴾ جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل) ﴿وَٱلْمُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا ﴿بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ بەماڵ و گیانیان ﴿فَضَّلَ ٱللَّهُ﴾ خوا باوی داوە ﴿ٱلْمُجَـٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ تێکۆشەران بە ماڵ و گیانیان ﴿عَلَى ٱلْقَـٰعِدِينَ دَرَجَةً﴾ بە سەر دانیشتوان (لە جیهاد)دا بە پلەیەك ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ وە هەر یەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێ داوون (کە بەهەشتە). ﴿وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَـٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَـٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ وە خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەکاندا بە پاداشتێکی گەورە. ٩٥) ﴿دَرَجَـٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً﴾ لەلای (خوا)وە پلەی زۆر و لێ خۆش بوون و میهرەبانیان بۆ هەیە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە خوا هەمیشە لێبوردەی میهرەبانە. ٩٦) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن ﴿ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ لە کاتێکدا کەستەمیان لەخۆیان دەکرد(بە کۆچ نەکردنیان) ﴿قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ﴾ (بە تەشەرەوە پێیان) دەڵێن (دەربارەی ئایینەکەتان) لەچیدا بوون؟! ﴿قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ دەڵێن ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەوی دا ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً﴾ (پێیان) دەڵێن مەگەر زەویی خوا فراوان نەبوو؟ ﴿فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا﴾ تا کۆچتان بکردایە تیایدا ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە ﴿وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ ئای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە. ٩٧) ﴿إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾ بێجگە لەو چەوساوانەی کە لە پیاوان ﴿وَٱلنِّسَآءِ﴾ و ئافرەتان ﴿وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ و لە منداڵانن ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ کە توانای هیچ چارەیەکیان نی یە (لەبەر بێ هێزی و پیریان) ﴿وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا﴾ وە بەهیچ شێوازێك ڕێ دەرناکەن. ٩٨) ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ﴾ ئا ئەوانە ئومێد هەیە خوا لێ یان خۆش بێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ وە خوا هەمیشە چاوپۆشیکەر و لێ خۆشبووە. ٩٩) ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە هەر کەسێك کۆچ بکات لە ڕێ ی خوادا ﴿يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ دەستی دەکەوێت لە زەویدا ﴿مُرَٰغَمًا كَثِيرًا﴾ جێگە و ڕێگەی زۆر (کە دوژمن پێی ناخۆشە) ﴿وَسَعَةً﴾ وە فراوانی (لە ڕۆزی ژیاندا) ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ﴾ وە هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێت ﴿مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ وە کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﴿ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ﴾ پاشان مردن پێی بگات ﴿فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئەوە بێ گومان پاداشتی ئەو کەسە کەوتۆتە سەر خوا ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە خوا هەمیشە لێ بوردەی بە بەزەیی یە. ١٠٠) ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هەر کاتێك سەفەرتان کرد (و گەڕان) بەزەوی دا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە ﴿أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ کە هەندێ لە نوێژەکان کورت بکەنەوە ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەگەر ترسان ئەوانەی بێ باوەڕن جەنگتان لەگەڵ بکەن ﴿إِنَّ ٱلْكَـٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ بە ڕاستی بێ باوەڕان هەمیشە بۆ ئێوە دوژمنێکی ڕوون و ئاشکران. ١٠١)

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ
مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟
مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟
فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ
عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ
أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ
وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾
فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ
جُنُوبِكُمْ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ
كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟
فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا
تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا
حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ
ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٩٥) سورەتی (النساء): ﴿لا يَسْتَوِي القاعِدُونَ...﴾ بوخاری لە بەرائەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: کاتێك ﴿لا يَسْتَوِي القاعِدُونَ مِنَ المُؤْمِنِينَ﴾ دابەزی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: زەیدی کوڕی ثابتم بۆ بانگ بکە، پێی بڵێ قەڵەم و ئیسك و تەختە لەگەڵ خۆی بێنێ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆم بنووسە: ﴿لا يَسْتَوِي القاعِدُونَ مِنَ المُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالمُجاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومیش لە دوای پێغەمبەرەوە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من کوێرم، سکاڵای حاڵی خۆی کرد ئیتر لەجێگەی ئەو ئایەتە ئایەتی ﴿لا يَسْتَوِي القاعِدُونَ مِنَ المُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ دابەزی.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٩٧) سورەتی (النساء): ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفّاهُمُ...﴾ بوخاری لە عەبدوڵڵای-

﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ﴾ کاتێك تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ) لەجەنگدا) لەناو ئیماندارانیدا بوویت ﴿فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ﴾ و پێش نوێژیت بۆ کردن ﴿فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾ ئەوە با تاقمێك لەوان لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ و با چەکەکانیان پێ بێت ﴿فَإِذَا سَجَدُواْ﴾ جا کاتێك سوژدەیان برد (رکاتێکیان تەواو کرد) ﴿فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ﴾ با (بچنە دواوە) لە پشتانەوە بن (پاسەوانتان بن) ﴿وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ﴾ وە باتاقمەکەی تر بێن ﴿لَمْ يُصَلُّواْ﴾ کە نوێژیان نەکردوە (وپاسەوان بوون) ﴿فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ﴾ و لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ﴾ وە با وریای خۆیان بن ﴿وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ و چەکەکانیشیان پێ بێت ﴿وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ باوەڕان ئاواتە خوازن ﴿لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ﴾ کە ئێوە بێ ئاگابن لە چەکەکانتان ﴿وَأَمْتِعَتِكُمْ﴾ و شت و مەکەکانتان ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم﴾ تا پەلامارتان بدەن ﴿مَّيْلَةً وَٰحِدَةً﴾ بە پەلامارێکی یەکجارەکی (بدەن بە سەرتاندا) ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ وە تاوانتان لەسەر نی یە ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ﴾ ئەگەر بەهۆی بارانەوە نارەحەت بوون ﴿أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ یان نەخۆش بوون ﴿أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ کە چەکەکانتان دانێن ﴿وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ بەڵام وریایی خۆتان بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئامادەی کردوە بۆ بێ باوەڕان ﴿عَذَابًا مُّهِينًا﴾ سزایەکی ریسواکەر. ١٠٢)﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَوٰةَ﴾ ئەجا کاتێك نوێژەکانتان بەجێ هێنا ﴿فَاذْكُرُواْ اللَّهَ﴾ ئەوسا یادی خوا بکەن ﴿قِيَٰمًا وَقُعُودًا﴾ بەپێوە و بەدانیشتنەوە ﴿وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾ وە لە سەرتەنیشتان (بە پاڵکەوتنەوە) ﴿فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ﴾ جا هەر کاتێك دڵ ئارام بوون (و ترس نەما) ﴿فَأَقِيمُواْ الصَّلَوٰةَ﴾ ئەو کاتە نوێژەکانتان بە رێك و پێکی بکەن ﴿إِنَّ الصَّلَوٰةَ﴾ بەڕاستی نوێژ ﴿كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ هەمیشە لەسەر باوەڕداران ﴿كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا﴾ فەرز کراوێکی کات بۆ دیاری کراوە. ١٠٣)﴿وَلَا تَهِنُواْ﴾ سست مەبن ﴿فِى ابْتِغَآءِ الْقَوْمِ﴾ لە بەدوا گەڕانی دوژمنتاندا (یان لە بەدوا گەڕانی ئەو قەومە کافرانەدا) ﴿إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ئێش و ئازارتان پێ بگات ﴿فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ﴾ بێگومان ئەوانیش ئێش و ئازاریان پێ دەگات﴿كَمَا تَأْلَمُونَ﴾ وەك چۆن ئێوە ئێش و ئازارتان پێ دەگات ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ﴾ وە ئێوە ئومێد دەکەن لەخوا ﴿مَا لَا يَرْجُونَ﴾ ئەوەی ئەوان ئومێدی ناکەن (کە پاداشت و سەرکەوتنە) ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وە بەڕاستی خوا هەمیشە زانای کار دروستە. ١٠٤)﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ﴾ بێگومان ئێمە دامانبەزاندۆتە سەر تۆ ﴿الْكِتَٰبَ بِالْحَقِّ﴾ ئەم قورئانە بەڕاستی ﴿لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لەنێوان خەڵکیدا﴿بِمَآ أَرَىٰكَ اللَّهُ﴾ بەو بڕیارەی کەخوا ئیلهامی داویت ﴿وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ وە بۆ ناپاکان مەبە بەپارێزەر و داواچی. ١٠٥)

وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾

- کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: کە هەندێ لە مسوڵمانان لەگەڵ موشریکەکاندا بوون ژمارەی ئەوانیان زۆر دەکرد لەبەرانبەری پێغەمبەری خوادا جا لەو حاڵەتەدا تیرێك دەهات و یەکێك لەوانی دەکوشت یا شمشێری لێ دەدراو دەکوژرا، خوای گەورە دەربارەیان ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ...﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠٠) سورەتی (النساء): ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ...﴾** ئیبن ئەبی حاتیم و ئەبو یەعلا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: ضەمرەی کوڕی جوندوب لەماڵ دەرچوو کۆچ بکات و بەخزمە نزیکەکانی خۆی ووت هەڵم گرن و لە خاکی بت پەرستان دەرم کەن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام پێش ئەوەی بگاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەڕێگادا مرد، -

﴿وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ﴾ داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بە بەزەیی یە. ١٠٦)﴿ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ﴾بەرگری مەکە لەوانەی﴿يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ﴾ناپاکی دەکەن دەربارەی خۆیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ﴾ بێگومان خوا خۆشی ناوێت ﴿مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا﴾ئەوانەی کە بەردەوام زۆر ناپاك و گوناهبارن. ١٠٧)﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (تاوانەکانی) خۆیان دەشارنەوە لەخەڵکی (لەترساندا) ﴿وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾ و نایشارنەوە لە خوا (شەرم ناکەن لە خوا) ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ﴾ لەکاتێکدا خوا لەگەڵیاندایە ﴿إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ کاتێ (کە بەنهێنی) لەشەودا تەگبیر دەکەن و قسەیەك دەکەن خوا پێ ی ڕازی نی یە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ وە خوا هەمیشە زاناو ئاگادارە بەهەر کردەوەیەك کە ئەوان دەیکەن. ١٠٨)﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ﴾ (ئیمانداران) بێدارین وا ئێوە بەرگریتان لەناپاکان کرد﴿فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ لەژیانی دنیادا ﴿فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ﴾دەی ئایا کێ بەرگرییان لێ دەکات (لە سزای خوا)﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا ﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾ یان کێ کارو باریان دەگرێتە دەست. ١٠٩)﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا﴾ وە هەرکەس کردەوەیەکی خراپ بکات ﴿أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ﴾ یان ستەم لەخۆی بکات ﴿ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ﴾ پاشان داوای لێ خۆش بوون لەخوا بکات ﴿يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە. ١١٠)﴿ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا﴾ وە هەرکەسێك گوناهێك (ی گەورە) بکات ﴿فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ بێگومان (زیانی) ئەو گوناهە هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە زانای کاردرووستە. ١١١)﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً﴾ وە هەرکەسێك گوناهێك بکات (بەهەڵە) ﴿أَوْ إِثْمًا﴾ یان گوناهێك بکات (بەقەست) ﴿ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا﴾ پاشان (ئەو تاوانە) بخاتە سەر بێ تاوانێك ﴿فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا﴾ ئەوە بێ گومان خستویەتیە ئەستۆی خۆی (سزای) بوهتانێك ﴿وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ و تاوانێکی ئاشکرا. ١١٢) ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ وە ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا بەسەر تەوە نەبوایە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ﴾ بێ گومان دەستەیەك لەو ناپاکانە بە نیازبوون ﴿أَن يُضِلُّوكَ﴾ کە گومڕات بکەن ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ بەڵام ئەوانە بەس خۆیان گومڕا دەکەن ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ﴾ وە ئەوانە هیچ زیانێ ناگەیەنن بە تۆ ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ﴾ وەخوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەرت﴿ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ قورئان و دانایی ﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ﴾ وە ئەوەی کەنەتئەزانی فێری کردی ﴿وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾وە هەمیشە بەخشش خوا بەسەر تۆوە زۆر گەورەیە. ١١٣)

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾

- ئیتر ئیگا دەربارەی دابەزی ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِراً....﴾ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠٢) سورەتی (النساء): ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ﴾ ئەبوداود و نەسائی و ئیمامی ئەحمەد و حاكیم لە ئەبو عەیاشی زورەقی یەوە دەگێڕنەوە، كە وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووین لە عوسفان موشریكەكان بەرانبەرمان بوون بە سەركردەیی خالیدی كوڕی وەلید، ئەوان لەنێوان ئێمەو ڕووگە (قیبلە) دابوون، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی بە جەماعەت بۆ كردین جا موشریكەكان وتیان بەڕاستی موسڵمانەكان لەحاڵەتێكدا بوون زۆر باش بوو ئەگەر پەلامارمان بدانایە، پاشان وتیان: ئێستە نوێژێكی تر كاتی دێت كەلەلایان لە منداڵیان و خۆشیان خۆشترە، ئیتر جوبرەئیل –

﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ هیچ چاکەیەك نی یە لەزۆربەی چپەو سرتە کردنەکانیان دا ﴿إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ﴾ مەگەر یەکێك فەرمان بکات بەماڵ بەخشین یان چاکە ﴿أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ یان چاککردنی نێوان خەڵکی ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ جا هەر کەسێك ئەوە بکات ﴿ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ﴾ بەنیازی ڕەزامەندی خوا ﴿فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ﴾ ئەوە لە داهاتوودا پێ ی دەبەخشین ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتی زۆر گەورە. ١١٤) ﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ﴾ وەهەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات ﴿مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ﴾ پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە ﴿وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وشوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لەڕێگای بڕواداران ﴿نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ﴾ ڕووی وەردەگێرین بۆئەو ڕێبازەی کەحەزی بۆکردووە ﴿وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ﴾ و دەیخەینە دۆزەخ ﴿وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە. ١١٥) ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ﴾ بەڕاستی خوا خۆش نابێت ﴿أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ لەوەی کەهاوەڵی بۆ دابنرێت ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ بەڵام جگە لەوە هەرچی بێت لێ ی خۆش دەبێت ﴿لِمَن يَشَاءُ﴾ لە هەرکەسێك کە(خوا) بیەوێت ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ﴾ وە هەرکەسێك هاوەڵ بۆ خوا دابنێت ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕابونێکی دوور لەڕاستی. ١١٦) ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ﴾ جگە لە خوا نزاو هاوار ناکەن (ناپەرستن جگە لەخوا) ﴿إِلَّا إِنَاثًا﴾ تەنها لەچەند (بتێکی ناولێنراوی) مێ ینەیە نەبێت ﴿وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا﴾ وە ناپەرستن جگە لە شەیتانی یاخی و سەرکەش نەبێ. ١١٧) ﴿لَّعَنَهُ اللَّهُ﴾ کە خوا نەفرینی لێ کردووە ﴿وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ﴾ وە(شەیتان) وتوویەتی سوێند بێت هەڵدەبژێرم (بەبەندەی خۆم) ﴿مِنْ عِبَادِكَ﴾ لەبەندەکانت دا ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ بەشێکی دیاری کراو. ١١٨) ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ﴾ سوێند بێت گومڕایان دەکەم ﴿وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ و بەئاوات و خەیاڵی درۆینە سەرگەرمیان دەکەم ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ﴾ وە فەرمانیان پێ دەدەم جا بێگومان ئەوانیش گوێچکەی ئاژەڵەکان دەبڕن ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ﴾ وە فەرمانیان پێ دەدەم ﴿فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ﴾ ئەوسا ئەوانیش دروست کراوی خوا دەگۆڕن ﴿وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ وە هەرکەسێك شەیتان بکات بەدۆستی خۆی بێجگە لەخوا ﴿فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾ ئەوە بێ گومان زیانی لێ کەوتووە بەزیانێکی دیارو ئاشکرا. ١١٩) ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ﴾ (شەیتان) بەڵێنیان پێ دەدات و ئاوات و ئومێدیان دەخاتەبەر ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾ دڵنیابن شەیتان هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە لەخەڵەتاندن نەبێت. ١٢٠) ﴿أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئەوانە شوێن و جێگایان دۆزەخە ﴿وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا﴾ و هیچ شوێنی ڕاکردن و لادانیان دەست ناکەوێت لێ ی. ١٢١)

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟﴾ خۆ ئەگەر بەڕاستی نامەدارەکان بڕوایان بهێنایە ﴿وَٱتَّقَوْا۟﴾ و خۆیان بپاراستایە و پارێزکار بوونایە ﴿لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾ بێ گومان گوناهو خراپەکانیانمان دەسڕی یەوە لێیان ﴿وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ وە دەمانخستنە ناو بەهەشتانی پڕ ناز و نیعمەت. ٦٥) ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ﴾ وە بێگومان ئەگەر ئەو نامەدارانە تەورات و ئینجیلیان کار پێ بکردایە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم﴾ هەروەها ئەو قورئانەی کەهێنراوەتە خوارەوە بۆیان ﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ﴾ بێ گومان ڕۆزی یان دەخوارد لەلای سەرویانەوە (لە ئاسمانەوە) ﴿وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم﴾ وە لە ژێرپێیانەوە(لە زەوی یەوە) ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ﴾ تێیان دایە دەستەو کۆمەڵێکی ڕێکو پێك ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ بەڵام زۆرێك لەوان ﴿سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوەی دەیکەن زۆر بەدو خراپە. ٦٦) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ﴿بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ رایگەیەنە (بەخەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ﴾ وە ئەگەر وانەکەی ﴿فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندوەو بەجێت نەهێناوە ﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ وە خوا تۆ دەپارێزێ لەخەڵکی (کەبت کوژن) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونی بێ بڕوایان ناکات. ٦٧) ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ ئەی نامەدارەکان ﴿لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین ﴿حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ﴾ هەتا بەڕێك و ڕاستی پەیڕەوی تەوراتو ئینجیل نەکەن ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم﴾ هەروەها ئەو قورئانەی کەهێنراوەتە خوارەوە بۆتان ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾ لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم﴾ سوێند بەخوا زیاد ئەکات بۆ زۆریان ﴿مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا﴾ سەرکەشی و بێ باوەڕییان (زیاد دەکات) ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە خەم مەخۆ لەسەر کۆمەڵی بێ بڕوایان. ٦٨) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ و ئەوانەی بوون بەجولەکە ﴿وَٱلصَّٰبِـُٔونَ﴾ ئەستێرە پەرست یان فریشتە پەرست ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ وە شوێن کەوتوانی عیسا پێغەمبەر ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ هەر کەس لەوانە بڕوایان هێنابێ بەخوا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ و بە ڕۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ و کردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ئەوە نەهیچ مەترسیەکیان لەسەرە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە نەخەفەت بار ئەبن (لەڕۆژی دوایی دا). ٦٩) ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ﴾ سوێند بەخوا پەیمانی بەهێزمان وەرگرت لە نەوەکانی ﴿إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئیسرائیل ﴿وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا﴾ و چەند پێغەمبەرێکمان نارد بۆیان ﴿كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ﴾ هەر جارێك پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە ﴿بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ﴾ بە هەر فەرمانێ کە بەدڵیان نەبوایە ﴿فَرِيقًا كَذَّبُوا۟﴾ دەستەیەکیان بەدرۆزن دائەنان ﴿وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾ وە دەستەیەکیشیان دەکوشتن. ٧٠)

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ
عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ وَٱللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا
يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ
ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ
ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ
ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾
لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ
إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ
إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾
مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ
ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ
ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ
يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾

= قال: أخذ رسول الله (ﷺ) بمنكبي فقال: (كن في الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل) وكان ابن عمر (رضي الله عنهما) يقول (إذا أمسيت فلا تنتظر الصباح وإذا أصبحت فلا تنتظر المساء، وخذ من صحتك لمرضك ومن حياتك لموتك) (رواه البخاري) لە عەبدوللای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) ڕیوایەت كراوە كە دەڵێت: پێغەمبەر شانی گرتم و وتی: (لە دونیادا وەك كەسێكی دوور لە خزم و كەسی خۆی یان وەك ڕێبوار وابە) وە عەبدوللای كوڕی عومەر دەیووت: ئەگەر ئێوارەت كردەوە چاوەڕوانی بەیانی مەبە، وە ئەگەر بەیانیت كردەوە چاوەڕوانی ئێوارە مەبە، لە كاتی لەش ساغیت دا چاكە بكە بۆ كاتی نەخۆشی و لە ژیاندا چاكە بكە بۆ دوای مردنت).

ئایەتی (١٧) سوورەتی (آل عمران) قال رسول الله (ﷺ) (قال الله تعالى: يا ابن آدم ، إنك ما دعوتني-

﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ وایان دەزانی کەتۆڵە و سزا دووچاریان نابێت ﴿فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾ جا بۆیە کوێرو کەڕبوون ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ لە پاشان خوا تەوبەو گەڕانەوەی لێ وەرگرتن ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە زۆر بەیان کوێرو کەڕبوون (لەبیستن‌و بینینی بەڵگەو ئایەتەکانی خوا) ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ وە خوا بینەرە بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن. ٧١)﴿لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ سوێند بێت بێ گومان بێ باوەڕبوون ئەوانەی کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ بێگومان خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە ﴿وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ لەکاتێکدا مەسیح (کاتێ ڕەوانەکرا) ووتی ئەی نەوەی ئیسرائیل ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ﴾ تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەشە ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ﴾ بەڕاستی هەر کەس هاویەش بۆخوا دابنێ ﴿فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام کردووە ﴿وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾وە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتی دەرێك نی یە.٧٢)﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بێ باوەڕبوون ئەوانەی کەووتیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾ بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا (کەبریتین لەپەروەردگارو عیساو دایکی) ﴿وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾ (لەکاتێکدا) هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە بێجگە لەتەنیا خوایەك ﴿وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ﴾ وە ئەگەر واز نەهێنن لەو ووتە ناڕەواو بەدانە ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ﴾ سوێند بەخوا دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کەبێ باوەڕبوون ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزایەکی بەئازارو سەخت. ٧٣)﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ﴾ دەی ئایا بۆ تۆبە ناکەن‌و ناگەڕێنەوە بۆلای خوا؟﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥ﴾ و داوای لێبوردنی لێ ناکەن؟ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ لەکاتێکدا خوا لێبوردەی میهرەبانە. ٧٤)﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ﴾ مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ نی یە جگە لەپێغەمبەری خوا ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ بێگومان لەپێش ئەوەوە چەندەها پێغەمبەر بوون ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞ﴾ دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست گۆیە ﴿كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾ هەردووکیان خواردنیان دەخوارد (واتە خوانین) ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ سەرنج بدە چۆن ئایەت و بەڵگەکان ڕوون دەکەینەوە بۆیان ﴿ثُمَّ ٱنظُرۡ﴾ پاشان سەیرکە ﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ چۆن لا دەدرێن لەحەق بەرەو بەتاڵ. ٧٥)﴿قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئایا ئێوە بێجگە لەخوا شتێك دەپەرستن؟ ﴿لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾ کە هیچ زەرەرو سوودێکی نی یە بۆتان ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ وە خوا هەر خۆی بیسەری زانایە. ٧٦)

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٨٢) سورەتی (المائدة): ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً ...﴾: ئیبنوئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەییب و ئەبوبەکری کوڕی عبدوڕەحمان و عورەوەی کوڕی زوبەیرەوە ووتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەمری کوڕی ئومەییەی ضەموری نارد بۆ لای نەجاشی و نامەیەکی دلیە بۆی، هەر کە گەیشتە لای نەجاشی نامەکەی خوێندەوە و پاشان ناردی بە دوای جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب و هاوەڵە کۆچەرییەکانیدا هەروەها ناردی بەدوای ڕاهیب و کەشیشەکاندا ئینجا فەرمانی دا جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب سورەتی مەریەمی بەسەردا خوێندنەوە. یەکسەر بڕوایان هێنا بە قورئان و چاویان پڕبوو لە فرمێسک تا ئەمانە ئەوانە بوون کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی لە بارەیانەوەنارده خوارەوە ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً﴾ تا ﴿فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾.

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئەی نامەدارەکان ﴿لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ﴾ زیادە ڕەوی مەکەن لەئاینەکەتاندا ﴿غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ جگە لەوە نەبێت کەڕاستو حەقە ﴿وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ﴾ و شوێن ئارەزووی کەسانێک مەکەون ﴿قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ﴾ کەبەڕاستی پێشتر گومڕاو سەرلێ شێواو بوون ﴿وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا﴾ وە زۆر کەسیشیان گومڕاکرد ﴿وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە خۆشیان گومڕابوونو لایاندا لەڕێگای ڕاست. ٧٧) ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون ﴿مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل ﴿عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ﴾ لەسەر زمانی داوود ﴿وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ و عیسای کوڕی مەریەم ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟﴾ ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد ﴿وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾ و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد. ٧٨) ﴿كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ﴾ ئەوانە بەرگری یەکتری یان نەدەکرد ﴿عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ﴾ لەهەر کارێکی بێزراوی بێ شەرعی کەدەیانکرد ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی کەئەیانکرد. ٧٩) ﴿تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ﴾ ئەبینی (ئەی موحەممەد(ﷺ)) زۆر بەیان ﴿يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ بێگومان زۆر بەدو خراپە ئەوەی کەپێشیان خست بۆخۆیان (کردویانە) ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ کە هۆی خەشم و قینی خوا بوو لێیان ﴿وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ﴾ وە ئەوانە لەسزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە. ٨٠) ﴿وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بەخوا ﴿وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ﴾ و پێغەمبەرو ئەو بەرنامەیەی کەنێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ﴿مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ ئەو بێبڕوایانە یان نەدەکرد بەدۆستو برادەر ﴿وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ﴾ بەڵام زۆر بەیان ﴿فَٰسِقُونَ﴾ لەئاین دەرچوونو یاخین لەخوا. ٨١) ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ سوێند بێت دەبینیت (ئەی موحەممەد(ﷺ)) خراپترینی خەڵکی بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ بڕواداران دا ﴿ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟﴾ جوولەکە و هاوبەش دانەرانن ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وە سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لەخۆشەویستی بۆ بڕواداران ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ﴾ ئەوانەن کەدەیان ووت بێگومان ئێمە گاوورین ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا﴾ ئەوەش لەبەر ئەوەیە بێگومان لە ناویاندا قەشەو کۆشەگیرانێک هەن ﴿وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ کە بەڕاستی ئەوان خۆیان بەزل و گەورە دانانێن. ٨٢)

وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾

**هۆی هاتنە** خـوارەوەی ئایـەتی (٨٧) سـورەتی (المائـدة): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ ...﴾: تـورمزی گێڕاویەتی یـەوە کەعەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر (ﷺ) و ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەڕاسـتی مـن هـەر کاتـێ گۆشتم خوارد بێ تاقەتی ژن ئەبم و ئارەزوو ئـەمگرێ بۆیە گۆشت خواردنم لەسەر خۆم حەرام کردووە و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی (٨٩) سـورەتی (المائـدة): ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ئیبن ماجە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە کە ووتویـەتی: پیـاو هـەبوو بژێوی خێزانەکەی ئەدا بە جۆرێکی زۆر فراوان و پیاوی واش هەبوو بژێوی خێزانەکەی –

﴿وَإِذَا سَمِعُواْ﴾ هەر کاتێ گوێیان لێ بووایە﴿مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ ئەو قورئانەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)﴿تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ﴾ دەبینی چاوەکانیان ﴿تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ﴾ لە فرمێسك (پڕدەبێ و) دەڕژێت ﴿مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ لەبەر ئەو ڕاستی یەی کە زانیویانە (و بۆیـان دەرکـەوتوە) ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ ئـەڵێن ئـەی پـەروەردگارمان ئـەوا ئێمـە باوەڕمان هێنا ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ دەتـۆش لەگـەڵ شـايەت دەران ناومـان بنوسـە. ٨٣)﴿وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ بۆچی دەبێ ئێمە باوەڕ نەهێنین بە خوا ﴿وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ و بەوەی کـە بۆمـان هـاتووە لـە حـەق و ڕاسـتی ﴿وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا﴾ لـە کاتێکدا ئومێدمان وابێ پەروەردگارمان بمانخاتە﴿مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ڕیـزی پیـاو چاکانەوە. ٨٤) ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ﴾ جا خوا پاداشتیان ئەداتەوە بـەهۆی ئـەوەوە کـە ووتیـان ﴿جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بەچەند باخێك کە ڕووبار بە ژێریاندا دەڕوات ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ دەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ وە ئەوەیـە پاداشـتی چـاکە کاران. ٨٥) ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ وە ئەوانـەی باوەڕیـان نـەهێناو ئایەتـەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوانـەن هـاوەڵانی دۆزەخ. ٨٦)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەو شتە پاك و خۆشانەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بۆتان یاساغی مەکـەن لـە خۆتـان ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ﴾ و سنوور مەشکێنن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ چونکە بێ گومان خوا سنوور شکێنەرانی خۆش نـاوێ. ٨٧)﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ بخـۆن لـەو ڕسـق و ڕۆزیانـەی کـە خـوا پێـی بەخشیوون ﴿حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾ کـە حـەڵاڵ و پـاکن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾ خۆتـان بپارێزن و بترسن لەو خوایەی کە ئێوە باوەڕتان پێ یەتی. ٨٨)﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا لێتان ناگرێ ﴿بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ ئەو سوێندانەتان کە نیازی دڵی لەگەڵدا نی یە ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم﴾ بـەڵام لێ تـان ئـەگرێ (بـە گوناهبارتـان دادەنـێ) ﴿بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾ بە(شکاندنی) سـوێندێ کەبـەنیازی دڵ داتـان بەسـتبێت ﴿فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ﴾ جـا کـەفارەتی (سڕینەوەی شکاندنی) ئەو سوێندانە ﴿إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ﴾ خۆراك دانی دە هەژارە ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ لە خۆراکێ مام ناوەندی کە بە منداڵ وخێزانی خۆتانی دەدەن ﴿أَوْ كِسْوَتُهُمْ﴾ یا پۆشاکی دە هەژار ﴿أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ یا ئـازاد کردنـی بەندەیـەك ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ جائەوەی دەستی نەکەوت هیچ کام لەمانە ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ﴾ ئەوە سێ ڕۆژ بـە ڕۆژوو بێت ﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾ ئەوە(ی باسکرا) کەفارەتی سـوێندەکانتانە کاتـێ کـە سـوێندتان خـوارد(و سـوێندەکەتان شـکاند) ﴿وَٱحْفَظُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ﴾ وە سـوێندەکانتان بپارێزن ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ بەو جۆرە خـوا ئایەتەکانی خـۆی بـە ڕوونی باسـی ئەکات بۆتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سـوپاسی بکەن. ٨٩)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٌ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

-ئەدا بە جۆرێکی کەم و ناڕەحەت جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٩٠-٩١) سورەتی (المائدة): ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ....﴾ ئیبن جەریر لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: یاساغ بوونی عارەق لەسەر دوو تیرەی ئەنصار هاتە خوارەوە کە عەرەقیان خواردبوویەوە تاوایان لێ هات مەست و سەرخۆش بوو بوون و گاڵتەیان بەیەکتری کردبوو لەیەکتریان دابوو ئینجا کاتێ سەرخۆشییەکە بەری دابوون هی وایان هەبوو شوێنی لێدانی دەبینی بەڕوخسار و ڕوومەتیەوە و دەیووت ئەمە فلان کەسی برام وای لێ کردووم(ئەوان برای یەک بوون لەدڵیاندا بەرامبەری یەک کینە نەبوو) سوێند بەخوا ئەگەر ئەو برایەم-

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ﴾ بێ گومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت﴿وَٱلۡأَزۡلَٰمُ﴾ و ئەو پارچە دارانەی (کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنووس) ﴿رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ ئەوانە پیسن و لەکردەوەی شەیتانن﴿فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ کەواتە دوورکەونەوە لێ ی تاڕزگاربن. ٩٠) ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ ﴿أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ﴾ کە دوژمنایەتی و کینەو ڕق بخاتە ناوتانەوە﴿فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ﴾ بەهۆی ئارەق و قومارەوە ﴿وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ وە بەرگریتان بکات لەیاد و باسی خوا و لەنوێژ کردن ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە وازدەهێنن (لەو خراپانە)؟. ٩١) ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾ وە فەرمانبەر و گوێ ڕایەڵی خوا بن﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ وە فەرمانبەرو گوێ ڕایەڵی نێرراوە کەی بن﴿وَٱحۡذَرُواْ﴾ و بترسن (ئاگادارین)﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن و فەرمان بەری نەکەن ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ ئەوا بزانن ﴿أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا﴾ بێگومان ئەوەی کە لەسەر نێردراوەکەی ئێمە بێ ﴿ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ بەس ڕاگەیاندنی ڕوون و ئاشکرای ئایینەکەیە. ٩٢)﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ نەبووەو نی یە لەسەر ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾ هیچ گوناهێك لەوەی خواردویانە (ئارەق و پارەی قومار پێش حەرام کردنیان) ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَواْ﴾ ئەگەر خۆیان پاراستبێ (لەو چەرخەدا لەوەی کە حەرام بووە لە سەریان) ﴿وَّءَامَنُواْ﴾ وە باوەڕداربووبن ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ﴾ پاشان خۆیان پاراستبێ (لەوەی کە حەرام کرابێ) ﴿وَّءَامَنُواْ﴾ و بڕواشیان هەبوبێت (بەوەی کە هاتبێ لە لایەن خواوە) ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ﴾ پاشان بەردەوام بووبن لەسەر خۆ پارێزی ﴿وَّأَحۡسَنُواْ﴾ و چاکەکانیشیان بەچاکی کردبێ ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ وە خوا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێ. ٩٣)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ﴾ سوێند بە خوا، خوا تاقیتان دەکاتەوە﴿بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ﴾ بە هەندێك نێچیر ﴿تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ﴾ کە بەدەست دەیانگرن و بە ڕمەکانتان ڕاویان دەکەن﴿لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ تا خوا دەری بخات کێ لێ ی دەترسێ بە پەنهانی ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەرکەس دەست درێژی بکات دوای ئەو (هەواڵ پێدانە)﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەوە بۆی هەیە سزایەکی بەئازار. ٩٤)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ﴾ نێچی مەکوژن ﴿وَأَنتُمۡ حُرُمٞ﴾ لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان ﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا﴾ وە ئەوەتان بەدەستی ئەنقەست بیکوژێ ﴿فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ﴾ ئەوە لەسەریەتی سەر بڕینی وێنەی ئەوەی کە کوشتویەتی ﴿مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ لە ئاژاڵ و ماڵات ﴿يَحۡكُمُ بِهِۦ﴾ ئەو بڕیارە بدەن (نێچیرەکە لە بەرانبەر چ ئاژەڵێکدایە) ﴿ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾ دوو پیاوی موسڵمانی چاك لەخۆتان ﴿هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ﴾ بە شێوەی قوربانی بگاتە کەعبە (و لەوێ بیکات بەقوربانی) ﴿أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ﴾ یان بە ئەندازەی نرخی قوربانیەکە خۆراك بدات بە چەند هەژارێ ﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا﴾ یان بەقەدەر ئەو خۆراکدانە ڕۆژوو بگرێت ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی بچێژێ ئۆباڵی کارەکەی ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾ خوا خۆش بووە لەوەی کە تێپەڕی و بەسەرچوو ﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ بەڵام هەرکەسێك بگەڕێتەوە (بۆ سەر ئەو کردەوەیە) ﴿فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُ﴾ ئەوا خوا تۆڵەی بە تینی لێ دەسێنێ ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ وەخوا زاڵە و خاوەنی تۆڵەی بەتینە. ٩٥)

أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾

- بەرامبەر بەمن سۆزو بەزەیی هەبوایە وای لێ نەئەکردم **تاوایان** لێ هات لەنێوانیاندا بەهۆی عارەق خواردنەوە رق و **کینە** دروست بوو ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ﴾ تا دەگاتە ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ ئینجا کەسانێکی پڕ چوو لەئایندا ووتیان عارەق پیسەو فلان کەس لە ئوحوددا کوژراوە هەر عەرەقی خواردووە جا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ ...﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٩٣) سورەتی (المائدة): ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ ...﴾ بوخاری لەئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کەووتی: من لەماڵی ئەبو طەلحەدا شەراب گێڕی کۆمەڵێك بووم لەوکاتەدا عارەقەکەیان لەخورما و ترێ بوو جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا -

﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ ڕاو(ی نێچیر) و خواردەمەنی دەریایی حەڵاڵ کراوە بۆتان ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ تا ئێوە و گەشتیارەکان سوودی لێ وەربگرن ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ﴾ و ڕاو(نێچیر)ی کێوی و ووشکایی یاساغ کراوە لێتان ﴿مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ تا لە ئیحرامدا بن ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ﴾ لە (بێ فەرمانی) ئەو خوایە بترسن کە﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ هەر بۆ لای ئەو کۆدەکرێنەوە (لە ڕۆژی دوایی دا). ٩٦)﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ﴾ خوا کەعبە کە (بيت الحرام)ە دایناوە بەهۆی ﴿قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ ڕاوەستانی کاروباری دین ودنیای خەڵکی ﴿وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ﴾ وە هەروەها مانگە یاساغەکان (کە جەنگ تێیاندا حەرامە)و قوربانیە دیاری نەکراوەکان و قوربانیە دیاری کراوەکان ﴿ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەوەش بۆ ئەوەی کە بزانن بەڕاستی خوا ﴿يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەزانێ و بە ئاگایە کە چی وا لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە بێگومان خوا بە هەموو شتێ زانایە. ٩٧)﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ باش بزانن کە بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بە تینە (بۆ یاخیان) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە بەڕاستی خوا لێبووردەی میهرەبانە (بۆ تۆ بەکاران). ٩٨) ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ﴾ نێردراوەکەی خوا هیچی لەسەر نی یە بێجگە لە ڕاگەیاندن ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ وە خوا دەزانێ بەوەی دەری دەخەن بەوەش دەیشارنەوە. ٩٩)﴿ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ پیس و پاك وەك یەك نین ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ﴾ هەرچەند سەرسامت بکات ﴿كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ﴾ زۆری پیسەکە ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ کەواتە لەخوا بترسن ﴿يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئەی خاوەنانی ژیریو هۆشمەندان ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ تا ڕزگار بین ١٠٠)﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە﴿لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ﴾ پرسیار مەکەن لە شتانێك ﴿إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ ئەگەر ئاشکرا بکرێن بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان﴿وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا﴾ وە ئەگەر پرسیار بکەن دەربارەیان ﴿حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ﴾ کاتێ قورئان دەنێردرێتە خوارەوە، بۆتان ئاشکرا دەکرێن ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا﴾ خوا خۆش بووە لەو پرسیارانەی لەوە و پێش ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ وە خوا زۆر لێبووردەی لەسەرخۆیە. ١٠١) ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ﴾ بێگومان ئەو (جۆرە) پرسیارانەیان کرد کۆمەڵێ ﴿مِّن قَبْلِكُمْ﴾ پێش ئێوە﴿ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ﴾ پاشان بێ بڕوا بوون بەهۆی ئەو پرسیارانەوە. ١٠٢)﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ﴾ خوا داینەناوە و بڕیاری نەداوە (سوود وەرنەگرتن لەم چوار جۆرە ووشترە) ﴿مِنۢ بَحِيرَةٍ﴾ لەبەحیرە: (ووشترێك بوو پێنج سکی بکردایەو پێنجەم نێر بوایە، ئەو کاتە گوێچکەیان لەت دەکرد و بەرەڵایان دەکرد) ﴿وَلَا سَآئِبَةٍ﴾ و سائیبە: ( ووشترێك بوو کە دە تا دوانزە سکی بکردایە هەموو مێینە بوایە)﴿ وَلَا وَصِيلَةٍ﴾ و وەصیلە: ( ووشترێك بوو یەکەم و دووەم سکی مێینە بوایە)﴿ وَلَا حَامٍ﴾ و حام: ( ووشترێکی نێر بوو کە لە پشتی ئەو دە سك پەیدا ببوایە) ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕبوون ﴿يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ درۆ بە دەم خواوە هەڵئەبەستن ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ و زۆربەیان ژیر نین (نەزانن). ١٠٣)

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

– بەجارێ مرۆڤ جارێ دەلێ بلێ خەلکینە بێدارین عەرەق حەرام کراوە ئەنەس وتی ئەبو طەلحە پێی ی وتم بڕۆ ئەو عەرەقە برژە منیش بردم و ڕژاندم و عەرەقەکە بەکۆلانەکانی مەدینەدا دەڕژێت کەسانێک وتیان کۆمەلێک موسلمان شەهیدبوون و عارەقیان خواردۆتەوە جا خوای ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا..﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠١) سورەتی (المائدة): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا..﴾ بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) وتارێکی دلەرگیز وێنەی ئەو وتارەم نەبیستبوو فەرمووی(ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتان زانیایە بەڕاستی کەم پێ دەکەنین و زۆر دەگریان) ئەنەس دەلێ ئینجا هاوەلانی پێغەمبەر (ﷺ)دەم و چاویان داپۆشی و دەنگی گریانیان دەهات –

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا﴾ وەکاتێ کە بووترێ پێیان وەرن ﴿إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ بۆ لای ئەو قورئانەی کە خوا ناردویەتیە خوارەوە ﴿وَإِلَى الرَّسُولِ﴾ و بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ﴿قَالُوا حَسْبُنَا﴾ دەڵێن بەسمانە ﴿مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ ئەو(ئاینەی) کەباوك و باپیرانمان لەسەری بوون ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ﴾ ئایا(چاویان لێ دەکەن) ئەگەر لە حاڵێکدا باو باپیرانیشیان ﴿لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ هیچ شتێکیان نەزانیبێ و گومڕابووبن. ١٠٤) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ هۆشتان بە خۆتانەوە بێت ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ﴾ زیانتان پێ ناگەیەنێ ئەوەی گومڕا بووە ﴿إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێی ڕاست بن ( بەرگری کردن لەخراپە بەشێکە لە ڕێنموونی وەرگرتن) ﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەی هەمووتان بە گشتی ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا هەواڵتان پێ ئەدا بەهەر کردەوەیەك کە کردووتانە. ١٠٥) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ﴾ شایەتی بدەن لە نێوانتاندا ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ کاتێ کەمردنی هەرکامتان نزیك بوویەوە ﴿حِينَ الْوَصِيَّةِ﴾ لەکاتی وەسیەت کردنتاندا ﴿اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان (موسوڵمان بن) ﴿أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافرین) ﴿إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوون بە وڵاتدا ﴿فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ و بەڵای مردنتان تووش هات ﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ﴾ (دوو شایەتەکە) ڕاگرن لەپاش نوێژ (ی عەسر) ﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ﴾ دەبێ سوێند بخۆن بەخوا ﴿إِنِ ارْتَبْتُمْ﴾ ئەگەر گومانتان بوو (لە ڕاستی و پاکی یان) ﴿لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا﴾ ئێمە(سوێند خواردنمان) بەخوا ناگۆڕینەوە بەهیچ نرخێك ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ باشایەتی بۆدراوەکە خزم و نزیکیش بێت ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ﴾ وە شایەتی (دان بۆ) خوا ناشارینەوە ﴿إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ﴾ بێگومان (ئەگەر شایەتییەکەمان شاردەوە) کەواتە بەڕاستی لە گوناهباران دەبین. ١٠٦) ﴿فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ﴾ ئینجا ئەگەر زانرا (پاش سوێند خواردنیان) بەوەی ﴿أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا﴾ کەئەو دوو شایەتە درۆیان کردوەو خۆیان تاوان بارکردووە ﴿فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا﴾ ئەوە دووکەسی تر لە شوێنی ئەواندا هەڵدەستن (بەسوێند خواردن) ﴿مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ﴾ لەوانەی کەشیاوو نزیکترین (لەمردووەکە) لەو دووانە ﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ﴾ئینجا هەردووکیان سوێند بخۆن بە خوا ﴿لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا﴾ کەبەڕاستی شایەتیەکەی ئێمە ڕاسترە لە شایەتیەکەی ئەو دووانەی پێشوو ﴿وَمَا اعْتَدَيْنَا﴾ وە لەڕاستی لامان نەداوە (لەسوێند خواردنەکەماندا) ﴿إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان (ئەگەر لابدەین) ئەوکاتە ئێمە لەستەمکاران دەبین. ١٠٧) ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ﴾ ئەو(جۆرە شایەتی دانە) نزیکترە ﴿أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا﴾ کە شایەتەکان هەڵسن بە شایەتیەکەیان بەشێوە ڕاستەکەی ﴿أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ﴾ یابترسن لە ڕەدکردنەوەی سوێندەکان (بۆخزمی نزیکی مردووەکە) ﴿بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ دوای سوێند خواردنی ئەمان (واتە بە درۆ بخرێنەوە) ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا﴾ بترسن لە خوا و خۆتان بپارێزن و گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوا بن ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی کۆمەڵی لەسنوور دەرچوو ناکات. ١٠٨)

۞ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُواْ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾ إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾

- پیاوێك ووتی بەپێغەمبەر(ﷺ) كێ باوكی منە؟ فەرمووی فلان كەس لەوكاتەدا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لا تَسْأَلُواْ عَنْ..﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠٦-١٠٨) سورەتی (المائدة)**: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ...﴾ بوخاری دەگێڕێتەوە لە عەبدوللای كوڕی عەبباسەوە: ووتی لە تەمیمی داریەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ...﴾ دەگێڕێتەوە دەڵێ هەموو خەڵك لێ ی بەری بوو جگە لەمن و عەدی كوڕی بەدداء، جا ئەوان كە هەردووكیان نەصرانی بوون و هات و چۆی شامیان دەكردو دەچوون بۆ مەككەو زۆر دەمانەوە لەوێ ئینجا لەپاش كۆچ كردن بۆ مەدینە، شوێنی بازرگانیەكەیان گواستەوە بۆ مەدینە جارێكیان لەوێ دەرچوون بۆ شام و گەنجێك لە(بني سهم) لە گەڵیان هات لە شوێنێكدا گەنجەكە مرد -

﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾ لە ڕۆژێك (بترسن) خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە﴿فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ﴾ ئەوسا پێیان دەفەرموێ چ وەڵامێکتان درایەوە؟﴿قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ﴾ دەڵێن هیچ زانیارییەکمان نی یە﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ بێگومان تەنها تۆ ئاگاداری هەموو نهێنیەکانیت. ١٠٩)﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ (بیر بکەرەوە) کاتێ خوا بە عیسای کوڕی مەریەمی فەرموو ﴿ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾ بیربکەرەوە لەچاکە و بەهرەی من بەسەر خۆت و دایکتەوە ﴿إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ کاتێ کە پشتیوانیم لێ کردیت بە گیانی هەرە پیرۆز (جوبرەئیل)﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا﴾ کاتێ لەبێشکەدا بوویت و بەگەورەییش قسەت لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد ﴿وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ﴾ وە کاتێکیش فێری کتێب (نووسین) و دروست کاری و تەورات و ئینجیلم کردیت ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا﴾ وەبیربکەرەوە کاتێ بەفەرمانی من لەقوڕ شتێکت لە شێوەی باڵندە دروست دەکرد ﴿فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى﴾ دەست بەجێ بەفەرمانی من ئەبوو بە باڵندە﴿وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى﴾ وە بەفەرمانی من کوێری زکماك و بەڵەکیت چاك دەکردەوە﴿وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى﴾ وەکاتێ بەفەرمانی من مردووانت لە گۆڕ دەردەهێنا (بەزیندوو کراوەیی) ﴿وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ﴾ وە بیربکەرەوە کاتێ بەرگری نەوەکانی ئیسرائیلم کردلێت (بتکوژن) ﴿إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ کاتێکیش موعجیزە ڕوونەکانت بۆهێنان ﴿فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾ جا ئەوانەیان کە بێ باوەڕبوون ووتیان ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی ئەمە هیچ نی یە جگەلە جادوویەکی ئاشکرا. ١١٠)﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ﴾ وە (بیربکەرەوە) کاتێ خستمە دڵی هاوەڵە تایبەتیەکانت ﴿أَنْ ءَامِنُواْ بِى وَبِرَسُولِى﴾ کەبڕوا بێنن بە من و بە پێغەمبەرەکەم (عیسا) ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ﴾ ئەوانیش ووتیان: ئەوا بڕوامان هێنا و تۆش شایەت بە کە بێگومان ئێمە موسڵمانین. ١١١)﴿إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ کاتێ حەواریەکان ووتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێ ﴿أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرێتە خوارەوە ﴿قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ (عیسا) ووتی لەخوا بترسن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕدارن. ١١٢)﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا﴾ (حەواریەکان) ووتیان دەمانەوێ لێی بخۆین ﴿وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ ودڵمان ئارام ببێ و دڵنیابین (کەپێغەمبەریت) ﴿وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا﴾ وەبزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵ کردوین (لەوەی کەپێت ڕاگەیاندین) ﴿وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ ئێمەش ببین بەشایەت لەسەری(بۆئەوانەی ئامادەنین). ١١٣)

قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ
خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ
مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾
وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي
وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ
أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي
نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا
قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ
عَلَيۡهِمۡ شَهِيدًا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ
عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ
وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ
يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٌ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾
لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ قَدِيرُۢ ﴿١٢٠﴾

- کەموسڵمانی تیانەبوو، وەسیەتی کرد بۆیان کە ئەو ماڵەی پێیەتی بیدەنەوە بەخاوەنەکەی، ئەوانیش دایانەوە بەڵام جامێکی زیوی تیابوو هەڵیان گرت و فرۆشتیان بۆ خۆیان لە لەپاش سوێند دان و سوێند خواردنیان جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە ئەوانەی کڕیبویان ووتیان لەتەمیم و عەدی مان کڕیوە ، پاشان دووکەس لە میرات گرانی مردووەکە هاتن و سوێندیان خوارد کەئەم جامە هینی فلانە مردووە و شایەتیەکەی ئێمە ڕاسترە لەشایەتیەکەی ئەوان و ئێمە دەست درێژیمان نەکردوە، ئەفەرموێ: ئینجا جامەکە وەرگیرا لێیان و لەواندا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە.

- وردجوتني غفرت لك على ماكان منك ولأبالي يابن آدم لوبلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك يابن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لاتشرك بي شيئاً لأتيتك بقرابها مغفرة)(رواه الترمذي) -

﴿قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ عیسای کوڕی مەریەم فەرمووی ﴿ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەی خوای پەروەردگارمان لەئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرە خوارەوە ﴿تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا﴾ تا ببێ بە جەژن بۆ ئێستامان و نەوەکانی داهاتووشمان ﴿وَءَايَةٗ مِّنكَ﴾ وەموعجیزە و بەڵگەیەك بێت لەلایەن تۆوە ﴿وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وە رسق و ڕۆزیمان پێ ببەخشە چونکە تۆ باشترینی هەموو ڕۆزی دەرانی. ١١٤) ﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡ﴾ خوای گەورە فەرموی: بە ڕاستی من ئەو خوانە دەنێرمە خوارەوە بۆتان ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ﴾ ئینجا هەر کەس لەئێوە بێ بڕوا و نا سوپاس بێ لە پاش ئەوە ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا﴾ ئەوە بێگومان سزاکی ئەدەم ﴿لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ کە سزای هیچ کەسی پێ نادەم لەجیهانیان. ١١٥) ﴿وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ وە(بیر بکەرەوە) کاتێ خوا دەفەرمووێ (لەڕۆژی دواییدا) ئەی عیسای کوڕی مەریەم ﴿ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ﴾ ئایا تۆ ووتووتە بە خەڵکی ﴿ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەمن و دایکم بەدوو پەرستراو دابنێن (وبمانپەرستن) لەجیاتی خوا؟ ﴿قَالَ سُبۡحَٰنَكَ﴾ (عیسا) ووتی: پاك و بێ گەردی بۆ تۆ ئەی خوایە ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّ﴾ نابێ و ناگونجێ بۆ من شتێ بڵێم کە بە هیچ شێوەیەك مافی من نی یە ﴿إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ﴾ ئەگەر من ئەو قسەیەم کردبێ ﴿فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥ﴾ ئەوە بەڕاستی تۆ ئاگات لێ یە﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي﴾ چونکە تۆ ئەوەی لە ناخم دایە دەیزانی ﴿وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ﴾ بەڵام من نازانم و بێ ئاگام لەوەی کە لەناخی تۆدایە﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنی یەك. ١١٦) ﴿مَا قُلۡتُ لَهُمۡ﴾ هیچم پێ نەوتوون ﴿إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ﴾ بێجگە لەوە نەبێت کە تۆ فەرمانت پێ داوم ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ﴾ کە بەندایەتی خوا بکەن کەپەروەردگاری من و ئێوەیشە ﴿وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡ﴾ و من شایەت و چاودێر بووم بە سەریانەوە تا لە ناویاندا بووم ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي﴾ ئینجا کاتێ تۆ منت بردەوە (و بەرزت کردمەوە بۆ ئاسمان) ﴿كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡ﴾ هەر خۆت چاودێر بووی بەسەریانەوە ﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ وەخۆت ئاگادار و شایەتی بەسەر هەموو شتێکەوە. ١١٧) ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَ﴾ ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن ﴿وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ وەئەگەر لێشیان خۆش ببی﴿فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بەدەستەڵاتی کاردروست. ١١٨) ﴿قَالَ ٱللَّهُ﴾ خوای گەورە فەرمووی: ﴿هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡ﴾ ئەمە ڕۆژێکە راستبێژان راستیەکەیان کەڵکیان پێدەگەیەنێ ﴿لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ بەهەشتانێکیان بۆ هەیە کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗا﴾ ئەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ خوا ڕازی بووە لێیان و ئەوانیش لە خوا رازی بوون ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە. ١١٩) ﴿لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ هەر بۆ خوایە خاوەنداریّتی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَمَا فِيهِنَّ﴾ و هەرچیشیان تێدایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ﴾ وە تەنها ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانا و دەسەڵاتدارە. ١٢٠)




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾

=پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: خوای گەورە فەرموویەتی: (ئەی نەوەی ئادەم بەڕاستی تۆچەند داوام لێ بکەیت و لێم بپاڕێیتەوە لێت خۆش دەبم لەوانەی کردووتە وبەلامەوە ئاسانە، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر تاوانت بگاتە هەورەکانی ئاسمان پاشان داوای لێبووردنم لێ بکەیت لێت دەبوورم ئەی ئادەمیزاد بەڕاستی ئەگەر پڕی زەوی تاوانت هەبێت و بگەڕێیتەوە لام و هاوەڵم بۆ بڕیار نەدەیت بەهێندەی ئەوە بە لێبووردنەوە دێم بە پیرتەوە).

ئایەتی (٢٨) سورەتی (آل عمران)؛ وعن أنس (رضي الله عنه) قال: خطبنا رسول الله (ﷺ) خطبة ما سمعت مثلها قط، فقال (لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلاً و لبكيتم كثيراً) فغطى أصحاب رسول الله (ﷺ) وجوههم ولهم خنين) (متفق عليه) ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) وتارێکی دا هەرگیز وتاری وام نەبیستبوو، فەرمووی:=

## سورەتی ﴿الأنعام﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشەندەی میهرەبان. ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ هەموو سوپاس و ستایشێ هەربۆ ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾ وە تاریکی یەکان و ڕووناکی داناوە﴿ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ ئینجا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون هاوتا و هاوبەش بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن. ١)﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەئێوەی لەقوڕ دروست کردووە﴿ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا﴾ پاشان کاتێکی دیاری کردووە(بۆ مردن) ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ﴾ وە کاتێکی دیاری کراویش لای خوای گەورە دانراوە (بۆ قیامەت) ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾ کەچی دوا ئەوەش ئێوە بەگومانن. ٢)﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ﴾ وەتەنها ئەو خوایە (بالادەست و پەرستراوە) لەئاسمانەکان و لەزەویدا﴿يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾نهێنی و ئاشکراتان دەزانێ و بە هەموو کردەوەیەکیش کەدەیکەن ئاگادارە. ٣)﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ وە هەر بەڵگەو نیشانەیەك لەبەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگاریان بۆ بێت ﴿إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئەوان ڕووی لێ وەردەگێڕن. ٤)﴿فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ﴾ بەڕاستی کاتێك قورئانیان بۆ هات بە درۆیان دانا ﴿فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ﴾جا لەمەو پاش بۆیان دێت﴿أَنبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾هەواڵی ئەو شتانەی کەئەوان گاڵتەیان پێدەکرد. ٥)﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ﴾ ئایا نەیان دیوە (نەیان زانیوە) لەپێش ئەوانەوە چەند گەل و نەوەمان لەناو بردووە ﴿مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ دەسەڵاتمان پێدا بوون لەزەویدا ﴿مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾ بە شێوەیەك کە بە ئێوەمان نەدابوو ﴿وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا﴾ و بارانی پەیتاپەیتامان بەسەرا باراندن ﴿وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ وە جۆگەو ڕووبارەکانمان واڵێ کرد بوو کە بەبن باغ و کۆشکەکانیاندا دەڕۆیشت ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ لەناو مان بردن بە هۆی گوناهەکانیانەوە﴿وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ﴾ وە لە دوای ئەوان دروستمان کرد ﴿قَرْنًا آخَرِينَ﴾ گەل و نەوەیەکی تر. ٦)﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا﴾وە ئەگەر نامەیەکی نوسراومان بناردایە تەخوارەوە بۆت﴿فِي قِرْطَاسٍ﴾لەناو کاغەزێکدا بوایە﴿فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾و دەستیشیان لێ بدایە﴿لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێ گومان ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیان ووت﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە تەنها جادوویەکی ئاشکرایە. ٧)﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ وە دەیان ووت: بۆچی فریشتەیەك نەنێرراوەتە خوارەوە بۆسەری (ببیبینین) ﴿وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا﴾ ئەگەر فریشتەیەکمان بناردایەتە خوارەوە ﴿لَّقُضِيَ الْأَمْرُ﴾ بێگومان کارتەواو دەبوو (لەناو بردنیان جێ بەجێ دەکرا) ﴿ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ﴾ پاشان مۆڵەت نەدەدران. ٨)

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾

= (ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، ئیتر هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سەریان داخست و بەهیواشی دەگریان).

ئایەتی (٢٩) سوورەتی (آل عمران)؛ قال رسول الله (ﷺ): (إن الله لاينظر إلى أجسامكم ولا إلى صوركم،ولكن ينظر إلى قلوبكم) (رواه مسلم). پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە تەماشای لەش و شکل و شێوەتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات).

ئایەتی (٣١) سوورەتی (آل عمران)؛ قال رسول الله (ﷺ): (كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى) قيل: ومن يأبى يارسول الله ؟ قال : (من أطاعني دخل الجنة ، ومن عصاني فقد أبى)(رواه البخاري) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:(هەموو ئوممەتم دەچنە بەهەشتەوە مەگەر یەکێک خۆی نەیەوێت ). وترا کێ نایەوێت ئەی=

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ﴾ پێش گەلەکەی دەکەوێ ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ﴾ ئەمجا هەموویان دەباتە ناو ئاگری دۆزەخ ﴿وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ ئایا چەند خراپە ئەو شوێنەی ئەوانی بۆ دەبرێ. ٩٨)﴿وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ لَعْنَةً﴾ وە لەم (دنیا)دا نەفرینیان بەشوێندا نێرراوە﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ هەروەها لەڕۆژی دواییشدا ﴿بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ﴾ ئایا چەند خراپە ئەو بەخشراوەی پێیان بەخشرا. ٩٩)﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْقُرَىٰ﴾ ئەوەی (باسکرا بۆت چەند هەواڵێکە) لە هەواڵی شارەکانی ڕابوردوو ﴿نَقُصُّهُ عَلَيْكَ﴾ دەیگێڕینەوە بۆت (لەم سورەتەدا) ﴿مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ﴾ هەندێکیان ماون و هەندێکی تریان نەماون (وەك دروێنەکرا بن). ١٠٠)﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ وە ئێمە ستەممان لێ نەکردن ﴿وَلَٰكِنْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیان کرد لەخۆیان ﴿فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ﴾ جا هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن ﴿آلِهَتُهُمُ الَّتِي﴾ ئەو پەرستراوانەیان ﴿يَدْعُونَ﴾ کە دەیان پەرستن و هاواریان لێ دەکردن﴿مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾لەجیاتی خوا ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ بە هیچ شتێك (سودیان پێ نەگەیاندن) ﴿لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ کاتێ فەرمانی پەروەردگارت هات (بۆ لەناو بردنیان) ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ ئەو (بت)انە هیچیان زیاد نەکرد بۆ ئەوانە(ی دەیان پەرستن) بێجگە زیان و لەناوچوون. ١٠١)﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ﴾ ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت ﴿إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ﴾ کاتێ خەڵکی شارەکان سزا دەدات ﴿وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ لە کاتێکدا ستەمکاربوون ﴿إِنَّ أَخْذَهُ﴾ بەڕاستی تۆڵە سەندنی ئەو ﴿أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ ئازار دەر و بەتینە. ١٠٢)﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بەڕاستی لەودا (باسکرا) پەندو ئامۆژگاری هەیە ﴿لِمَنْ خَافَ﴾ بۆ کەسێ بترسێ ﴿عَذَابَ الْآخِرَةِ﴾ لەسزای دوا ڕۆژ ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە ﴿مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ﴾ کەئادەمی بۆ کۆدەکرێتەوە ﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ﴾ و ئەوە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە (هەموان ئامادەن تێیدا). ١٠٣)﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُ﴾ وە ئێمە دوای ناخەین ﴿إِلَّا لِأَجَلٍ مَعْدُودٍ﴾ مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو. ١٠٤)﴿يَوْمَ يَأْتِ﴾ ئەو ڕۆژە کەدێت ﴿لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ﴾ هیچ کەس قسە ناکات ﴿إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ مەگەر بەمۆڵەتی خوا ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ ئەوسا لەناویاندا هەیە بێ بەخت (نەگبەت)و هەیە بەختەوەر(ئاسوودە). ١٠٥)﴿فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا﴾ جا ئەوانەی بێ بەخت بوون ﴿فَفِي النَّارِ﴾ ئەوە لەناو ئاگردان ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾ لەناو ئەو (ئاگرە)دا هەر ئاخ و هەنیسکیانە. ١٠٦)﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ تا ئاسمانەکان و زەوی بمێنێت ﴿إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ مەگەر ئەو کەسەی پەروەردگارت بیەوێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ ئەوەی کەبیەوێت دەیکات. ١٠٧)﴿وَأَمَّا الَّذِينَ﴾ بەڵام ئەوانەی ﴿سُعِدُوا﴾ کەبەختەوەر کراون ﴿فَفِي الْجَنَّةِ﴾ ئەوە لەبەهەشت دان ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی دەمێننەوە تیایا ﴿مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ تا ئاسمان و زەوی بمێنێت ﴿إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ مەگەر ئەو کەسەی پەروەردگارت بیەوێ﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ ئەوە بەخشینێکە بێ بڕانەوە. ١٠٨)

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتْرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾

هـۆی هاتنـە خوارەوەی **ئایەتی** (١١٤) **سورەتی** (هـود): ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ **ذَلِكَ ذِكْرَى** لِلذَّاكِرِينَ﴾ بوخاری لەرێگەی عەبدوللای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕێتـەوە کەدەڵێت: پیاوێک ماچی ئافرەتێکی بێگانـەی کـرد، ئەنجا هاتە خزمەتی پێغەمبـەر (ﷺ) بەسـەر هاتەکـەی خۆی بۆ گێڕایەوە خوای گەورەش ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ پیاوەکە ووتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە تەنها بۆ منە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بۆ هەموو کەسێکە لە ئوممەتی من)

= الفراش فقال رسول الله (ﷺ): (ما بال أقوام قالوا: كذا و كذا لكني أصلي و أنام و أصوم وأفطر، و أتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني) (رواه مسلم). کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتن =

﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ﴾ کەواتە هیچ جۆرە گومان و دودڵیەکت نەبێ ﴿مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ﴾ لە(ناڕاستی) ئەوەی ئەوانە دەیپەرستن ﴿مَا يَعْبُدُونَ﴾ تەنها ئەوە دەپەرستن ﴿إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُم﴾ کەباوو باپیرانیان دەیان پەرست ﴿مِّن قَبْلُ﴾ لەوەو پێش ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە پێیان دەدەین بەتەواوی ﴿نَصِيبَهُمْ﴾ بەشی خۆیان(لەسزا) ﴿غَيْرَ مَنقُوصٍ﴾ بێ لێ کەمکردنەوە(پڕاوپڕ). ١٠٩) ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە بەخشیمان ﴿مُوسَى الْكِتَابَ﴾ بەمووسا پەڕاو (تەورات) ﴿فَاخْتُلِفَ فِيهِ﴾ ئینجا جیاوازی تێداکرا ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ﴾ ئەگەر لەبەر بڕیارێك نەبوایە کەپێشتر دراوە ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ لەلایەنی پەروەردگارتەوە ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ دادوەری دەکرا لەنێوانیاندا ﴿وَإِنَّهُمْ﴾ و بەڕاستی ئەوانە ﴿لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ لەگومانو دوو دڵیدان لەو (قورئانە). ١١٠) ﴿وَإِنَّ كُلًّا﴾ بێگومان هەموو (ئەوانەی جیاوازن) ﴿لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾ پەروەردگارت (پاداشتی) کردەوەکانیان بەتەواوی پێ دەدات ﴿إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەو ئاگادارە بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن. ١١١) ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ کەواتە ڕاست بە بەو شێوەی فەرمانت پێدراوە ﴿وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾ وە ئەوانەش تۆبەیان کردوە لەگەل تۆدا(و گەڕاونەتەوە) ﴿وَلَا تَطْغَوْا﴾ زیادە ڕەوی مەکەن ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەو(خوا) بینایە بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن. ١١٢) ﴿وَلَا تَرْكَنُوا﴾ پاڵ مەدەن ﴿إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ بەوانەوە کەستەمیان کردوە ﴿فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ و بێجگە لەخوا هیچ پشتیوانێکتان نابێ ﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ پاشانیش یارمەتی نادرێن. ١١٣) ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ﴾ وە نوێژ ئەنجام بدە ﴿طَرَفَيِ النَّهَارِ﴾ لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژدا ﴿وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ﴾ و لە بەشێك لەشەودا ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ﴾ چونکە بەڕاستی (کردەوە) چاکەکان ﴿يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ (کردەوە) خراپەکان لادەبەن﴿ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ﴾ ئەوە پەند و ئامۆژگاری یە بۆ پەند وەرگران. ١١٤) ﴿وَاصْبِرْ﴾ وە خۆڕاگر بە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ﴾ چونکە بەڕاستی خوا ﴿لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ پاداشتی چاکە کاران وون ناکات. ١١٥) ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ﴾ دەی بابوایە لەناو ئەو ئوممەتانەی ﴿مِن قَبْلِكُمْ﴾ کەلە پێش ئێوە دابوون ﴿أُولُو بَقِيَّةٍ﴾ کەسانی خاوەن ئایین و ژیری ﴿يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ﴾ کەبەرگریان بکردایە لەخراپەکاری لەزەویدا ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ مەگەر کەمێك ﴿مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ لەوانەی ڕزگارمان کردن لەو گەلانەدا ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ وە ئەوانەی کەستەمیان کرد شوێنی ژیان خۆشی و رابواردن کەوتن ﴿وَكَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ و بەردەوام بوون لە خراپەکاری. ١١٦) ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ﴾ هەرگیز پەروەردگارت لەناوی نەبردووە ﴿الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ﴾ (دانیشتوانی) شارەکان بەستەم ﴿وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ لە کاتێکدا دانیشتوانی (ئەو شارانە) چاکە کاربووبن. ١١٧)

وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

## سُورَةُ يُوسُف

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢) سورەتی (یوسف): ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ حاکیم و ئیبن حیبان لە سەعدەوە گێڕاویانەتەوە کەوتی خوای گەورە قورئانی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش دەیخوێندەوە بەسەر هاوەڵانی دا تا ماوەیەك ئەدجا وتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، خۆزگە چیرۆکت بۆباس بکردینایە، ئیتر خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ تا ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ پێغەمبەریش ئەم چیرۆکەی (یوسفی) بەسەریاندا خوێندەوە بۆ ماوەیەك، ئەدجا هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەر خۆزگە گفتوگۆت لەگەڵماندا بکردایە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە ﴿الله نزل أحسن الحديث كتاباً متشابهاً﴾.

- و پرسیاریان لە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەربارەی ئەوەی کردەوە و خواپەرستی پێغەمبەر (ﷺ)-

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ﴾ گەر پەروەردگارت بیویستایە ﴿لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ﴾ گشت خەڵکی دەکرد ﴿أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ بە (پەیڕەوی) یەك ئایین ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ بەڵام ئەوان بەردەوام جیاوازدەبن. ١١٨)﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ﴾ مەگەر کەسێ پەروەردگارت میهرەبانی لەگەڵ کردبێ ﴿وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ وە هەر لەبەر ئەوەش دروستی کردوون ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ﴾ بڕیاری پەروەردگارت دەرچوو (کۆتایی هات) ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ﴾ کە سوێند بەخوا دۆزەخ پڕ دەکەم ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ لە جنۆکە و لە ئادەمی هەموو پێکەوە. ١١٩)﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ﴾ هەمووت بۆ دەگێڕینەوە ﴿مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ﴾ لە هەواڵی پێغەمبەران (علیهم السلام)﴿مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ﴾ ئەوەی کەدڵی تۆی پێ دامەزراو بکەین ﴿وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ﴾ وە لەم (سورەتە)دا حەق و ڕاستیت بۆ هاتووە ﴿وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئامۆژگاری و پەندیشی تیایە بۆ بڕواداران. ١٢٠)﴿وَقُل لِّلَّذِينَ﴾ وە بڵێ بەوانەی ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کەبڕوا ناهێنن ﴿ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ ئێوە کردەوە بکەن لەسەر شێوەی خۆتان (کەوان لەسەری) ﴿إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾ بێگومان ئێمەش کردەوە دەکەین. ١٢١)﴿وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ئەوسا چاوەڕوانی بکەن (بۆ بەسەرهاتی خراپ) بەڕاستی ئێمەش چاوەڕوانین. ١٢٢)﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وە تەنها بۆ خوایە (زانینی) نهێنیەکانی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ﴾ هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنرێتەوە ﴿ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ﴾ هەموو کارو بارێك ﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ کەواتە ئەو بپەرستەو هەرپشت بەو ببەستە ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە بێ گومان پەروەردگارت بێ ئاگانی یە لەهەر کردەوەیەك ئێوە دەیکەن. ١٢٣)

## سورەتی ﴿ یوسف ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿الٓر﴾ بە (ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ ئەمانە نیشانەکانی کتێبی ئاشکران. ١)﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ﴾ بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە ﴿قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ قورئانێك بە عەرەبی ﴿لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی ژیربن و لێی تێ بگەن. ٢)﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ ئێمە دەگێڕینەوە بۆ تۆ ﴿أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾ جوان ترین چیرۆك و بەسەرهات ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾ لە ڕێگای ئەم قورئانەوە نیگامان کردووە بۆت ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ﴾ هەر چەندە تۆ لەپێش (هاتنی) ئەم قورئانەدا ﴿لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ﴾ لە بێ ئاگایان بووی. ٣)﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ﴾ (بیریان خەرەوە) کاتێ یوسف بە باوکی ووت ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ﴾ ئەی بابە گیان بە ڕاستی من لە خەومدا دیم ﴿أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾ یازدە ئەستێرە ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ و مانگ و ڕۆژ ﴿رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ﴾ دیمن سوژدەیان بۆ دەبردم. ٤)

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾ ۞ لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾

- لەپەنهانیدا **(لە** ماڵەوە) ئەنجا یەکێکیان **ووتی من** هەرگیز ژن ناهێنم وە یەکێکی تریان ووتی: من هەرگیز گۆشت ناخۆم وە ئەوی تریشیان ووتی: من قەت لەسەر جێگا ناخەوم، پێغەمبەریش (ﷺ)(کاتێ هەواڵی بیستن) فەرمووی ( ئەوە چییانە کەسانێ ئاوا دەڵێن بەلام من (لە-شەودا) شەونوێژ دەکەم دەشخەوم و ڕۆژووش دەگرم و بەڕۆژوویش نابم ژنیش دەهێنم جا هەر کەسیش پشت لەڕچە ڕێبازی من بکات ئەوە لەمن نی یە).

**ئایەتی (٩٥) سورەتی (المائدة):** قال رسول الله (ﷺ) (خمس فواسق يقتلن في الحل و الحرم: الحية و الغراب الأبقع، و الفأرة و الكلب العقور و الحديا) (رواه مسلم و النسائي و ابن ماجه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پێنج گیاندار هەیە بەدو خراپن دەکوژرێن لە کاتی ئاسایی و کاتی ئیحرامیشدا : مار و -

﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ﴾ ووتی ئەی کوڕی شیرینم ﴿لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ﴾ خەوەکەت مەگێڕەرەوە ﴿عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ﴾ بۆ براکانت ﴿فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا﴾ نەوەک بەهۆیەوە فێڵ و پیلانێکت لێبکەن ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ﴾ بەڕاستی شەیتان ﴿لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمی. ٥) ﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ﴾ ئابەو شێوەیە هەڵت دەبژێرێ (بۆ پێغەمبەرایەتی) ﴿رَبُّكَ﴾ پەروەردگارت ﴿وَيُعَلِّمُكَ﴾ وە فێرت دەکات ﴿مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ بەشێك لەخەو پەرژین ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ﴾ وە بەهرەی خۆی تەواو دەکات بۆت ﴿وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ وەبۆ بنەماڵەی یەعقوب ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ﴾ هەر چۆنێ تەواوی کرد بۆ هەردوو باپیرەت ﴿مِن قَبْلُ﴾ لەپێشدا ﴿إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ﴾ کەئیبراهیم و ئیسحاقن ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت زانای کاردروستە. ٦) ﴿لَّقَدْ كَانَ فِى يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەبەسەرهاتی یوسف و براکانی دا ﴿ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ﴾ پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ پرسیارکەران. ٧) ﴿إِذْ قَالُوا۟﴾ کاتێ (برایانی یوسف) ووتیان ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ﴾ بێگومان یوسفو براکەی ﴿أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا﴾ خۆشەویسترن لە ئێمە بەلای باوکمانەوە ﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ لەکاتێکدا ئێمە کۆمەڵێکی بەوزەو توانایین ﴿إِنَّ أَبَانَا﴾ بەڕاستی باوکمان ﴿لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ لە هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکرادایە. ٨) ﴿ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ﴾ (هەندێکیان ووتیان) یوسف بکوژن ﴿أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا﴾ یافڕێی بدەنە زەوی یەکی دوور ﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾ (ئەو کاتە) سەرنجی باوکتان تەنیا بۆلای ئێوە دەبێت ﴿وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ﴾ و لەدوای ئەوەوە دەبن بەکۆمەڵێکی چاکەکار (بەتۆبەکردن). ٩) ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ﴾ قسەکەرێك لەوان ووتی ﴿لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ﴾ یوسف مەکوژن ﴿وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ﴾ بەڵکو فڕێی بدەنە بێخی بیرێکەوە ﴿يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ﴾ هەندێ لە کاروانیەکان (دەی دۆزنەوە) هەڵی دەگرن ﴿إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾ ئەگەر ئێوە (کارەکە) هەر دەکەن. ١٠) ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا﴾ ووتیان ئەی باوکی بەڕێزمان لەبەرچی تۆ لێمان دڵنیانیت ﴿عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ دەربارەی یوسف ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئێمە دڵسۆزو خەمخۆرین بۆی. ١١) ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا﴾ سبەینێ لەگەڵمان بینێرە (بۆ دەرو دەشت) ﴿يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ﴾ (بە ئارەزووی خۆی) خواردن بخوات و یاری بکات ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ و بێگومان ئێمە پارێزگاری دەکەین. ١٢) ﴿قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ﴾ (باوکیان) ووتی بەڕاستی دڵتەنگ و خەمباردەبم ﴿أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ﴾ کەئێوە یوسف بەرن (لەگەڵ خۆتان) ﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ وە دەترسم کەگورگ بیخوات ﴿وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئێوە لێی بێ ئاگابن. ١٣) ﴿قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ ووتیان ئەگەر گورگ خواردی ﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ لەکاتێکدا ئێمە دەستەیەکی بەهێزین ﴿إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بەڕاستی ئەو کاتە ئێمە زەرەر مەندین (ڕوو زەردی تۆ دەبین). ١٤)

فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾

- دالّ - ئەوەی لە سکی و پشتیا ڕەنگی سپی هەیە، قەڵە ڕەشە - و مشك و سەگی خەلك گر و كۆلارە (باڵندەیەكی گۆشت خۆرە - واشە).

ئایەتی (٩٦) سورەتی (المائدة): عن أبي هريرة: سأل رجل رسول الله (ﷺ) فقال يا رسول الله إنا نركب البحر نحمل معنا القليل من الماء فإن توضأنا به عطشنا أفنتوضأ بماء البحر فقال رسول الله (ﷺ) (هو الطهور ماؤه الحل ميتته). (رواه الإمام الشافعي و أحمد و أصحاب السنن الأربع). ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە دەڵێت: پیاوێك پرسی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە سواری بەلەم دەبین لە دەریادا ئاوی كەم لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێبگرین تینومان دەبێت ئایا دەستنوێژ بگرین بە ئاوی دەریا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (دەریا ئاوەكەی پاك كەرەوەیە و مردارەوە بووشی حەڵاڵە).

﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ﴾ ئینجا کاتێ یوسفیان برد لەگەڵ خۆیان ﴿وَأَجْمَعُوا أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ﴾ وە هەموو بڕیاریاندا بیخەنە بێخی بیرەکەوە ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ﴾ وە ئێمە سرووشمان بۆ (یوسف) کرد ﴿لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا﴾ سوێند بەخوا هەواڵی ئەم کارەیان پێ دەدەیت (کەپێیان کردی) ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوان هەست ناکەن. ١٥) ﴿وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً﴾ جا ئێوارە درەنگانێك هاتنەوە بۆلای باوکیان ﴿يَبْكُونَ﴾ دەگریان. ١٦) ﴿قَالُوا يَا أَبَانَا﴾ ووتیان ئەی باوکی ئێمە ﴿إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان دەکرد ﴿وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَاعِنَا﴾ و یوسفمان لای شتومەکەکانمان بەجێ هێشت ﴿فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ بۆیەگورگ خواردی ﴿وَمَا أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا﴾ وە تۆ قەت باوەڕ بەئێمە ناکەیت ﴿وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ﴾ هەرچەند ئێمە ڕاستگۆش بین. ١٧) ﴿وَجَاءُوا عَلَىٰ قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ﴾ (براکانی)کراسەکەی (یوسف)یان هێنایەوە کە خوێنی درۆینەی پێوە بوو ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ (باوکیان) ووتی بەڵکو دڵ و دەروونی خۆتان ئەم کارە(ناپەسەندە)ی بۆ ئاسان و جوان کردوون ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾(ووتی جا ئارام دەگرم) بەئارام گرتنێکی چاك و پەسەند ﴿وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ خواش یارمەتی دەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن. ١٨) ﴿وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ﴾ جا کاروانێك هات ﴿فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ﴾ و ئاو هێنەرەکەیان نارد (بۆ ئاو) ﴿فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُ﴾ ئەویش دۆڵچەکەی داهێلا بۆ ناو بیرەکە ﴿قَالَ يَا بُشْرَىٰ﴾(کە دۆڵچەکەی هێنایە سەرەوە) ووتی ئەی خەڵکینە مـوژدە بێ ﴿هَٰذَا غُلَامٌ﴾ ئەمە کوڕێکە ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً﴾وە ئەوان (یوسف)یان شاردەوە کردیانە کاڵای بازرگانی ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾وە خوا زانایە بەوەی ئەوانە دەیکەن. ١٩) ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ﴾ و فرۆشتیان بەنرخێکی کەم ﴿دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ﴾ کە چەند دەرهەمێك بوو ﴿وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ﴾ و ئەوان بێ نیاز بوون لێی (چونکە دەترسان ڕازیان دەرکەوێ). ٢٠) ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ﴾ وە ئەو کەسەی لە میسر یوسفی کڕی ووتی ﴿لِامْرَأَتِهِ﴾ بە ژنەکەی ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾ ڕێزی لێ بگرە (شوێن حەوا نەوەی چاکی بۆ ئامادە بکە) ﴿عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا﴾ بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێت ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ یان بیکەین بەکوڕی خۆمان ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ﴾ ئابەم جۆرە یوسفمان جێ گیرکرد(و پلەو پایەمان پێدا) ﴿فِي الْأَرْضِ﴾ لە زەوی (میسر)دا ﴿وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ﴾ (ئەمەمان کرد) تا فێری خەو لێکدانەوەی بکەین ﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ﴾ وە خوا بەسەرکاری خۆیدا زاڵە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. ٢١) ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ﴾ وە کاتێ بوو بەپیاو وپێ گەیی ﴿آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ فەرمان ڕەوایی و زانیاریمان پێدا ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ وە ئابەم جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. ٢٢)

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾

**ئایەتی (١٠٣) سورەتی (المائدة):** عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): (رأيت جهنم يحطم بعضها بعضاً و رأيت عمراً يجر قصبه وهو أول من سيب السوائب) (رواه البخاري). عائشه (خوا لێ ی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دۆزەخم بینی ئاگرەکەی هەندێکی دەیدا بەسەر هەندێکیدا و عەمر(ی کوڕی عامری خوزاعەیی)م بینی ڕیخۆڵەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە سائیبەی داهێنا).

**ئایەتی (١١٨) سورەتی (المائده):** قال عمرو بن العاص أن رسول الله (ﷺ) تلا قول الله عز و جل في إبراهيم (ﷺ) ﴿رب إنهن أضللن كثيرا من الناس فمن تبعني فإنه مني﴾ وقال عيسى(ﷺ) ﴿إن تعذبهم فإنهم عبادك و إن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم﴾ فرفع يديه: (اللهم أمتي أمتي و بكى فقال الله عز و جل: يا جبريل اذهب إلى-

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیدا بوو دەست تێکەڵاوی لەیوسف ویست ﴿وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ﴾و هەموو دەرگاکانی داخست ﴿وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ﴾ ووتی وەرە پێشەوە بەپەلە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ﴾ (یوسف) ووتی من پەنا دەگرم بەخوا ﴿إِنَّهُۥ رَبِّيٓ﴾ بەڕاستی ئەو(خوا) پەروەردگاری منە (یا عەزیزی میسر خاوەنی منە) ﴿أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ﴾ ڕێزی لێ گرتووم ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بەڕاستی ستەم کاران ڕزگار نابن. ٢٣) ﴿وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئەو ژنە نیازی (تێکەڵی ژن و مێردی) یوسفی کرد ﴿وَهَمَّ بِهَا﴾ یوسفیش نیازی ئەو (ژنە)ی کرد ﴿لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ﴾ ئەگەر ئەو بەڵگە ڕوونەی پەروەردگاری نەدیایە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە(بەڵگەمان نیشانی یوسف دا) ﴿لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ﴾ بۆ ئەوەی خراپەو داوێن پیسی لێ دوور بخەینەوە ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەو(یوسف) لەبەندە پاكو هەڵبژاردەکانی ئێمەیە. ٢٤) ﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾ (یوسفو ئافرەتەکە) هەر دووکیان بۆلای درگاکە ڕایان کرد ﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ﴾ و (ئافرەتەکە) کراسەکەی (یوسفی) دڕاند لەدواوە ﴿وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا﴾ جا هەردووکیان تووشی مێردی (ئافرەتەکە) بوون ﴿لَدَا ٱلۡبَابِۚ﴾ لەبەردەم دەرگاکە(ی دەرەوە)دا ﴿قَالَتۡ مَا جَزَآءُ﴾ (ئافرەتەکە) ووتی هیچ تۆڵەیەکی نیە ﴿مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا﴾ ئەو کەسەی ویستبێتی خراپە (داوێن پیسی) لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات ﴿إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ جگە لەوەی بەند بکرێ یان سزایەکی سەخت بدرێ. ٢٥) ﴿قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ﴾ (یوسف)ووتی ئەو (ژنە) داوێن پیسی لەمن وویستووە ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ﴾ ئەوسا شایەتێك لەکەس و کاری ئەو (ئافرەتە) شایەتی دا ﴿إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ﴾(ووتی) ئەگەر کراسەکەی (یوسف) ﴿قُدَّ مِن قُبُلٖ﴾ لە پێشەوە دڕێنرابێ ﴿فَصَدَقَتۡ﴾ ئەوە ئافرەتەکە ڕاست دەکات ﴿وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ وە ئەو (یوسف) لەدرۆزنانە. ٢٦) ﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ﴾ وە ئەگەر کراسەکەی ﴿قُدَّ مِن دُبُرٖ﴾ لەدواوە دڕێنرابێ ﴿فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەوە ئافرەتەکە درۆ دەکاتو ئەو (یوسف) لەڕاست گۆیانە. ٢٧) ﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ﴾ ئینجا کاتێ (عەزیز) بینی کراسەکەی یوسف ﴿قُدَّ مِن دُبُرٖ﴾ لەدواوە دڕاوە ﴿قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ﴾ ووتی بەڕاستی ئەمە لەفڕو فێڵی ئێوەیە (ئافرەتان) ﴿إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ﴾ بەڕاستی فڕوفێڵی ئێوە زۆر گەورەیە. ٢٨) ﴿يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ﴾ (عەزیز ووتی) یوسف وازبێنە لەم کارەو باسی مەکە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ﴾ و (ژنەکە) تۆش بۆ گوناهەکەت داوای لێبوردن بکە ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ لەپێڕی تاوانبارانی. ٢٩) ﴿وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ (دەستەیەك) لەژنانی شار (بەتەشەرەوە) ووتیان ﴿ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ﴾ ژنەکەی عەزیز(ی میسر) ﴿تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ﴾ دەیەوێ (هەوڵ دەدا) لەگەڵ غولامەکەی داوێن پیسی بکات ﴿قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ﴾ بەڕاستی خۆشەویستی (ئەو غولامە) چووەتە ناو پەردەی دڵی ﴿إِنَّا لَنَرَىٰهَا﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو (ژنە) دەبینین ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ لە گومراییەکی ڕوون دایە. ٣٠)

فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا وَءَاتَتۡ
كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيۡنَهُۥٓ أَكۡبَرۡنَهُۥ
وَقَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ
كَرِيمٞ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمۡتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن
نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَۖ وَلَئِن لَّمۡ يَفۡعَلۡ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسۡجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا
مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ
إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ
﴿٣٣﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ
حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ
إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ
رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا
بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ
مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾

- محمد- وربك أعلم- فسله ما يبكيه ؟ فأتاه جبريل (عليه السلام) فساله فأخبره رسول الله (ﷺ) بما قال- وهو أعلم- فقال الله تعالى: يا جبريل اذهب إلى محمد فقل سنرضيك في أمتك و لا نسوءك) (رواه مسلم). عەمری کوڕی عاص ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە لەبارەی ئیبراهیم پێغەمبەرەوەیە (عليه السلام) ﴿ رب إنهن أضللن كثيراً من الناس فمن تبعني فإنه مني﴾ وە عیسا (عليه السلام) کە دەڵێ ﴿ إن تعذبهم فإنهم عبادك و إن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم ﴾ جا پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی : (ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم و گریا خوای گەورە و بە دەسەڵاتیش فەرمووی بە جوبرەئیل بڕۆ بۆ لای موحەممەد - لە کاتێکدا پەروەردگارت زاناترە- لێی بپرسە بۆچی دەگری ؟ جوبرەئیل (عليه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پرسیاری لێ کرد (پێغەمبەری خوایش ووتەکەی-

﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ جا کاتێ ژنەکە(ی عەزیز)تانەو تەشەری ئەوانی بیست ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾ ناردی بەدوایانـدا ﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً﴾ ئامادەی کرد بۆیان شوێنی (خۆشی دڵنیشتنی) شان دادان ﴿وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ و هەریەك لەوان چەقۆیەکی پێدان (بۆ میوەلەت کردن) ﴿وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾ ئەوسا ووتی (بەیوسف) وەرە بۆ ناویان (بابتبینن) ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ﴾ هەر کە ئەو (یوسف)یان بینی حەپەسان (لەجوانی ئەو) ﴿وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ و هەموویان دەستی خۆیانیان بڕی ﴿وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾ ووتیان پاکی وبێ گەردی بۆ خوا ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾ ئەمە ئادەمی نی یە ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ ئەمە تەنها فریشتەیەکی بەڕێزو بەرێزە. ٣١) ﴿قَالَتْ﴾ (ژنەکە) ووتی پێیان ﴿فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى﴾ ئەمە ئەو کەسەیە کە ﴿لُمْتُنَّنِى فِيهِ﴾ ئێوە سەرزەنشتی منتان دەکرد لەسەری ﴿وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ وە سوێند بەخوا بێ گومان ویستم دەستم لەگەڵ تێکەڵ کات ﴿فَٱسْتَعْصَمَ﴾ بەڵام ئەو خۆی گرتووە (نەیکرد) ﴿وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ﴾ وە سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێ دەکەم نەیکات ﴿لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ ئەوە بێ گومان بەند دەکرێ و لەریسوایان دەبێت. ٣٢) ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ﴾ (یوسف) ووتی ئەی پەروەردگارم بەندکردنم ﴿أَحَبُّ إِلَىَّ﴾ لا خۆشترە ﴿مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ﴾ لەوەی کەئەوانە داوای دەکەن لێم (بیکەم) ﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى﴾ وە ئەگەر لێم لانەدەی ﴿كَيْدَهُنَّ﴾ پیلانی ئەوانە ﴿أَصْبُ إِلَيْهِنَّ﴾ دڵم بۆلایان دەڕوا (حەزیان لێ دەکەم) ﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ و لەنەفامان دەبم و دەچمە ریزیانەوە. ٣٣) ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ ئەوسا پەروەردگاری دوعاکەی لێ وەرگرت ﴿فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ﴾ و پیلانەکەی ئەوانی لێ لادا ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی هەر خوا بیسەری زانایە. ٣٤) ﴿ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئینجا بۆیان دەرکەوت و پێیان چاك بوو پاش ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەیان (لێ) بینی ﴿لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ تاماوەیەك بەندی بکەن. ٣٥) ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ﴾ ئەوسا دوو کوڕی لاو (خزمەتکار) لەگەڵی چوونە بەندیخانە ﴿قَالَ أَحَدُهُمَآ﴾ یەکێکیان ووتی (بەیوسف) ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ﴾ بەڕاستی لەخەومدا خۆمم دی ﴿أَعْصِرُ خَمْرًا﴾ ترێم دەگوشی کەدەبێ بەعەرەق ﴿وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ﴾ وە ئەوی تریان ووتی ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ﴾ بێگومان لەخەودا خۆمم دی ﴿أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا﴾ نانم هەڵدەگرت بەسەر سەرمەوە ﴿تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ﴾ باڵندە لێی دەخوارد ﴿نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ﴾ لێکدانەوەی ئەو (خەو)ەمان پێ بڵێ ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ لەچاکەکاران دەبینین (کەچاك خەو پەرژین بکەیت). ٣٦) ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ﴾ (یوسف) ووتی هیچ خۆراکێکتان پێ نادرێ کە بیخۆن ﴿إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ﴾ مەگەر من بەهەر دووکتان دەڵێم چی یە ﴿قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا﴾ پێش ئەوەی بێت بۆتان ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ﴾ ئەمەش لەو بەهرانەیە کەپەروەردگارم فێری کردوم ﴿إِنِّى تَرَكْتُ﴾ بەڕاستی من وازم هێناوە ﴿مِلَّةَ قَوْمٍ﴾ لەئاینی گەلێك ﴿لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ کەبڕوایان بە خوا نەهێنا ﴿وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ﴾ وە ئەوان بێ بڕواش بوون بە ڕۆژی دوایی. ٣٧)

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾

- خۆی پێی ڕاگەیاندکە خوا زاناترە پێی، جا خوای گەورەش فەرمووی: ئەی جوبرەئیل برۆ بۆ لای موحەممەد پێی بڵێ دەربارەی ئوممەتەکەت بێگومان ڕازیت دەکەین وە کارێ ناکەین کە تۆ پێت ناخۆش بێت و دلگران ببیت).

**ئایەتی (٣) سورەتی (الأنعام):** قال رسول الله (ﷺ): (اتق الله حيثما كنت، و اتبع السيئة الحسنة تمحها و خالق الناس بخلق حسن).(رواه الإمام أحمد و النسائي و الحاكم و البيهقي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە خوا بترسە و پارێزکاربە لە هەر جێگایەکدا بوویت وە بە شوێن خراپەدا کردەوەی چاکە ئەنجام بدە دەیسڕێتەوە وە لەگەڵ خەڵکیدا با ڕەوشتت جوان و بەرز بێت).

**ئایەتی (١٢) سورەتی (الأنعام):** قال رسول الله (ﷺ): (سددوا و قاربوا و أبشروا فإنه لن يُدخل أحداً الجنة عملهُ، قالوا و لا أنت يا رسول الله؟ قال: ولا أنا إلا ان يتغمدني الله برحمته)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: -

﴿وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ﴾ وە شوێنی ئاینی باوو باپیرانم کەوتووم ﴿إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن ﴿مَا كَانَ لَنَآ﴾ ڕەوا و شیاونی یە بۆمان ﴿أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ کەهیچ شتێ بکەین بەهاوبەش بۆ خوا ﴿ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا﴾ ئەمەش چاکەو بەهرەی خوایە بەسەر ئێمەوە ﴿وَعَلَى ٱلنَّاسِ﴾ وە بەسەر خەڵکیشەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بەلام زۆربەی خەلکی سوپاسی خوا ناکەن. ٣٨) ﴿يَٰصَٰحِبَىِ ٱلسِّجْنِ﴾ ئەی دوو هاوڕێکەی بەندینخانەم ﴿ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ﴾ ئایا چەند خوایەکی جیاجیا باشترن ﴿أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ﴾ یان خوایەکی تاکی بەدەسەلات. ٣٩) ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ ئێوە بێجگە لەخوا هیچ شتێك ناپەرستن ﴿إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم﴾ جگە لەچەند ناوێك نەبێت کە ئێوەو باوو باپیراتان ناوتان ناوون ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾ خوا هیچ بەلگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ بێ گومان بڕیار تەنها بۆ خوایە ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ فەرمانی داوە بێجگە لەو (خوا) هیچ شتێ نەپەرستن ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ ئەوەیە ئاینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاو ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەلام زۆربەی خەلکی نازانن. ٤٠) ﴿يَٰصَٰحِبَىِ ٱلسِّجْنِ﴾ ئەی دوو هاوڕێکەی بەندینخانەم ﴿أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسْقِى رَبَّهُۥ خَمْرًا﴾ یەکێکتان عارەق دەرخواردی گەورەکەی (پاشا) دەدات ﴿وَأَمَّا ٱلْءَاخَرُ فَيُصْلَبُ﴾ بەلام ئەوی ترتان (دەکوژرێ و) هەلدەواسرێ ﴿فَتَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِن رَّأْسِهِۦ﴾ ئەوسا باڵندە لەسەر (و دەم چاو)ی دەخوات ﴿قُضِىَ ٱلْأَمْرُ ٱلَّذِى فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ﴾ ئەو کارەی کەئێوە دەربارەی پرسیار دەکەن بڕیار دراوە. ٤١) ﴿وَقَالَ لِلَّذِى ظَنَّ﴾ و(یوسف) ووتی بەوەی کەدەیزانی ﴿أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا﴾ ڕزگاری دەبێ لەدوو بەندکراوەکە ﴿ٱذْكُرْنِى عِندَ رَبِّكَ﴾ باسم بکە لای گەورەو پادشاکەت (کە بەناهەق گیراوم) ﴿فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ بەلام شەیتان لەبیری بردەوە ﴿ذِكْرَ رَبِّهِۦ﴾ باسکردنی (یوسف) لای پادشای بکات ﴿فَلَبِثَ فِى ٱلسِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾ بۆیە ماوەی چەند ساڵێك (یوسف) لەبەندیخانەدا مایەوە. ٤٢) ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ﴾ وە پادشا ووتی ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ﴾ بێگومان من لەخەومدا حەوت مانگای قەلەوم بینی ﴿يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾ کەحەوت (مانگا)ی لەڕ دەیخواردن ﴿وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ﴾ وە حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزو حەوتی تر وشکیشم بینی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ﴾ ئەی پیاوماقولان ﴿أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ﴾ ئەم خەوەم بۆم لێك بدەنەوە ﴿إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ﴾ ئەگەر ئێوە مانای خەو دەکەن و دەزانن خەوچەڕاوێن بکەن. ٤٣)

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾

- (ڕێگـای **ڕاست** بگـرن **وە** (لەکارەکانتاندا) میانەبن **و زیادە** ڕەوی مەکەن و مژدە دەر **بـن** چـونکە بێگومان هیچ کەسێ کـردەوەی خـۆی نایباتە بەهەشتەوە. ووتیان:تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فـەرمووی: هـەروەها منـیش مەگەر **خوای گەورە** بەر ڕەحمەتی خۆیم خات).

**ئایـەتی (١٧) سورەتی (الأنعام):** قال النبي (ﷺ) لابن عباس : **(یا غلام** احفظ **الله یحفظك** احفظ الله تجده تجاهك، تعرف الى الله في الرخاء يعرفك في الشدة إذا سألت فسأل الله و إذا استعنت فاستعن بالله، و اعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، و إن اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء **قد كتبه** الله عليك رفعت الأقلام وجفت الصحف)(رواه الإمام أحمد والترمذي والحاكم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس: (ئـەی کوڕی لاو سنووری خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێ، سنووری خوا بپارێزە-

﴿قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ﴾ ووتیان خەوی تێکەڵ و پێکەڵ (و پڕوپوچە) ﴿وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ﴾و ئێمەش لێکدانەوەی خەوی تێکەڵ و پێکەڵ نازانین. ٤٤) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ﴾ ئەوسا ئەوەیان کەڕزگاری بوو لەدوو (بەندکراو)ەکە لەپاش چەند ساڵێك بیری کەوتەوە ووتی ﴿أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ﴾ من بۆتان لێکدەدەمەوە مانای ئەو خەوە ﴿فَأَرۡسِلُونِ﴾ جا (فەرموو) بمنێرن (بەدوای یوسف دا کە لەبەندینخانەدایە). ٤٥) ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ﴾(هات ووتی) یوسف ئەی هاوڕێی ڕاستگۆ ﴿أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ﴾ مانای ئەو خەوەمان پێ بڵێ چی یە حەوت مانگای قەڵەو کەحەوت مانگای لەڕو لاواز بیانخوات ﴿وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ﴾ هەروەها حەوت گوڵی دانەوێڵەی سەوزو حەوت گوڵی ووشك ﴿لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ﴾ تا من بگەڕێمەوە بۆلای خەڵکی ﴿لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئەوان ئەوە بزانن. ٤٦) ﴿قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا﴾ (یوسف) ووتی حەوت ساڵ کشتوکاڵ دەکەن بەدوای یەکداو بەبەردەوامی ﴿فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ﴾ جائەوەی کەدروێنەتان کرد بیهێڵنەوە لەگوڵەکەیدا ﴿إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ﴾ کەمێك نەبێت لەوەی کەدەیخۆن. ٤٧) ﴿ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ﴾ ئینجا لەپاش ئەو (حەوت ساڵە) حەوت ساڵی تردێت کەسەختو قاتو قڕیە ﴿يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ﴾ هەرچیتان پاشە کەوت کردووە بۆ ئەم (حەوت ساڵە سەختە) دەیخۆن ﴿إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ﴾ مەگەر کەمێك لەوەی قایم هەڵی دەگرن (بۆ تۆو). ٤٨) ﴿ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ﴾ پاشان دوای ئەو (حەوت ساڵە سەختە) ساڵێك دێت ﴿فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ﴾ خەڵکی تێیدا (ڕزگار دەکرێن) بارانیان بۆ دەبارێنرێ و تێیدا دۆشاو(ی میوەهات) دەگرن. ٤٩) ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ﴾ پاشا ووتی ﴿ٱئۡتُونِي بِهِۦ﴾ ئەو (پیاوە)م بۆ بێنن ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ﴾ جا کاتێ نێردراوەکە(ی پاشا)هاتە لای یوسف ﴿قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ (یوسف) ووتی بگەڕێرەوە بۆلای گەورەکەت (پادشاکەت) ﴿فَسۡـَٔلۡهُ﴾و پرسیاری لێ بکە ﴿مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ﴾ هۆی چی بوو کەئەو ژنانە دەستی خۆیانیان بڕی ﴿إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ﴾ بێ گومان پەروەردگارم بەپیلانی ئەو (ژن)انە ئاگادارو زانایە. ٥٠) ﴿قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ﴾ ووتی (بەژنەکان) مەبەستان چی بوو کاتێ ویستتان یوسف بخەڵەتێننو کاری خراپی پێ بکەن ﴿قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾(ئافرەتەکان) ووتیان پاك و بێ گەردی بۆ خوا ﴿مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ﴾ ئێمە هیچ خراپەیەکمان لێ نەدیوە ﴿قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ﴾ ژنەکەی عەزیز ووتی ﴿ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾ ئائێستا حەق و ڕاستی دەرکەوت ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ من دەمویست ئەو (یوسف) دەستم لەگەڵ تێکەڵ کات ﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ و بێ گومان ئەو لەڕاست گۆیانە. ٥١) ﴿ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي﴾ (یوسف ووتی) ئەوە بۆ ئەوەی (پادشا) بزانێ بەڕاستی من ﴿لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ بەپەنهانی ناپاکیم نەکردووە لێ ی ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ وە بەڕاستی خواش پیلانی ناپاکان ناگەیەنێ بەپایان. ٥٢)

۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ
رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ
لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ
ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ
مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ
بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجۡرُ
ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ وَجَآءَ إِخۡوَةُ
يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا
جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ
أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا
كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ
وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ
لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ
﴿٦٢﴾ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ
فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾

- **خوات لەگەڵدا** دەبێ، **لەخۆشی و** ئارامی **دا خواناس** بەو خوا **لەیاد ئەکە** لەکاتی ناخۆشیو سەختیدا دەگاتە فریات، ئەگەر داوای شتێکت کردو پاڕایتەوە تەنها لە خوا داوابکەو لەو بپاڕێرەوە وە ئەگەر دەسەنرێتەوە لە بزنی شاخدار کە قۆچی لیدا بێ).

**ئایەتی (٤٤) سورەتی (الأنعام):**

عن عقبة بن عامر عن النبي(ﷺ) قال (إذا رأيت الله يعطي العبد من الدنيا- على معاصيه- ما يحب فانما هو استدراج. ثم تلا رسول الله(ﷺ) ﴿فلما نسوا ما ذكروا به فتحنا عليهم أبواب كل شيء حتى اذا فرحوا بما أوتوا أخذناهم بغتة فإذا هم مبلسون﴾ (رواه الإمام أحمد). عوقبەی کوڕی عامر گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر دیت خوا لە (بەهرەی) دنیا دەبەخشی بەبەندەیەکی هەرچی بەندەکەحەزی لێ بوو - گەرچی تاوانیش بکات - ئەوە دڵنیابە کە ئەوە ئیستدراجە (واتە: ووردە ووردە بەرەو سزا بردن). پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە-

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ﴾ وە (یوسف ووتی) من هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ (چونکە) بەڕاستی نەفس زۆر فەرمان دەرە بەخراپە ﴿إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ﴾ بێجگە ئەو نەفسەی پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێ ﴿إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم لێبووردەی میهرەبانە. ٥٣) ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ﴾ جا پادشا ووتی (بەژێردەستەکانی) ﴿ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ﴾ ئەو یوسفەم بۆ بێنن ﴿أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾ دەیکەمە (کەسێکی) تایبەت بەخۆمەوە ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ﴾ جا کاتێ کە(پادشا) قسەی لەگەڵ کرد ﴿قَالَ إِنَّكَ﴾ ووتی بەڕاستی تۆ ﴿ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ﴾ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو پایە و باوەڕپێکراوی. ٥٤) ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ (یوسف) فەرمووی (بەپادشا) لەسەر خەزنە و دارایی زەوی (میسر)دا دامنێ بەڕاستی من پارێزەرێکی شارەزام. ٥٥) ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ﴾ ئا بەو جۆرە یوسفمان پایەدارو جێگیر کرد ﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەخاك (ی میسر)دا ﴿يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ﴾ لەهەر شوێنێك(ی میسردا) بیویستایە دەژیا ﴿نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ﴾ هەر کەسمان بوێ بەرمیهرەبانی خۆمانی دەخەین (لەدنیادا) ﴿وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ و پاداشتی چاکە کاران وون ناکەین. ٥٦) ﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ﴾ وە بەڕاستی پاداشتی ڕۆژی دوایی چاکترە ﴿لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ و بەهەمیشەیی خۆپارێز بوون (لە هاویەش بڕیاردان و تاوان). ٥٧) ﴿وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ﴾ وە (لە کاتی گرانیدا) براکانی یوسف هاتن (بۆ میسر) ﴿فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ﴾ ئەوسا چوونە لای (یوسف) ﴿فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ دەست بەجێ (یوسف) ئەوانی ناسی یەوە بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسی یەوە. ٥٨) ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ﴾ جا کاتێ کە ڕێکی خستن و ئەوەی کە ویستیان پێ ی دان ﴿قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ﴾ ووتی برایەکی باوکیتان هەیە بۆم بێنن ﴿أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ﴾ ئایا نابینن کەمن ﴿أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ﴾ پێوانەم تێرو تەواوە (بۆ کڕیارەکان) ﴿وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ﴾ وەمن خانە خوێی چاکم. ٥٩) ﴿فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ﴾ جا ئەگەر ئەو (برایەتان)م بۆ نەهێنن ﴿فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ﴾ ئەوە پێوانە(ی دانەوێڵە)تان لای من نیەو نزیك (ئەم وولاتەش) مەکەونەوە. ٦٠) ﴿قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ﴾ ووتیان هەوڵ و تەقەلا دەدەین لەگەڵ باوکی دا ﴿وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ﴾ و دڵنیابە ئێمە ئەو کارە دەکەین. ٦١) ﴿وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ﴾ وە (یوسف) ووتی بە بەردەست و خزمەتکارەکانی ﴿ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ﴾ دراوەکانیان کە داویانە (بە دزی یەوە) بیخەنە ناو بارەکانیان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ﴾ بەلکو بیناسنەوە ﴿إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ﴾ کاتێ کە گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ تا (ببێتە هۆی ئەوەی) بگەڕێنەوە و بێنەوە. ٦٢) ﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ﴾ ئینجا کاتێ گەڕانەوە بۆ لای باوکیان ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا﴾ ووتیان ئەی باوکی بەڕێزمان ﴿مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ﴾ (بۆ ساڵی داهاتوو) پێوانەمان لێ قەدەغە کراوە (شتمان پێ نافرۆشن ئەگەر بنیامین نەیەت لەگەڵماندا) ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ﴾ جا کەواتە براکەمان لەگەڵماندا بنێرە پێوانەش دەکەین (دانەوێڵە دەکڕین) ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ و دڵنیابە ئاگاداریشی دەکەین. ٦٣)

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾

- **(فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا** ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا **فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟** أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً **فَإِذَا** هُم مُّبْلِسُونَ).

**ئایەتی (٥٣) سورەتی (الأنعام)**

قال رسول الله (ﷺ): (إن **الله** لا ينظر إلى صوركم **ولا إلى أموالكم** ولكن ينظر إلى قلوبكم وأعمالكم) (رواه مسلم وأحمد). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خوا سەیری شێوەو ڕەنگتان ناکات بەڵکوسەیری دڵو کردەوەکانتان دەکات).

**ئایەتی (٥٤) سورەتی (الأنعام)**: عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): (لما قضى الله على الخلق كتب في كتاب فهو عنده فوق العرش إن رحمتي غلبت غضبي ) (رواه البخاري ومسلم). ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە ووتی: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە لەدروست کردنی بونەوەر بوویەوە لەنامەیەکدا کە لای خۆیەتی و لەسەر عەرشە نوسیویەتی بەبێگومان بەزەیی و میهرەبانیم زاڵ بووە بەسەر ڕق و تورە ییم دا).

﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ و کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿طُوبَىٰ لَهُمْ﴾ خۆش بەختی بۆ ئەوانە ﴿وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ لەگەڵ سەرەنجامی چاك. ٢٩) ﴿كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَاكَ﴾ هەر بە شێوەی (پێغەمبەرانی تر) تۆمان ڕەوانە کردوە ﴿فِي أُمَّةٍ﴾ لەناو گەل و ئوممەتێکدا ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَا أُمَمٌ﴾ کە لەپێش ئەوانەوە گەل و ئوممەتی تر هاتوون و چوون ﴿لِّتَتْلُوَ عَلَيْهِمُ الَّذِي﴾ بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەریاندا ئەوەی ﴿أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ نیگامان کردووە بۆت ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَٰنِ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە بڕواناهێنن بەخوای میهرەبان ﴿قُلْ هُوَ رَبِّي﴾ بڵێ ئەو پەروەردگاری منە ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێك نی یە بێجگە لەو ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ پشتم هەر بەو بەستووە ﴿وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ گەڕانەوەشم هەر بۆلای ئەوە. ٣٠) ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآنًا﴾ بەڕاستی ئەگەر قورئانێك (بەخوێندنەوەی) ﴿سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ﴾ چیاکانی پێ ببرایە (بۆ شوێنێکی تر) ﴿أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الْأَرْضُ﴾ یان زەوی پێ لەت لەت بکرایە ﴿أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَىٰ﴾ یان لەگەڵ مردووەکاندا قسەی بکردایە (ئەنجا باوەڕ ناهێنن) ﴿بَل لِّلَّهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا﴾ بەڵام هەموو کاروبارەکان بەدەست خوان ﴿أَفَلَمْ يَيْأَسِ﴾ دەی ئایا بێ هیوا نەبوون (ونەیان زانیوە) ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە ﴿أَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ﴾ کەئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا﴾ هەموو خەڵکی دەخستە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی کەبێ باوەڕ بوون هەمیشە ﴿تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ﴾ بەڵای سەختیان تووش دەبێت بەهۆی ئەوەی کردوویانە ﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ﴾ یان ئەو (بەڵایە) لە نزیكماڵەکانیانەوە ڕوودەدات ﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ﴾ هەتا بەڵێنی خوا دێتە دی ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی خۆی بەدی دەهێنێ. ٣١) ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان گاڵتە کرا ﴿بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ بە پێغەمبەرانی زۆر لەپێش تۆوە ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ منیش (ماوەیەك) مۆڵەتم دا بەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ پاشان ئەوانم گرت (تۆڵەم لێ سەندن) ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵەی من (دەربارەیان). ٣٢) ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ﴾ دەی ئەو (خوایە)ی چاودێرە ﴿عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾ بەسەر هەموو کەسەوە هەرچی کردەوە (وەك بتانێکە ئاگای لە هیچ نی یە) ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ﴾ ئەوانە هاوبەشانێکیان بۆ خوا بڕیار داوە ﴿قُلْ سَمُّوهُمْ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ ناوی ئەو (بت و هاوبەشانەم) بۆ بڵێن ﴿أَمْ تُنَبِّئُونَهُ﴾ یان ئێوە هەواڵ دەدەن بەخوا ﴿بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي الْأَرْضِ﴾ بەوەی کە(بەخەیاڵی ئێوە) نایزانێ لەزەویدا ﴿أَم بِظَاهِرٍ مِّنَ الْقَوْلِ﴾ یان قسەی ڕوت (بێ مانا) دەکەن ﴿بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ﴾ (نەخێر خوا هاوبەشی نی یە) بەڵکو ئەوانەی بێ باوەڕ بوون فێڵ و پیلانی خۆیان بۆ ڕازێنرایەوە ﴿وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ﴾ وە بەرگری کران لەڕێگەی ڕاست ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ﴾ هەر کەسیش خوا گومڕای بکات ﴿فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ ئەوە هیچ ڕێ نیشاندەرێکی بۆ نی یە. ٣٣) ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ئەوانە لە ژیانی دنیادا سزایان بۆ هەیە ﴿وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَقُّ﴾ وە بەڕاستی سزای ڕۆژی دوایی سەخت ترو گران ترە ﴿وَمَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ وە بێ گومان هیچ پارێزەرێك نی یە بۆ ئەوان لە (سزای) خوا. ٣٤)

۞ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِ إِلَيْهِ أَدْعُوا وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُوا ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾

**فەرمووی: جنێو دەدات بە باوکی پیاوێک ئەویش جنێو دەداتەوە** به باوکی **ئەم، وە** جنێو دەدات بە دایکی ئەویش جنێو دەداتەوە به دایکی ئەم).

**ئایەتی (١٢٠) سورەتی (الأنعام)**: عن النواس بن سمعان قال: سألت رسول الله (ﷺ) عن الإثم فقال: (الإثم ما حاك في صدرك و كرهت أن يطلع عليه الناس). (رواه مسلم) نەواسی کوڕی سەمعان ئەگێڕێتەوە و دەڵێ: پرسیارم له پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد دەربارەی گوناه فەرمووی: ( گوناه ئەوەیە لە سینە و دەرونتدا کاریگەر بێت (بچەسپێت) و پێشت ناخۆشه خەڵکی پێی بزانن).

**ئایەتی (١٢١) سورەتی (الأنعام)**: قال (ﷺ) (ما منكم من أحد إلا و قد وكل به قرينه من الجن) قالوا و إياك؟ قال: ( و إياي، إلا أن الله أعانني عليه فأسلم فلا يأمرني إلا بخير). (رواه مسلم و أحمد)-

﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ وێنەی ئەو بەهەشتەی کەبەڵێن دراوە بە پارێزکاران ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان دەڕۆن بەژێر باغەکانیدا ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا﴾ میوەو سێبەرەکانی (بەهەشت) هەمیشەیین ﴿تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟﴾ ئەو(بەهەشتە) ئاکامی ئەوانەیە کە خۆیان پاراست (لە دنیادا) ﴿وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ﴾ و ئاکامی بێ باوەڕانیش هەر ئاگرە. ٣٥)﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانەش کتێبمان پێ داون ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ شاد دەبن بەوەی نێرراوەتە خوارەوە بۆت ﴿وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن﴾ و هەندێ لە گرۆ و تاقمەکان هەن ﴿يُنكِرُ بَعْضَهُۥ﴾ هەندێ لەو ئینکار دەکەن ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ﴾ بڵێ من تەنها فەرمانم بەوە پێ دراوە ﴿أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ﴾ کە خوا بپەرستم﴿وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ﴾ و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێم ﴿إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ﴾ هەر بۆلای خوا (خەڵکی) بانگ ئەکەم گەڕانەوەشم تەنها بۆلای ئەو(خوایە). ٣٦)﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ﴾ بەو شێوە ئەو(قورئانە)مان ناردۆتەخوارەوە(بۆ تۆ)﴿حُكْمًا عَرَبِيًّا﴾ کە فەرمانێکی عەرەبی یە﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئەگەر تۆ شوێنی ئارەزواتی ئەوانە بکەوی ﴿بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ لەدوای ئەو شارەزاییەی کە هاتووە بۆت ﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ﴾ هیچ پارێزەرێکت نابێ لە(سزای) خوا. ٣٧)﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووە ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ﴾ و پێمان داون ﴿أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً﴾ هاوسەر و نەوە و وەچە ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ﴾ وە بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ﴿أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ﴾ (پێش تۆ) نیشانەیەك (موعجیزەیەك) بێنێ ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بەئیزنی خوا ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ بۆ هەموو کارێك وەختێکی تایبەتی هەیە کە نووسراوە. ٣٨)﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ﴾ ئەوەی خوا بیەوێ دەیسڕێتەوەو (ئەوەش بیەوێ) دەیهێڵێتەوە ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ سەرچاوەی کتێبەکان لای ئەو (خوایە کە لوح المحفوظ)ە. ٣٩)﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ﴾ جا ئەگەر نیشانت دەین ﴿بَعْضَ ٱلَّذِى﴾ هەندێکی ئەو ﴿نَعِدُهُمْ﴾ هەڕەشەی لێمان کردون ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یان (پێش ئەوە) بتمرێنین ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ﴾ بێ گومان تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە ﴿وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾ و لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. ٤٠)﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا (بێباوەڕان) سەرنجیان نەداوە ﴿أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ کەئێمە زەوی (کافران) کەم دەکەینەوە لە هەموو لایەکانی یەوە ﴿وَٱللَّهُ يَحْكُمُ﴾ و خوا (بەویستی خۆی) بڕیار دەدات ﴿لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ﴾ کەس ناتوانێ بڕیاری ئەو (خوا) بگۆڕێ (یا هەڵوەشێنێتەوە) ﴿وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ و ئەو (خوا) لێپرسینەوەی خێرایە. ٤١)﴿وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە بێ گومان ئەوانەی پێش ئەمانیش فێڵ و پیلانیان گێڕا ﴿فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا﴾ بەڵام هەموو نەخشە و پیلانەکان هی خوایە ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ (خوا) دەزانێ هەموو کەس چی دەکات ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ﴾ و لەمەو دواش بێ باوەڕان دەزانن ﴿لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾ سەرئەنجامی (هەر دوو جیهان) بۆ کێ دەبێت. ٤٢)

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾

-پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ یەکێ لە ئێوە نی یە مەگەر هاوەڵێکی لە شەیتان بەسەرەوە دانراوە) ووتیان ئەنانەت تۆش؟ فەرمووی: (بەڵێ منیش بەڵام بێگومان خوای گەورە یارمەتی دام لەبەرانبەری دلو موسڵمان بووە جابۆیە فەرمانم پێناکات بەچاکە نەبێت).

**ئایەتی (١٢٤) سوورەتی (الأنعام):** قال رسول الله (ﷺ): (إن الله اصطفى من ولد إبراهيم إسماعيل و اصطفى من بني إسماعيل بني كنانة و اصطفى من بني كنانة قريشاً و اصطفى من قريش بني هاشم و اصطفاني من بني هاشم) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بەڕاستی خوا لە ناو کوڕانی ئیبراهیمدا ئیسماعیلی هەڵبژاردوە وە لە نەوەی ئیسماعیل نەوەی کینانەی هەڵبژاردوە وە لە نەوەی کینانە قورەیشی هەڵبژاردوە وە لە قورەیش نەوەی هاشمی هەڵبژاردوە و لەنەوەی هاشم منی هەڵبژاردوە).

**ئایەتی (١٢٥) سوورەتی (الأنعام):** قال رسول الله (ﷺ): على كل مسلم صدقة، قال أرأيت إن لم يجد؟ -

﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پێت دەڵێن ﴿ لَسْتَ مُرْسَلاً ﴾ تۆ ڕەوانەکراو (وپێغەمبەری خوا) نیت ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ ﴾ تۆش (ئەی موحەممەد(ﷺ) پێیان) بڵێ خوا بەسە ﴿ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾ شایەت بێت لەنێوان من و ئێوەدا ﴿ وَمَنْ عِندَهُ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ هەروەها ئەو کەسەش کەشارەزایی کتێبی (ئاسمانی) لایە. ٤٣)

## سورەتی ﴿ إبراهيم ﴾

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿ الر ﴾ بە(ئەلیف لام ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ ﴾ ئەمە پەڕاوێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ﴿ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت ﴿ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ لەتاریکی یەکانەوە بۆ ڕووناکی ﴿ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾ بەئیزنی پەروەردگاریان ﴿ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ (ڕێنموونیان بکەیت) بۆ ڕێگای (خوای) بەدەسەڵاتو زاڵی سوپاس کراو. ١)﴿ ٱللَّهِ ٱلَّذِى ﴾ئەو خوایەی﴿ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە هی ئەوە ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾ و هاوار و وای بۆ بێ باوەڕان ﴿ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴾ لە سزایەکی سەخت. ٢)﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ ئەوانەی کە ژیانی دنیایان لا خۆشترە لە ژیانی ڕۆژی دوایی ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ و بەرگری (خەڵکی) دەکەن لەڕێگای خوا ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾ دەیانەوێت ئەو (ڕێگای خوا) لارو چەوت نیشان دەن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴾ ئەوانە لەگومڕاییەکی دوور(لە ڕاستی)دان. ٣) ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ ﴾ وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە ﴿ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ ﴾ بەزمانی گەلەکەی خۆی نەبێت ﴿ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾ بۆ ئەوەی (ئایینەکەیان) بۆ ڕوون بکاتەوە ﴿ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ ﴾ ئەوسا خوا هەرکەسی ویستبێ گومڕای کردووە ﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ هەرکەسێکیشی ویستبێ ڕێنموونی کردووە﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ هەر ئەویش زاڵی کاردروستە. ٤) ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی مووسامان نارد ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾ بەموعجیزەکانمانەوە ﴿ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ ﴾ (فەرمانمان پێ دا) کەگەلەکەت ڕزگار بکە﴿ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ لەتاریکیەکانەوە بۆ ڕووناکی﴿ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ﴾ و ئامۆژگاریان بکە بە (ڕووداوەکان لە) ڕۆژەکانی خوادا (یا بەهرەکانی خوایان بیر بخەرەوە) ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ ﴾ بەڕاستی لەو (بیرخستنەوە)دا پەند و بەڵگەی زۆر هەیە﴿ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار. ٥)

وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ أَنجَىٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾

- قال يعمل بيديه فينتفع نفسه ويتصدق، قال فإن لم يستطع؟ قال: يعين ذا الحاجة الملهوف، قال أرأيت إن لم يستطع؟ قال: يأمر بالمعروف أو الخير، قال أرأيت إن لم يفعل؟ قال: يمسك عن الشر فإنها صدقة) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لەسەر هەموو موسوڵمانێکە خێرێك بکات ووتی: ئەی ئەگەر نەیبوو خێر بکات؟ فەرمووی: با بەدەستی کارێك بکات و سوودی هەبێت بۆ خۆی و خێرێشی لێ بکات، ووتی: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: با یارمەتی کەسێکی هەژار بدات کە هانای بۆ هێناوە و داوای یارمەتی دەکات، ووتی: ئەی ئەگەر نە یتوانی؟ فەرمووی: با فەرمان بکات بە چاکە و خێر کردن، ووتی ئەی ئەگەر نەی کرد؟ فەرمووی: باواز لە خراپە کردن بهێنێت ئەوە خێرو چاکەیە).

ئایەتی (١٤٦) سورەتی (الأنعام): قال رسول الله (ﷺ): (لعن الله اليهود حرمت عليهم الشحوم-

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێ مووسا بەگەلەکەی ووت ﴿ ٱذْكُرُوا نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾ بیری بەهرەوچاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿ إِذْ أَنجَىٰكُم ﴾ کاتێ کەڕزگاری کردن ﴿ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴾ لە دارو دەستەکەی فیرعەون ﴿ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ کەسزای خراپیان پێ دەچەشتن (بەهەمیشەیی) ﴿ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ ﴾ و کوڕانی ئێوەیان سەردەبڕی ﴿ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾ و ئافرەتانی ئێوەیان بەزیندوویی دەهێشتەوە (بۆ خزمەت کاری) ﴿ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ لەوەتاندا تاقی کردنەوەیەکی گەورە بوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە. ٦) ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەروەردگارتان ڕای گەیاند ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ سوێندبێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی) من بکەن بۆتان زیاد دەکەم ﴿ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ﴾ بەلام بێگومان ئەگەر نا سوپاسی بکەن ئەوە بەڕاستی سزای من زۆرپەتینە. ٧) ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ ﴾ مووسا فەرمووی ﴿ إِن تَكْفُرُوٓا أَنتُمْ ﴾ ئەگەر ئێوە ناسوپاسی (بەهرەکانی خوا) بکەن ﴿ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ و هەموو ئەو کەسانەش لەزەویدان ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾ ئەو بەڕاستی خوا بێ نیازی سوپاس کراوە. ٨) ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ ﴾ ئایا بۆتان نەهاتووە ﴿ نَبَؤُا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ هەواڵی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئێوەدا بوون ﴿ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾ گەلی نووح و عاد و سەموود ﴿ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾ هەروەها ئەوانەی کە لەپاش ئەوان بوون و هاتن ﴿ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ بێجگە لەخوا هیچ کەس نایانزانێ ﴿ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ پێغەمبەرەکانیان بۆهات بە موعجیزە و بەڵگەی ئاشکراوە ﴿ فَرَدُّوٓا أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾ ئینجا ئەوان دەست و پەنجەی خۆیان گەست لە ڕق و قین دا ﴿ وَقَالُوٓا إِنَّا كَفَرْنَا ﴾ و ووتیان بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین ﴿ بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ ﴾ بەو(پەیامە)ی کە بەئێوەدا نێردراوە ﴿ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لەگوماندایین ﴿ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾ لەوەی ئێوە بانگمان دەکەن بۆلای و دوو دڵین. ٩) ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ ﴾ پێغەمبەرەکانیان ووتیان (پێیان) ﴿ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ ﴾ ئایا لەخوادا گومان هەیە ﴿ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿ يَدْعُوكُمْ ﴾ بانگتان دەکات ﴿ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾ بۆ ئەوەی لەگوناهەکانتان خۆش بێت ﴿ وَيُؤَخِّرَكُمْ ﴾ و دواتان بخات ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ بۆ کاتێکی دیاری کراو ﴿ قَالُوٓا إِنْ أَنتُمْ ﴾ ووتیان ئێوەش ﴿ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾ هەر ئادەمیەکی وەک ئێمەن ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا ﴾ دەتانەوێ بەرگری ئێمە بکەن و لامان دەن ﴿ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾ لە(پەرستنی) ئەوەی کە باوو باپیرانمان دەیان پەرست ﴿ فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾ دەی نیشانە و بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن (ئەگەر ڕاست دەکەن پێغەمبەرن). ١٠)

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴿١٨﴾

-فباعوها و أكلوا أثمانها و أن الله إذا حرم **على قوم أكل شيء حرم** عليهم **ثمنه)(رواه أحمد).** پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:(خوا **نەفرینی کرد لەجولەکە،** چەوری **و دوو گیان لێ حەرام کرا کەچی ئەوان فرۆشتیان و نرخەکەیان خوارد** جا **بێگومان خوا** کاتێ خواردنی شتێکی لەسەر گەل و کۆمەڵێك حەرام کرد نرخەکەشی حەرام **دەکات** لێیان).

**ئایەتی (١٥١) سورەتی (الأنعام):** قال رسول الله (ﷺ): (أتاني جبريل فبشرني أنه من مات لا يشرك بالله شيئاً من أمتك دخل **الجنة قلت** و إن زنى وإن سرق؟ قال و إن زنى وإن سرق، قلت و إن زنى و إن سرق؟ قال و إن زنى و إن سرق. قلت و إن زنى و إن سرق؟ قال و إن زنى و إن سرق و إن شرب الخمر).(رواه البخاري ومسلم).
پێغەمبەری **خوا** (ﷺ) فەرمووی: (جیبریل هات بۆ لام و مژدەی پێ دام کە بێگومان ئەو کەسەی بمرێ لە-

﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ﴾ پێغەمبەرەکانیان پێیان ووتن ﴿إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئێمە هەر ئادەمیەکین وەکو ئێوە ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ﴾ بەڵام خوا ﴿يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ منەت دەنێ بەسەر هەرکام لەبەندەکانی دا کەبیەوێ(دەیکاتە پێغەمبەر) ﴿وَمَا كَانَ لَنَا﴾وە ئێمە هەرگیز ناتوانین ﴿أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ﴾ موعجیزە و بەڵگەیەکتان بۆ بێنین ﴿إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ مەگەر بەئیزنی خوا ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ وە باوەڕداران پشت هەر بەخوا ببەستن. ١١)﴿وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ﴾ وە ئایا بۆچی پشت بەخوا نەبەستین ﴿وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا﴾ کە بێگومان ئەو (زاتە) ڕێگای ڕاستی نیشان داوین؟ ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ﴾ وە بەڕاستی دان بەخۆماندا دەگرین ﴿عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا﴾ هەر ئازارێکمان بدەن ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ دەبا خۆسپێران پشت هەر بەخوا ببەستن. ١٢)﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێ بڕواکان ووتیان ﴿لِرُسُلِهِمْ﴾ بەپێغەمبەرەکانیان ﴿لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا﴾ بەڕاستی لەخاك و وڵاتەکەمان دەرتان دەکەین ﴿أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾ یان بەڕاستی دەبێ بگەڕێنەوە ناو ئاینەکەی ئێمە ﴿فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ﴾ جا پەروەردگاریان نیگای بۆ (پێغەمبەران) کرد ﴿لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ﴾ کە بێگومان ستەمکاران لەناو دەبەین. ١٣) ﴿وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ﴾ و بێگومان ئێوە نیشتەجێ دەکەین﴿الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ﴾ لەو خاکەدا پاش (تیاچوونی) ئەوان ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي﴾ ئەوەش بۆ کەسانێکە لەوەستانی بەردەم من دەترسن (لەقیامەتدا) ﴿وَخَافَ وَعِيدِ﴾ وە(پێشتر) ترسابێ لەهەڕەشە(ی من). ١٤) ﴿وَاسْتَفْتَحُوا﴾ وە (پێغەمەران) داوای سەرکەوتن و زاڵ بونیان کرد (لەخوا) ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ و هەموو ملهوڕو یاخییەك بێ هیوا بوون. ١٥)﴿مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ﴾ لەدوا (تیاچوونی) جێگای) ئەو دۆزەخە ﴿وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ﴾ و لە کێم و زووخاو ئاو دەدرێت. ١٦)﴿يَتَجَرَّعُهُ﴾ کە قوم قوم (زۆر بە قیزەوە) دەیخواتەوە ﴿وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ﴾ بەڵام ناتوانێ قوتی بدات ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ﴾ و مردنی بۆ دێت ﴿مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ لەهەموو لایەکەوە ﴿وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ و کەچی ناشمرێ ﴿وَمِن وَرَائِهِ﴾ و لەدوا ئەوەش ﴿عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ سزای سەخت (دەدرێ). ١٧)﴿مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی بێ بڕوابوون بەپەروەردگاریان نموونەی ﴿أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ﴾ کردەوەکانیان وەك خۆڵەمێشێك وایە ﴿اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ﴾ بەتوندی با لێی هەڵکردبێت ﴿فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾ لە ڕۆژێکی ڕەشەبای سەختدا ﴿لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ ئەوان هیچیان دەست ناکەوێت لەوەی کەلە دنیادا کردویانە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ﴾ ئا ئەوەیە گومڕابوونی دوور لە ڕاستی. ١٨)

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ
يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ
﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟
إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ
مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ
أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ
لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ
فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ
فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠
بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ
أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ
﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ
تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ
فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً
كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾

-نوممەنەکـەت و هیـچی نەکردبێتـە هاوبـەش بـۆ خـوا ئـەوە دەچـێتە بەهەشتەوە، ووتم: ئەگەر زینا و دزیش بکـات؟ فـەرمووی: ئەگەر زینا و دزیش بکات. ووتم: ئەگەر زینـا و دزیـش بکات؟ فـەرمووی: ئەگەر زینَا و دزیش بکات. ووتم: ئەگەر زینـا و دزیـش بکـات؟ فـەرمووی: ئەگەر زینا و دزیش بکـات و عـارەقیش بخواتەوە).

**ئایەتی (١٥٣) سورەتی (الأنعام)**

عـن ابـن مـسعود (ﷺ) قـال: خـط رسول الله (ﷺ) خطاً بيده ثم قال (هذا سبيل الله مستقيماً) وخط عن يمينه و شماله ثم قال (هذه السبل ليس منها سبيل إلا عليه شيطان يدعو إليه) ثم قرأ ﴿وإن هذا صراطي مستقيماً فاتبعوه و لا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله﴾.(رواه أحمد والحاكم). ئیبن و مەسعود(رەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبەر(ﷺ) هێڵێکی بەدەستی کێشاو پاشان فەرمووی: (ئەمە ڕێگای خوایە کەڕاست و دروستە) وە لە-

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا نەتان زانیوە کە بێگومان خوا ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئاسمانەکان و زەوی لەسەر ڕاستی دروست کردوە ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئەگەر بیەوێ ئێوە لا دەبات و ناتان هێڵێ ﴿وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ وە دروست کراوی تازە دەهێنێ (لە جێ ی ئێوە). ١٩) ﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ ئەوەش بۆ خوا گران و زەحمەت نی یە. ٢٠) ﴿وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ و هەموویان (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) بۆ خوا دەردەکەون و ئاشکرا ئەبن ﴿فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟﴾ ئینجا بێ دەسەڵاتەکان دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟﴾ بە زۆر دارو خۆ بەزل زانەکان ﴿إِنَّا كُنَّا﴾ بەڕاستی ئێمە لە دنیادا ﴿لَكُمْ تَبَعًا﴾ شوێن کەوتووی ئێوە بووین ﴿فَهَلْ أَنتُم﴾ ئاخۆ ئێوە ﴿مُّغْنُونَ عَنَّا﴾ بەرگری دەکەن لە ئێمە ﴿مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ هەندێك لە سزای خوا ﴿قَالُوا۟﴾ (ئەوانیش) دەڵێن ﴿لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ﴾ ئەگەر خوا ئێمەی ڕێنموونی بکردایە ئێمەش ئێوەمان ڕێنموونی دەکرد ﴿سَوَآءٌ عَلَيْنَآ﴾ یەکسانە بۆمان ﴿أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا﴾ هاوار و ناڵە بکەین یان ئارام بگرین ﴿مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ ڕزگار بوونمان نی یە (لە سزای خوا). ٢١) ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ جا شەیتان دەڵێ ﴿لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ﴾ کاتێ کە کار تەواو دەبێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ﴾ بێ گومان خوا بەڵێنی پێدان ﴿وَعْدَ ٱلْحَقِّ﴾ بە بەڵێنێکی هەق و ڕاست ﴿وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ و منیش بەڵێنم پێدان بەڵام درۆم کرد لەگەڵتان ﴿وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم﴾ وەمن ئەم بوو بەسەرتاندا ﴿مِّن سُلْطَٰنٍ﴾ هیچ زۆر و دەسەڵاتێك ﴿إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ﴾ تەنها ئەوە نەبێ کە بانگم کردن (بۆ گومرایی) ﴿فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى﴾ ئیتر ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن (و بەگوێتان کردم) ﴿فَلَا تَلُومُونِى﴾ کەواتە لۆمەی من مەکەن ﴿وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم﴾ بەڵکو لۆمەی خۆتان بکەن ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ﴾ بەڕاستی من ناتوانم بێم بە هاواری ئێوەوە ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ﴾ و ئێوەش ناتوانن بێن بەهاواری منەوە ﴿إِنِّى كَفَرْتُ﴾ بەڕاستی من بڕوام نەبوو ﴿بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ﴾ بەوەی کە پێشتر (لە دنیادا) منتان کرد بوو بە هاوبەش بۆ خوا ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ستەم کاران ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزای سەختیان دەبێت. ٢٢) ﴿وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە دەخرێنە ﴿جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ناو بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بە هەمیشە تیایدا دەبن بە ئیزنی پەروەردگاریان ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ بەخێرهاتنیان لەو (بەهەشتە)دا بەووتەی سەلامە. ٢٣) ﴿ أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەت زانیوە؟ ﴿كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا﴾ خوا چۆن نموونەی هێناوەتەوە ﴿كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾ کە ووتەی چاك و ڕاست (لا إلە إلا الله) وەك درەختێکی چاك و بەسوود وایە ﴿أَصْلُهَا ثَابِتٌ﴾ ڕەگی قایم (لە زەویدا)دا کۆتایی ﴿وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ و لق و پۆپەکانیشی (بەرز بووبێوە) بە ئاسماندا. ٢٤)

تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذْنِ رَبِّهَاۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ
كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ
﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ
ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا
وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَاۖ وَبِئْسَ
ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلْ
تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ
فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ
ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٧) سورەتی (ابراهیم):** ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ ئەسانى لە بەڕائى کوڕی عازیبەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم ئایەتە ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ دەربارەی سزای ناوگۆڕ هاتۆتە خوارەوە ، دەوترێت بە مردوو:کێ پەروەردگارتە ؟ ئەویش دەڵێت خوا پەروەردگارمە ئایینم ئایینی موحەممەدە (ﷺ) ئەمەیە واتای ئەم ئایەتە ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ ...﴾.

-لای ڕاست و چەپیەوە چەند مێلی تری کێشا و پاشان فەرمووی: (ئەم ڕێگایانەش هیچ ڕێگایەکیان نی یە مەگەر شەیتانێکی لەسەرە و بانگی(خەڵکی) بۆ دەکات) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە-

﴿ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا﴾ ئەو (درەختە) میوە و بەرپێگرێت ﴿كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ هەموو کاتێک بەئیزنی پەروەردگاری ﴿وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ﴾ وە خوا ئەو نموونانە دەهێنێتەوە ﴿لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە. ٢٥) ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ وە نموونەی ووتەی خراپ و پیس (بێ باوەڕی) ﴿كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ وەکو درەختێکی خراپ و پیس وایە ﴿ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ﴾ هەڵکەنرابێ لەسەر زەوی (و ڕەگی نەبێت) ﴿مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ هەر خۆی نەگری. ٢٦) ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەی کەبروایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات ﴿بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ﴾ بە ووتەی بەرێ وجێ (کە شایەتومانە) ﴿فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ لەژیانی دنیادا و لەڕۆژی دوایشدا ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ وە خوا ستەم کارانیش گومرا دەکات ﴿وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ وە خوا هەرچی بیەوێ دەیکات. ٢٧)﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە ﴿بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا﴾ لە جیاتی (سوپاسی) بەهرە و چاکەی خوا بێ باوەڕ و سپڵە بوون ﴿وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ﴾ و گەلەکەیان بەرەو هەڵدێر برد. ٢٨)﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا﴾ ئەویش دۆزەخە کەدەچنە ناوی ﴿وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾ کە ئارامگایەکی زۆر خراپە ٢٩)﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ (بێ باوەڕان) چەند هاوتایان بۆخوا بڕیاردا ﴿لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی (خەڵك) گومرابکەن لەڕێگەی خوا ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا۟﴾ ئەی (موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بەوانە ڕابوێرن ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ چونکە بێ گومان چارەنوستان دۆزەخ دەبێت. ٣٠) ﴿قُل لِّعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ بەوبەندانەم کەبروایان هێناوە ﴿يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەڕێکی نوێژەکان بکەن ﴿وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ﴾ و لەوەی پێمان داوون ببەخشن ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ بەنهێنی و ئاشکرا ﴿مِّن قَبْلِ﴾ لەپێش ئەوەی ﴿أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ﴾ کە ڕۆژێك بێت ﴿لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَـٰلٌ﴾ نەکڕین و فرۆشتنی تێدایەو نەدۆستایەتی. ٣١)﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ خوا ئەو زاتەیە کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ و لەئاسمانەوە بارانی باراندوە ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ و هەموو بەرووبوم (و دانەوێڵە)یەکی پێ ڕواندووە ﴿رِزْقًا لَّكُمْ﴾ کە ڕسق و ڕۆزیە بۆ ئێوە ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ﴾ هەروەها کەشتی بۆ رام هێناون ﴿لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی بڕوات بەناو دەریادا بەفەرمانی خوا ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَـٰرَ﴾ و ڕووبارەکانی بۆ رام هێناون. ٣٢) ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ﴾ وە هەروەها رامی هێناوە بۆتان ﴿ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ﴾ ڕۆژ و مانگ بەهەمیشەیی ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ وە شەو و ڕۆژیشی بۆ رام هێناون. ٣٣)

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ
لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ وَإِذْ
قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ
أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ
فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾
رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ
تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ
فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى
عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾
رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ
دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ
ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ
ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾

-﴿وإن هذا صراطي مستقيماً فاتبعوه و لا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله﴾.

**ئایەتی (١٥٨) سورەتی (الأنعام)**: عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (ثلاث إذا خرجت لاينفع نفساً إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيراً طلوع الشمس من مغربها والدجال و دابة الأرض) (رواه مسلم) ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (سێ نیشانە هەن ئەگەر دەرکەوتن هیچ کەسێك باوەڕەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت گەر لەوەو پێش باوەڕی نەهێنا بێت یان چاکەیەکی نەکرد بێت لەکاتی باوەڕ بوونەکەیدا: هەڵاتنی خۆر لەخۆرئاواوە و دەجال و پەیدابوونی گیاندارەکەکە بە(دابة الأرض) ناوبراوە).

**ئایەتی (١٦٠) سورەتی (الأنعام)**: عن ابن عباس (رضي الله عنهما) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال فيما يرويه عن ربه-

﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ وە لەهەموو ئەو شتانە کەداواتان کردووە پێی بەخشیوون ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ﴾ خۆ ئەگەر بەهرە و نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ﴿لَا تُحْصُوهَآ﴾ بۆتان ناژمێردرێن ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ﴾ بەڕاستی ئادەمی (بێ بڕوا) ﴿لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ زۆر ستەم کار و سپڵەیە. ٣٤) ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێ ئیبراهیم ووتی ئەی پەروەردگارم ﴿ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا﴾ ئەم شارە (مەککە) بکە بەشارێکی ئارام و ئاسایش ﴿وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ﴾ وە خۆم و کوڕەکانم بپارێزە و دوورخەرەوە ﴿أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ﴾ لەوەی بتەکان بپەرستین. ٣٥) ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ﴾ ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە ﴿أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ زۆر لەخەڵکیان گومڕا کردوە (و لایان دان لەڕێگەی ڕاست) ﴿فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى﴾ جا هەرکەسێ (لەڕۆڵەکانم) شوێن من کەوت ئەوە بێگومان لەمنە ﴿وَمَنْ عَصَانِى﴾ هەرکەسیش سەرپێچی کردم ﴿فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێ گومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی. ٣٦) ﴿رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى﴾ ئەی پەروەردگارمان من هەندێ لەڕۆڵەکانم نیشتەجێ کرد ﴿بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ﴾ لە شیوێکی بێ کشتوکاڵ دا ﴿عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ﴾ لای ماڵە پیرۆز و ڕێزگیراوەکەت ﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەی پەروەردگارمان تا بە چاکی نوێژ بەجێ بێنن ﴿فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ بەڵکو دڵی خەڵکانێ وا لێبکەیت ﴿تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ﴾ سۆزیان ببێ بۆلایان ﴿وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ و لەهەموو بەر و میوەیەکیش ڕۆزیان بدە ﴿لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ بەڵکو شوکرانە بژێرن. ٣٧) ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ دەزانی ﴿مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ﴾ بە هەرچی دەیشارینەوە و هەرچی دەری دەبڕین ﴿وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ وە هیچ شتێ لای خوا شاراوە نی یە ﴿فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ نەلەزەوی و نەلەئاسماندا. ٣٨) ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى﴾ هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی ﴿وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ﴾ کە ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم بەپیری ﴿إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە. ٣٩) ﴿رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى﴾ ئەی پەروەردگارم من و ڕۆڵەکانم وا لێبکەی بەچاکی نوێژەکان بەجێ بێنین ﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ﴾ ئەی پەروەردگارمان پاڕانەوە و نزاکەم وەرگرە. ٤٠) ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی پەروەردگارمان لەمن و باوکم و دایکم و هەموو بڕواداران ببورەو خۆش ببە ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ﴾ لە ڕۆژێك دا کە لێپرسینەوە دەکرێ و بەرپا ئەبێ. ٤١) ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا﴾ وا مەزانە خوا بێ ئاگایە ﴿عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ لەوەی کەستەم کاران دەیکەن ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ﴾ بێگومان ئەو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك ﴿تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ کەچاوەکان تێیدا ئەبلەق دەبن (و ئانوقێن لە ترسا). ٤٢)

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ الْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ النَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٥٢﴾

-تبارك و تعالى (إن ربكم رحيم من هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة فإن عملها كتبت له عشراً إلى سبعمائة إلى أضعاف كثيرة، ومن هم بسيئة فلم يعملها كتبت له حسنة فإن عملها كتبت له واحدة أو يمحوها الله عز وجل و لا يهلك على الله إلا هالك)(رواه البخاري و مسلم).
عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەپەروەردگاریەوە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ:
(بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە زۆر بە بەزەییە یە هەر کەس نیازی چاکەیەکی کردو ئەنجامی نەدا ئەوە یەک چاکەی بۆ دەنوسێ ئەگەر ئەنجامیدا ئەوە دە تا حەوت سەد چاکەو تا چەندانەی زیاتریشی بۆ دەنووسێ، وە هەر کەس نیازی خراپەیەکی کردو ئەنجامی نەدا ئەوە یەک چاکەی بۆ دەنوسێ وەئەگەر ئەنجامی دا ئەوە یەک خراپەی بۆ دەنوسێ یان خوای گەورە دەیسڕێتەوە، وەکەس گرفتار نابێ و تیا ناچێ مەگەر یەکێ هەرنەیەوێ ڕزگار بێ).

﴿مُهْطِعِينَ﴾ بەچەسپانی دەڕۆن (بەدەم بانگ کەریانەوە) ﴿مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ﴾ سەریان بەرزکردۆتەوە(بۆ ئاسمان) ﴿لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ﴾ پێڵوی چاویان ناتروکێنن ﴿وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ﴾ و دڵیان خالّی یە (لەتێگەشتن). ٤٣) ﴿وَأَنذِرِ النَّاسَ﴾ وە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خەڵکی ئاگاداربکە و بترسێنە ﴿يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ﴾ لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ﴿فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئینجا ئەوانەی کەستەمیان کردووە دەڵێن ﴿رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە ﴿نُّجِبْ دَعْوَتَكَ﴾ تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوە ﴿وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ﴾ و شوێنی پێغەمبەران بکەوین ﴿أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد ﴿مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾ کە هەرگیز لە ناوناچن. ٤٤) ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ﴾ هەر لەجێ و شوێنی ئەوانە نیشتەجێ بوون ﴿ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ کەستەمیان لەخۆیان کرد ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ﴾ و بەروونی بۆتان دەرکەوت ﴿كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ﴾ کە چیمان بەسەر هێنان ﴿وَضَرَبْنَا لَكُمُ الْأَمْثَالَ﴾ نموونەی زۆریشمان بۆتان هێنایەوە. ٤٥) ﴿وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ﴾ بێگومان ئەو (بێ باوەڕانە) پیلانی گەورەی خۆیانیان گێڕا (دژی پێغەمبەرەکانیان) ﴿وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ﴾ خوای گەورە ئاگادارە بە پیلانەکانیان ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ﴾ وە هەر چەندە پیلانەکەیان ﴿لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴾ شاخەکانی پێ بترازێ (و لەبن بچێ). ٤٦) ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ﴾ جا واگومان مەبە خوا ﴿مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ﴾ ئەو بەڵێنەی داویەتی بەپێغەمبەرانی بەدی ناهێنێ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ بەڕاستی خوا خاوەن دەسەڵاتی تۆڵەسێنە. ٤٧) ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ﴾ لەڕۆژێکدا کە ئەم زەوی یە دەگۆڕێ ﴿غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾ بەزەوی یەکی تر و ئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ ئەوسا هەموو (لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا. ٤٨) ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ﴾ و لەو ڕۆژەدا تاوان باران دەبینی ﴿مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ لە کۆت و زنجیردا پێکەوە بەستراون. ٤٩) ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ﴾ پۆشاکیان قەترانی ڕەشە ﴿وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ و دەم و چاویشیان ئاگر دایپۆشیوە. ٥٠) ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ بۆ ئەوەی خوا تۆڵەو پاداشتی هەموو کەسێك بدات بە گوێرەی ئەوەی کەکردویەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ بەڕاستی خوا لێپرسینەوەی خێرایە. ٥١) ﴿هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەم (قورئانە) ڕاگەیاندن و جاڕێکە بۆ هەموو خەڵك ﴿وَلِيُنذَرُوا بِهِ﴾ و تا پێی بێدار بکرێنەوە ﴿وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ وە بۆ ئەوەی بزانن بێگومان ئەو(خوا) پەرستراوێکی تاك و تەنهایە ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ و تا خاوەن ژیرییەکان بیربکەنەوە و پەند بگرن. ٥٢)

# سُورَةُ الحِجر

آیاتها ٩٩ — ترتیبها ١٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤﴾ مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٥﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾

**ئایەتی (١٦١) سورەتی (الأنعام):** عن ابن أبزى عن أبيه قال: كان رسول الله (ﷺ) إذا أصبح قال: (أصبحنا على ملة الإسلام و كلمة الإخلاص و دين نبينا محمد و ملة أبينا إبراهيم حنيفاً وما كان من المشركين) (رواه النسائي). ئیبن ئەبزا لەباوكیەوە گێڕاویەتیەوە ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێ ڕۆژی دەكردەوە دەیفەرموو: (ڕۆژمان كردەوە لەسەر ئاینی ئیسلام و ووشەی یەكتاپەرستی و ئاینی پێغەمبەرمان موحەممەد و ئاینی ئیبراهیم كە پاك و ڕاستە و لەبت پەرستان نەبوو).

**ئایەتی (١٦٥) سورەتی (الأنعام):** عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن الدنيا حلوة خضرة و إن الله مستخلفكم فيها فناظر ماذا تعملون، فاتقوا الدنيا و اتقوا النساء فإن أول فتنة بني إسرائيل كانت في النساء). (رواه مسلم). ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتی یەوە ووتی:

## سورەتی ﴿الحجر﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿الر﴾ بە(ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ﴾ ئەمە ئایەتەکانی ئەو کتێبەن کەقورئانی ڕوون کەرەوەیە. ١) ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی کەبێ باوەڕ بوون زۆر جار ئاوات دەخوازن﴿لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾ کاشکای موسوڵمان بوونایە. ٢) ﴿ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا﴾ لێیان گەڕێ بابخۆن و ڕابوێرن﴿وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ﴾ وئومێد بێ ئاگایان بکات ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ جا بێگومان لەمەو دوا دەزانن (چۆن سزایان دەدەین). ٣) ﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾ (خەڵکی) هیچ شارێکمان لەناو نەبردووە﴿إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ﴾ مەگەر کاتی دیاری کراو بۆ لەناو چوونیان هەبووە. ٤) ﴿مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ﴾ وەهیچ ئوممەتێك پێش ناکەوێ﴿أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ لەکاتی لەناوبردنی خۆی هەروەها دواش ناکەوێ. ٥) ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي﴾(بێ باوەڕان) ووتیان ئەی ئەو کەسەی﴿نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ﴾ کە قورئان نێرراوەتە خوار بۆ سەرت﴿إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ بەڕاستی تۆ شێتی. ٦) ﴿لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَائِكَةِ﴾دەی بۆ فریشتەمان بۆ ناهێنی (شایەتی بدات تۆ پێغەمبەری)﴿إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانیت. ٧) ﴿مَا نُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ ئێمە فریشتە نانێرینە خوارەوە مەگەر بەڕاست و ڕەوا ﴿وَمَا كَانُوا إِذًا مُّنظَرِينَ﴾ وە ئەو کاتەش ئەوانە مۆڵەت نادرێن. ٨) ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ﴾ بێ گومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە ﴿وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ و بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین. ٩) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ﴾ سوێندبێ بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانمان ناردووە ﴿فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ﴾ لەناو هۆزو کۆمەڵە پێشووەکاندا. ١٠) ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ﴾ هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە ﴿إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ مەگەر گاڵتەو لاقرتێیان پێ کردووە. ١١) ﴿كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە ئێمە ئەو (قورئانە) دەخەینە ناو دڵی تاوان بارانەوە. ١٢) ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ کەچی ئەوان باوەڕی پێ ناهێنن ﴿وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ﴾ کەبێ گومان باوو ڕێبازی پێشووەکانیش هەر وابوو. ١٣) ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم﴾ ئەگەر بۆمان بکردنایەتەوە﴿بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾ دەرگایەك لەئاسمانەوە ﴿فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ﴾ و ئەوان پیایدا بڕۆنە سەرەوە. ١٤) ﴿لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا﴾ ئەوسا دەیان ووت بێ گومان ئێمە چاومان بەستراوە ﴿بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێ کراوە. ١٥)

وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾

-پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی **دنیا** خۆشی **و شیرینی سەوزایی و جوانیەکی سەرنج ڕاکێشە** وە بێگومان **خوا ئێوەی کردوە بە جێنشین تێیدا جا سەیرتان دەکات تابیینێ چی دەکەن دەی کەواتە خۆتان بپارێزن لە** دونیا **و خۆشتان بپارێزن** لەئافرەتان **چونکە** بە ڕاستی **یەکەم** بەلاو لە نایین لادانی ئەوەی ئیسرائیل **بەهۆی** ئافرەتانەوە **بوو).**
**ئایەتی (٦) سورەتی**
**(الأعراف):** عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) (كلكم راع و كلكم مسؤول عن رعيته فالإمام يسأل عن **رعيته** و الرجل يسأل عن أهله و المرأة تسأل عن بيت زوجها و العبد يسأل عن مال سيده). (رواه البخاري ومسلم) عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتی یەوە ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ( هەمووتان شوانن وە هەمووشتان بەرپرسیارن لە ژێر دەستەکانتان (لە بواری خۆتاندا)-

﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا﴾ سوێند بەخوا بێ گومان ئێمە دروستمان کردووە ﴿فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا﴾ چەند بورجێك لەئاسماندا ﴿وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ﴾و ئەو(ئاسمانە)مان رازاندۆتەوە بۆ سەرەنج دەران. ١٦) ﴿وَحَفِظْنَاهَا﴾و ئەو(ئاسمانە)مان پاراستووە ﴿مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ﴾ لەهەموو شەیتانێکی دەر کراو لەبەزەیی خوا. ١٧) ﴿إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ﴾ مەگەر ئەوانەی کەبەدزیەوە گوێ دەگرن ﴿فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ یەکسەر گڕو ئاگرێکی دیار دوایی دەکەوێ (وەدوای دەنێ). ١٨) ﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾ زەویشمان راخستووە ﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ﴾ وچەند کێوو شاخی دامەزراومان تێدا داناوە ﴿وَأَنبَتْنَا فِيهَا﴾و رواندوومانە تیایدا ﴿مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ﴾ لەهەموو رووەکو درەختێك بەرێکو پێکی. ١٩) ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ﴾ وە لەو(زەویە)دا هۆکارەکانی ژیانمان بۆ ئێوە رەخساندوە ﴿وَمَن لَّسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ﴾ هەروەها بۆ ئەوانەش کەئێوە رزق رۆزیان نادەن. ٢٠) ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ﴾ وە هیچ شتێك نی یە مەگەر خەزێنەکانی لای ئێمەیە ﴿وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾و نای نێرین و نایدەین بەئەندازەی دیاری کراو نەبێت. ٢١) ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ﴾ وە بامان ناردووە (پەمۆی) پیتێنران (بۆ دارو درەختو رووەك) ﴿فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ ئینجا لەئاسمانەوە بارانمان باراندووە ﴿فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ﴾ وەئێوەمان پێ تێراو کردووە ﴿وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ لەکاتێکدا ئێوە نەتان دەتوانی ئەو(ئاوە) خەزن بکەن. ٢٢) ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ﴾ بێ گومان هەر ئێمە دەژێنین و دەمرێنین ﴿وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ﴾ هەر ئێمەش میراتگری هەمووانین. ٢٣) ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ﴾ سوێند بەخوا ئێمە ئاگادارین بەوانەی لەپێش ئێوەوە بوون ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ﴾و سوێند بەخوا بێگومان ئەوانەش دەناسین کەپاش ئێوە دێن. ٢٤) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ﴾ بێ گومان هەر پەروەردگارت هەموویان کۆ دەکاتەوە ﴿إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی هەر خۆی کاردروستی زانایە. ٢٥) ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ﴾ سوێندبێ بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروست کرد ﴿مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ لە قوڕێکی رەشی ترشاوی رەق. ٢٦) ﴿وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ﴾ جنۆکەشمان پێشتر دروست کرد ﴿مِن نَّارِ السَّمُومِ﴾ لە ئاگرێکی بەتین. ٢٧) ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ﴾ (بیریان بخەرەوە) کاتێك پەروەردگارت بەفریشتەکانی فەرموو ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا﴾ بەڕاستی من بەشەرێك دروست دەکەم ﴿مِّن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ لە قوڕێکی رەشی ترشاوی رەق. ٢٨) ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ﴾ هەر کاتێ رێك و پێکم کرد ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ و فوم بە بەریدا کرد لە رۆحێك کە خۆم دروستم کردووە (مەبەست لەدانە پاڵی رۆح بۆلای خوا رێزو تەشریفە) ﴿فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ دەبێ یەکسەر سوژدەی بۆ بەرن. ٢٩) ﴿فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ جا فریشتەکان هەموو تێکڕا سوژدەیان برد (بۆی). ٣٠) ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ﴾ ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کرد ﴿أَن يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ لەوەی کە لەگەڵ سوژدەبەراندا بێت. ٣١)

قَالَ يَـٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَـٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَـٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَـٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٌ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَـٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾

**-کەوا بوو پێشەوا پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی، ژێر دەستەکانی پیاو پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی ئەو کەس وکارەی کە ئەو سەرپەرشتی** کردون. **ئافرەت** پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی مالّی مێردەکەی وە کۆیلەش پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی مالّی خاوەن و گەورەکەی).

**ئایەتی (١٢) سورەتی (الأعراف)**: عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): (خلقت الملائكة من نور و خلق إبليس من مارج من نارو خلق آدم مما وصف لكم )(رواه مسلم). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (فریشتەکان لەڕووناکی (تیشک) دروست کراون و ئیبلیس لە بڵێسەی ئاگر دروست کراوە و ئادەمیش لەوە دروست کراوە کە بۆتان باس کراوە).

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٧٥-٧٦) سورەتی (النحل):** ﴿وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً عَبْداً مَّمْلُوكاً لاَّ يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ﴾ طەبەری لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە **گێڕاویەتیەوە** کە **وتویەتی** ئەم **ئایەتە** ﴿مَثَلاً رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لاَ يَقْدِرُ عَلَىَ شَيْءٍ﴾ **تا دەگاتە** ﴿وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەو **پیاوە عوسمانی کوڕی عەففانە و پیاوە** لاڵەکەش کە **چاکەی پێ ناکرێ ڕووی لە هەر شوێنێ** بکرێ بەندەکە عوسمانی کوڕی عەففانە کە عوسمان بەخێوی دەکرد و خەرجی دەدا **بەڵام ئەو بەندەیە حەزی لە ئیسلام** نەبوو موسوڵمان نەدەبوو بە عوسمانیشی دەووت ماڵ مەبەخشە و **چاکە مەکە ئیتر ئەو ئایەتە** دەربارەی عوسمان و ئەو بەندەیەی هاتەخوارەوە.

**ئایەتی (٥٨) سورەتی (الأعراف):** عن أبي موسى الأشعري قال: قال رسول الله (ﷺ): (مثل ما بعثني-

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا﴾ ئەوان لەجیاتی خوا شتانێ دەپەرستن﴿لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا﴾ کەخاوەنی هیچ ڕزق و ڕۆزییەکی ئەوان نین ﴿مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا﴾ نەلە ئاسمانەکان و نە لەزەویدا ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾و ناشتوانن (ڕۆزیان بدەن). ٧٣) ﴿فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ﴾ کەواتە وێنە بۆ خوا مەهێننەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی خوا دەزانێ و ئێوە نازانن. ٧٤) ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا﴾ خوا نموونەی هێناوەتەوە بەبەندەیەکی خاوەن دار﴿لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ کەتوانای بەسەر هیچ شتێکدا نی یە﴿وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا﴾ لەگەڵ کەسێکی (باوەڕدار) کەڕزق و ڕۆزی چاکمان پێ دابێ لەلایەن خۆمانەوە ﴿فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا﴾ ئەویش لەو (ڕۆزییە)ی ببەخشێت بەنهێنی و ئاشکرا ﴿هَلْ يَسْتَوُۥنَ﴾ ئایا ئەو دووانە یەکسانن ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوا ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن. ٧٥) ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ﴾ وە هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بەدوو پیاو ﴿أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ یەکێکیان لاڵی زگماکی یە کەتوانای بەسەر هیچ شتێکدا نی یە ﴿وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ﴾ و ئەو (پیاوە) ئەرکو بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە ﴿أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ﴾ بەرە و هەرشوێنێ بینێرێ هیچ خێرو چاکەیەك ناهێنێتەوە ﴿هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ﴾ ئایا ئەو کەسە یەکسانە لەگەڵ کەسێك فەرمان بەداد گەری بدات ﴿وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾و ئەو(کەسە) لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بێت. ٧٦) ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وە هەر بۆ خوایە نهێنی و پەنهانیەکانی ئاسمانەکان و زەوی﴿وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ﴾ وە هاتنی ڕۆژی دوایش (بەلای خواوە) ﴿إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ هەر وەکو چاو تروکانێك وایە یان نزیك تر لەوەش ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ٧٧) ﴿وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾ وە خوا ئێوەی لەسکی دایکتان دەرهێناوە ﴿لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا﴾ کە هیچتان نەدەزانی ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ بەڵام (خوا) گوێ و چاو و دڵی پێدان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی (خوا) بکەن. ٧٨) ﴿أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ﴾ ئایا ئەوان سەرنجی باڵندەیان نەداوە؟ ﴿مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ﴾ کەچۆن لەهەوای ئاسماندا ڕام هێنراون ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ بێجگە لەخوا کێ ڕایان دەگرێ ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بەڕاستی لەو (ڕاگیرکردنە) دا چەند نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕ دێنن. ٧٩)

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلْأَنْعَٰمِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾

-الله به من العلم والهدى كمثل الغيث الكثير أصاب أرضاً فكانت منها نقية قبلت الماء فأنبتت الكلأ والعشب الكثير وكانت منها أجادب أمسكت الماء فنفع الله بها الناس فشربوا وسقوا وزرعوا وأصاب منها طائفة أخرى إنما هي قيعان لا تمسك ماء ولا تنبت كلأ فذلك مثل من فقه في دين الله ونفعه ما بعثني الله به فعلم و علم و مثل من لم يرفع بذلك رأساً و لم يقبل هدى الله الذي أرسلت به).(رواه مسلم). ئەبو مووسای ئەشعەری دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نموونەی ئەوەی خوا منی پێ ڕەوانە کردووە لەزانست و ڕێنمایی وەک بارانێکی زۆر وایە لە زەوییەک ببارێ، جا بەشێک لەو زەوییە پاک و بە پیت بێت ئاوەکەی وەرگرتبێت گیاو لـە وەڕی پێ سەوز بووبێ، وە بەشێکی تری زەوییەکە ڕەقان و بێ گیابێ و ئاوەکە (لەخۆیدا) هەڵگرێت جا بەو (ئاوە) خوای گەورە سوودی گەیاندبێ بە خەڵک-

﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا﴾ **وە خوا** ماڵەکانتانی کردووە بەجێی دانیشتن و **حەوانەوە** ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتًا﴾ وە لەپێستی ئاژەڵیش دەوارو ڕەشماڵی بۆ **فەراهەم هێناون** ﴿تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ﴾ (هەڵدەدرێ و دەگوێزرێتەوە) بە **ئاسانی لەڕۆژی کۆچ و بارکردنتاندا** و لەڕۆژی مانەوەو نیشتەجێ بونتاندا ﴿وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا﴾ وە **(سازاندویەتی بۆتان) لەخوری** و گوڵك ﴿وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا﴾ مووەکانیان شتومەکی ناوماڵ کەکەلکی لێ وەردەگرن ﴿إِلَىٰ حِينٖ﴾ تا ماوەیەك. ٨٠) ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا﴾ **وە خوا لەوەی** کەدروستی کردوە سێبەری زۆری **ڕەخساندووە بۆتان** ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا﴾ وە لەچیاکاندا پەنا گاو ئەشکەوتی **بۆ بەدی هێناون** ﴿وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ﴾ وە سازیداوە بۆتان جل و پۆشاکێك **کەدەتان پارێزێ لەگەرما** ﴿وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡ﴾ **هەروەها** جل پۆشاکێك کە لەکاتی **جەنگدا دەتان پارێزێ** ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ﴾ **ئا بەو جۆرە** چاکەو نیعمەتەکانی **خۆی تەواو دەکات بەسەرتانەوە** ﴿لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ﴾ **بۆ ئەوەی مل** کەچ و موسوڵمان **ببن**. ٨١) ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ﴾ **ئەوسا** ئەگەر ئەوان ڕوویان وەرگێڕا ئەوە بێگومان **ئەوەی لەسەر تۆیە تەنها** ﴿ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ **ڕاگەیاندنی** ئاشکرایە. ٨٢) ﴿يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ﴾ **ئەوانە بەهرەکانی خوا دەناسن** (و دەزانن) ﴿ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾ پاشان ئینکاری دەکەن ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ وە زۆریەی ئەوانە هەر بێ باوەڕن. ٨٣) ﴿وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا﴾ **وە ڕۆژێك دێ ئێمە لەهەر** ئوممەتێك شایەتێك (پێغەمبەرێك) یان بۆ دەنێرین ﴿ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ **ئەوسا مۆڵەت نادرێت** بەوانەی باوەڕیان نەهێناوە ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾ **بیانوشیان لێ وەرناگیرێت**. ٨٤) ﴿وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ وە کاتێ **ئەوانەی ستەمیان کردوە سزای دۆزەخ دەبینن** ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ **نەسزاکەیان لەسەر سووك دەکرێت** نەمۆڵەتیش دەدرێن. ٨٥) ﴿وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ﴾ وە کاتێ ئەوانەی **کەهاوبەشیان** داناوە پەرستراوەکانیان دەبینن ﴿قَالُواْ﴾ دەڵێن ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا﴾ **ئەی** پەروەردگارمان ئەوانە پەرستراوەکانمانن ﴿ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَ﴾ **کە ئێمە هاوارمان لێ ئەکردن** لەجیاتی **تۆ** ﴿فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ﴾ **ئینجا** ئەو **(پەرستراوانە) وتەیان** ئاڕاستە دەکەن (و دەڵێن) بەڕاستی **ئێوە** ﴿لَكَٰذِبُونَ﴾ **درۆزنن**. ٨٦) ﴿وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ﴾ وە **لەو ڕۆژەدا** گوێ **ڕایەڵی و ملکەچی** ئاراستە ئەکەن بۆلای **خوا** ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ وە وون دەبێ لێیان ئەوە درۆیانەی کەهەڵیان دەبەست (لەدنیادا). ٨٧)

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

**-ئاویـــــــان لێ خواردبێتــــەوە و ئاوی** (ئاژەڵ)یان **پێ دابێ و کشت و کاڵیـــان لەبـــەردا** کردبـــــــێ، وە (بارانەکــــــــە) لەزەوییــەکی تــر بیارێ کە تـەخت و ساف بێت نە ئاوی بارانەکە هـەڵگرێت و نــــە لــــەوەڕ سەوزکات، جا ئەم **(زەوی** و بارانــــە) نموونـەی کەسێکە کە لە ئایینی **خوا** گەشـتووە **و** ئـەو (پەیامەی) خوا بـە منــدا **ناردویــەتی** ســـــوودی پـــێ گەیانــدووە بۆیــە فێری زانست بـووە و کەسـانی تریـشی فێرکـردوە، وە نموونـەی کەسـێ کـە بـەم ئاینـە سـەری بـەرز نـەکرد بێتـەوە و ئـــەو ڕێنماییــــــەی وەرنــــــەگرتبێت کـــــە بــــە منــــــدا ڕەوانــــــە کـــــراوە).

**ئایەتی (٦٢) سورەتی (الأعراف):** عن جرير بن عبد الله (رضي الله عنه) قال: (بايعت رسول الله (ﷺ) على إقام الصلاة و إيتاء الزكاة و النصح لكل مسلم).(متفق عليه). جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ)-

﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون و بەرگری خەڵکیشیان کردووە لەڕێگەی خوا ﴿زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ﴾ جگە لە سزا کەی خۆیان سزایان بۆ زیاد دەکەین ﴿بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ﴾ لەبەر ئەوەی کەخراپەکاریان دەکرد. ٨٨)﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا﴾ وە ئەو ڕۆژەی کەئێمە لە هەر ئوممەتێك شایەتێك (پێغەمبەرێك) دەنێرین ﴿عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ بۆسەریان لەخۆیان (کەشایەتیان لێ بدات) ﴿وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ وە تۆش دەهێنین (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەشایەت لەسەر ئەوانە﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆت ﴿تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾ کەڕوون کەرەوەیە بۆ هەموو شتێ ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ وەڕێنموونیو میهرەبانیو مژدەیە بۆ موسڵمانان. ٨٩)﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ﴾ بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بەدادگەری و بەچاکە ﴿وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾و بە بەخشین بەخزم و خوێش ﴿وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ﴾ وە (خوا) بەرگری دەکات لەداوێن پیسی و خراپەو دەست درێژی ﴿يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی پەند وەرگرن و بیربکەنەوە. ٩٠) ﴿وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ﴾ وە بەڵێنی خوا بەجێ بێنن کاتێ کەبەڵێن دەدەن ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾و بەڵێن و پەیمانەکانتان مەشکێنن ﴿بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ لەپاش بەهێز کردنیان ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا﴾ لەکاتێکدا خواتان کردووە بەشایەت و چاودێر بەسەر خۆتانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ بەڕاستی هەرچی دەکەن خوا دەیزانێ. ٩١)﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا﴾ وەك ئەو (ئافرەتە) مەبن کەڕیسەکەی کردەوە بەخوری ﴿مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا﴾ لەپاش بادان و ڕستن و شەتەك دانی ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ﴾ سوێندو پەیمانەکانتان دەکەن بەهۆی ناپاکیو فرو فێڵ لەنێوانتاندا﴿أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ﴾ لەبەر ئەوەی دەستەو کۆمەڵێك زۆرترو بەهێز ترە لەدەستەو کۆمەڵێکی تر ﴿إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ﴾ خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وە سوێند بەخوا لەڕۆژی دواییدا بۆتان ڕوون دەکاتەوە ﴿مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ئەوەی کەئێوە تیایدا جیاواز بوون. ٩٢)﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی دەکرد بەیەك ئوممەت﴿وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام (خوا) هەر کەسێکی بوێ گومڕای دەکات ﴿وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ هەر کەسێکیشی بوێ ڕێنموونی دەکات ﴿وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ وە سوێند بەخوا پرسیارتان لێ دەکرێت لەوەی کەدەتانکرد. ٩٣)ب

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا
وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ
هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ
وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ
مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ
أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ
أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ
فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ
عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا
سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ
﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ
بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ
﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾

**وتی:** (پەیمانم دا بە **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **لەسەر** نوێژ کردن **و زەکات دان** و ئامۆژگاری **و دڵسۆزی بۆ هەموو** موسڵمانێ).

**ئایەتی (٧٣) سورەتی (الأعراف):** عن عبد الله بن عمر قال: **قال رسول** الله (ﷺ) **وهو بالحجر (لا تدخلوا على** هؤلاء **المعذبين إلا** أن **تكونوا باكين** فإن لم تكونوا باكين **فلا** تدخلوا عليهم أن يصيبكم مثل ما **أصابهم)** (رواه البخاري و مسلم). عەبدوڵلای کوڕی **عومەر** وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ لە جێگای گەلی سەموددا بوو فەرمووی: (مەڕۆنە ناو شوێنی ئەو سزادراوانەوە مەگەر بە گریانەوە جا ئەگەر بە گریانەوە نەبێ مەڕۆنە جێگاکەیان نەوەك ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئێوەشدا بێت).

**ئایەتی (٨١) سورەتی (الأعراف):** عن ابن عباس قال: قال رسول الله (ﷺ) : (من وجدتموه يعمل عمل-

﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ﴾ وە سوێندو پەیمانتان مەکەن بەهۆی ﴿دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ﴾ غەدرو ناپاکی لەنێوانتاندا ﴿فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا﴾ تا پێ لەپاش جێگیر بوونی (لەسەر باوەڕ) هەڵنەخلیسکێ ﴿وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ﴾ و سزاو ناڕەحەتی نەچەژن ﴿بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی بەرهەڵستی کردنتان لەڕێبازی خوا ﴿وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ ئەوسا سزای زۆر گەورەتان دەبێ. ٩٤)﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾ وە بەڵێن و پەیمانی خوا بەنرخێکی کەم مەگۆڕنەوە ﴿إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ بەڕاستی ئەوەی کەلای خوا هەیە چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن. ٩٥)﴿مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖ﴾(چونکە) هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێت و نامێنێ بەڵام ئەوەی لای خوایە هەر دەمێنێت ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم﴾ سوێند بەخوا ئەوانەی کە بەئارام بوون پاداشتیان دەدەینەوە﴿بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەپاداشتی چاکترین کردەوەیان. ٩٦)﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ هەرکەس لەنێر یان لەمێ کردەوەی چاکی کردبێ ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗ﴾ و بڕواداریش بوو بێت ئەوە سوێند بەخوا بەژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین ﴿وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ﴾ و سوێند بێ پاداشتیان دەدەینەوە بەچاکتر ﴿مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ لەوەی کەئەوان دەیانکرد. ٩٧)﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی ﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا. ٩٨)﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ﴾ بەڕاستی ئەو(شەیتان) دەسەڵاتی نی یە ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەسەر ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ وتەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. ٩٩)﴿إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ﴾ تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە ﴿يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ﴾ کە ئەو(شەیتان) دەکەنە دۆست پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بەهۆیەوە بوونەتە هاوەڵ دانەر. ١٠٠)﴿وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ﴾ هەر کاتێ ئایەتێک لەجێی ئایەتێکی تردا دابەزێنین ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾ وە خوا چاکتر دەزانێ چی دەنێرێتە خوارەوە ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭ﴾ دەڵێن تۆ لە خۆتەوە درۆ هەڵدەبەستی بەناوی خواوە ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (وانیە) بەڵکو زۆر بەیان هیچ نازانن. ١٠١)﴿قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ﴾ بڵێ جوبرەئیل دایبەزاندوە ﴿مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە بەڕاستی ﴿لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾تا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دامەزراویان بکات﴿وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ﴾و ڕێنموونی و موژدەش بێت بۆموسوڵمانان. ١٠٢)

وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾

هـــــــۆی هاتنـــەخوارەوەی ئایـــەتی (١٠٣) سورەتی (النحل): ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ طـەبـەری لـە حوشـەیمەوە ئـەویش لـــە حوصـــــەینەوە ئـــەویش لـــە عەبدوڵڵای کوڕی موســــــلیمی حەضرەمی یـەوە گێڕاویەتیـــــەوە دەڵێـــــت: دوو کۆیلـەمان هەبوو کـــە خــــەڵکی یەمـــەن نـەبوون ناویـان یەســـــار و جـەبر بوو هـــەردووکیان تـەوراتیان دەخوێند و جار جار پێغەمبـەر (ﷺ) لـــەگەڵیاندا دادەنیـشت، بـۆ بـاوەڕانی قـوڕەیش ووتیـان موحەممـەد لــەبەر ئەوە لـــەگەڵ ئەو دوو منداڵەدا دادەنیشـێت لــەوانەوە ئـەم قورئانـە فێر دەبێت لەو کـاتەدا ئەم ئایەتە هـاتەخوارەوە ﴿لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾.

﴿وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە دەزانین کەئەوانە دەڵێن ﴿إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞ﴾ هەر ئادەمی یە (ئەم قورئانەی) فێری دەکات ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ﴾ کەچی زمانی ئەو کەسەی ئەوەی دەدەنەپاڵ عەجەمی یە ﴿وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ﴾ و ئەم (قورئانە)ش بەزمانی عەرەبی پاراوو ڕوونە. ١٠٣) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەبڕوایان بەئایەتەکانی خوا نی یە ﴿لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ خوای گەورە ڕێنموونیان ناکات، وسزای سەختی بۆ ئامادە کردوون. ١٠٤) ﴿إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومان تەنها ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن بەناوی خواوە ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەباوەڕیان بەئایەتەکانی خوا نی یە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ﴾ و هەر خۆیان درۆزنن. ١٠٥) ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ﴾ ئەو کەسەی بێ باوەڕ بێ بەخوا لەپاشان باوەڕهێنانی ﴿إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ﴾ مەگەر کەسێك زۆری لێ کرا بێت ﴿وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ و دڵیشی دامەزراو بێت بەباوەڕ ﴿وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا﴾ بەڵام کەسێ دڵی خۆش و شادمان بێت بەبێ باوەڕی ﴿فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ و سزای گەورەیان دەبێ. ١٠٦) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ﴾ ئەم (هەڕەشەیە) لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوانە ﴿ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ژیانی دنیا یان لا خۆشەویستر بوو لەژیانی ڕۆژی دوایی ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وە بەڕاستی خوا ڕێنموونی کەسانی بێباوەڕ ناکات. ١٠٧) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ ﴿وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ و گوێ و چاویاندا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾ وە هەر ئەوانەن بێ ئاگایان. ١٠٨) ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ڕاستەو بێگومان ئەوانە لەڕۆژی دواییدا ﴿هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوان زەرەرمەندن. ١٠٩) ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ **پاشان بەڕاستی** پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کۆچیان کردوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ﴾ لەپاش ئەوەی سزا دران پاشان جیهاد و **تێ کۆشانیان کرد** ﴿وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا﴾ و بەئارام بوون **بێ گومان پەروەردگارت لەدوا** ئەوە ﴿لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ لێ بوردەی میهرەبانە. ١١٠)

۞ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١١٣﴾ فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ۖ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾

هۆی هاتنه‌خواره‌وه‌ی ئایه‌تی (١١٠) سوره‌تی (النحل): ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِن بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ طه‌به‌ری له عه‌بدوڵڵای کوڕی عه‌بباسه‌وه گێڕاویه‌تیه‌وه که ووتوویه‌تی: که‌سانێک له خه‌ڵکی مه‌ککه موسوڵمان بوون وه موسڵمان بوونه‌که‌یان شاردبوویه‌وه، له غه‌زای به‌دردا بێ‌باوه‌ڕانی مه‌ککه له‌گه‌ڵ خۆیان بردبوونیان بۆ ئه‌و غه‌زایه، له به‌دردا هه‌ندێکیان لێ کوژرا و هه‌ندێکیان لێ بریندار بوو، موسوڵمانه‌کان ده‌رباره‌یان ووتیان: ئه‌م هاوه‌ڵانه‌مان موسوڵمان و به‌ناچاری هێنراوون بۆ شه‌ڕ له‌به‌رئه‌وه داوای لێبوردنیان بۆ بکه‌ن له‌سه‌ر ئه‌مه ئه‌م ئایه‌ته هاته‌خواره‌وه ﴿ان الذين توفاهم الملائكة ...﴾ عه‌بدوڵڵا ده‌ڵێ: ئه‌م ئایه‌ته ﴿ان الذين توفاهم ...﴾ نووسراو نێردرا بۆ ئه‌و موسوڵمانانه‌ی –

﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ﴾ لەڕۆژێكدا كەهەموو كەسێك دێت ﴿تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا﴾ بەرگری لەخۆی دەكات ﴿وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ﴾ وە هەموو كەسێ هەرچی كردبێ پاداشتی تەواوی وەردەگرێ ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾و ئەوان ستەمیان لێ ناكرێ. ١١١)﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً﴾ خوا نموونەی هێناوەتەوە بە(خەڵكی) شارێك ﴿كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً﴾ كە هێمن و دڵنیا بوون ﴿يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا﴾ ڕزق و ڕۆزی زۆری بۆ دەهات ﴿مِّن كُلِّ مَكَانٍ﴾ لەهەموو شوێنێكەوە﴿فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ﴾ كەچی بەرانبەر چاكە و بەهرەكانی خوا نا سوپاس و سپڵە بوون ﴿فَأَذَاقَهَا اللَّهُ﴾ جا خوا بەو هۆیەوە كردی بەبەر (خەڵكە كە)یدا ﴿لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ﴾ پۆشاكی برسێتی و ترس ﴿بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ﴾ لەبەر ئەو كردەوانەی كەدەیانكرد. ١١٢)﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێكیان لەخۆیان بۆهات ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ كەچی باوەڕیان پێ نەهێنا ﴿فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾ جا سزا گرتنی لەكاتێكدا ستەم كاربوون. ١١٣)﴿فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ جا لەو بژێویەی خوا پێ ی بەخشیوون بخۆن ﴿حَلَالًا طَيِّبًا﴾ كەحەڵاڵ و پاكە ﴿وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ﴾و سوپاسی چاكەو نیعمەتی خوا بكەن ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن. ١١٤)﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ﴾ بێگومان (خوا) ئەوەی حەرامی كردووە لەسەرتان تەنها مردارەوە بوو ﴿وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ و خوێن و گۆشتی بەراز ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ و ئەوەی (كەسەربڕاوەو) ناوی غەیری خوای لێ هێنراوە﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ﴾ بەڵام هەر كەسێك ناچار بوو(لەو حەرامانە بخوات) بێ دەست درێژی و زیادەڕەوی﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا لێ بووردەی میهرەبانە. ١١٥) ﴿وَلَا تَقُولُوا﴾ وە لەخۆتانەوە نەڵێن ﴿لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ﴾ ئەوەی كەبەزبانتاندا دێت بەدرۆ ﴿هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ﴾ ئەوە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە ﴿لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ بۆ ئەوەی درۆ هەڵبەستن بەدەم خواوە﴿إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی درۆ هەڵدەبەستن بەناوی خواوە ﴿لَا يُفْلِحُونَ﴾ ڕزگار نابن. ١١٦)﴿مَتَاعٌ قَلِيلٌ﴾ (لە دنیادا) ڕابواردنێكی كەم(یان دەبێ)﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (لەدوا ڕۆژدا) سزای سەختیان هەیە. ١١٧)﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا﴾ وە لەسەر ئەوانەی كەجوولەكە بوون ﴿حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ﴾ حەراممان كرد (لێیان) ئەوەی كەباسمان كردوە بۆت ﴿مِن قَبْلُ﴾ لەپێش (دابەزینی ئەم ئایەتە) ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ وە ئێمە ستەممان لێ نەكردن ﴿وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵكو خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەكرد. ١١٨)

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ
﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا
كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ
وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾
وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ
لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ
وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ
﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

- لە مەککە مابوونەوە کە بیانوویان نی یە کۆچ ناکەن، ئەنجا ئەوانیش لە مەککە دەرچوون (بە نیازی کۆچ کردن بۆ مەدینە) بەڵام بێ باوەڕانی مەککە پێیان گەیشتن تۆڕیان لێکردن بێ باوەڕ بینەوە ئەوانیش بە ناچاری بێ باوەڕ بوونەوە ئەم ئایەتە لەسەریان هاتەخوارەوە ﴿ ومن الناس من يقول آمنا بالله فإذا أوذي في الله جعل فتنة الناس كعذاب الله ...﴾ ئەنجا موسوڵمانان ئەم ئایەتەیان بۆ ناردن ئەوانیش بۆ جاری دووەم لە مەککە دەرچوون و بێ هیوا بوون لە هەموو خێر و چاکەیەک پاشان ئەم ئایەتە لەسەریان هاتەخوارەوە ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەنجا ئەم ئایەتەیان بۆ ناردن کە خوا دەرووی لێ کردونەتەوە ، ئەوانیش لە مەککە دەرچوون (بێ باوەڕانی مەککە پێیان گەیشتن هەر لە نێوانیاندا چووی ما ئەوەی کوژرا ، کوژرا و ئەوەی ڕزگاری بوو ڕزگاری بوو.

﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ﴾ پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی ﴿عَمِلُوا السُّوءَ بِجَهَالَةٍ﴾ خراپەیان کردووە بەنەفامی ﴿ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ پاشان دوا ئەوە گەڕاونەتەوەو تۆبەیان کردووە ﴿وَأَصْلَحُوا﴾و کرداری خۆیان چاك کردووە ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿مِنْ بَعْدِهَا﴾ لە پاش ئەوانە ﴿لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ لێبوردەی میهرەبانە. ١١٩) ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم ﴿كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ﴾ ئوممەتێك بوو فەرمانبەردار بۆ خوا ﴿حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ لا دەربوو لەهەموو ئاینێکی ناهەق و هەرگیز لەهاوبەش دانەران نەبووە. ١٢٠) ﴿شَاكِرًا لِأَنْعُمِهِ﴾ شوکرانە بژێری (خوا) بووە لەبەرامبەر ئازو نیعمەتەکانیدا ﴿اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ ئەویش هەڵی بژارد و ڕێگەی ڕاستی نیشان دا (کەئیسلامە). ١٢١) ﴿وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ وە ئێمە لەدنیادا بەهرەی چاکمان پێبەخشی ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ وە بەڕاستی ئەو لەڕۆژی دوایشدا لەڕیزی چاکاندایە. ١٢٢) ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ پاشان نیگامان بۆ کردی ﴿أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ﴾ کەپەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە ﴿حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ چونکە پاكو ڕاست بوو بەهیچ جۆرێ لەهاوبەش دانەران نەبوو. ١٢٣) ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ﴾ بێگومان (ڕێزگرتنی) ڕۆژی شەممان تەنها لەسەر ئەوانە دانرا ﴿اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ کەجیاواز بوون تیایدا ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگارت ﴿لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ دادوەری دەکات لەنێوانیاندا ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی کەئەوان تیایدا جیاواز بوون. ١٢٤) ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ﴾ (خەڵکی) بانگ بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت ﴿بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ بەلێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین ﴿وَجَادِلْهُمْ﴾ وە لەگەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) ﴿بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ بەچاکترین شێوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ﴾ بێ گومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ ﴿بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ﴾ بەوانەی گومڕا بوون و لایاندا وە لەڕێگاکەی ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن. ١٢٥) ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ﴾ وە ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە ﴿فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ ئەوە بەئەندازەی ئەو ستەمەی لێتان کراوە تۆڵە بکەنەوە ﴿وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ﴾ وە ئەگەر ئارام بگرن ﴿لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ﴾ ئەوە باشترە بۆ ئارام گران. ١٢٦) ﴿وَاصْبِرْ﴾ وە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) دان بەخۆتدا بگرە ﴿وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾ ئارام گرتنەکەشت هەر بە(یارمەتی) خوایە ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾و خەفەتیان بۆ مەخۆ ﴿وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ﴾و بەو فێڵو پیلانانەش دەیکەن دڵ تەنگ مەبە. ١٢٧) ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) ﴿وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ﴾ هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن. ١٢٨)

# سُورَةُ الإِسْرَاءِ

آیاتها ١١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٢٦) سورەتی (النحل): ﴿وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ﴾ تورمزی دەگێڕێتەوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەڵێ: لە غەزای ئوحودا شەست و چوار پیاوی ئەنصاری و شەش کۆچەری کە حەمزە یەکێکیان بوو شەهید بوون و لوت و گوێیان بڕی بوون، ئەنصارییەکان وتیان ئەگەر ڕۆژێک سەر کەوتین بەسەریاندا لەوەی کردوویانە بەکوژراوەکانمان خراپتر دەکەین بەکوژراوەکانیان، ئەوجا لەڕۆژی ئازاد کردنی شاری مەککەدا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ پیاوێك وتی: لە ئەمڕۆ بە دواوە قوڕەیش نەما، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (قسە بەکەس مەڵێن جگە لە چوار کەس).

## سوورەتی ﴿ الإسراء ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ﴾ پاك و بێ گەردی بۆ ئەوزاتەی کە شەوڕەوی کرد ﴿بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا﴾ بە بەندەی خۆی لە شەوێكدا ﴿مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ لە مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزەوە (مەككە) ﴿إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾ بۆ مزگەوتی (الأقصى) لە (بيت المقدس) ﴿ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ﴾ کە دەورو بەریمان پیرۆز و فەڕدار كردووە ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ﴾ بۆ ئەوەی هێندێ لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی خۆمانی نیشان بدەین ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە. ١) ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە تەوراتیشمان بەخشی بە مووسا ﴿وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ وە ئەو(تەوراتە)مان كردە هۆی ڕێنموونی بۆ نەوەی ئیسرائیل ﴿أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا﴾ (پێمان ووتن) کە بێجگە لە من کەس مەکەنە پشتیوانی خۆتان. ٢) ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ (ئەی) نەوەی ئەو کەسانەی کەلەگەڵ نووح (لە کەشتیدا) هەڵمان گرتن ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ بەڕاستی نووح بەندە یەکی زۆر سوپاس گوزار بوو. ٣) ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئیسرائیلیە کانمان ئاگادار کردو هەواڵمان پێدان لەنامەکەیاندا ﴿لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ﴾ کە سوێند بەخوا ئێوە خراپەکاری دەکەن لەزەوی دا دووجار ﴿وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ و بێگومان بەرز دەبنەوەو زاڵ دەبن (بەسەر خەڵکی دا) بەبەرز بونەوەیەکی زۆر گەورە. ٤) ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا﴾ جا کاتێ یەکەمین بەڵێن (لەو دووانە) هات(کەبەڵێنتان پێدراوە) ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ﴾ دەینێرینە سەرتان چەند بەندەیەکی خۆمان ﴿أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ کە خاوەنی دەست وەشاندنێکی بەتینن لەجەنگ دا ﴿فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ﴾ ئینجا ئەوانە دەگەڕێن بەناو وڵاتەکەتاندا ﴿وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا﴾ وە ئەوە بەڵێنێکی بەدی هێنراو بوو. ٥) ﴿ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ﴾ لەپاشان جارێکی تر ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەکەینەوە ﴿وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ﴾ وە دارایی و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشین ﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا﴾ وە لەشکر و نەفەرتان (لە جاری پێشوو) زۆرتر دەکەین. ٦) ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە چاکە بکەن ئەوا چاکە بۆ خۆتان دەکەن ﴿وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا﴾ وە ئەگەر خراپەش بکەن ئەوا (سزاکەی) هەر بۆ خۆتانە ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ جا کاتێ بەڵێنی (سزاو تۆڵەی) دووهەم هات ﴿لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ بۆ ئەوەی پەژارە و خەفەت بەڕوخسارتانەوە دەرکەوێ ﴿وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ﴾ وە بۆ ئەوەی بچنەوە ناو مزگەوتی قودس ﴿كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەرچۆنێ لەجاری یەکەمدا چوونە ناویەوە ﴿وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا﴾ وە بۆئەوەی ویرانی بکەن بەوێران کردنێکی گەورە. ٧)

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ
حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ
الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾
وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾
وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾
وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ
النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ
السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ
إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا
يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا
﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ
عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ
رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا
فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ
الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾

-قوم لوط فاقتلوا الفاعل و المفعول به). (رواه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجه). عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەستان دی کاری قەومی لووطی ئەنجام دەدا (کە نێربازیە) ئەوە یەکەمەر بکەر و لێکراو هەردووکیان بکوژن).

ئایەتی (٩٥) سورەتی (الأعراف): قال رسول الله (ﷺ): (عجباً للمؤمن؛ لا يقضي الله له قضاءً إلا كان خيراً له ، إن أصابته ضراء صبر فكان خيراً لهُ وإن أصابته سراء شكر فكان خيراً له) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئیماندار جێگەی سەرسوڕمانە خوای گەورە هەر بڕیارێکی بۆ بدات ئەوە خێر و چاکەیە بۆی ، ئەگەر ناخۆشی یەکی تووش هات ئارامی لەسەر دەگرێ ئەوە خێرو چاکەیە بۆی وە ئەگەر خۆشیەکی تووش هات سوپاسی خوا دەکات ئەوە خێرو چاکەیە بۆی).

﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ﴾ ئومێد وایە پەروەردگارتان ڕەحمتان پێ بکات (ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای خوا) ﴿وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا﴾ ئەگەر بگەڕێنەوە (بۆسەر تاوان) ئێمەش دەگەڕێینەوە (بۆ سزادانتان) ﴿وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا﴾ وە دۆزەخمان کرد بەندیخانە بۆ بێ باوەڕان. ٨) ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات ﴿لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کەڕاست ترینە ﴿وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ﴾ و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی ﴿يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾ کە کردەوە چاکەکان دەکەن ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ کە بەڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە. ٩) ﴿وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ وە بەڕاستی ئەوانەی کەباوەڕیان نیە ﴿بِالْآخِرَةِ﴾ بەڕۆژی دوایی ﴿أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ سزایەکی سەختمان بۆئامادەکردوون. ١٠) ﴿وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ﴾ وە ئادەمی نزاو هاوار بۆشەڕ و خراپە دەکات ﴿دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ﴾ (هەروەکو) داواو نزاکردنی بۆخێرو چاکە ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا﴾ وە ئادەمی هەمیشە هەر پەلەیە. ١١) ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ﴾ شەوو ڕۆژمان کرد بەدوو نیشانە ﴿فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ﴾ ئینجا نیشانەی شەومان تاریك کرد (یا سڕییەوە) ﴿وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾ و بەلکەو نیشانەی ڕۆژمان ڕووناك کرد ﴿لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بەشوێن ڕزقی پەروەردگارتاندا بگەڕێن ﴿وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ وە بۆئەوەی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی(مانگو شەوو ڕۆژەکان) بزانن ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا﴾ وە ئێمە هەموو شتێکمان بەڕوون و ڕەوانی باس کردووە (بۆتان). ١٢) ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾ وە هەموو مرۆڤێك (لەڕۆژی دواییدا) کردەوەی خۆیمان کردۆتەملی (چاکە بێت یا خراپە) ﴿وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ وە لەڕۆژی دواییدا بۆی دەردەهێنن ﴿كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا﴾ نامەیەك کە بەکراوەیی (و هەموو کردەوەکانی تێدا نوسراوە) دەیبینێ. ١٣) ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ﴾ (پێ ی دەووترێ) نامەکەت بخوێنەرەوە ﴿كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ ئەمڕۆ خۆت بەسە بەحیساب کەر بەسەر خۆتەوە (ئەمڕۆ هەر خۆت موحاسەبەی خۆت بکە). ١٤) ﴿مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ﴾ هەرکەس ڕێنموونی وەرگرتبێ ئەوە بێگومان ڕێنمونیەکەی هەر (سوودی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ و هەرکەسیش گومڕا بووبێ ئەوە بێگومان (زیانەکەی) هەر لە دژی خۆیەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ﴾ ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین ﴿حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان). ١٥) ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا﴾ وە کاتێ بمانەوێ ﴿أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً﴾ (دانیشتوانی) شار و وڵاتێ لەناو بیەین ﴿أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا﴾ فەرمان دەدەین (بەگوێ ڕایەڵی و کردەوەی چاك) بە دەوڵەمەندە خراپەکارو زۆردارەکانی ﴿فَفَسَقُوا فِيهَا﴾ کەچی ئەوان یاخی دەبن و لەفەرمان دەردەچن ﴿فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ﴾ جا بڕیاری (سزادان) پێویست دەبێ بۆ(دانیشتوانی) ئەو شارانە ﴿فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾ جا ئەو شارانە وێران دەکەین بەوێران کردنێکی تەواو. ١٦) ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا﴾ وە زۆر (گەل و میللەت)مان لەناو برد ﴿مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ﴾ لە چەرخەکانی پاش نووح ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ﴾ پەروەردگارت بەسە بە گوناهی بەندەکانی ﴿خَبِيرًا بَصِيرًا﴾ کە ئاگادار و بینایە. ١٧)

مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَـٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾

**ئایەتی (٩٩) سورەتی (الأعراف)**: قال رسول الله (ﷺ): (**يقول الله تعالى: إني خلقت عبادي حنفاء فجاءتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم وحرمت عليهم ماأحللت لهم**)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: من بەندەکانی خۆم دروست کردوە کە لەسەر ئاینی ڕاست بێ لادان بەملاولادا بەڵام شەیتانەکان هاتن بۆ لایان و لە ئاینەکەیان لایان دان وە ئەوەی کە بۆم حەڵاڵ کردبوون یاساغ و حەرامیان کرد لێیان).

**ئایەتی (١٠٣) سورەتی (الأعراف)**: قال رسول الله (ﷺ): (يقول الله تعالى: مالعبدي المؤمن عندي جزاء إذا قبضت صفيه من أهل الدنيا ثم احتسبه إلا الجنة)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: هەر بەندەیەکی باوەڕدارم ئەگەر کەسێکی زۆر خۆشەویستیم بردەوەو لێم-

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ﴾ هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێ ﴿عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا﴾ لەم (دنیا)دا زوو پێ ی دەدەین ﴿مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾ ئەوەی بمانەوێ بۆ هەرکەسێك ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ﴾ لە پاشان دۆزەخمان بۆ سازداوە ﴿يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا﴾ دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی و دەرکراوی لەمیهرەبانی خوا. ١٨)﴿وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ﴾ هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوو بێت ﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا﴾ وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوە ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ و باوەڕداریش بێت ﴿فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا﴾ ئائەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە. ١٩) ﴿كُلًّا نُّمِدُّ﴾ دەبەخشین بەهەمووان ﴿هَٰؤُلَاءِ وَهَٰؤُلَاءِ﴾ ئەوانە(کەهەر دنیایان دەوێ) و ئەوانە(ی ڕۆژی دواییان دەوێ) ﴿مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ﴾ لە بەخششی پەروەردگارت (لەم دنیایەدا) ﴿وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا﴾ بێگومان ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت هەرگیز قەدەغە کراونەبووە. ٢٠) ﴿انظُرْ كَيْفَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) سەرنج بدە چۆن ﴿فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ (لەدنیادا) باوی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا ﴿وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ﴾ وە بێ گومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە، ﴿وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾ باودانەکانیش گەورەترە. ٢١)﴿لَّا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾ (ئەی ئادەمی) لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر مەپەرستە ﴿فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا﴾ ئەگینا دەبێتە لۆمەکراوی یارمەتی نەدراو. ٢٢)﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ﴾ وە پەروەردگارت بڕیاری داوە ﴿أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ﴾ کەهیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ وە لەگەڵ دایك و باوکتان چاکەبکەن ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا﴾ ئەگەر یەکێکیان (باوکت و دایکت)یان هەردووکیان لای تۆ پیربوون ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ﴾ قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش ﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾ وەتێیان مەخوڕە و پێیاندا مەڵمەشاخێ ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾(بەڵکو) ووتەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا) بەکاربێنە. ٢٣)﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ﴾ باڵی خۆ بەکەم زانینیان بۆ ڕابخە ﴿مِنَ الرَّحْمَةِ﴾ لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان ﴿وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە ﴿كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردە کرد بەمنداڵی. ٢٤)﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ﴾ پەروەردگارتان چاك دەزانێ بەهەرچی لەدڵو دەروونتانداهەیە ﴿إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ﴾ ئەگەر ئێوە چاك بن و نیازی چاکەتان ببێ ﴿فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا﴾ ئەوا بێ گومان ئەو (خوا) لێ بووردەیە بۆ تۆبەکاران. ٢٥)﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ﴾ وەمافی خزمانت بدە ﴿وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾ (هەروەها مافی) هەژارو ڕێبواریش ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾ زیادە ڕەویش مەکە. ٢٦)﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ﴾ بەڕاستی زیادەڕەوان ﴿كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ دۆست و برای شەیتانەکانن ﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾ شەیتانیش بەرانبەر (ناز و نیعمەتەکانی) پەروەردگاری هەمیشە سپڵەیە! ٢٧)

وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾

- سەندەوە پاشان ئارامی گرت و بەتەمای پاداشتی دوارۆژ بوو پاداشتی هیچ نییە بەهەشت نەبێت).

**ئایەتی (١٥٠) سورەتی (الأعراف):** قال رسول الله (ﷺ): (يرحم الله موسى، ليس المعاين كالمخبر، أخبره ربه عزو جل أن قومه فتنوا بعده، فلم يلق الألواح، فلما رآهم وعاينهم ألقى الألواح) (رواه ابن أبي حاتم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە سۆزو ڕەحمی خۆی بەسەر مووسادا برێژێت ، شتێك بەچاو ببینرێت وەك ئەوە نی یە هەواڵی پێ بدرێت ، پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵاتی هەواڵی پێ دا کە گەلەکەی دوای ئەو گومڕا کراوون مووسا تەختەکانی (تەوراتی تیانوسرابوو) فڕێ نەدا بەڵام کاتێك خۆی بینینی و چاوی پێیان کەوت تەختەکانی فڕێدا).

**ئایەتی ( ١٥٦ ) سورەتی (الأعراف):** قال رسول الله (ﷺ): (إنّ الله تعالى خلق يوم خلق السموات-

﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ﴾ وە ئەگەر ڕووت وەرگێڕا لەوانە (لەبەر نەداری) ﴿ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا﴾ چاوەڕوانی بەخشش و ڕۆزیەك بوویت لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا﴾ ئەوە قسەی جوان و نەرمیان لەگەڵدا بكە. ٢٨) ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ﴾ وە دەستت مەكە ﴿مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾ كۆت بەگەردنتدا ﴿وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ﴾ و كراوە و بەرەڵاشی مەكە بەتەواوی ﴿فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾ تا نەبیتە كەسێكی لۆمەكراوی هیچ بەدەستەوە نەماو. ٢٩) ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ﴾ ڕسق و ڕۆزی فراوان دەكات ﴿لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ بۆ هەر كەسێك كەبیەوێ و وەتەنگی دەكات بۆهەركەسێ بیەوێ ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ بەڕاستی ئەو هەمیشە ئاگاو بینایە بەبەندەكانی. ٣٠) ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ﴾ وە ڕۆڵەكانتان مەكوژن ﴿خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ﴾ لەترسی هەژاری و بێ نەوایی ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ ئێمە ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا﴾ بەڕاستی كوشتنی ئەوانە هەڵەو تاوانێكی گەورەیە. ٣١) ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ﴾ و نزیكی زیناش مەكەونەوە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً﴾ بەڕاستی ئەوە كردەوەیەكی زۆر ناشرین ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ و ڕێگەیەكی پیس و خراپە. ٣٢) ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ﴾ وە كەسێك مەكوژن ﴿ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ كەخوا كوشتنی ئەوی حەرام كردوە مەگەر بە(هۆیەكی) ڕاست و ڕەوا ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا﴾ جا هەر كەسێك بەنا هەق و ستەم لێ كراوی كوژرا ﴿فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ ئەوە دەسەڵاتمان داوە بەخاوەنەكەی (بەسەر بكوژەكەدا) ﴿فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ﴾ جا با خاوەنەكەی زیادەڕۆیی نەكات لە تۆڵەسەندندا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾ چونكە بەڕاستی ئەو (خاوەنە) یارمەتی دراوە. ٣٣) ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ﴾ وە نزیكی ماڵی هەتیو مەكەونەوە ﴿إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ مەگەر بەچاكترین شێوە (كە بریتی یە لە پاراستن و بەرهەم هێنانی) ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ هەتا (هەتیوەكە) دەگاتە كەماڵی ژیری و لێزانی ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ﴾ وەفا بكەن بە بەڵێن و پەیمانەكانتان ﴿إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾ بەڕاستی (خاوەن) بەڵێن و پەیمان پرسیار لێ كراوە. ٣٤) ﴿وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ﴾ وە كاتێ كە پێوانە دەكەن (بۆ خەڵكی) بەڕێك و پێكی پێوانە بكەن ﴿وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ﴾ و كێشانەش بكەن بەتەرازوی ڕاست ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ ئەمە (بۆ ئێوە) چاكترو ئاكامیشی باشترە. ٣٥) ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ وە شوێن شتێ مەكەوە كەزانیاریت دەربارەی نی یە ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ﴾ بەڕاستی گوێ و چاو و دڵ ﴿كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ هەموو ئەوانە(خاوەنیان) پرسیار لێكراوە. ٣٦) ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ وە مەڕۆ بەزەویدا بەكەشخەو شانازیەوە ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ﴾ (چونكە) بەڕاستی تۆ نەدەتوانی زەوی كون كەیت ﴿وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ وە نەدەگەیتە شاخەكان لەدرێژیدا. ٣٧) ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ﴾ هەموو ئەوەی باسكرا خراپەكانی ﴿عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ لای پەروەردگارت نابەجێ و بێزراوە. ٣٨)

﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ (مووسا) فەرمووی زانیاری ئەوە لای پەروەردگارمە ﴿فِي كِتَٰبٍ﴾ لە پەراوێکدایە ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ پەروەردگارم هیچی لێ وون نابێ و هیچی لەبیر ناچێ. ٥٢) ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾ (پەروەردگارم) زاتێکە کە زەوی بۆ کردوونەتە شوێنی حەسانەوە (وەکو بێشکە) ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ وە لەناوییدا چەندەها ڕێگای بۆ فەراهەم هێناون ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وە لەئاسمانەوە باران دەبارێنی (بۆتان) ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ﴾ جا بەو بارانەی ڕواندومانە ﴿أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ زۆر جوتی جۆراو جۆر لەڕووەك (کە جیاوازن لە تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەدا). ٥٣) ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ﴾ (ئەی مرۆڤەکان) بخۆن و ئاژەڵ و ماڵاتەکانیشتان بلەوەڕێنن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کە باسکرا) ﴿لَأَيَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلنُّهَىٰ﴾ بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی ژیرین. ٥٤) ﴿مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ﴾ لەم زەویە دروستمان کردوون ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ دووبارە دەتانگێڕینەوە ناو زەوی (بەمردوویی) ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾ جارێکی تر لەو زەوییە دەرتان دێنینەوە (بەزیندوویی بۆ لێپرسینەوە). ٥٥) ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە هەموو بەڵگەو نیشانەکانی خۆمان نیشان فیرعەون دا ﴿فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ کەچی باوەڕی نەهێناو سەپێچی کرد. ٥٦) ﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا﴾ (فیرعەون) ووتی هاتوویت بۆ ئاومان بۆ ئەوی دەرمان کەیت ﴿مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ لەخاکەکەمان بەجادوو گەریەکەت ئەی مووسا. ٥٧) ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ﴾ سوێندبێ جادوویەکت بۆ (بەکار) بێنین ﴿مِّثْلِهِۦ﴾ وەك ئەو (جادووەی خۆت) ﴿فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا﴾ جا شوێن و کاتێ لە نێوان ئێمە و خۆتدا دابنێ ﴿لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ﴾ نە ئێمە و نەتۆ خۆمانی لێ نەبوێرین ﴿مَكَانًا سُوًى﴾ (با) جێگایەکی تەخت بێ. ٥٨) ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ﴾ (مووسا) فەرمووی کاتی دیارکراوتان ڕۆژی خۆڕازاندنەوە (ڕۆژی جەژن) بێت ﴿وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾ بەمەرجێ لە کاتی چێشتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێنەوە. ٥٩) ﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ﴾ ئینجا فیرعەون ڕۆیشت لەو جێگایە ﴿فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ﴾ وهەمووجادوو گەرەکانی کۆکردەوە ﴿ثُمَّ أَتَىٰ﴾ پاشان هات (بۆ شوێنی دیاری کراو). ٦٠) ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ﴾ مووسا بە جادوو گەرانی ووت ﴿وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ هاوار بۆ ئێوە درۆ بەدەم خواوە نەکەن ﴿فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ﴾ ئەگینا بەسزایەك لەناوتان دەبات ﴿وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ﴾ بەڕاستی هەر کەسێ درۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە ڕەنجە ڕۆ دەبێت. ٦١) ﴿فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ﴾ ئینجا (جادوو گەرەکان) سەبارەت بەکارەکەیان لە نێوانیان دا جیاوازی پەیدا بوو ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ و بەنهێنی چرپەیان دەکرد. ٦٢) ﴿قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ﴾ ووتیان بەڕاستی ئەمانە دوو جادووگەرن ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم﴾ دەیانەوێ دەرتان پەڕێنن ﴿مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾ لە خاك و وڵاتەکەتان بە جادووەکەیان ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾ وە ڕێباز و نەریتە هەرە باشەکەتان لەناو بەرن. ٦٣) ﴿فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ﴾ جا کەواتە هەموو جادوو و پیلانێکتان کۆبکەنەوە ﴿ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا﴾ پاشان بە یەك ڕیز بێنە (گۆڕەپانەوە) ﴿وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ﴾ بەڕاستی هەرکەسێ ئەمڕۆ سەرکەوێ ڕزگاری دەبێ و سەرفرازە. ٦٤)

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾

-مت من ليلتك مت على الفطرة وإن أصبحت أصبت خيراً)(متفق عليه).

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فلان کەس کاتێ ڕادەستیتە ناو جێگای نوستن بڵێ: ئەی خوایە خۆم بەتۆ سپارد ڕووم تەنها بۆ لای تۆیە، کاری خۆم ئاوەتە دەستی تۆ، پشتو پەنام هەر تۆی حیوا و ترسم هەر لە تۆیە، پەناو دەربازبوون نی یە لەتۆ مەگەر لای خۆت باوەڕم هێناوە بەو پەڕاوەی ناردوتە خوارەوەو بەو پێغەمبەرەی ناردۆتە، ئەگەر ئەو شەوەی -ئەم نزایە دەخوێنێ- بمرێت ئەوا لەسەر سرووشت و باوەڕداری دەمرێ وە ئەگەر ڕۆژت کردەوە -نەمرێت- ئەوە خێرو چاکەی زۆرت دەسکەوتووە).

**ئایەتی (١١٩) سورەتی (التوبة)**: قال رسول الله(ﷺ): (إن الصدق يهدي إلى البر وإن البر يهدي إلى-

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ (ساحیرەکان) ووتیان ئەی مووسا ﴿إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ﴾ یاتۆ (جادووەکەت) فڕێ ی بدە ﴿وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ﴾ یا ئێمە لەسەرەتاوە فڕێ ی دەدەین. ٦٥) ﴿قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ﴾ (مووسا) فەرمووی نەخێر ئێوە (لەپێشەوە) فڕێ ی بدەن ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ﴾ (ئەوانیش فڕێیاندا) جا لەناکاودا گوریس و دار دەستەکانیان. ٦٦) ﴿يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ﴾ واهاتە پێش چاوی (مووسا) بەهۆی جادووەکەیانەوە کەبەڕاستی دەجولێن و دەڕۆن ﴿فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ﴾ جا مووسا لەدڵی خۆیدا کەمێ ترسا. ٦٧) ﴿قُلۡنَا لَا تَخَفۡ﴾ ووتمان پێی مەترسەو بێ باك بە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ بێگومان هەر تۆ سەرکەوتوو دەبی. ٦٨) ﴿وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾ ئەوەی لەدەستی ڕاستتدایە (کەگۆچانەکەتە) فڕێی بدە ﴿تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ﴾ هەرچی (جادوو) ئەوان کردوویانە قوتی دەدات (هەڵی دەلوشێ) ﴿إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ﴾ بێگومان ئەوەی ئەوانە کردوویانە تەنها فروفێڵی جادوو بازە ﴿وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ﴾ جادوو بازیش سەرکەوتوو نابێ لەهەر کوێ وەهاتبێ (هەرچی بکات). ٦٩) ﴿فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا﴾ ئەوسا جادووگەرەکان خران بەڕوودا بەسوژدە بردنەوە (بۆ خوا) ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾ ووتیان بروامان هێنا بەپەروەردگاری هاروون و مووسا. ٧٠) ﴿قَالَ﴾ (فیرعەون) ووتی پێیان ﴿ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ﴾ ئایا ئێوە بڕواتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي﴾ بێ گومان ئەو مووسا گەورەتانە ﴿عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ﴾ کەفێری جادووی کردوون ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ﴾ جا سوێند بێت دەیبڕم (دەیقرتێنم) ﴿أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ﴾ دەست و قاچتان بەپێچەوانەوە (ڕاست و چەپ) ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾ وەبێگومان بەقەدی دارخورمادا هەڵتان دەواسم (دەتانکەم بە دارا) ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ﴾ (ئەوسا) بەڕاستی دەزانن ﴿أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ﴾ کاممان (من یاخواکەی مووسا) سزامان سەختترو بەردەوام ترە. ٧١) ﴿قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ﴾ (ساحیرەکان) ووتیان ئێمە هەرگیز تۆ هەڵنابژێرین ﴿عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ بەسەر ئەو نیشانەو موعجیزانەدا کەبۆمان هاتووە ﴿وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ﴾ (وە تۆ هەڵنابژێرین بەسەر) ئەو خوایەی کە لەنەبوون ئێمەی دروست کردووە ﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ﴾ جا هەر چیت لەدەست دێت بیکە ﴿إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ﴾ بێگومان تۆ تەنها لەم ژیانی دنیا دەست دەڕواو بڕیار دەدەیت. ٧٢) ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا﴾ بەڕاستی ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردگارمان ﴿لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا﴾ بۆ ئەوەی لەتاوانەکانمان خۆش ببێت ﴿وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ﴾ هەروەها لەو جادووەش کە بەزۆر پێت کردین ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾ وەخوای گەورە (پاداشتی) چاکترەو بەردەوامترە. ٧٣) ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ﴾ بەڕاستی هەر کەسێ بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری ﴿مُجۡرِمٗا﴾ بەتاوانباری ﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾ نەدەمرێ تێیدا نەدەژی (بەئاسوودەیی). ٧٤) ﴿وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا﴾ وە ئەو کەسەی بەباوەڕداری بگەڕێتەوە لای (خوای گەورە) ﴿قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی کردەوەی چاکیشی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ﴾ ئائەوانە پلەو پایەی بەرزو بڵندیان هەیە. ٧٥) ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ کە بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمەمیشەیی ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان دەڕۆن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ بێ بڕانەوە دەمێننەوە تێیدا ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ﴾ ئەوە پاداشتی کەسێکە خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ (لە کوفر و تاوان). ٧٦)

وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ۖ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ۞ وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمْ أُو۟لَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾

**=الجنة وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عند الله صديقاً، وإن الكذب يهدي إلى الفجور وإن** الفجور يهدي إلى **النار** وإن الرجل **ليكذب حتى يكتب عند الله كذاباً) . (متفق عليه) پێغەمبەری خوا** (ﷺ) فەرمووی: **(بێ گومان راست گۆیی** رێنموونی **(مرۆڤ) دەكات** بۆ **چاكەو چاكەش رێنموونی** دەكات **بۆ بەهەشت، وە بەراستی مرۆڤ بەردەوام راست دەكات تاكو لای** خوا بەراستگۆ دەنووسرێت، **هەروەها** بەراستی درۆكردنیش رێنموونی (مرۆڤ) دەكات بۆخراپە خراپەش سەردەكێشێ بۆ ئاگر **وەبێگومان بەردەوام** مرۆڤ درۆ دەكات تاكو لای خوا بەدرۆزن دەنووسرێت).

**ئایەتی (١٠) سورەتی (یونس):** قال رسول الله (ﷺ): (إذا مات ولد العبد قال الله تعالى لملائكته: **قبضتم ولد عبدي** فيقولون نعم: فيقول قبضتم ثمرة فؤاده: فيقولون نعم فيقول فماذا قال عبدي: فيقولون=

﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ بەڕاستی نیگامان نارد بۆ مووسا ﴿أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى﴾ کە بەندەکانم بە شەو ببە (و لە میصر دەرچن) ﴿فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا﴾ ڕێگەیەکی ووشکیان لە دەریا (ئاوی نیل)دا بۆ بکەرەوە ﴿لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا﴾ مەترسە (فیرعەون) پێت بگات ﴿وَلَا تَخْشَىٰ﴾ وە مەترسە (لەخنکان لەدەریادا). ٧٧)﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ﴾ ئینجا فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوتن ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾ جا لە ناکاو دەریا ئەوانی (لەناو شەپۆلی خۆیدا) داپۆشی چ داپۆشینێك. ٧٨)﴿وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ﴾ فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کرد ﴿وَمَا هَدَىٰ﴾ و ڕێنموونیی نەکردن. ٧٩)﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل ﴿قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ﴾ بەڕاستی ڕزگارمان کردن لە دوژمنەکەتان ﴿وَوَٰعَدْنَٰكُمْ﴾ وە بەڵێنمان پێدان ﴿جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ﴾ (بەهاتنی موسا بۆ) لای ڕاستی کێوی طور ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ﴾ و بۆمان ناردن ﴿ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ﴾ گەزۆ و شەلاقە (باڵندەیەکە گۆشتی لە هەموو باڵندەیەك چاکترە). ٨٠)﴿كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ بخۆن لەو ڕۆزیە پاکانەی پێمان داون ﴿وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ﴾ و زیادە ڕەوی تیا مەکەن ﴿فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى﴾ ئەگینا خەشم و قاری من دەتانگرێتەوە ﴿وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى﴾ جا هەر کەسێك قار و خەشمی من دایگرێ ﴿فَقَدْ هَوَىٰ﴾ ئەوە بێگومان تیاچووەو هەڵدێراوە. ٨١)﴿وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ﴾ وە بەڕاستی من زۆر لێبوردوم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ ﴿وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت ﴿ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ پاشان بەردەوام بوبێ لەسەر ئەو ڕێبازە. ٨٢)﴿وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ (خوا فەرمووی) ئەی مووسا بۆ چی پێش گەلەکەت کەوتی (بۆ گەیشتن بە کێوی طور). ٨٣) ﴿قَالَ هُمْ أُو۟لَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى﴾ (مووسا) فەرمووی گەلەکەم ئەوانەن بە دوامەوەن ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ﴾ بۆیە بەپەلە هاتم بۆ لات ئەی پەروەردگارم ﴿لِتَرْضَىٰ﴾ بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت. ٨٤)﴿قَالَ﴾ (خوای گەورە) فەرمووی ﴿فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ﴾ جا بەڕاستی ئێمە قەومەکەتمان تاقی کردەوە ﴿مِنۢ بَعْدِكَ﴾ لەپاش (هاتنی) تۆ ﴿وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِىُّ﴾ وە سامیری گومڕای کردن. ٨٥)﴿فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ ئینجا (پاش وەرگرتنی تەورات) مووسا گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی ﴿غَضْبَٰنَ أَسِفًا﴾ بە قار و خەشمەوە ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم ﴿أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ﴾ ئایا پەروەردگارتان بەڵێنی پێ نەدان ﴿وَعْدًا حَسَنًا﴾ بە بەڵێنی چاك ﴿أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ﴾ بۆچی من زۆرم پێ چوو ﴿أَمْ أَرَدتُّمْ﴾ یان هەر ویستتان ﴿أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ توڕەیی و خەشم لەلایەن پەروەردگارتانەوە یەخەتان بگرێ ﴿فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى﴾ بۆیە بەڵێنی منتان شکاند. ٨٦)﴿قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ﴾ ووتیان ئێمە بەڵێنەکەی تۆمان نەشکاند ﴿بِمَلْكِنَا﴾ بەویست و دەسەڵاتی خۆمان ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا﴾ بەڵکو ئێمە چەند کۆڵ و بارێ درابوو بەکۆڵماندا ﴿مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ﴾ لەخشڵی قیبتییەکان ﴿فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ﴾ جا فڕێماندایە (ناو ئاگرەوە) هەروەها سامیریش فڕێی دا. ٨٧)

فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ
وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا
يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ
يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ
أَمۡرِي ﴿٩٠﴾ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ
﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ
أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ
إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ
قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ
بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ
فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ
فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ
مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ
عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ
إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾

-حمدك واسترجع، فيقول الله تعالى: ابنوا لعبدي بيتاً في الجنة وسموه بيت الحمد) (رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێ منداڵی بەندەیەکی خوا دەمرێ، خوای گەورە دەفەرمووێ بە فریشتەکانی: گیانی منداڵی بەندەکەمتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، ئینجا دەفەرمووێ: ئەو منداڵەی مایەی دڵخۆشی بوو لێتان سەندەوە؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرمووێ: ئەی بەندەکەم وتی چی؟ دەڵێن: سوپاسی کردیت و وتی ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ خوای گەورەش دەفەرمووێ: پێیان:ماڵێك لەبەهەشتدا دروست بکەن بۆ بەندەکەم ناوی بنێن ماڵی سوپاس و ستایش).

**ئایەتی (١١) سورەتی (یونس):** قال رسول الله (ﷺ): (لا تدعوا على أنفسكم، لا تدعوا على أولادكم، لا تدعوا على أموالكم، لا توافقوا من الله ساعة فيها إجابة فيستجيب لكم) (رواه أبو داود). پێغەمبەری خوا (ﷺ)-

﴿فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا﴾ ئیتر(سامری لەو خشڵە تواوانە) پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن﴿لَّهُۥ خُوَارٞ﴾ بۆڕەیەکی هەبوو(وەك بۆڕەی گوێرەکە) ﴿فَقَالُواْ﴾ ئەنجا وتیان ﴿هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ﴾ ئەمەیە خوای ئێوەو خوای مووساشە ﴿فَنَسِيَ﴾ ئەوە (مووسا) لەبیری چووە (دەگەڕێ بەشوێن خوادا). ٨٨)﴿أَفَلَا يَرَوۡنَ﴾ ئایا ئەوان نازانن (نابینن)﴿أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا﴾(ئەو گوێرەکەیە) وەڵامی هیچ وتەیەکیان ناداتەوە﴿وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾ وەخاوەنی هیچ زیان و قازانجێکی نییە بۆیان. ٨٩)﴿وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ﴾ سوێند بەخوا بەراستی هاروون پێی وتن ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لەوەو پێش ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ﴾ بێگومان ئێوە بەم(گوێرەکەیە) تاقی کرانەوە (گومڕا بوون)﴿وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾بەراستی پەروەردگاری ئێوە خوای میهرەبانە ﴿فَٱتَّبِعُونِي﴾ کەواتە شوێنی من بکەون ﴿وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي﴾ گوێ ڕایەڵی فەرمانی من بن. ٩٠)﴿قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ﴾وتیان هەرگیز واز نامێنین و بەدەوریدا دێین و دەیپەرستین ﴿حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ﴾ هەتا مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان. ٩١) ﴿قَالَ يَٰهَٰرُونُ﴾(مووسا) وتی ئەی هارون﴿مَا مَنَعَكَ﴾ چ شتێك بەرگری کردیت﴿إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ﴾ کاتێ بینیت ئەمانە گومڕا بوون. ٩٢)﴿أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ﴾(لەوەی) کەشوێن من بکەوی ﴿أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي﴾ ئایا سەرپێچی فەرمانی منت کرد؟. ٩٣)﴿قَالَ يَبۡنَؤُمَّ﴾ (هاروون) فەرمووی ئەی کوڕی دایکم﴿لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ﴾ موی ریش و سەرم مەگرەو ڕامەکێشە ﴿إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ﴾ بەراستی ترسام کە(هاتیتەوە پێم) بڵێیت﴿فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾تۆجیاوازیت خستە نێوان بەنی ئیسرائیلیەکانەوە ﴿وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي﴾ و چاوەڕوانی فەرمانی منت نەکرد. ٩٤)﴿قَالَ﴾ (مووسا) وتی﴿فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ﴾ ئەی سامری تۆ ئەم کارە ترسناکە چی بوو کردت. ٩٥)﴿قَالَ بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ﴾ (سامیری) وتی من شتێکم زانی ئەوان نەیانزانی (یامن شتێکم بینی ئەوان نەیان بینی)﴿فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾ ئنجا من مشتێکم لەشوێن پێی(وڵاخەکەی) جوبرەئیل هەڵگرت ﴿فَنَبَذۡتُهَا﴾وە پرژاندم (بەخشڵە تواوەکەدا)﴿وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي﴾ بەو جۆرە نەفسم ئەو کارەی بۆ جوان و شیرین کردم. ٩٦)﴿قَالَ فَٱذۡهَبۡ﴾(مووسا) وتی دەبڕۆ ﴿فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ﴾ ئەوسا بێگومان تاماوی لەم ژیانەدا (هەر کەس لێت نزیك بویەوە) دەبێ بڵێیت: ﴿لَا مِسَاسَۖ﴾ نزیکم مەکەوەرەوە، دەستم لێ مەدە ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ﴾ وەبێگومان بەڵێنێکیشت هەیە(لەڕۆژی دواییدا) هەرگیز رزگار نابیت لێی﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ﴾ وەسەیری پەرستراوەکەشت کە ﴿ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ﴾ کەبەردەوام دەتپەرست ﴿لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ﴾ دڵنیابە چاك دەیسوتێنین ﴿ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ پاشان بێگومان (خۆڵەمێشەکەش) پرژو بڵاو دەکەینەوە بەدەریادا ﴿نَسۡفًا﴾ بەپرژو بڵاوێکی وا (کە سوشمیشی نەمێنێت). ٩٧)﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ﴾ پەرستراوی (راستەقینەی) ئێوە تەنها خوایە ﴿ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە ئەو نەبێت ﴿وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا﴾ زانیاری ئەو هەموو شتێکی گرتۆتەوە. ٩٨)

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

=فەرمووی: (نزاو پاڕانەوە مەکەن لە خۆتان، نزاو پاڕانەوە مەکەن لە منداڵەکانتان، نزاو پاڕانەوە مەکەن لە سەروەت و سامانتان، نەوەك دوعا کردنەکەتان لە کاتێکدا بێت خوای گەورە دوعا تێیدا گیرا دەکات و دوعاکەتان گیرا بکات).

**ئایەتی (٢٤) سورەتی (یونس):** قال رسول (ﷺ): (**الدنيا سجن المؤمن و جنة الكافر**) (رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) **فەرمووی:** (دونیا زیندانی باوەڕدارەو بەهەشتی بێ بڕوایە).

**ئایەتی (٢٦) سورەتی (یونس):** إن رسول الله (ﷺ) تلا هذه الآية: ﴿للذين أحسنوا الحسنى و زيادة﴾ وقال: (**إذا دخل** أهل الجنة الجنةو أهل النار النار نادى مناد يا أهل الجنة إن لكم عند الله موعدا يريد أن ينجزكموه، فيقولون: **وما هو؟** ألم يثقل موازيننا؟ ألم يبيض وجوهنا؟ ويدخلنا الجنة ويزحزحنا من النار؟=

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ئا بەو جۆرە دەیگێڕینەوە بۆت ﴿مِنْ أَنبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾ هەندێك لەبەسەرهات و هەواڵی ئەو (گەلانەی) رابوردون ﴿وَقَدْ آتَيْنَاكَ﴾ بێگومان پێمان داوی. ﴿مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾ لەلایەن خۆمانەوە قورئان. ٩٩)﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ﴾ هەر کەسێ پشتی تێ بکات ﴿فَإِنَّهُ يَحْمِلُ﴾ ئەوە بەراستی هەڵیدەگرێ ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا. ﴿وِزْرًا﴾ بارێکی قورس (لەتاوان). ١٠٠)﴿خَالِدِينَ فِيهِ﴾ بێ بڕانەوە تێیدا دەمێننەوە ﴿وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلًا﴾ ج بارێکی خراپ و بێ فەڕیان بەکۆڵەوەیە لەرۆژی دواییدا. ١٠١)﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ﴾ ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ بەشەیپوردا (بۆ جاری دووەم) ﴿وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەوسا تاوان باران کۆدەکەینەوە ﴿يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾ لەو ڕۆژەدا لەش و چاویان شین هەڵگەڕاوە. ١٠٢)﴿يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ﴾ بەچرپەوە لەنێوان خۆیاندا دەڵێن ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا﴾ ئێوە تەنها دە (شەوو ڕۆژ لەدنیادا) ماونەتەوە. ١٠٣)﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾ ئێمە چاك دەزانین بەوەی ئەوان دەیڵێن ﴿إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً﴾ کاتێ (ئەوەیان) کە ژیرتریانە و نزیك تریانە لەڕاستییەوە دەڵێ ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا﴾ ئێوە تەنها یەك ڕۆژ ماونەتەوە. ١٠٤)﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بەشاخەکان ﴿فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا﴾ تۆش بڵێ پەروەردگار لەبێخیان دێنێ و وردو خاشیان دەکات ئینجا باپرۆ بڵاویان دەکاتەوە. ١٠٥)﴿فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا﴾ ئینجا ڕێك و ساف بێ ئاوو گژوگیاو دەیهێڵێتەوە. ١٠٦)﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا﴾ نابینی تێیدا ﴿عِوَجًا وَلَا أَمْتًا﴾ هیچ جۆرە لاری و بەرزی و نزمییەك. ١٠٧)﴿يَوْمَئِذٍ﴾ لەو ڕۆژەدا ﴿يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ﴾ هەموو دەکەونە شوێن جارِدەری (کۆکردنەوە) ﴿لَا عِوَجَ لَهُ﴾ لارە جلەوی ناکەن لەفەرمانی ﴿وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ لەترسی خوای میهرەبان هەموو دەنگەکان نزم دەبن ﴿فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾ چپەچپ نەبێ شتێك نابیستی. ١٠٨)﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ئا لەو ڕۆژەدا ﴿لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ﴾ تکا کردن سوودی نیە ﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ﴾ مەگەر کەسێ خوای میهرەبان ڕێگای بدات ﴿وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا﴾ و لەو وتەکەشی ڕازی بێ. ١٠٩)﴿يَعْلَمُ﴾ (خوا) دەزانێ و ئاگادارە ﴿مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهەموو ئەو شتانەی لەپێشیانەوەیە (لەقیامەتدا چاوەڕێیاتە) ﴿وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ وە بەهەموو ئەو شتانە لەپاشیانەوەیە (لەدنیادا کردوویانە) ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا﴾ بەڵام ئەوان دەربارەی خوا هەموو شتێك نازانن. ١١٠)﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ﴾ هەموو دەم و چاوەکان (لەڕۆژی قیامەتدا) مل کەچ و فەرمانبەردارن ﴿لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ﴾ بۆ (خوای) هەمیشە زیندوو و ڕاگری بوونەوەرە ﴿وَقَدْ خَابَ﴾ بێگومان زەرەرمەند بووە. ١١١) ﴿مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾ ئەوەی کەباری ستەمی هەڵگرتبێ ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوەش کردەوە چاکەکانی کردبێ ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ باوەڕداریش بوو بێت ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا﴾ ئەوە نەلە ستەم دەترسێ (لێی بکرێ) ﴿وَلَا هَضْمًا﴾ نەلە کەم کردنەوەی پاداشتی (دەترسێ). ١١٢)﴿وَكَذَٰلِكَ﴾ ئابەو جۆرە ﴿أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾ قورئانێکی عەرەبیمان دابەزاندووە ﴿وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ﴾ بە چەند جۆر و شێواز هەڕەشەمان لەودا باسکردووە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوەی لە خوا بترسن و خۆیان بپارێزن (لە تاوان) ﴿أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا﴾ یابیرکردنەوەو بێ داری دروست ببێ بۆیان (بەهۆی قورئانەوە). ١١٣)

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾

-قال: فيكشف لهم الحجاب فينظرون إليه، فو الله ما أعطاهم الله شيئاً أحب إليهم من النظر إليه ولا أقر لأعينهم) (رواه أحمد و مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿للذين أحسنوا الحسنى و زيادة﴾ لەڕووی: (کاتێ بەهەشتی یەکان چوونە بەهەشتەوە و دۆزەخی یەکان چوونە دۆزەخەوە جارچیەک هاوار دەکات و دەڵێ: ئەی بەهەشتی یەکان ئێوە لەلایەن پەروەردگارەوە بەڵێنێکتان پێ دراوە دەیەوێ بۆتان جێبەجێکات ، ئەوانیش دەڵێن: چی یە ئەو (بەڵێنە)؟ ئایا کێشانی کردەوە چاکەکانمانی قورس نەکردووە؟، ئایا ڕومانی سپی نەکردووە؟، ئایا نەی خستووینەتە بەهەشت و لەئاگریش نەیپاراستووین؟، (ووتی): جا پەردە لادەبرێ بۆیان، و سەیری خوای گەورە دەکەن سوێند بەخوا هیچ شتێکی پێ نەداون خۆشتربێت لایان لەسەیر کردنی خوای گەورەو ئەوەندە دڵو چاویانی پێ گەش بێتەوە).

﴿فَتَعَلَى ٱللَّهُ﴾ ئنجا بەرزو بڵندە ئەو خوایە ﴿ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ﴾ کەدەسەڵات دارێکی(پادشایەکی) حەق‌و ڕاستە ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ﴾ پەلە مەکە لە(خوێندنی) قورئاندا ﴿مِن قَبْلِ﴾ لەپێش ئەوەی﴿أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ﴾ سرووەش کردنەکەی بۆت تەواو بێت﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾ وەبڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە. ١١٤) ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ﴾ سوێند بەخوا بەراستی ئێمە پێشتر پەیمان و بەڵێنمان لەئادەم وەرگرت (لەدرەختی قەدەغەکراو نەخوات) ﴿فَنَسِىَ﴾ بەڵام کاری پێ نەکرد (لەبیری چوو) ﴿وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾ وە ئێمە لەودا لێبرانمان نەدی. ١١٥)﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾(باسی) ئەو کاتە بکە بەفریشتەکانمان ووت: ﴿ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ سوژدە بەرن بۆ ئادەم﴿فَسَجَدُوٓا۟﴾ ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ﴾ جگە لەشەیتان کەسەرپێچی کرد(و سوژدەی نەبرد). ١١٦) ﴿فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ﴾ ئینجا ووتمان ئەی ئادەم ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ بەڕاستی ئەم (ئیبلیسە) ﴿عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ﴾ دوژمنی تۆو هاوسەرەکەتە﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ﴾ کەواتە (ئاگاداربن) لە بەهەشت دەرتان نەکات﴿فَتَشْقَىٰٓ﴾ چونکە دوو چاری ناخۆشی‌و زەحمەت دەبیت. ١١٧)﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا﴾ بێگومان تۆ لەو(بەهەشتە)دا برسیت نابێ ﴿وَلَا تَعْرَىٰ﴾ ورووت‌و قوت نابی. ١١٨)﴿وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا﴾ وبێگومان لەودا تینووت نابێ﴿وَلَا تَضْحَىٰ﴾ وە هەتاوی (خۆر) لێت نادات (ئازارت پێ ناگەیەنێ). ١١٩)﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ئینجا شەیتان نیازی خراپی خستە دڵیەوە﴿قَالَ﴾ ووتی﴿يَٰٓـَٔادَمُ﴾ ئەی ئادەم ﴿هَلْ أَدُلُّكَ﴾ئایا نیشانت بدەم ﴿عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ﴾ دەرەختی نەمری (هەر کەس لێ ی بخوات هەرگیز نامرێ) ﴿وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ﴾ و موڵك و دەسەڵاتێ هەر دوایی نەیەت. ١٢٠)﴿فَأَكَلَا مِنْهَا﴾ ئینجا هەردووکیان لەو (بەروبوومی درەختە) یان خوارد ﴿فَبَدَتْ﴾ بەو هۆیەوە (جل‌و بەرگیان داماڵدراو) دەرکەوت ﴿لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾ عەیب‌و عەورەتیان ﴿وَطَفِقَا﴾ وەدەستیان کرد ﴿يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾ بە داپۆشینی لەشیان بەگەڵای (درەختەکانی) بەهەشت ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ﴾ وەئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد ﴿فَغَوَىٰ﴾ ئیتر لەڕێگای ڕاست لای دا. ١٢١)﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ پاشان پەروەردگاری هەڵیبژارد (بۆ پێغەمبەرێتی) ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾ وتەوبەی لێ قبووڵ کردو ڕێنموونی کرد. ١٢٢)﴿قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا﴾ (خوا) فەرمووی هەردووکتان برۆنە خوارەوە لەوێ (بەهەشت) ﴿جَمِيعًۢا﴾ بەیەکەوە ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ (نەوەکانتان) دەبنە دوژمنی یەکتری ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى﴾ جا ئەگەر (بەپێغەمبەراندا) پەیامتان بۆ هات لەلایەن منەوە ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ﴾ ئەوسا ئەوەی شوێنی ڕێنموونی من بکەوێ ﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ﴾ ئەو (لەدنیادا) گومڕا نابێ و **(لەڕۆژی دوایشدا) تووشی ناخۆشی و زەحمەت نابێ.** ١٢٣)﴿وَمَنْ أَعْرَضَ﴾ وە **هەرکەسێ ڕوو وەرگێڕێ** ﴿عَن ذِكْرِى﴾ **لەڕێبازو** یادی من ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ ئەوە بێگومان ئەو کەسە گوزەرانێکی سەخت و تەنگی دەبێت (لەگۆڕدا) ﴿وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ **و لەڕۆژی دواییشدا حەشری** دەکەین ﴿أَعْمَىٰ﴾ بەکوێری. ١٢٤) ] ﴿قَالَ رَبِّ﴾ **دەڵێ ئەی پەروەردگارم** ﴿لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ﴾ **بۆچی بە کوێری حەشرت کردم** ﴿وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا﴾ **خۆ من (لە دنیادا)** ساغ و بینا بووم. ١٢٥)

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ
نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ
وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ
فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ
مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ
وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا
تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ
﴿١٣٢﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى
ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ
لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن
قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ ۖ
فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

**ئایەتی (٤٤) سورەتی (یونس):** قال **رسول الله** (ﷺ): **(یقول** الله **عز وجل یاعبادي إني حرمت** الظلم **على نفسي وجعلته بينكم محرماً فلا** تظالموا ياعبادي إنما **هي أعمالكم** أحصيها لكم ثم أوفيكم أياها **فمن وجد خيراً فليحمد الله ومن وجد** غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه) **(رواه** مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) **فەرمووی:** (خوای گەورە دەفەرموێ: **ئەی** بەندەکانم **من** ستەمم لەسەر خۆم یاساغ (حەرام) کردووە لەنێوان ئێوەشدا بە یاساغ (حەرام)م داناوە کەواتە لە نێوان خۆتاندا ستەم لەیەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم بێگومان ئەمانە کردەوەکانتانە بۆتان تۆماری دەکەم پاشان پاداشتتان دەدەمەوە جا هەر کەس پاداشتی چاکەی درایەوە باسوپاسی خوا بکات وە هەرکەسیش پاداشتی خراپی درایەوە بالۆمەی کەس نەکات خۆی نەبێت).

﴿قَالَ كَذَٰلِكَ﴾ (خوا) دەفەرموێ هەر بەو شێوەی ﴿أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا﴾ ئایەتەکانی ئێمەت بۆ هات و لەبیری خۆت بردەوە (و کوێر بوویت لە ئاستیدا) ﴿وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾ بەهەمان شێوە تۆش ئەمڕۆ گوێت پێ نادرێ لەبیر دەکرێی. ١٢٦) ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ﴾ وەهەر بەو جۆرە تۆڵە دەستێنین لەوەی زیادە ڕەوی کردبێت ﴿وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ﴾ و باوەڕی نەهێنابێ بەئایەتەکانی پەروەردگاری ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ وە سزای ڕۆژی دوایی ﴿أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ﴾ بەتین ترو بەردەوام ترە (لەسزای دنیا). ١٢٧) ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ دەی ئایا (خوا) بۆی ڕوون نەکردوونەتەوە ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا﴾ چەندمان لە ناو برد ﴿قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ لەگەلو نەوەی چەرخەکانی پێش ئەمان ﴿يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ﴾ کە (ئەم بێ باوەڕانە) دەگەڕێن و هات و چۆ دەکەن بەجێ و شوێنەکانیاندا ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کەباسکرا) ﴿لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴾ چەند بەلگە و نیشانەی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کەژیرن. ١٢٨) ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ﴾ ئەگەر لەبەر بەڵێن و بڕیارێك نەبوایە ﴿سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ لەپەروەردگارتەوە پێشتر دراوە (بۆ لەناوبردنیان) ﴿لَكَانَ لِزَامًا﴾ بێگومان (لەناو بردنی بێ باوەڕان) پێویست دەبوو ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ ئەگەر ماوەی دیاری کراویش نەبوایە (کەقیامەتە). ١٢٩) ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ کەواتە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ئارام بگرە لەسەر ئەوەی ئەوانە دەیلێین ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ وپەروەردگارت بەپاکی رابگرەو سوپاسی بکە ﴿قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ﴾ لەپێش هەلاتنی خۆر ﴿وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ و لەپێش ئاوا بوونی دا ﴿وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ﴾ و لەهەندێ کات و ساتەکانی شەودا خوا بپەرستە و نوێژ بکە ﴿وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ﴾ وەلە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژدا ﴿لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ﴾ بۆ ئەوەی (پاداشتێ بدرێیتەوە) کەپێی رازی بیت. ١٣٠) ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ﴾ تۆ چاوەکانت مەبڕە ﴿إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ﴾ ئەو نازو نیعمەتانەی داومانە ﴿أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ بەتاقم و دەستەیە لەوان (بێ باوەڕان) ﴿زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ (چونکە ئەوە) زینەت و جوانی ئەم ژیانی دنیایە ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ بۆ ئەوەیە تاقییان بکەینەوە تیایدا ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ﴾ دڵنیابە ڕسق و ڕۆزی پەروەردگارت (لەدوا ڕۆژدا) ﴿خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ چاکترو بەردەوامترە. ١٣١) ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) فەرمان بدە بەئەندامانی خێزانەکەت ﴿بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ بەنوێژ کردن و خۆشت خۆڕاگرو بەردەوام بە لەسەر بەجێ هێنانی ﴿لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا﴾ ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ بەلکو ئێمە ڕسق و ڕۆزی تۆ دەدەین ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ وسەرەنجامی چاك بۆ پارێزکاران و خواناسانە. ١٣٢) ﴿وَقَالُوا۟﴾ (بێ باوەڕان) ووتیان ﴿لَوْلَا يَأْتِينَا﴾ (ئەگەر راستە پێغەمبەرە) دەی بۆ بۆمان ناهێنێ ﴿بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ﴾ بەلگەو موعجیزەیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە ﴿أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ﴾ ئایا ئەوان بەلگەی ئاشکرایان بۆ نەهاتووە ﴿مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾ کە لەپەڕاوە پێشووەکاندا هەبوو (وەك تەورات و ئینجیل). ١٣٣) ﴿وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم﴾ ئەگەر ئێمە ئەوانمان لەناو ببردایە ﴿بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ﴾ بەسزایەك پێش (ناردنی پێغەمبەر(ﷺ)) ﴿لَقَالُوا۟ رَبَّنَا﴾ بێگومان (لەدوا ڕۆژدا) دەیان ووت ئەی پەروەردگارمان ﴿لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾ بۆچی (لەدنیادا) پێغەمبەرێکت بۆ نەناردین ﴿فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ﴾ تاشوێنی بەرنامەو ئایەتەکانی تۆ بکەوتینایە ﴿مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ﴾ پێش ئەوەی سەرشۆڕ و ڕیسوا ببین. ١٣٤) ﴿قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بلێ: هەموو چاوەڕوانین (چ لایەکمان سەردەکەوین) ﴿فَتَرَبَّصُوا۟﴾ دە ئێوەش چاوەڕوان بن ﴿فَسَتَعْلَمُونَ﴾ ئەوسا لە ئایندەدا دەزانن ﴿مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ﴾ چ کەسێ خاوەنی ڕێگای راستە ﴿وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ﴾ و چ کەسێ ڕێنموونی وەرگرتووە. ١٣٥)



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا ٱسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ۖ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّى يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ ۖ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۖ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾

ئایەتی (٥٩) سورەتی (یونس)؛ عن مالك بن نضلة (رضي الله عنه) قال: أتيت رسول الله وأنا رثُّ الهيئة، فقال: (هل لك مال؟)، قلت: نعم، قال: (من أي مال)، قال قلت: من كل المال من الإبل و الرقيق و الخيل و الغنم، فقال: (إذا آتاك الله مالاً فليُرَ عليك)(رواه الإمام أحمد). مالیکی کوڕی نەزلە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) جل و بەرگێکی کۆن و شڕم لەبەردابوو، فەرمووی: (ئایا تۆ ماڵ و سەروەتت هەیە؟)، ووتم: بەڵێ، فەرمووی: (کام جۆرە ماڵەت هەیە؟)، دەڵێ ووتم: هەموو جۆرە ماڵێکم هەیە لە وشترو کۆیلەو ئەسپ و مەڕو بزن، فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە ماڵێکی پێدایت با لێتەوە دیار بێت و ببینرێت).

## سورەتی ﴿ الانبیاء ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ﴾ لێپرسینەوەی خەڵکی نزیک بۆتەوە ﴿وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾ بەڵام ئەوان لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدا ﴿مُعْرِضُونَ﴾ پشت تێکەر و ڕوو وەرگێڕن (لە ئایینی خوا). ١)﴿مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ﴾ هەر پەیامێکی تازەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ بێت (کە قورئانە) ﴿إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ ئەوان دەیبیستن و گاڵتەی پێ دەکەن. ٢)﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەکانیان بێ ئاگایە ﴿وَأَسَرُّوا النَّجْوَى﴾ زۆر بە نهێنی چپەیان دەکرد ﴿الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئەوانەی ستەمیان کردبوو ﴿هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ﴾ (دەڵێن) ئایا ئەم (پێغەمبەر)ەش هەر بەشەرێك نییە وەك ئێوە ﴿أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ﴾ دەی ئایا ئێوە دەڕۆن بە دوای جادوودا ﴿وَأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ لە کاتێکدا ئێوە دەبینن (دەزانن ئەوەی موحەممەد (ﷺ) دەیڵێ سیحرە). ٣) ﴿قَالَ﴾ (پێغەمبەر (ﷺ)) فەرمووی ﴿رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ﴾ پەروەردگارم بە هەموو قسەیەك (چرپە یەك) دەزانێ ﴿فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ لە ئاسمان بێ یا لە زەوی ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ ئەو زاتە بیسەری زانایە. ٤)﴿بَلْ قَالُوا﴾ ئەوانە ووتیان نا (ئەوەی موحەممەد(ﷺ) هێناویەتی نیگانییە) بەڵکو﴿أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ﴾ چەند خەو بینینێکی تێکەڵ و پێکەڵی (موحەممەدە (ﷺ)) ﴿بَلِ افْتَرَاهُ﴾ نا بەڵکو موحەممەد (ﷺ) خۆی ئەم (قورئانە)ی هەڵبەستووە ﴿بَلْ هُوَ شَاعِرٌ﴾ نابەڵکو ئەو (موحەممەدە (ﷺ)) شاعیرە ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ﴾ دەبانیشانە وموعجیزەیەکمان بۆ بێنێ ﴿كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ﴾ وەك (ئەو موعجیزانەی) پێغەمبەرانی پێشووی پێ نێردرابوو. ٥) ﴿مَا آمَنَتْ﴾ بڕوایان نەهێنا ﴿قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا﴾ (خەڵکی) هیچ شار و ئاوەدانێك پێش ئەمان کەلەناومان بردوون ﴿أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەمان باوەڕ دێنن. ٦)﴿وَمَا أَرْسَلْنَا﴾ ئەمان ناردووە ﴿قَبْلَكَ﴾ پێش تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿إِلَّا رِجَالًا﴾ جگە لە پیاوانێك ﴿نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ کە نیگا و سرووشمان بۆ کردوون ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ﴾ دەی پرسیار بکە لە خاوەنی کتێبەکانی (پێشوو زانایانی گاوور و جوولەکە) ﴿إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە نازانن. ٧)﴿وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا﴾ ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان نەکردۆتە پەیکەرێك ﴿لَا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ﴾ کە خواردن نەخۆن ﴿وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ﴾ وە ئەوان هەمیشەیی و نەمر نەبوون. ٨)﴿ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ﴾ پاشان بەڵێنێك کە پێمان دابوون بەجێمان هێنا ﴿فَأَنْجَيْنَاهُمْ وَمَنْ نَشَاءُ﴾ جا ئەوانە و هەرکەسێکمان دەویست (لە باوەڕداران) ڕزگارمان کردن ﴿وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ﴾ وە زیادەڕەوانمان لەناوبرد. ٩)﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا﴾ سوێند بەخوا ناردومانەتە خوارەوە ﴿إِلَيْكُمْ كِتَابًا﴾ کتێبێك بۆ ئێوە ﴿فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾ کە سەربەرزی و ناوبانگی ئێوەی تێدایە ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا بۆ بیر ناکەنەوە. ١٠)

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً ۖ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ ۖ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي ۗ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ ۖ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾

**ئایەتی (٦٢) سورەتی (یونس):** قال رسول الله (ﷺ): (لقد كان فيما كان قبلكم من الأمم ناس محدَّثون فإن يك في أمتي أحد فإنه عمر) (متفق عليه).
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەڕاستی لەگەلان ومیللەتانی پێش ئێوە دا کەسانێك هەبوون هەواڵیان پێ دەدرا، ئەگەر لەم ئوممەتەی مندا کەسێك هەبێت ئەوە بێ گومان عومەرە).

**ئایەتی (٩٢) سورەتی (یونس):** قدم النبي (ﷺ) المدينة و اليهود تصوم يوم عاشوراء، فقال: (ماهذا اليوم الذي تصومونه، فقالوا هذا يوم ظهر فيه موسى على فرعون، فقال النبي (ﷺ) لأصحابه أنتم أحق بموسى فصوموه)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە جوولەکەکان ڕۆژی عاشورا (دەیەم ڕۆژی مانگی موحرەم) بەڕۆژوو دەبوون، فەرمووی: -

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾ چەندەها شارو دێهاتمان تێك شكاند (لەناو برد) ﴿كَانَتْ ظَالِمَةً﴾ كە(خەڵكەكەی) ستەمكار بوون ﴿وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾ وەپاش ئەوان گەل و تاقمی ترمان (لەجێیان) بەدی هێنا. ١١)﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ﴾ جا وەختێ (بێ باوەڕان) هەستیان كرد بەسزاو تۆڵەی ئێمە ﴿إِذَا هُم﴾ دەست بەجێ ئەوان ﴿مِّنْهَا يَرْكُضُونَ﴾ لەو شارانە بەچەسپانێ ڕایان دەكرد ١٢)﴿لَا تَرْكُضُواْ﴾ (فریشتەكان بەگاڵتەوە پێیان دەڵێن) ڕامەكەن ﴿وَٱرْجِعُوٓاْ﴾ و بگەڕێنەوە ﴿إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ﴾ بۆلای ئەو نازو نیعمەتانەی كە ڕاچوون تێیدا ﴿وَمَسَٰكِنِكُمْ﴾ وە(بگەڕێنەوە) بۆ سەر خانوو ماڵەكانتان ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾ بەڵكو پرسیارتان لێ بكرێ (لەوەی بەسەرتان هاتووە). ١٣)﴿قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ﴾ (لەگەڵ هەڵهاتندا) دەیان ووت: هاوار بۆ ئێمە ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە ستەمكار بووین. ١٤)﴿فَمَا زَالَت﴾ ئیتر بەردەوام ﴿تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ﴾ ئەمە هاواریان بوو (هاوار بۆ ئێمە) ﴿حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ﴾ هەتا هەموویانمان دروێنە و خامۆش كرد (لەناومان بردن). ١٥)﴿وَمَا خَلَقْنَا﴾ ئێمە دروستمان نەكردووە ﴿ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە بەگاڵتەو بێ هودە. ١٦)﴿لَوْ أَرَدْنَآ﴾ ئەگەر بمان ویستایە ﴿أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا﴾ سەرقاڵی بۆ خۆمان هەڵبژێرین (وەك هاوسەرو منداڵ) ﴿لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ لەلایەن خۆمانەوە هەڵمان دەبژارد. ١٧)﴿بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ﴾ (واز لەوە بێنە) بەڵكو حەق دەدەین بەسەر بەتاڵ و ناحەقدا ﴿فَيَدْمَغُهُۥ﴾ بەهۆیەوە (بەتاڵ) مێشكی دەپژێ و تێكدەشكێ ﴿فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ ئینجا دەست بەجێ بەتاڵ دەفەوتێ و لەناو دەچێت ﴿وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ﴾ هاوار (سزا بەتین) بۆ ئێوە ﴿مِمَّا تَصِفُونَ﴾ لەبەر ئەوەی دەیڵێن و ڕەوای دەدەن بۆ خوا (لەهاوسەرو منداڵ). ١٨)﴿وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ تەنها بۆ خوایە ئەوەی لەئاسمانەكان و زەویدایە ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ﴾ وەئەوانە (فریشتانە)ی كە لای خوان ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ﴾ هەرگیز لەپەرستنی ئەو خۆیان بەزل نازانن ﴿وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ﴾ قەتیش ماندوو نابن. ١٩)﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ شەوو ڕۆژ تەسبیحات و ستایش دەكەن ﴿لَا يَفْتُرُونَ﴾ ماندوونابن و سارد نابنەوە. ٢٠)﴿أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ﴾ ئایا ئەوانە هەڵیان بژاردووە (بڕیاریان داوە) ﴿ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ چەند پەرستراوێك لەزەوی دا (بۆ خۆیان) ﴿هُمْ يُنشِرُونَ﴾ كەئەوانە (مردوو) زیندوو دەكەنەوە؟. ٢١)﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ﴾ ئەگەر لەهەردووكیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند پەرستراوێك هەبوایە ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ جگە لەخوا ﴿لَفَسَدَتَا﴾ بێگومان (ئاسمان و زەوی) هەردوو كاول و وێران دەبوون ﴿فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ﴾ دەی پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری عەرش ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ لەوەی بێ باوەڕان ڕەوای دەدەن (بۆ خوا). ٢٢)﴿لَا يُسْـَٔلُ﴾ (خوا) پرسیاری لێ ناكرێت (ڕەخنەی لێ ناگیرێ) ﴿عَمَّا يَفْعَلُ﴾ لەهەر كارێك كەدەیكات ﴿وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾ بەڵام ئەوان (ئادەمیزاد) پرسیاریان لێ دەكرێ. ٢٣)﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ﴾ ئایا ئەوانە هەڵیان بژاردووە (بڕیاریان داوە) ﴿مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ چەند پەرستراوێك جگە لەخوا ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ﴾ (پێیان) بڵێ بەڵگەتان بێنن (لەسەر ئەوەی بڕیارتان داوە) ﴿هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ﴾ ئەمە قسەی ئەم قورئانەیە (خوا ناردویەتی) بۆ من ﴿وَذِكْرُ مَن قَبْلِى﴾ وەقسەی ئەو (پەیامانەیە) لەپێش منە هاتوون (وەك تەورات و ئینجیل لەهیچیاندا بوونی چەند پەرستراوێك ڕەوانەدراوە) ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ﴾ بەڵام زۆربەی زۆریان ﴿لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ﴾ حەق و ڕاستی نازانن ﴿فَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ لەبەر ئەوە پشتی تێدەكەن و ڕووی لێ وەردەگێڕن. ٢٤)

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ
بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم
بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ
وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ
﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ
جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ
يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ
ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ
وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ
ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ
ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾

**- (ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە ڕۆژووی تێدا دەگرن، ووتیان ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە مووسا** تیایدا **سەرکەوت بەسەر** فیرعەوندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) **فەرمووی بەهاوەڵەکانی: (ئێوە شایستەترو لەپێش ترن بە** مووسا لەبەر ئەوەبە ڕۆژوو بن تێیدا).

**ئایەتی (١) سورەتی (هود):** قال رسول الله (ﷺ): (شيبتني هود والواقعة والمرسلات وعم يتساءلون وإذا الشمس كورت)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەم سورەتانە پیریان کردم، (هود) و (الواقعة) و (المرسلات) و (عم يتساءلون) و (إذا الشمس كورت)).

**ئایەتی (٢) سورەتی (هود):** صعد النبي (ﷺ) الصفا فدعا بطون قريش الأقرب ثم الأقرب فاجتمعوا، فقال: (يامعشر قريش: أرأيتم لو أخبرتكم أن خيلاً تصبحكم ألستم مصدقيَّ، -

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا﴾ وەنێمە نەمان ناردووە ﴿مِن قَبۡلِكَ﴾ پێش تۆ ﴿مِن رَّسُولٍ﴾ هیچ پێغەمبەرێك ﴿إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ﴾ مەگەر نیگامان بۆ ناردووە ﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾ (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە ﴿فَٱعۡبُدُونِ﴾ کەواتە تەنها من بپەرستن. ٢٥) ﴿وَقَالُواْ﴾ (وەبێ باوەڕان) ووتیان ﴿ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا﴾ خوای میهرەبان مندالی بۆ خۆی بڕیاردلوە (کە فریشتەکانن) ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ پاکو بێگەردە خوا (لەم شتانە) ﴿بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ﴾ بەلکو ئەوانە (فریشتە) بەندەی ڕێزگیراو (ی خوا) ن. ٢٦) ﴿لَا يَسۡبِقُونَهُۥ﴾ لە خوا پێش ناکەون ﴿بِٱلۡقَوۡلِ﴾ بەقسەو ووتە ﴿وَهُم بِأَمۡرِهِۦ﴾ وەئەوان بەفەرمانی خوا ﴿يَعۡمَلُونَ﴾ کار دەکەن. ٢٧) ﴿يَعۡلَمُ﴾ (خوا) دەزانێ، ئاگادارە ﴿مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ بە ئەوەی لەدنیا لەبەر دەستیاندایە ﴿وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ وە بە ئەوەی لەڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادەکراوە ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ﴾ وە (فریشتەکان) تکا ناکەن ﴿إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾ تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ (خوا) ڕازی بێ (تکای بۆ بکرێ) ﴿وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ﴾ وە ئەوان (فریشتەکان) لەترس وهەیبەتی خوا ﴿مُشۡفِقُونَ﴾ زۆر دەترسن. ٢٨) ﴿وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ﴾ وە هەرکام لەوانە (فریشتەکان) بلێ ﴿إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ﴾ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لەخوا ﴿فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ﴾ ئەو بە(ئاگری) دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەربەوجۆرە ﴿نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە(تۆڵەیان لێ دەکەینەوە). ٢٩) ﴿أَوَلَمۡ يَرَ﴾ ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانە بێ باوەڕ بوون ﴿أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ کەئاسمانەکان و زەوی ﴿كَانَتَا رَتۡقٗا﴾ هەردووکیان پێکەوەلکابوون (یەك پارچە بوون) ﴿فَفَتَقۡنَٰهُمَا﴾ ئینجا لەیەکترمانجیاکردنەوە ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ﴾ وە فەراهەممان هێنا لەئاو ﴿كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ﴾ هەموو شتێکی زیندوو ﴿أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟. ٣٠) ﴿وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وەدروستمان کردووە (دامان ناوە) لەزەویدا ﴿رَوَٰسِيَ﴾ چەند شاخی دامەزراو ﴿أَن تَمِيدَ بِهِمۡ﴾ بۆ ئەوە جوولە جولێ نەکات بەوان(ەی بەسەر پشتێوەن) ﴿وَجَعَلۡنَا فِيهَا﴾ وە سازاندومانە لە زەوی (یا شاخەکان) دا ﴿فِجَاجٗا سُبُلٗا﴾ دۆڵ و ڕێگاوبانی زۆر ﴿لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ﴾ تا ئەوان شارەزا بن و پێویستی خۆیان دابین بکەن. ٣١) ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ﴾ وە ئاسمانمان کردووە ﴿سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ﴾ بەسەقفێکی (سەرێکی) پارێزراو ﴿وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا﴾ بەلام ئەوانە سەربارەت بە ئایەتەکانی ئاسمان ﴿مُعۡرِضُونَ﴾ پشت تێکەرو ڕوو وەرگێر بوون. ٣٢) ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي﴾ وە هەر ئەو (خوا)یە ﴿خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ کە شەو و ڕۆژی دروست کردووە ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ﴾ وە خۆر و مانگیش(ی دروست کردووە) ﴿كُلّٞ﴾ هەریەك لەوان ﴿فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە. ٣٣) ﴿وَمَا جَعَلۡنَا﴾ بڕیارمان نەداوە ﴿لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ﴾ بۆ هیچ کەسێك لەپێش تۆوە ﴿ٱلۡخُلۡدَۖ﴾ مانەوەی هەمیشەیی (نەمری) ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ﴾ ئینجا ئەگەر تۆ بمری ﴿فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ﴾ (لەوا مردنی تۆ) جا ئایا ئەوان ژیانیان بەردەوام دەبێ و نامرن (نەخێر). ٣٤) ﴿كُلُّ نَفۡسٖ﴾ هەموو کەسێك ﴿ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ﴾ مردن دەچێژێ (دەمرێ) ﴿وَنَبۡلُوكُم﴾ وە ئێمە تاقیتان دەکەینەوە ﴿بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ﴾ بەخراپە و ناخۆشی وە بە چاکە و خۆشی ﴿فِتۡنَةٗۖ﴾ تاقیکردنەوەیەك (چاك و خراپ) ﴿وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ﴾ وەهەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە. ٣٥)

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

**- فقالوا ما** جربنا **عليك كذباً، قال: فإني نذير لكم بين يدي عذاب شديد) (رواه مسلم).** **پێغەمبەری** خوا (ﷺ) **چووە سەر کێوی صەفاو بانگی تیرەکانی** قورەیشی **کرد** لەپێشدا خزمە نزیکەکانی **پاشان ئەوانەی** دوا **ئەوان تێن** هەموویان کۆبونەوە، فەرمووی: (ئەی خەڵکی **قورەیش** ئەگەر هەواڵتان بدەمێ سوپایەک دەیەوێت بەرەبەیان بدات بەسەرتاندا، ئایا باوەڕم پێ دەکەن؟ ووتیان: (بەڵێ چونکە) درۆمان لێ نەبیستوویت، فەرمووی: دەی من ترسێنەرم بۆ ئێوە (لە لایەن خواوە) لە سزایەکی سەخت (ئەگەر باوەڕ نەهێنن و شوێن ئاینەکەی نەکەون).

**ئایەتی (٣) سورەتی (هود):** قال رسول الله(ﷺ) لسعد: (وإنك لن تنفق نفقة تبتغي بها -

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ
(٣١) ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ
(٣٢) لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ
ٱلْعَتِيقِ (٣٣) وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ
ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ (٣٤) ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ
قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا
رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (٣٥) وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ
ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ
جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا
لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٣٦) لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا
وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟
ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ (٣٧) ۞ إِنَّ ٱللَّهَ
يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ (٣٨)

=لما بينهن ما لم تغش الكبائر)(رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پێنج نوێژە فەرزەکەو نوێژی هەینی تا نوێژی هەینی یەکی تر گوناهەکانی نێوانیان دەسڕنەوە ئەگەر گوناهە گەورەکانی نەکرد بێت).

**ئایەتی (٣٢)**

**سورەتی (یوسف):**

قال رسول الله (ﷺ): (سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل إلاّ ظله: إمام عادل، وشاب نشأ في عبادة الله، ورجل قلبه معلق بالمسجد إذا خرج منه حتى يعود إليه، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم شماله ما أنفقت يمينه، ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال فقال إني أخاف الله ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (حەوت (کۆمەڵ) خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لەڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نی یە جگە لەسێبەری ئەو: پێشەوایەکی دادگەر و لاوێك لەبەندایەتی خوادا پێگەیشتبێت و=

﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ﴾ گەردن کەچ بن بۆ خوا (خۆتان لە هەموو بیرو باوەڕێکی لار دووربگرن) ﴿غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾ هاوبەش بڕیاردەر مەبن بۆ خوا ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ جا هەرکەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ ﴿فَكَأَنَّمَا﴾ ئەوە وەك ئەوە وایە ﴿خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە ﴿فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ﴾ ئینجا باڵندە (لە هەوادا) بە پەلە بیفڕێنێ (پارچە پارچە بێت) ﴿أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ یا بایەکی توند ببیات ﴿فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ بۆ جێگایەکی زۆر دوور (چۆڵەوانی). ٣١) ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمە (کە باسکرا نموونەی هاوبەش دانان بوو بۆ خوا) ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ وە هەر کەس دروشمەکانی (ئایینی) خوا بەگەورە راگرێ ﴿فَإِنَّهَا﴾ جا بەڕاستی ئەو کارە ﴿مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ لە خوا ترسی دڵەکانیانەوەیە (تەقواکارن). ٣٢) ﴿لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ﴾ بۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانە)دا چەند سوود وەرگرتنێك هەیە (وەك سوار بوون، خواردنی شیریان) ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تاکاتی دیاری کراو (بۆ سەربڕینیان) ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ﴾ پاشان شوێنی (سەربڕینی) ئەوانە ﴿إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ کەی گەیشتنە ماڵی دێرێنی بەڕێز (کەعبە). ٣٣) ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ وە بۆ هەموو ئوممەتێ ﴿جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ قوربانی کردنمان داناوە ﴿لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەوەی ناوی خوا ببەن ﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ (کاتی سەربڕین) لەسەر ئەو ئاژەڵانەی خوا پێی داون ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ جا خوای ئێوە پەرستراوێکی تەنهایە ﴿فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟﴾ کەواتە تەنها ملکەچی ئەو بن ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ﴾ وە مژدە بدە بە ملکەچان و خۆ بەکەم زانان. ٣٤) ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ﴾ ئەوانەی هەرکاتێ ناو خوا برا ﴿وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەکانیان دەترسێ (دەلەرزێ) ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ﴾ وە ئارام گران لەسەر ئەوەی تووشیان دەبێ (لەناخۆشی) ﴿وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ وە بەجێ هێنەرانی نوێژەکانیان ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ وە (ئەوانەی) لەو رزق رۆزییەی پێمان داون دەبەخشن. ٣٥) ﴿وَٱلْبُدْنَ﴾ ئەو ووشترە گەورەو قەڵەوانە (دەبرێن لەبیت الحرام سەردەبڕێن) ﴿جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ﴾ ئێمە کردومانەتە دروشمی خوا بۆ ئێوە ﴿لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ بۆ ئێوە لەواندا خێرو چاکە هەیە ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا﴾ کەواتە (کاتی کردنیان بەقوربانی) ناوی خوایان لەسەر بێنن ﴿صَوَآفَّ﴾ لە کاتێکدا لەسەر سێ پەل وەستاون و دەستی چەپیان بەسراوەتەوە (لەبەر ئەوەی وشتر بە پێوە سەر دەبڕدرێت) ﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا﴾ جا کاتێ کەوتنە سەر زەوی بە تەنیشتدا (کاتێك گیانیان دەرچوو) ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا﴾ ئەوە لە گۆشتەکەیان بخۆن ﴿وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ﴾ وە بیدەن بە هەژاران و سواڵکەران ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ﴾ ئا بەو جۆرە ئەو ماڵاتانەمان بۆ ئێوە رامهێناوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تا سوپاس گوزار بن بۆ خوا. ٣٦) ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ﴾ هەگیز ناگات بە خوا ﴿لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا﴾ نەگۆشتی ئەو (قوربانی)انە نەخوێنیان ﴿وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾ بەڵام ئەوەی بە خوا دەگات تەقوا و پارێزکاری ئێوەیە ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ﴾ ئا بەو جۆرە ئەو ماڵاتانەی بۆ ئێوە رامهێناوە ﴿لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ بۆ ئەوەی خوا بە گەورە بگرن (یادی بکەن) ﴿عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾ لەسەر ئەوەی رێنموونی کردوون ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ وەمژدە بدە بەچاکە کاران. ٣٧) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ﴾ بەڕاستی خوا پشتیوانی دەکات ﴿عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ لەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ﴾ بێگومان خوا خۆشی ناوێ ﴿كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ﴾ هەموو خیانەتکار و بێ باوەڕ و کافرێ. ٣٨)

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٍ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ وَقَوۡمُ لُوطٖ ﴿٤٣﴾ وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰۖ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾

**-پیاوێک دڵی پەیوەست بێت بەمزگەوتەوە هەرکات** لەمزگەوت **دەرچوو تا دەگەڕێتەوە بۆی و دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت لەسەر ئەو یەکتر خۆشویستنە کۆببنەوە (لەژیان دا) و جیا ببنەوە (بەمردن) وەپیاوێک** بەخشینێکی بەخشیبێت و شاردبێتیەوە بەجۆرێ لای چەپی نەزانێ **لای ڕاستی** چی **بەخشیوە**، و پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن پلەو **پایە** و جوانی داوای لێ بکات داوێن پیسی لەگەڵدا بکات پیاوەکەش بڵێت بەڕاستی من لە خوادەترسم- ئەو کارە ناکەم- و پیاوێك بەتەنها یادی خوا بکات و چاوەکانی فرمێسکیان پیادابێتە خوارەوە).

**ئایەتی (٨٧) سورەتی (یوسف):** قال رسول الله (ﷺ): (الجنة أقرب الى أحدكم من شراك نعله والنار مثل ذلك)(رواه البخاري).

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) فەرمووی: (بەهەشت لەهەرکام لەئێوەوە لەچەرمی سەرنەعلەکەی نزیکترە دۆزەخیش بەهەمان شێوە).

﴿أُذِنَ﴾ (جەنگ و جیهاد) ڕێگە درا ﴿لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ﴾ بە ئەو (موسڵمان)انەی شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ ﴿بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟﴾ لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ستەمیان لێ کراوە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بێگومان خوا ﴿عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ بۆ سەرخستنیان بە توانایە ٣٩)﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟﴾ ئەوانەی کە دەرکران ﴿مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ لە ماڵ و وڵاتیان بە ناهەق ﴿إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟﴾ تەنها (گوناهیان ئەوە بوو) کە دەیان ووت ﴿رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ پەروەردگارمان خوایە ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ﴾ وە ئەگەر خوا خەڵکی لە ناو نەبردایە ﴿بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ هەندێکیان بە هەندێکیان ﴿لَّهُدِّمَتْ﴾ بێگومان دەروخێنرا (وێران دەکرا) ﴿صَوَٰمِعُ﴾ دێر (خەڵوەتگە) ﴿وَبِيَعٌ﴾ و کلیسا ﴿وَصَلَوَٰتٌ﴾ و کەنیسە ﴿وَمَسَـٰجِدُ﴾ مزگەوتەکان ﴿يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ کە یادی خوا لەو (پەرستگایانە)دا زۆر دەکرا ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن﴾ وە بێگومان خوا یارمەتی کەسانێ ئەدات (سەریان دەخات) ﴿يَنصُرُهُۥٓ﴾ کە یارمەتی (دینی) خوا دەدەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بە ڕاستی خوا ﴿لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ بەهێز وباڵادەست و بەتوانایە. ٤٠)﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوانەی ئەگەر دەسەڵاتمان پێدان لە زەویدا ﴿أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بە چاکی نوێژ بەجێ دێنن ﴿وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەکات دەدەن ﴿وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ و فەرمان دەدەن بە چاکە ﴿وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ و بەرگری دەکەن لە خراپە ﴿وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ و سەرئەنجامی هەموو کارەکان تەنهابەدەست خوایە. ٤١)﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ وە ئەگەر (بێ باوەڕان) تۆ بە درۆزن دەزانن و باوەڕت پێ ناکەن ﴿فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ﴾ ئەوە بێگومان پێش ئەوان باوەڕیان نەکردووە (بە پێغەمبەرانیان) ﴿قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ﴾ گەلی نووح و عاد و سەموود. ٤٢)﴿وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ﴾ و گەلی ئیبراهیم و گەلی لووط. ٤٣)﴿وَأَصْحَـٰبُ مَدْيَنَ﴾ هەروەهایارانی مەدیەن (هۆزی شوعەیب) ﴿وَكُذِّبَ مُوسَىٰ﴾ وە مووساش بە درۆزن زانراو ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلْكَـٰفِرِينَ﴾ ئینجا (بۆ ماوەیەك) مۆڵەتی بێ باوەڕانم دا ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ دواتر تۆڵەم لێسەندن ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو بەگژا چوونی ئێمە (لەوان). ٤٤)﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَـٰهَا﴾ ئینجا چەندەها شار و دێهاتمان وێران کرد ﴿وَهِىَ ظَالِمَةٌ﴾ کە (خەڵکەکەی) ستەمکار بوون ﴿فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ ئەو(شارانەدیواری خانوەکانی) کەوتبوون بەسەر سەربانەکانیاندا ﴿وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ﴾ وە چەندەها بیر بێ خاوەن بوون (لە کار کەوتبوون) ﴿وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ﴾ وە چەندەها کۆشکی بەرز و بڵند (بێ خاوەن بوون) ٤٥)﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ دەی ئایا ئەوانە بە زەوی دا نەگەڕاون ﴿فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ﴾ تا دڵیان هەبێ ﴿يَعْقِلُونَ بِهَآ﴾ بیری پێ بکەنەوە (لەو وێران بوونە) ﴿أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ یا گوێیان هەبێ گوێی پێ بگرن (بۆ ڕاستی) ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ﴾ لەڕاستی دا چاوەکان کوێر نابن ﴿وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ﴾ بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن ﴿ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾ کەلە سینەکاندان. ٤٦)

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَـٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَـٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَـٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

**ئایەتی (١٠١) سورەتی (یوسف):** قال رسول الله (ﷺ): **(لا يتمنين أحد منكم الموت لضر نزل به، فإن كان ولا بد متمنياً للموت فليقل: اللهم أحيني ماكانت الحياة خيراً لي وتوفني إذا كانت الوفاة خيراً لي)(رواه البخاري).** پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هیچ یەك لەئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت لەبەر زیانێك تووچاری بووە، جا ئەگەر هەر ناچار بوو ئاواتی مردن بخوازێت بابڵێت: ئەی خوایە بمژێنە ئەوەندەی ژیان چاك بێت بۆم وە بمرێنە ئەگەر مردن چاكە ترە بۆم).

**ئایەتی (١٠٩) سورەتی (یوسف):** قال النبي (ﷺ): (المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم خير من الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على أذاهم) (رواه أحمد). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەو ئیماندارەی تێكەڵاوی خەڵك دەكات و لەسەر ئازاریان ئارام دەگرێ چاكترە لەو ئیماندارەی تێكەڵاوی خەڵك ناكات و لەسەر ئازاریان ئارام ناگرێت).

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ﴾ وە ئەوان (قورەیش بە گاڵتەوە) بەپەلە داوای سزات لێ دەکەن ﴿وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ لەکاتێکدا هەرگیز خوا پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ﴾ و بێگومان رۆژێك لای پەروەردگارت ﴿كَأَلْفِ سَنَةٍ﴾ وەك هەزار ساڵ وایە ﴿مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن. ٤٧)﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا﴾ وە(خەڵکی) چەندەها شار و دێ (هەبوون) مۆڵەتم دان﴿وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ کە ستەمکار بوون ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهَا﴾ لەپاشان تۆڵەم لێ سەندن (لەناوم بردن) ﴿وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ وە هەر بۆلای من دەگەڕێنەوە. ٤٨)﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ بڵێ ئەی خەڵکینە ﴿إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ﴾ بێگومان من بۆ ئێوە تەنها ﴿نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ ترسێنەرێکی ئاشکرام.٤٩)﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئێنجا ئەو کەسانەی بڕوایان هێناو ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ بۆ ئەوانەیە لێخۆشبوون ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ و ڕۆزییەکی چاك. ٥٠)﴿وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا﴾ وە ئەوانەی هەوڵیان داوە بۆ(دژایەتی) ئایەتەکانی ئێمە ﴿مُعَاجِزِينَ﴾ ناتەوان و دەستەپاچەن ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانە هاوەڵی دۆزەخن. ٥١) ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ﴾ وە ئێمە لەپێش تۆ نەمان ناردووە ﴿مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ﴾ هیچ رەوانەکراو یا پێغەمبەرێك ﴿إِلَّا إِذَا تَمَنَّىٰ﴾ مەگەر هەر کاتێ (قورئانی) دەخوێندەوە ﴿أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ﴾ شەیتان گومانی دەخستە ناو خوێنراوەکەیەوە (تا خەڵك باوەڕی پێ نەهێنن)﴿فَيَنسَخُ اللَّهُ﴾ ئینجا خوا لایدەبات (پوچەڵی دەکاتەوە)﴿مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ﴾ ئەوەی شەیتان داوێتی بە گوێی خەڵکدا (لە کاتی قورئان خوێندنی پێغەمبەردا (ﷺ))﴿ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ﴾ پاشان خوا ئایەتەکانی خۆی دەچەسپێنێ ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای کاردروستە. ٥٢) ﴿لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ﴾ لەبەر ئەوەی ئەو گومانانەی شەیتان دەیخاتە(دڵەکان خوا) دەیکاتە ﴿فِتْنَةً لِّلَّذِينَ﴾ (هۆی) تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ نەخۆشی لە دڵیاندایە و (ئەوانەی) دڵیان رەقە﴿وَإِنَّ الظَّالِمِينَ﴾ وە بەراستی ستەمکاران ﴿لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ لە دژایەتی یەکی زۆر دور(لە راستی)دان. ٥٣)﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ﴾ وە بۆ ئەوە بزانن ئەو کەسانەی ﴿أُوتُوا الْعِلْمَ﴾ کە زانیاریان پێ دراوە ﴿أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بێگومان ئەم (قورئان)ە راستیەکە لە لایەن پەروەردگارتەوە﴿فَيُؤْمِنُوا بِهِ﴾تا باوەڕی پێ بێنن(بەردەوام بن لەسەری) ﴿فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ﴾ وە دڵەکانیان ملکەچ و بەئارام ببێ بۆ ئەو (خوا)﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ﴾ وە بێگومان خوا هیدایەتدەری ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوە ﴿إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بۆ سەر ڕێگای ڕاست. ٥٤)﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بەردەوام ئەو کەسانەی بێ باوەڕن ﴿فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾ لە گوماندان دەربارەی قورئان ﴿حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً﴾ تا لەناکاودا ڕۆژی دوایی یەخەیان دەگرێت ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمْ﴾ یا یەخەیان دەگرێت (دێت بۆیان) ﴿عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ﴾سزای ڕۆژێکی نەزۆك و بێ خێر. ٥٥)

ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥٧﴾
وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ
لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ
ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۗ وَإِنَّ
ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ
مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ
لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي
ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ
﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن
دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٦٢﴾
أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ
مُخۡضَرَّةًۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٦٤﴾

**ئایەتی (١) سورەتی (الرعد):** قال رسول الله (ﷺ): (**من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليصل رحمه ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيراً أو ليصمت**)(**متفق عليه**). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی بارێزی میوانی بگرێت، وە ئەو کەسەی باوەڕی **هەیە بەخوا و بەڕۆژی** دوایی باپەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنێ، وە ئەو کەسەی باوەڕی هەیە **بەخوا و بەڕۆژی** دوایی باقسەی چاك بكات یابێ دەنگ بێت).

**ئایەتی (١١) سورەتی (الرعد):** قال رسول الله (ﷺ): (يتعاقبون فيكم ملائكة بالليل وملائكة بالنهار، **ويجتمعون في صلاة** الصبح وصلاة العصر فيصعد إليه الذين باتوا فيكم فيسألهم ربهم وهو أعلم بكم، كيف-

﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ دەسەڵاتو پاشایەتی لەو ڕۆژەدا تەنها بۆ خوایە ﴿يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ لەنێوانیاندا دادوەری دەکات ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئینجا ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەو چاکەکانیان کردووە ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لە بەهەشتانی پڕ نازو نیعمەت دان. ٥٦) ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەو کەسانەی بێ باوەڕ بوون ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەوانە هەیە ﴿عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ سزای ڕیسواکەر. ٥٧) ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ وە ئەو کەسانەی کۆچیان کردووە ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەڕێگای خوادا ﴿ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ﴾ پاشان کوژران(شەهید بوون) یامردن ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾ بێگومان خوا ڕزق و ڕۆزیکی چاکیان دەداتێ ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بێگومان خوا ﴿لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ چاکترینی ڕۆزی دەرانە. ٥٨) ﴿لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ﴾ سوێند بەخوا، خوا ئەوانە دەخاتە جێگایەك کەپێی ڕازی دەبن ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾ وە بێگومان خوا زانای لەسەر خۆیە. ٥٩) ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمەی (باسمان کرد بۆت) ﴿وَمَنْ عَاقَبَ﴾ و هەر کەسێ تۆڵەی خۆی بسەنێ (لەدەس درێژی کەر) ﴿بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ﴾ بەوێنەی ئەو ستەمەی لێی کراوە ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ﴾ لەدوا ئەو جارێکی تر دەست درێژی بکرێتە سەر ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾ ئەوە بێگومان خوا یارمەتی دەدات (سەری دەخات) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ بەڕاستی خوا چاوپۆشی کەری لێبوردووە. ٦٠) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئەم(سەرخستنە خوا) لەبەر ئەوەیە بەڕاستی خوا ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾ (ئەوەندە بەدەسەڵاتە) شەو دەباتە ناو ڕۆژەوە (کاتێ شەو درێژ تر بێت لەڕۆژ) ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾ وەڕۆژ دەباتە ناو شەوەوە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ وە بێگومان خوا بیسەری بینایە. ٦١) ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمە ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ﴾ لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەر خوا هەقو ڕاستە ﴿وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ وەبێگومان ئەوەی جگە لەخوا هاواری لێ دەکەن (دەیپەرستن) ﴿هُوَ ٱلْبَٰطِلُ﴾ هەر ئەوە بەتاڵ و ناڕاست ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وبەڕاستی خوا ﴿هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ هەر خۆی بەرزو بڵندو گەورەیە. ٦٢) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نابینی ﴿أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ﴾ کەبەڕاستی خوا باراندویەتی ﴿مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ لە ئاسمانەوە باران ﴿فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾ (بەهۆی ئەو بارانەوە) زەوی سەوز دەبێ (بەڕوەك) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خوا وردبینی ئاگایە (بە هەموو شتێك). ٦٣) ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هەر بۆ ئەوە (خوا) ئەوەی لە ئاسمانەکانە ﴿وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ و ئەوەش لە زەویدایە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بەڕاستی خوا ﴿لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ هەر خۆی بێ نیاز و دەوڵەمەندی شایستەی سوپاسە. ٦٤)

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ
بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ إِنَّ
ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاكُمْ
ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾
لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ
فِى ٱلْأَمْرِ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾
وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ
بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾
أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ
فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ
مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى
وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ
بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن
ذَٰلِكُمُ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

**تركتم عبادي؟ فيقولون: أتيناهم وهم يصلون وتركناهم وهم يصلون) (رواه البخاري ومسلم).**
پێغەمبەری **خوا** (ﷺ) **فەرمووی:** (فریشتانێک- **کە** چاودێری ئێوەن- بەشەو لەگەڵتانن ئەوان **دەڕۆن و** بەڕۆژدا **فریشتانێکی تر دێن، لەنوێژی بەیانی و عەسردا بەیەکتری دەگەن و کۆدەبنەوە، جا** ئەوانەیان بەشەو **لەگەڵتان بوون بەرز دەبنەوە بۆ لای** خوا **ئەوسا خوای گەورەش پرسیاریان لێ** دەکات لەکاتێکدا خۆی شارەزاترە بەئێوە، چۆن و بەچ شێوەیەک بەندەکانی منتان بەجێ هێشت؟ فریشتەکانیش دەڵێن: ئێمە ڕۆشتین بۆ لایان نوێژیان دەکرد وە بەجێمان هێشتن هەر نوێژیان دەکرد).

**ئایەتی ( ١٨ ) سورەتی ( الرعد ):** قال رسول الله (ﷺ): (من نوقش الحساب هلك) (رواه البخاري).
**پێغەمبەری** خوا (ﷺ): فەرمووی: (هەرکەس لەموحاسەبەدا موناقەشەی لەگەڵدا بکرێت ئەوە تیاچووە).

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ﴾ ئایا نابینی (نازانی) بەڕاستی خوا ﴿سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ﴾ رامی هێناوە بۆتان هەموو ئەو شتانەی لەزەویدایە ﴿وَالْفُلْكَ تَجْرِي﴾ وەکەشتی (رام هێناوە) دەڕوات ﴿فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾ بەناو دەریادا بەفەرمانی ئەو (خوا) ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ﴾ وەئاسمانی راگیر کردووە ﴿أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ﴾ تا کە نەکەوێ بەسەر زەویدا ﴿إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ مەگەر بەفەرمانی ئەو ﴿إِنَّ اللَّهَ﴾ بەراستی خوا ﴿بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵسۆز و میهرەبانە بەرانبەر بەخەڵکی. ٦٥)﴿وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ﴾ وە ئەو (خوا) زاتێکە کەژیانی پێ بەخشیوون (لەسەرەتای دروسکردنتانەوە) ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ دواتر دەتان مرێنێت پاشان زیندووتان دەکاتەوە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ﴾ بێگومان خەڵکی زۆر ناسوپاس و سپڵەن. ٦٦)﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ﴾ بۆ هەموو ئوممەتێك ﴿جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ شەریعەت و بەرنامەیەکمان داناوە ﴿هُمْ نَاسِكُوهُ﴾ ئەوان کاریان پێ کردووە ﴿فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ﴾ کەواتە نابێ (خاوەن ئایینەکانی تر) لەکاری ئاییندا کێشەو ئاژاوەت لەگەڵدا دروست کەن ﴿وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ وەتۆ خەڵك بانگ بکە بۆ لای پەروەردگارت ﴿إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان تۆ لەسەر ئایینێکی ڕاستی. ٦٧)﴿وَإِن جَادَلُوكَ﴾ جا ئەگەر موجادەلەیان لەگەڵدا کردیت ﴿فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ تۆش بڵێ خوا خۆی چاك دەزانێ بەو کردەوانەی ئێوە دەیکەن. ٦٨)﴿اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ خوا دادوەری دەکات لەنێوانتاندا ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ﴿فِيمَا كُنتُمْ﴾ لەو شتانەی کەئێوە ﴿فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ تێیدا جیاوازن. ٦٩)﴿أَلَمْ تَعْلَمْ﴾ ئایا نازانی ﴿أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ﴾ بەڕاستی خوادەزانێ ﴿مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ بەهەموو ئەو شتانەی لە ئاسمانو زەویدایە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ﴾ بێگومان ئەوەی باسکرا لەکتێبی (لوح المحفوظ) دایە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەم (زانیارییەی باسکرا) بەلای خواوە ئاسانە. ٧٠)﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا﴾ ئەوان جگە لەخوا شتێ دەپەرستن ﴿لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا﴾ (خوا) هیچ بەڵگەیەکی نەناردۆتە خوارەوە لەسەری ﴿وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ﴾ وە بێگومان خۆشیان هیچ زانیاریان دەربارەی ئەو (پەرستراوە) نییە ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ﴾ وەبۆ ستەم کاران نییە ﴿مِن نَّصِيرٍ﴾ هیچ یارمەتی دەرێك. ٧١)﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ وەکاتێ بخوێنرێتەوە بۆیان ﴿آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ﴾ نیشانە روونەکانی ئێمە ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەدەم و چاوی ئەو کەسانەی بێ باوەڕن دەبینی ﴿الْمُنكَرَ﴾ رووگرژی و توڕەیی ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ﴾ نزیکە پەلامار (هێرش) بەرن بۆ ئەو کەسانەی ﴿يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾ کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ ﴿بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾ بەخراپتر لەو (روگرژی و توڕەیی)ەی ئێوە چی یە ﴿النَّارُ﴾ ئاگر دۆزەخە ﴿وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ کەخوای گەورە بەڵێنی داوە بەو کەسانەی کە بێ باوەڕن ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ج جێگە و ئاکامێکی خراپە (پێ ی دەگەن). ٧٢)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُواْ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾




**ئایەتی (٥) سورەتی (إبراهيم):** قال رسول الله (ﷺ): (عجبا لأمر المؤمن إن أمره كله خير وليس ذلك لأحد الاّ للمؤمن، إن أصابته سراء شكر فكان خيراً لـه، وإن أصابته ضراء صبر فكان خيراً لـه) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاری ئیماندار سەیرە بەڕاستی کارەکانی هەمووی چاکە و خێرە، ئەمەش بۆ کەس نی یە جگە لەئیماندار، ئەگەر باشەو خۆشی تووش بێت سوپاسی خوا دەکات و ئەوە چاکەیە بۆی وە ئەگەر زیان و ناخۆشی تووش بێت خۆڕادەگرێ و ئەوەش چاکەیە بۆی).

**ئایەتی (٨) سورەتی (إبراهيم):** قال رسول الله (ﷺ): (يقول الله عزوجل: ياعبادي لو أن أولكم وآخركم وأنسكم وجنكم كانوا على أتقى قلب رجل واحد منكم مازاد ذلك في ملكي شيئاً، يا عبادي لو أن –

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئـەی خەڵكینـە ﴿ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓ﴾ نموونەیـەك هێنراوەتـەوە جـا گوێی بۆ بگرن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی هاواریان لێ دەكەن ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لە جیاتی خوا ﴿لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا﴾ هەرگیز ناتوانن مێشێك دروست بكەن ﴿وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥ﴾ هەرچەند هەموویشیان بۆی كۆببنەوە ﴿وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا﴾ وە ئەگەر مێشیش شتێكیان لێ بفڕێنێ ﴿لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُ﴾ ناتوانن لێی بسێننەوە ﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ داواكار و داوا لێ كراو ناتەوان و بێ دەسەڵاتن. ٧٣) ﴿مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ ئەوانە بەو شێوە پێویستە خوا بناسن نەیان ناسیوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ بێگومان خوا بە توانای بەدەسـەڵاتە. ٧٤) ﴿ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا﴾ خـوا لـە فریـشتەكاندا نێـردراو هەڵدەبـژێرێت ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ هـەروەها لـە خـەڵكیش دا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ﴾ بەڕاستی خـوا بیسەری بینایـە. ٧٥) ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ خـوا ئاگادارە بەوەی لە بەردەمیاندایە (ڕووی داوە) و بەوەی لە دوایانەوەیە (دواتـر ڕوودەدات) ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ و هەموو كارەكان هەر بـۆ لای خـوا دەگەڕێتـەوە. ٧٦) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی ئەوانـەی كـە باوەڕتـان هێنـاوە ﴿ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ﴾ كڕنوش و سوژدە بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن ﴿وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ وە كـاری چـاك بكـەن بـۆ ئـەوەی ڕزگـارین. ٧٧) ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾ جیهـاد و تێكۆشان بكەن لە پێناوی خوادا بەو شێوەی شـیاویەتی ﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ﴾ ئـەو (خـوا) ئێوەی هەڵبژاردوە (بۆ هەڵگرتنی ئەم ئایینە) ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ وە لـە ئایین دا هیچ كارێكی قورس و گرانی لەسەر دانەناوە ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئەمە ئایینی ئیبراهیمی باوانانە ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا﴾ ئەو (خوا) پێشتر ئێوەی بە موسڵمان ناوناوە وە لەم قورئانەش دا ﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ﴾ تا پێغەمبەر ببێت بە شایەت لەسـەر ئێوە ﴿وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ و ئێوەش ببنـە شـایەت لەسـەر خەڵكی ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ كەواتە بە چاكی نوێژەكانتان بكەن و زەكات بدەن ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ﴾ وە تـەنها پـشت بـە خـوا ببەسـتن ﴿هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡ﴾ چـونكە هـەر ئـەوە پشتیوانتانە ﴿فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ ئای چەند پشتیوان و یارمەتی دەرێكی چاكە. ٧٨)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾

**-أولكم** وآخركم **وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فأعطيت كل إنسان مسألته ما نقص ذلك من ملكي شيئاً إلا كما ينقص المخيط إذا دخل** البحر **(رواه** مسلم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) **فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ئەی بەندەکانم ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان و ئادەمی و پەریتان لەسەر دڵی خواناسترین** پیاوێك **لە خۆتان** بن ئەوە **هیچ** لەدەسەلات **و موڵکی** من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان و ئادەمی و پەریتان لەزەوییەکی تەخت دا بوەستن و هەموو داوام لێ بکەن هەر مرۆڤێك داواکەی پێ دەدەم ئەو پێدانەش هیچ لەموڵکی من کەم ناکات مەگەر بەئەندازەی ئەوەی دەرزیەکی درومان ، کاتێ دەخرێتە دەریایەکەوە- چەند ئاو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ کاتێ دەریهێنرێ﴾.

## سورەتی ﴿ المؤمنون ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ بەڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن (سەر دەکەون). ١) ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ﴾ ئەوکەسانەی کەلە نوێژەکانیاندا ﴿خَٰشِعُونَ﴾ لەخواترسن (کەردن کەچن بۆخوا). ٢) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ﴾ وە ئەوانەی ﴿عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ لەشتی بێ هودە خۆیان دوور دەگرن. ٣) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ﴾ وە ئەوانەی ﴿لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ﴾ کەزەکاتی (سامانیان) دەردەکەن. ٤) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ﴾ وەئەوانەی ﴿لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ﴾ کەپارێزەری داوێنیان (لەشەرواڵ پیسی). ٥) ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ﴾ مەگەر بۆ خێزانی خۆیان ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ یابۆ کەنیزەکێك کەبووبن بەخاوەنیان ﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن. ٦) ﴿فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ﴾ ئەدجا هەرکەسێ نیازی جگەلەو (دووجۆرە ئافرەتە) بکات (و ئارەزووی خۆی تێربکات) ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ﴾ ئەوسا ئەوانە دەست درێژی کەرن. ٧) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾ وە ئەوانەی کەپارێزەری سپاردەو پەیمانەکانیانن. ٨) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ وە ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان. ٩) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾ هەر ئەوانەن میرات گران. ١٠) ﴿ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ﴾ ئەوانەی کەدەبنە خاوەن فیردەوس (بەهەشت) ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوان لەبەهەشتدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی. ١١) ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی مرۆڤمان دروست کرد ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ لەخولاسەو پاڵفتەیەلەقوڕ. ١٢) ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً﴾ لەپاشان ئەومان کردە بەنوتفەیەك ﴿فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ لەئارامگایەکی قایم (منداڵدانی دایك)دا. ١٣) ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ دواتر نوتفەکەمان کرد بەخوێنی مەیيو ﴿فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ ئینجا خوێنە مەیيوەکەشمان کرد بەپارچە گۆشتێکی جووا و ﴿فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا﴾ ئینجا ئەویشمان کرد بەئێسقان ﴿فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا﴾ ئینجا بەگۆشت (پەیکەرە) ئێسکەکەمان داپۆشی ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾ پاشان ئەومان کرد بەدروست کراوێکی تر ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ﴾ جا گەورەو پیرۆزە ئەو خوایەی ﴿أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ کەچاکترینی بەدی هێنەرانە. ١٤) ﴿ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ﴾ پاشان بەڕاستی ئێوە لەدوای ئەوە هەمووتان دەمرن. ١٥) ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ﴾ لە پاشان بێگومان ئێوە لەرۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە. ١٦) ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەسەری ئێوەوە دروستمان کردوە ﴿سَبْعَ طَرَآئِقَ﴾ حەوت نهۆم ئاسمان ﴿وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ﴾ وە ئێمە لە دروست کراوەکان بێ ئاگانین. ١٧)

وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾

**ئایەتی (٢٧) سورەتی (إبراهیم):** قال النبي (ﷺ): (يبعث كل عبد في القبر على ما مات، المؤمن على إيمانه والمنافق على نفاقه)(رواه أحمد). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەموو بەندەیەك لەگۆڕدا زیندوو دەكرێتەوە لەسەر ئەو حاڵەتەی كە لەسەری مردووە، باوەڕدار لەسەر باوەڕداریەكەی دوو ڕووش لەسەر دووڕوویی و ناپاكی یەكەی).

**ئایەتی (٤١) سورەتی (إبراهیم):** قال رسول الله (ﷺ): (دعوة المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابة، عند رأسه ملك موكل به كلما دعا لأخيه بخير قال الملك الموكل به آمين ولك بمثل)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دوعای مرۆڤی موسڵمان بۆ برای موسڵمانی لەپشتی ملە گیرایە، فریشتەیەكی تایبەت كراو بەلای سەرییەوەیە هەر كاتێ دوعایەكی چاكە بكات بۆ برا موسڵمانەكەی ئەو-

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ﴾ وە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە(ی پێویست) بارانمان باراند ﴿فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئینجا ئەو (ئاوە)مان لە زەوی دا هێڵایەوە (راگرت) ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ﴾ وە بێگومان ئێمە بەسەر لەناوبردنی ئەو (ئاوە)دا. ﴿لَقَٰدِرُونَ﴾ بەتواناین. ١٨) ﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ﴾ ئینجا بە هۆی ئەو (بارانە)وە بەدیمان هێناوە (ڕواندومانە) بۆتان ﴿جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾ چەند باخی خورما و ترێ ﴿لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەو باخانەدا میوەی زۆر ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ وەلە هەندێکیان دەخۆن (بەشێوەی بژێوی وەك مێوژ و خورما). ١٩) ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ﴾ هەروەها (ڕواندومانە) جۆرە دارێك (زەیتون) کەلە توری سینا دەڕوێ ﴿تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ﴾ کە ڕۆن و پێخۆرێك دەگرێت بۆ ئەوانەی دەیخۆن. ٢٠) ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً﴾ وە بەراستی بۆ ئێوە لە ماڵات و ئاژەڵدا پەند هەیە ﴿نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا﴾ پێتان دەنۆشین ئەو (شیر)ەی لە ناو سکیاندایە ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ﴾ وە بۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانەدا) سوود و کەڵکێکی زۆر هەیە ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ و لێشیان دەخۆن. ٢١) ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ وە لەسەر (پشتی هەندێ لە) ئەوان و لەسەر (پشتی) کەشتییەکانیش سوار دەکرێن. ٢٢) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە نووحمان نارد بۆ لای هۆزەکەی ﴿فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ جا پێی وتن ئەی هۆزەکەم خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ ئێوە جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نی یە ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا خۆتان ناپارێزن. ٢٣) ﴿فَقَالَ﴾ جا وتیان ﴿ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ ئەو پیاو ماقوڵانەی کە بێ باوەڕ بوون لە هۆزەکەی (نووح) ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئەم (نووحە) تەنها کەسێکە وەك ئێوە ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ دەیەوێت خۆی بکاتە گەورە بەسەرتانەوە ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾ ئەگەر خوا بیویستایە (پێغەمبەرێك بنێرێ) فریشتەی دەناردە خوارەوە ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا﴾ ئێمە شتی وامان نەبیستووە ﴿فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ لە باوو باپیرە پێشووەکانمانەوە. ٢٤) ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ﴾ ئەم (نووحە) هەر پیاوێکە ﴿بِهِۦ جِنَّةٌ﴾ شێتی لەگەڵدایە ﴿فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ جا تاماوەیەك چاوەڕوانی بکەن (بەڵکو چاك بێتەوە). ٢٥) ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى﴾ (نووح) وتی ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە (سەرم بخە) ﴿بِمَا كَذَّبُونِ﴾ لەبەر ئەوەی باوەڕم پێ ناهێنن. ٢٦) ﴿فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ﴾ ئینجا ئێمە نیگامان بۆ کرد ﴿أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ﴾ کە کەشتیەکە دروست بکە ﴿بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ بە چاودێری ونیگای ئێمە ﴿فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ ئینجا کاتێ فەرمانی ئێمە (بۆ لەناوبردنی ئەوان) هات ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾ و ئاو لە تەنورەوە هەڵقوڵا (نیشانەی دەسپێکردنی توفانەکەیە) ﴿فَٱسْلُكْ فِيهَا﴾ تۆش بیخەرە ناو کەشتی یەکەوە (سواری کە) ﴿مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ﴾ لە هەموو جۆرە (ئاژەڵێك) جوتێك (نێر ومێ یەك) ﴿وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ﴾ هەروەها (سوار بکە ئەندامانی) خێزانەکەت جگە لەوانەیان کە بڕیاری لە ناو چوونیان دراوە (کە کوڕەکەی و هاوسەرەکەی بوون) ﴿وَلَا تُخَٰطِبْنِى﴾ و قسەشم لەگەڵ مەکە ﴿فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾ لەبارەی ئەوانەی کەستەمیان کردوە (و باوەڕیان نەهێنا) ﴿إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ چونکە بێگومان ئەوانە دەخنکێنرێن. ٢٧)

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾

=فریشتەیە دەڵێ، گیرابێ و بۆ تۆش بەوێنەی دوعاکەت بنوسرێت).

**ئایەتی (٤٥) سورەتی (الحجر):** قال **رسول الله** (ﷺ): **(إن** الله عز وجل يقول لأهل الجنة"يا أهل الجنة، فيقولون: **لبيك** ربنا وسعديك **والخير في** يديك، **فيقول: هل** رضيتم؟ **فيقولون:** مالنا **لا نرضى** يا ربنا **وقد أعطيتنا** ما **لم تعط أحداً** من خلقك؟ **فيقول: ألا** أعطيكم أفضل من ذلك؟ فيقولون: وأي شيء أفضل من **ذلك؟ فيقول:** أحلّ عليكم رضواني فلا أسخط عليكم بعده أبداً) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوای گەورە بەبەهەشتیەکان دەڵێ، ئەی بەهەشتیەکان، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بەدەم فەرمانتەوە هاتین‌و لەخزمەت داین و هەموو چاکە لەدەستی تۆدایە، جا (خوای گەورە) دەفەرموێ: ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بۆچی ڕازی نابین لەکاتێکدا ئەوەی بەئێمەت داوە=

﴿فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ﴾ ئینجا کاتێ تۆو ئەو کەسانەی لەگەڵت دان سواری کەشتی یەکە بوون ﴿فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى﴾ (ئەی نووح) بڵێ سوپاس بۆ خوایەکی ئەو تۆ ﴿نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە ئێمەی ڕزگار کرد لە دەست گەلی زاڵمان. ٢٨)﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا﴾ وە بڵێ ئەی پەروەردگارم دامبەزێنە (لە کەشتی یەکە) لە جێگایەکی پیرۆز و بەفەڕدا (کە کێوی جوودی یە لە کوردستانی تورکیا) ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾ وە تۆ (خوایە) چاکترینی دابەزێنەرانی. ٢٩)﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەراستی لەم (بەسەرهاتەی نووح دا ) پەند ونیشانەی زۆر هەیە (بۆ کەسانی عاقڵ) ﴿وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە تاقیکەرەوەین (بۆ هەموو خەڵك). ٣٠)﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ پاشان لەدوای ئەوان بەدیمان هێنا ﴿قَرْنًا ءَاخَرِينَ﴾ گەل و نەوەیەکی تر. ٣١)﴿فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ ئینجا لە ناو ئەواندا پێغەمبەرێکمان لە خۆیان نارد ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ (پێی وتن) تەنها خوا بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ جگە لەو (خوایە) پەرستراوێکی ترتان نی یە ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا خۆتان ناپارێزن (لە خوا ناترسن). ٣٢)﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ﴾ پیاو ماقوڵانی گەلەکەی (هوود (ﷺ)) وتیان ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو بێ باوەڕ بوون بە دیداری ڕۆژی دوایی ﴿وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ وە لە ژیانی دنیادا ناز و نیعمەتمان پێ دابوون ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ (وتیان) ئەمە هەر مرۆڤێکە وەك ئێوە ﴿يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ﴾ لەوەی ئێوە دەیخۆن دەخوات ﴿وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴾ وە لەوەی ئێوە دەیخۆنەوە دەخواتەوە. ٣٣)﴿وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی بەشەرێکی وەك خۆتان بکەن ﴿إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بێگومان ئەو کاتە ئێوە لە زیان باران دەبن. ٣٤) ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ﴾ ئایا ئەو (هوود (ﷺ)) بەڵێن بە ئێوە دەدات کەبەڕاستی کاتێ مردن ﴿وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا﴾ وە بوونە بەخاك و ئێسك (ی ڕزیو) ﴿أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ﴾ بێگومان ئێوە (لە گۆڕ) دەر دەهێنرێن (زیندوو دەکرێنەوە). ٣٥)﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ﴾ زۆر دوورە، ئەستەمە ﴿لِمَا تُوعَدُونَ﴾ ئەو بەڵێنەی بە ئێوە دراوە (گوایە زیندوو دەکرێنەوە). ٣٦)﴿إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا﴾ ژیان (یکی تر) نی یە تەنها ژیانی ئەم دنیایەمان نەبێ ﴿نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾ دەمرین و دەژین (نەوە لە دوای نەوە) ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ وە ئێمە زیندوو ناکرێینەوە. ٣٧)﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ﴾ ئەوە (کە دەڵێ پێغەمبەرم) تەنها پیاوێکە ﴿ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ درۆ دەکات بە دەم خواوە ﴿وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ﴾ وە ئێمە هەرگیز باوەڕی پێ ناکەین. ٣٨)﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى﴾ (هوود (ﷺ)) وتی ئەی پەروەردگارم یامەتیم بدە (و تۆڵەیان لێ بسەنە) ﴿بِمَا كَذَّبُونِ﴾ بەهۆی ئەوەی کە باوەڕم پێ ناهێنن. ٣٩)﴿قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ﴾ (خوا) فەرمووی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ﴿لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ﴾ بێگومان پەشیمان دەبنەوە. ٤٠)﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ﴾ ئینجا شریخە و دەنگێکی زۆ بەهێز (دای بەسەریاندا) هەموویانی گرت کە هەقیان بوو ﴿فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً﴾ و ئەوانمان کرد بە (وێنەی) پوش و کەڵ (سەر لافاو) ﴿فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ جا دووری (لە ڕەحمەتی خوا) بۆگەلی ستەمکاران. ٤١)﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ دواتر لە پاش ئەوان بەدیمان هێنا ﴿قُرُونًا ءَاخَرِينَ﴾ چەند گەل و ئوممەتێکی تر. ٤٢)

مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا
كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ
أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ
هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ
فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا
وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ
﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا
ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ
﴿٥٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّى بِمَا
تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ
فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ
فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا
نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ
﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم
بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾

-بەهیچ یەکێ لە دروست کراوەکانت نەداوە؟ جا خوای گەورە ئەفەرموێ: ئایا شتێکتان پێ بدەم چاکتر لەوە ئەوانیش دەڵێن: چ شتێك هەیە چاکتر لەمەی پێمان دراوە؟ جا خوای گەورە دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆم دەڕژێنم بەسەرتاندا و لەپاش ئەوە هەرگیز لێتان زویر و تووڕە نابم).

**ئایەتی (٨٥) سورەتی (الحجر):**

عن أنس (رضي الله عنه) قال: (كنت أمشي مع النبي (ﷺ): **وعليه برد نجراني غليظ** الحاشية، فأدركه أعرابي فجبذه بردائه جبذة شديدة، فنظرت إلى صفحة عاتق النبي (ﷺ) وقد أثرت بها حاشية البردة من شدة جبذته ثم قال: يا محمد مر لي من مال الله الذي عندك، فالتفت (ﷺ) **إليه فضحك ثم أمر له** بعطاء) (متفق عليه). ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: (من لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەڕۆشتم، پێغەمبەر عەبایەکی نەجرانی قەراغ ئەستوری لەسەر شان بوون، عەرەبێکی-

﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا﴾ هیچ ئوممەتێ لە ماوەی دیاری کراو (بۆ مردن)یان نە پێش دەکەون ﴿وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ نەدواش دەکەون. ٤٣)﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا﴾ لەپاشان پێغەمبەرانی خۆمان یەك لەدوای یەك نارد ﴿كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا﴾ هەر کاتێ ئوممەتێك لەخۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە ﴿كَذَّبُوهُ﴾ باوەڕیان پێ نەدەهێنا ﴿فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا﴾ جا ئێمەش ئەم ئوممەتە (بێ باوەڕانەمان) یەك بە دوای یەکدا (لەناوبرد) ﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ﴾ وە(باسی) ئەوانمان کردە ڕووداوو بەسەرهاتانێك (خەڵکی لەنێوان خۆیان باسی بکەن) ﴿فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ ئینجا دووری (لەڕەحمی خوا) بۆ گەلێ باوەڕ ناهێنن. ٤٤)﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ﴾ لەپاشان مووسا و هاروونی برایمان نارد ﴿بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ بەنیشانەکانمان و بەڵگەی ئاشکراوە. ٤٥)﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾ بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی ﴿فَاسْتَكْبَرُوا﴾ بەڵام خۆیان بە گەورە دانا (باوەڕیان نەهێنا) ﴿وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ﴾ وە ئەوان گەلێکی دەسەڵات دار بوون بەسەر خەڵکیدا. ٤٦)﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا﴾ ئینجا ووتیان ئایا ئێمە بەدوو کەسی وەك خۆمان باوەڕ بێنین. ﴿وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ﴾ لەکاتێکدا گەلەکەیان (بەنی ئیسرائیل) ئێمە دەپەرستن (کەردن کەچن بۆ ئێمە). ٤٧)﴿فَكَذَّبُوهُمَا﴾ لەبەر ئەوە باوەڕیان پێ نەهێنان ﴿فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ﴾ ئەمانیش (وەك گەلانی تر) لەناو بران. ٤٨)﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى الْكِتَٰبَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بەمووسا ﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ تا (بەنی ئیسرائیل) ڕێنموون بن. ٤٩)﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً﴾ هەروەها عیسای کوڕی مەریەم و دایکیمان کرد بەبەڵگەو موعجیزەیەك ﴿وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ﴾ و هەر دووکیان (عیسا و دایکی)مان دانا لەشوێنێکی بڵند (بیت المقدس) ﴿ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ کەخاوەنی (هەموو هۆیەکی) حەسانەوەو کانیاوە. ٥٠) ﴿يَٰٓأَيُّهَا الرُّسُلُ﴾ ئەی نێر راوانی خودا ﴿كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَٰتِ﴾ لەخۆراکی پاك (حەڵاڵ) بخۆن ﴿وَاعْمَلُوا صَٰلِحًا﴾ وە کردەوەی چاك بکەن ﴿إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (چونکە) بەراستی من بەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارم. ٥١)﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ﴾ وەبێگومان هەر ئەمەیە ئاین و دینی ئێوە (ئەی پێغەمبەران دەستی پێوە بگرن) ﴿أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ کەیەك ئایین و بەرنامەیە ﴿وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ وەمنیش پەروەردگارتانم کەواتە خۆتان بپارێزن (لەتۆڵەم). ٥٢)﴿فَتَقَطَّعُوٓا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا﴾ (شوێنکەو توانیان) ئاینەکەیان (کەیەك ئایین بوو) پارچە پارچە کرد لەنێوان خۆیاندا بەچەند پارچەیەك ﴿كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ جا هەر کۆمەڵ و دەستەیەکیان دڵخۆشن بەو (بەشە ئایینەی) کەهەیانە. ٥٣)﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ﴾ کەوا بوو وازیان لێ بێنە لەو بێ ئاگایی و گومرایی یەی دایپۆشیون ﴿حَتَّىٰ حِينٍ﴾ (بابژین) تاماوەیەك. ٥٤)﴿أَيَحْسَبُونَ﴾ ئایا ئەوانە وادەزانن ﴿أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ﴾ ئەوەی پێیان دەبەخشین ﴿مِن مَّالٍ وَبَنِينَ﴾ لەسامان و منداڵان. ٥٥)﴿نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَٰتِ﴾ (بەهۆی شیاویانەوە) چەسپانیمان کردووە بۆیان لەخێرو خۆشیەکاندا ﴿بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ (نەخێر وانی یە) بەڵکو ئەوانە هەست ناکەن (کە بۆ تاقی کردنەوەیانە). ٥٦) ﴿إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ بەراستی ئەو کەسانەی لەترسی (سزای) پەروەردگاریان هەمیشە دەترسن. ٥٧)﴿وَالَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾ وە ئەو کەسانەش کە بەئایەتەکانی پەروەردگاریان باوەڕ دێنن. ٥٨)﴿وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ﴾ وە ئەو کەسانەش کەهاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن. ٥٩)

وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا۟ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَهُمْ لَهَا سَـٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَـٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِى غَمْرَةٍ مِّنْ هَـٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَـٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَـٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَـٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَـٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَـٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَـٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾

**-دەشتەکی پێی گەیشت و زۆر** بەتوندی بەبوردەکەی ڕایکێشا، **و منیش سەیری شان و** ملیم کرد قەراغی بوردەکە **سوری** کردبۆیەوە **بەهۆی** توند ڕاکێشانی بوردەکەوە **پاشان** عەرەبە **دەشتەکی** یەکە ووتی: ئەی موحەممەد(ﷺ)، **فەرمان بکە** بەشم **بدەن لەو ماڵەی خوا کەلاتە، پێغەمبەریش** (ﷺ) **لای کردەوە بەلایدا و پێکەنی ئەوجا فەرمانی دا ماڵی پێ بدەن).**

**ئایەتی ( ٩٨ ) سورەتی ( الحجر ):** قال ثوبان قال رسول الله (ﷺ): (عليك بكثرة السجود فإنك لن **تسجد لله سجدة** إلا رفعك الله بها درجة وحط عنك بها خطيئة) (رواه مسلم). ئەوبان دەڵێ: **پێغەمبەری** خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوژدەی زۆربەرە، چونکە تۆ هەر سوژدەیەك ببەیت بۆ خوا **بەهۆیەوە خوا پلەیەك** بەرزت دەکاتەوە و گوناهێکت لەسەر لا دەبات).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾

**-موسلیم له جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە گێڕاویتیەوە و دەڵێت عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی دوو کەنیزەکی هەبوو ناویان موسەیکە و ئومەیمە بوو ئەوی لێ دەکردن بۆ لەش فرۆشی جا هەردووکیان شکاتی خۆیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیتر خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند** ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥٥) سورەتی (النور):** ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ .....﴾ حاكيم و طەبەرانی لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە کەدەڵێ: کاتێك کەپێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی هاتن بۆ مەدینە ئەنصاریەکان جێگەیان کردنەوە، هەموو عەرەب بوون بەدوژمنیان و لێیان هەستان، پێغەمبەر(ﷺ) و یارانیشی شەوو ڕۆژ لەئامادە باشیدا بوون و چەکیان پێ بوو دەیان ووت: ئاخۆ ڕۆژێك بێت ئێمە بەدڵنیایی بخەوین و لەخوا نەبێت -

## سورەتی ﴿ الشعراء ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿طسٓمٓ﴾ بە (طا، سین، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە. ١)﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ ئەم (سورەتە) لەئایەتەکانی قورئانی ڕوونکەرەوەیە. ٢)﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ﴾ خەریکە خۆت لەناو دەبەی (دەکوژی) بەخەفەت ﴿أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ لەبەر ئەوە ئەوان (خەڵکی مەککە) باوەڕ ناهێنن. ٣) ﴿إِن نَّشَأْ﴾ ئەگەر بمانەوێت ﴿نُنَزِّلْ عَلَيْهِم﴾ دێنینە خوارەوە بۆیان ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً﴾ نیشانەو بەڵگەیەك لەئاسمانەوە ﴿فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ﴾ کەبەردەوام گەردنیانی بۆ دانەوێنن (ناچاریان بکات باوەڕ بێنن). ٤)﴿وَمَا يَأْتِيهِم﴾ هەر بێت بۆیان ﴿مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ﴾ پەیامێکی تازە دابەزێنراو (کەقورئانە) لەخوای میهرەبانەوە ﴿إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾ ئەوان بەردەوام پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن لێی. ٥)﴿فَقَدْ كَذَّبُوا۟﴾ جا بێگومان ئەوانە بەدرۆیان زانیو باوەڕیان پێ نەکرد (ئەوەی ناردبومان) ﴿فَسَيَأْتِيهِمْ﴾ جا بەزوویی بۆیان دێت ﴿أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ هەواڵەکانی ئەوەی ئەوان گاڵتەو لاقرتییان پێ دەکرد. ٦)﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا سەیری زەوی ناکەن ﴿كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا﴾ چەندمان ڕواندووە تیایدا ﴿مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ لەهەموو جۆرێکی چاکی بەکەڵك. ٧)﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بەڕاستی لەڕواندنی ئەو هەموو ڕووەکەدا بەڵگەی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆر بەیان بڕوادارنین و باوەڕ ناهێنن. ٨)﴿وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ بێگومان پەروەردگارت ﴿لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ تەنها ئەو خاوەن دەسەڵاتی بەزەیی دارە. ٩)﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ﴾ (باس بکە) ئەو کاتەی پەروەردگارت بانگی مووسای کرد ﴿أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە (بەپێغەمبەری) بڕۆ بۆ لای ئەو گەلە ستەمکارە. ١٠) ﴿قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾ کە گەلەکەی فیرعەونە ﴿أَلَا يَتَّقُونَ﴾ ئایا ئەوان ناترسن (بێ فەرمانی خوادەکەن). ١١)﴿قَالَ رَبِّ﴾ (مووسا) ووتی ئەی پەروەردگارم ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ بەڕاستی من دەترسم بڕوام پێ نەکەن. ١٢)﴿وَيَضِيقُ صَدْرِى﴾ وەسینگم (دڵم) تەنگ ببێ ﴿وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى﴾ وە(دەترسم) بەچاکی قسەم بۆ نەکرێو زمانم بەر نەبێ (لەو گرێیەی هەیەتی) ﴿فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ﴾ کەواتە (خوایە جوبرەئیل) بنێرە بۆ لای هاروون (و بیکە بەپێغەمبەر بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات). ١٣)﴿وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ﴾ وەئەوان (گەلی فیرعەون) تۆڵەی تاوانێکیان لەسەرمە ﴿فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴾ بۆیە دەترسم کەبمکوژن (لەجیاتی ئەو کوژراوە). ١٤)﴿قَالَ كَلَّا﴾ (خوا) فەرمووی نەخێر (ئەوەی باست کرد هیچی ڕوونادات) ﴿فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ کەواتە هەردووکتان بەموعجیزەکانمانەوە بڕۆن (بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی) ﴿إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ﴾ ئێمە لەگەڵتان گوێ دەگرین. ١٥) ﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ﴾ ئەوسا بڕۆنە لای فیرعەونو هەردووکتان بڵێن ﴿إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانین. ١٦)﴿أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ (نێراوین) کەتۆ نەوەی ئیسرائیل (لەژێر دەستەی خۆت) بەرەڵا کەیت لەگەڵ ئێمەدا (بڕۆین بۆ شام). ١٧)﴿قَالَ﴾ (فیرعەون) ووتی ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا﴾ ئایا ئێمە پێمان نەگەیاندی لەناو (ماڵی) خۆماندا بەمنداڵی ﴿وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ وە تۆ چەند ساڵێك لەتەمەنت لەناو ئێمەدا نەمایتەوە. ١٨)﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ﴾ وە ئەو کردەوە (خراپە)ش کرد کەکردت (کوشتنی قیبتی یەك) ﴿وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە تۆ لەوانەی سپڵەو ناشوکرن. ١٩)

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾

- لەکەس نەترسین ئیتر ئایەتی ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ دابەزی.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦١) سورەتی (النور): ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ ....﴾**

ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لەعائیشەوە کەدەڵێ: موسوڵمانەکان حەزیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەرچن بۆ غەزا جا کلیلەکانیان دەدایە دەست کەسانێکی نەخۆشی کەوتوو لەجێگادا پێیان دەووتن: گەردنتان ئازاد بێت حەزتان لەهەرچی بوو بیخۆن بەڵام ئەوان دەیان ووت حەڵاڵ نی یە بۆمان لێی بخۆین چونکە ئەو رێگە پێدانە بەئێمە لەدڵەوە پێیان خۆش نی یە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ﴾ دابەزاند تا گەیشتە ﴿أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُ﴾.

﴿قَالَ فَعَلْتُهَآ﴾ (مووسا) ووتی ئەوکارەم کرد (ئەو پیاوەم کوشت) ﴿إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ کاتێ کەمن لەڕێزی نەزاناندا بووم. ٢٠) ﴿فَفَرَرْتُ مِنكُمْ﴾ ئینجا رام کردو هەڵهاتم لەئێوە ﴿لَمَّا خِفْتُكُمْ﴾ کاتێ ترسام لێتان (تۆڵەم لێ بسەنن) ﴿فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا﴾ ئەوسا پەروەردگارم حیکمەتی (پێغەمبەریەتی) پێ بەخشیم ﴿وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ منی خستە ریزی پێغەمبەرانەوە (کردمی بەپێغەمبەر). ٢١) ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ﴾ وە ئەو (بەخێو کردنە) کە تۆ دەیکەیت بەمنەت بەسەرمەوە ﴿أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بووە کەتۆ نەوەی ئیسرائیلت کردبووە کۆیلە و ژێردەستەی خۆت (لەترسا ملیکی مووسا مووسای بەخێو نەکرد). ٢٢) ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (ئینجا) فیرعەون ووتی پەروەردگاری جیهانیان کێ یە. ٢٣) ﴿قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ (مووسا) ووتی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیان دایە ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە دڵنیان. ٢٤) ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ﴾ (فیرعەون) ووتی بەوانەی بەدەوری دا بوون (لەشوێنکەوتوانی) ﴿أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴾ ئایا گوێتان لێیە (چی دەڵێ). ٢٥) ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ (مووسا) ووتی پەرەوەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوکو باپیرە پێشووەکانتانە. ٢٦) ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ﴾ (فیرعەون) ووتی بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە کەنێرراوە بۆ ئێوە ﴿لَمَجْنُونٌ﴾ شێتە. ٢٧) ﴿قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ (مووسا) ووتی پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژ ئاوایەو ئەوەی لەنێوانیادایە ﴿إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بیربکەنەوەو ژیرین. ٢٨) ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى﴾ (فیرعەون) ووتی سوێندبێ ئەگەر پەرستراوێ تر جگە لەمن دابنێیت ﴿لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾ بێگومان دەتخەمە ریزی بەندکراوەکانەوەو زینندانت دەکەم. ٢٩) ﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ﴾ (مووسا) ووتی ئایا هەر زیندانم دەکەیت ئەگەر شتێکی (موعجیزەیەکی) ڕوون و ئاشکرات بۆ بێنم (کەڕاستە پێغەمبەرم). ٣٠) ﴿قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ﴾ (فیرعەون) ووتی دەی ئەو شتە بێنە (بینوێنە) ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانی. ٣١) ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ﴾ ئینجا مووسا گۆچانەکەی فڕێدا ﴿فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾ دەست بەجێ بوو بەئەژدیهایەکی دیارو ئاشکرا. ٣٢) ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ﴾ وە دەستی دەرهێنا (لەبن باڵیدا) ﴿فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴾ یەکسەر دەستی سپیو پرشنگدار بوو بۆ بینەران. ٣٣) ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ﴾ (فیرعەون) ووتی بەو پیاوە گەورانەی لەدەورەی بوون ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان ئەمە جادووگەرێکی زۆر زانایە. ٣٤) ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم﴾ دەیەوێ دەرتان بکات ﴿مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ﴾ لەووڵاتو خاکی خۆتان بەجادووەکەی ﴿فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ جا فەرمانی چی دەدەن (لەدژی بیکەم). ٣٥) ﴿قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ ووتیان جارێ مووسا و براکەی وازی لێ بێنە (دوایخە) ﴿وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴾ پیاوانی کۆکەرەوە بۆ هەموو شارەکان بنێرە. ٣٦) ﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ﴾ هەموو جادوو گەرێکی زۆر زانات بۆ بێنن. ٣٧) ﴿فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ ئینجا ئەو جادووگەرانە کۆکرانەوە ﴿لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ لەکات و ڕۆژی دیاری کراودا. ٣٨) ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ﴾ و بەخەڵکیش ووترا ئێوەش کۆدەبنەوە؟ ٣٩)

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦٨) سورەتی (الفرقان): ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ بوخاری دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە (ﷺ) دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان پرسیاری لێ کرا: کام تاوانێک زۆر گەورەیە لای خوای گەورە؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دابنێیت لە کاتێکدا ئەو دروستی کردوویت، ووتم ئەی پاش ئەوە چی تر؟

فەرمووی: داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەتدا ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ڕاستی ووتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٧٠) سورەتی (الفرقان): ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ بوخاری دەگێڕێتەوە و دەڵێت سەعیدی کوڕی جوبەیر ووتی:-

﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ﴾ تا شوێن جادووگەران بکەوین ﴿إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾ ئەگەر ئەوان زاڵ و سەرکەوتوو بوون. ٤٠) ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ ئینجا کاتێ جادووگەرەکان هاتن ﴿قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ﴾ ووتیان بەفیرعەون ﴿أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا﴾ ئایا بەڕاستی پاداشتمان هەیە ﴿إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾ ئەگەر ئێمە زاڵ و سەرکەوتوو بین. ٤١) ﴿قَالَ نَعَمْ﴾ (فیرعەون) ووتی بەڵێ ﴿وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ وەبێگومان ئێوە ئەو کاتە لەنزیکانی خۆم دەبن. ٤٢) ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ﴾ مووسا بەساحیرەکانی ووت ﴿أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ بیهاوێژن ئەوەی ئێوە هاوێژەریانن (لەجادوو). ٤٣) ﴿فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ ئەوانیش گوریس و حەبل و دار دەستەکانیان فڕێدا ﴿وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ﴾ وە ووتیان سوێند بەگەورەیی فیرعەون ﴿إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ بەڕاستی هەر ئێمە زاڵ و سەرکەوتووین. ٤٤) ﴿فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ﴾ ئینجا مووسا داردەستەکەی فڕێدا (و بوو بەمارێکی گەورە) ﴿فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ جا کوت و پڕ ئەو (مارە گەورە) هەرچی جادوویان کردبوو هەڵی لوشی. ٤٥) ﴿فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ﴾ ئینجا جادوو گەرەکان خران (کەوتن) بەڕوودا بەسوژدە بردنەوە (بۆ خوا). ٤٦) ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ووتیان ئەوا باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری جیهانیان. ٤٧) ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ کەپەروەردگاری مووسا و هاروونە. ٤٨) ﴿قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ﴾ (فیرعەون) ووتی ئایا باوەڕتان پێ هێنا ﴿قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ بەڕاستی ئەو (مووسا) جادوو گەرە گەورەکەتانەکە فێری جادووی کردون ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ جا بێگومان لەمەودوا دەزانن (چیتان لێ دەکەم) ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ﴾ بەڕاستی دەست و قاچتان ڕاست و چەپ دەبڕم ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ وە بێگومان هەمووتان هەڵ دەواسم (بەدارا). ٤٩) ﴿قَالُواْ لَا ضَيْرَ﴾ (جادووگەرەکان) ووتیان هیچ زیانی نی یە (بۆ ئێمە ئەوەی تۆ ئەتەوێ بیکەی) ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ (چونکە) بەڕاستی ئێمە گەڕانەوەمان بۆ لای پەروەردگارمانە. ٥٠) ﴿إِنَّا نَطْمَعُ﴾ بەڕاستی ئێمە بەتەماین و ئومێد دەکەین ﴿أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ﴾ کەپەروەردگارمان لە گوناهو تاوانەکانمان ببورێ ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ چونکە ئێمە یەکەمی باوەڕداران بووین (لەگەلەکەماندا). ٥١) ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ وەحیمان نارد بۆ مووسا ﴿أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ﴾ کەبەشەو بەندە (باوەڕدارە)کانم ببە(و میصر بەجێ بێڵن) ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ بێگومان (فیرعەون و کۆمەڵەکەی) دواتان دەکەون. ٥٢) ﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ﴾ ئەوسا فیرعەون پیاوانی کۆ کەرەوەی نارد بەشارەکاندا (بۆکۆ کردنەوە لەشکرو هێز). ٥٣) ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ (فیرعەون ووتی) بەڕاستی ئەوانە (مووسا و شوێن کەوتوانی) کۆمەڵێکی کەمی بێ نرخن. ٥٤) ﴿وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ﴾ وە بەڕاستی ئەوانە رقی ئێمە هەڵدەستێنن (بەووتارو کرداریان). ٥٥) ﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە کۆمەڵێکین بێدارین و ئاگادارین (بەپیلانەکانیان). ٥٦) ﴿فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ ئینجا ئەوان (فیرعەون و کۆمەڵەکەی)مان دەرکرد لە باخات و کانیاوەکان. ٥٧) ﴿وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ وە (دەرمان کردن) لەو هەموو گەنج و غەزنە و کۆشکە زۆر جوان و چاکانە. ٥٨) ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئا بەو جۆرە (لەناومان بردن) ﴿وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ نەوەکانی یەعقوب (جوولەکە)مان لەجێگایان دانا. ٥٩) ﴿فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ﴾ ئینجا (فیرعەون و لەشکرەکەی) کاتێ خۆر هەڵهاتن شوێنیان کەوتن. ٦٠)

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾

-عەبدورەحمانی کوڕی ئەبزا پێی وتم: (پرسیار بکە لە عەبدوللای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهما) دەربارەی ئەم دوو ئایەتە ئایا مەبەست پێیان چی یە) ئایەتی ﴿ولا تقتلوا النفس التي حرم الله إلا بالحق﴾ و ئایەتی ﴿ومن يقتل مؤمناً متعمداً﴾ دەڵێت: منیش پرسیارم کرد لەعەبدوللای کوڕی عەبباس و ئەویش وتی: کاتێک ئایەتەکەی سورەتی (الفرقان) دابەزی کافرەکانی مەککە وتیان: ئێمە خەڵکانێکمان بە ناڕەوا کوشتووە وە لەگەڵ خوادا پەرستراوی ترمان پەرستووەو داوێن پیسی شمان ئەنجام داوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿إلا من تاب﴾ بەڵام ئەو ئایەتەی کە لە سورەتی (النساء) دایە کاتێک کەسێک ئایینی ئیسلامی ناسی و پاشان بە ناڕەوا کەسێکی کوشت ئەوە پاداشتی ئەو کەسە ئاگری دۆزەخە و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، دەڵێت منیش ئەمەم گێڕایەوە بۆ موجاهید ئەویش وتی: وایە مەگەر کەسێک کەپەشیمان بێتەوە.

﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ئینجا کاتێ دوو کۆمەڵەکە چاویان بەیەکتر کەوت ﴿قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ﴾ هاوەڵەکانی مووسا ووتیان ﴿إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ﴾ بێگومان ئێمە گیراوین، (پێمان دەگەن). ٦١) ﴿قَالَ كَلَّآ﴾ (مووسا) ووتی نەخێر پێتان ناگەن ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ﴾ بێگومان من پەروەردگارم لەگەڵە دڵنیابن ڕێگای (ڕزگار بوونم) نیشان دەدات. ٦٢) ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ ئینجا سرووشمان کرد بۆ مووسا ﴿أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَ﴾ کە بە گۆچانەکەت بدە لەدەریاکە ﴿فَٱنفَلَقَ﴾ (ئەویش لێیداو) جا دەریاکە لەت بوو ﴿فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ کە هەر لەتێکی وەك شاخێکی زۆر گەورە وابوو. ٦٣) ﴿وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ وە ئەوانی تر (فیرعەون و لەشکرەکەی)مان نزیك کردەوە لەوێ (دەریاکە). ٦٤) ﴿وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ﴾ جا مووساو هەموو ئەوانەی لەگەڵی بوون ڕزگارمان کردن. ٦٥) ﴿ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانی ترمان نوقم کرد (لەدەریادا). ٦٦) ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کەباسکرا) بەڵگەیەکی گەورە هەیە (لەسەر دەسەڵاتی خوا) ﴿وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەهێنا. ٦٧) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت زاڵو بەبەزەیی یە. ٦٨) ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بخوێنەرەوە بەسەریاندا هەواڵی ئیبراهیم ٦٩) ﴿إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ﴾ کاتێ ووتی بەباوکی و گەلەکەی ﴿مَا تَعۡبُدُونَ﴾ چی دەپەرستن. ٧٠) ﴿قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا﴾ ووتیان بتانێك دەپەرستین ﴿فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ﴾ ئینجا بەردەوام بەندایەتیان دەکەین. ٧١) ﴿قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ئایا ئەوانە گوێیان لێتانە ﴿إِذۡ تَدۡعُونَ﴾ کاتێ هاوار ونزایان لێ دەکەن. ٧٢) ﴿أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ﴾ یا ئایا ئەوان سوود یازیانتان پێ دەگەیەنن. ٧٣) ﴿قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا﴾ ووتیان (نەخێر هیچیان پێ ناکرێ) بەڵکو ئێمە باوو باپیرانمان دیوە ﴿كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾ ئابەو شێوە(ی ئێمە) یان کردووە. ٧٤) ﴿قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ﴾ ووتی ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن. ٧٥) ﴿أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ﴾ ئێوەو باوو باپیرە پێشووەکانتان. ٧٦) ﴿فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ﴾ جا بەڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن ﴿إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ جگە لەپەروەردگاری جیهانیان. ٧٧) ﴿ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ﴾ کە ئەو منی دروست کردووە پاشان هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات. ٧٨) ﴿وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ﴾ وە هەر ئەو زاتە خۆراکم پێدەدات و تێراوم دەکات. ٧٩) ﴿وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ﴾ وە کاتێ نەخۆش بکەوم هەر ئەو شیفام دەدات (چاکم دەکاتەوە). ٨٠) ﴿وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ﴾ وە زاتێکە کەمن دەمرێنێ و پاشان زیندووم دەکاتەوە. ٨١) ﴿وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ﴾ وە (پەروەردگارم) زاتێکە بەتەماو ئومێد دەکەم ﴿أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ﴾ لە ڕۆژی پاداشت دا (قیامەتدا) ببورێ لەهەڵەکانم و بیانسڕێتەوە. ٨٢) ﴿رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا﴾ ئەی پەروەردگارم دانایم پێ ببەخشە ﴿وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بمبەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە. ٨٣)

وَٱجْعَل لِّى لِسَانَ صِدْقٍ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِى مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾

-كرد بێت خوای گەورە چوونە بەهەشتی لێ قەدەغە دەكات).

**ئایەتی (٩٢) سورەتی (النحل):** قالت عائشة (رضي الله عنها): (كان النبي: (ﷺ): أحب الدين إليه ما دوم عليه صاحبه) (رواه البخاري). عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (خۆشەویسترین ئیندارى و عیبادەت بەلای پێغەمبەرەوە ئەو ئیندارى یە بوو خاوەنەكەی لەسەری بەردەوام بێت).

**ئایەتی (١٢٨) سورەتی (النحل):** قال رسول الله(ﷺ): (أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقاً، وخياركم خياركم لنسائهم)(رواه الترمذي) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تەواوترینی باوەڕداران لە ئیمانا چاكترینیانە لەڕەوشت دا وە چاكترینتان چاكترینتانە بۆ خێزانەكانیان).

**ئایەتی (١٨) سورەتی (الاسراء):** قال عبد الله بن مسعود (نام رسول الله (ﷺ) على حصير، فقام وقد-

﴿وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ﴾ وە باس کردنم بەچاکە لەناوگەلە داهاتووەکاندا پێ ببەخشە. ٨٤)﴿وَٱجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ﴾ وە بم کێڕە لەوەرگرانی بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت. ٨٥)﴿وَٱغْفِرْ لِأَبِيٓ﴾ وە لەباوکم خۆش ببە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ بەڕاستی ئەو لەگومڕایانە. ٨٦) ﴿وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾ وە شەرمەزارو ڕیسوام مەکە لەڕۆژێکدا کە(خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە. ٨٧)﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ﴾ ڕۆژێ کەماڵ و سامان و منداڵ و نەوە سوود ناگەیەنن. ٨٨) ﴿إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ بێجگە لەکەسێ بێتە خزمەتی خوا بەدڵێکی ساغ و پاك و خاوێنەوە. ٨٩) ﴿وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ وە (لەڕۆژی دواییدا) بەهەشت نزیك دەخرێتەوە بۆ پارێزکاران و لەخوا ترسان. ٩٠) ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ دۆزەخیش دەردەخرێت (و ئاشکرا دەکرێ) بۆ گومڕایان. ٩١) ﴿وَقِيلَ لَهُمْ﴾ وە پێیان دەوترێت ﴿أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ﴾ کوان ئەوانەی کەئێوە دەتان پەرستن. ٩٢) ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لەجیاتی خوا ﴿هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ﴾ ئایا یارمەتیتان دەدەن یا یارمەتی خۆیان دەدەن. ٩٣)﴿فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ﴾ ئینجا هەموو ئەوانە (پەرستراوان) و گومڕایان سەر بەرو خوار فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە. ٩٤)﴿وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ﴾ هەروەها هەموو سەربازانی شەیتان. ٩٥) ﴿قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ﴾ (بت پەرستان) لەکاتێکدا لەدۆزەخ دا شەڕە قسەو ئاژاوەیانە (لەگەڵ پەرستراوەکانیان دا) دەڵێن. ٩٦) ﴿تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ سوێند بەخوا ئێمە لەگومڕایی یەکی ئاشکرادا بووین. ٩٧) ﴿إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ کاتێك ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوە. ٩٨) ﴿وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ کەس ئێمەی گومڕا نەکرد تاوانباران نەبێت. ٩٩)﴿فَمَا لَنَا مِن شَـٰفِعِينَ﴾ وەهیچ تکاکارێ بۆ ئێمە نی یە. ١٠٠) ﴿وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ وە هیچ هاوڕێیەکی دڵسۆزمان نیە. ١٠١) ﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً﴾ خۆزگە جارێکی تر بگەڕاینایەتەوە (بۆ دنیا) ﴿فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوسا لەباوەڕداران دەبووین. ١٠٢) ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً﴾ بەڕاستی لەوەدا (باسکرا) پەندو بەڵگە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. ١٠٣) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر پەروەردگارت زاڵ و میهرەبانە. ١٠٤) ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی نووح(ﷺ) پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا (بڕوایان پێ نەکردن). ١٠٥)﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ﴾ کاتێ کەنووحی برایان پێی وتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا ناترسن لەخوا (خۆتان ناپارێزن). ١٠٦) ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆئێوە. ١٠٧)﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی من بکەن. ١٠٨) ﴿وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وە من داوای هیچ کرێیەکتان لێ ناکەم لەسەر ئەو (ڕێنموونیی کردنەتان) ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ (چونکە) پاداشتی من تەنها لەسەر پەروەردگاری جیهانیانە. ١٠٩) ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١١٠) ﴿قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ﴾ ووتیان ئایا (چۆن) باوەڕ بەتۆ بێنین ﴿وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ﴾ لەکاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتون پەسترین کەسن (هەژارو داماو نەفامن). ١١١)

قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي
لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ
﴿١١٥﴾ قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ
رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن
مَّعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ
﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ
أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتْ
عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ
آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾
وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾
وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾
وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ
﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ ﴿١٣٦﴾

- أثر في جنبه قلنا: يارسول الله، لو اتخذنا لك وطاءً؟ فقال: (مالي و للدنيا؟ ما أنا إلا كراكب استظل تحت شجرة ثم راح وتركها)(رواه الترمذي). عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر حەسیرێك خەوتبوو، پاشان لەخەو هەستا و شوێنی قامیش و داری حەسیرەکە بەتەنیشتیەوە دیار بوو، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا، خۆزگە زۆر خەریکی ئەرمان بۆ دانایتایە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: (من چیم لەدونیادایە-من دونیام بۆچی یە؟ من لەدونیادا تەنها وەك وڵاخ سوارێك وام (لەبەر گەرما) چوومەتە سێبەری درەختێك و پاش ماوەیەك بڕۆم و بەجێی بێڵم).

ئایەتی (٣٤) سورەتی (الاسراء): قال رسول الله (ﷺ): (إن أشرّ الناس عند الله منزلة يوم القيامة الرجل يفضي إلى المرأة و تفضي إليه ثم ينشر سرّها)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:-

﴿قَالَ وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ (نووح (ﷺ)) ووتی من چووزانم ئەوانە چی کردەوەیەك دەکەن. ١١٢) ﴿إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّى﴾ پرسینەوەیان تەنها لەسەر پەروەردگارمە ﴿لَوْ تَشْعُرُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەست بکەن (بزانن). ١١٣) ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ و من دەر کەری باوەڕداران نیم. ١١٤) ﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون کەرەوەم. ١١٥) ﴿قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ﴾ ووتیان ئەی نووح ئەگەر کۆتایی نەهێنی (لەم کاری بانگەوازەت) ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ﴾ بێگومان لەبەرد باران کراوان دەبی. ١١٦) ﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ﴾ (نووح) ووتی: ئەی پەروەردگارم بێ گومان گەلەکەم بڕوایان پێ نەکردم. ١١٧) ﴿فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا﴾ کەواتە لەنێوان من و ئەواندا حوکم بدە بەحوکم دانێکی یەکجاری ﴿وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ و من و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگار بکە. ١١٨) ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ﴾ ئێمەش نووح و ئەو کەسانەی لەگەڵی بوو ڕزگارمان کردن (لەخنکان) ﴿فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾ لەو کەشتی یەی کەپڕ کراو بوو (لەمرۆڤ و هەموو جۆرە گیاندارێك). ١١٩) ﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ﴾ لەپاشان لەدوا (ڕزگار کردنی ئیمانداران) ئەوانەی کەمانەوە نوقممان کردن (لە ئاوی تۆفانەکەدا). ١٢٠) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بەڕاستی لەوەدا (باسکرا) بەڵگەیەکی گەورەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. ١٢١) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە بەڕاستی هەر پەروەردگارت زاڵی بەبەزەییە. ١٢٢) ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی عاد پێغەمبەرانی (خوا)یان بە درۆزن دانا (باوەڕیان پێ نەکردن). ١٢٣) ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ﴾ کاتێ هوود(ﷺ)ی برایان پێی ووتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا خۆتان ناپارێزن (لەسزای خوا). ١٢٤) ﴿إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە. ١٢٥) ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١٢٦) ﴿وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وە من هیچ کرێیەك لەئێوە داوا ناکەم لەسەر ئەم (گەیاندنی بانگەوازە) ﴿إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پاداشتی من تەنها لای پەروەردگاری جیهانیانە. ١٢٧) ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ﴾ ئایا ئێوە لەهەموو شوێنێکی بەرز(ی سەرەڕێگا) بورجێك دروست دەکەن بەبێ هوودە. ١٢٨) ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ﴾ وە چەند کۆشك و قەڵای بەهێز (کارگە) دروست دەکەن ﴿لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾ بەو ئومێدەی هەر بمێننەوەو نەمرن. ١٢٩) ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم﴾ وە هەر کاتێ دەست بوە شێنن ﴿بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾ ستەمکارانە دەس دەوە شێنن. ١٣٠) ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە (لەسزای خوا) خۆتان بپارێزن و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١٣١) ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِىٓ﴾ وە لە(سزای) ئەو خوایە خۆتان بپارێزن ﴿أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ﴾ کەخۆتان دەزانن چی پێ بەخشیون. ١٣٢) ﴿أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ﴾ ئاژەڵ و ماڵات و منداڵ و. ١٣٣) ﴿وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ باخ و کانیاوی زۆری پێ داون. ١٣٤) ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ﴾ بەڕاستی من دەترسم دووچارتان بێ ﴿عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە(ی دژوارو پڕ لەسزا). ١٣٥) ﴿قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ﴾ ووتیان (بەهوود (ﷺ)) لای ئێمە یەکسانە ﴿أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ﴾ ئامۆژگاری بکەیت یا ئامۆژگاری نەکەیت. ١٣٦)

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

-(بەڕاستی لەو کەسانەی کە لە ڕۆژی دوایی دا لای خوا خراپترین پلەیان هەیە پیاوێکە لەگەڵ خێزانیدا دروست بێ پاشان نهێنی ئافرەتەکە ئاشکرا بکات و باسی بکات بۆ خەلکی).

**ئایەتی (٣٦) سورەتی (الاسراء)**: قال النبي (ﷺ): (**إن** العبد ليتكلم بالكلمة ما يتبين فيها يزل بها إلى النار أبعد ما بين المشرق و المغرب) (متفق عليه). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان مرۆڤ ووتەیەك دەڵێ بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە بە هۆیەوە بەئەندازەی دووری نێوانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا زیاتر دەچێتە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخ).

**ئایەتی (٧٩) سورەتی (الاسراء)**: قالت عائشة (رضي الله عنها): (كان النبي (ﷺ) يقوم في الليل حتى **تتفطر** قدماه فقلت له : لم تصنع هذا يا رسول الله ، وقد غفر لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر ؟ قال: أفلا-

﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە(ی تۆ هێناوتە) تەنها درۆو دەلەسەی پێشینانە. ١٣٧)﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ وە ئێمە سزا نادرێین. ١٣٨) ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ﴾ ئیتر باوەڕیان پێ نەهێنا بۆیە ئێمەش لەناومان بردن ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بێگومان لەوەدا (باسکرا) نیشانەی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆر بەیان باوەڕدار نەبوون. ١٣٩)﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر پەروەردگارت بەدەسەڵات و بەبەزەیی یە. ١٤٠)﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی سەموود پێغەمبەرانیان بەدرۆزن زانی. ١٤١) ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ﴾ کاتێ صالحی(عليه السلام) برایان پێی ووتن ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئایا (لەسزای خوا) خۆتان ناپارێزن ١٤٢) ﴿إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆتان. ١٤٣) ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ دەی لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١٤٤)﴿وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ و من هیچ کرێ و پاداشتێك لەسەر ئەم (پێغەمبەرێتی یە) لەئێوە داوا ناکەم ﴿إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ کرێ و پاداشتی من تەنها لای پەروەردگاری جیهانیانە. ١٤٥)﴿أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ﴾ (وا دەزانن) وازتان لێ دەهێنرێ لەدنیادا بەهێمنی (دەژین). ١٤٦)﴿فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ لەناو باخات و کانیاوی زۆردا. ١٤٧)﴿وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾ وە لەناو کشتوکاڵی زۆرو باخاتی دار خورمای میوە گەییودا. ١٤٨)﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ﴾وە لەچیاکان دا خانوو دادەتاشن زۆر بەلێزانانە. ١٤٩)﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لە(سزای) خوا بترسن و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١٥٠)﴿ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ وە گوێ ڕایەڵی زیادە ڕەوان مەکەن. ١٥١)﴿ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوانەی خراپەکاری دەکەن لەزەوی دا ﴿وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ وە کردەوەی چاك ناکەن. ١٥٢)﴿قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ﴾ ووتیان (بەصالح(عليه السلام)) تۆ تەنها یەکێکی لە جادوو لێکراوان. ١٥٣) ﴿مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ تۆ تەنها مرۆڤێکی وەك ئێمە ﴿فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ دەی ئایەت و موعجیزەیەکمان بۆ بێنە ئەگەر لەڕاست گۆیانی. ١٥٤) ﴿قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ﴾ (صالح (عليه السلام)) ووتی ئەم وشترە مێینە (موعجیزە)یە ﴿لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ ئاو خواردنەوە ڕۆژێك بۆ ئەوەو ڕۆژێکیش بۆ ئێوەیە. ١٥٥) ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾ دەستی بۆ مەبەن بەخراپە ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئەگینا سزای تۆڵەی ڕۆژێکی گەورە تووشتان دێت. ١٥٦)﴿فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ﴾ کەچی ئەوان سەریان بڕی ئەوسا پەشیمان بوونەوە (لەترسی تۆڵەی خوا). ١٥٧)﴿فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ ئینجا سزای تۆڵە ئەوانی گرت ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڕاستی لەمەدا (باسکرا) نیشانەیەکی گەورە هەیە بەڵام زۆر بەیان باوەڕدار نەبوون. ١٥٨) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بێگومان پەروەردگارت زاڵ و بەبەزەیی یە. ١٥٩)

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾

**- أكون عبداً شكوراً)(متفق عليه)**. عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە شەونوێژی دەکرد تا هەردوو پێی ئاوسا بوون، منیش پێم ووت: بۆچی ئاوا دەکەیت و خۆت ماندوو دەکەیت، لە کاتێکدا خوا لە گوناهەکانی پێشوو و پاشت خۆش بووە، فەرمووی: دەی منیش بەندەیەکی سوپاس گوزار نەبم؟).

**ئایەتی (١٠٩) سورەتی (الاسراء)** : قال رسول الله(ﷺ) (ليس شيء أحب إلى الله تعالى من قطرتين و **أثرين : قطرة من دموع في** خشية الله، و قطرة دم تهراق في سبيل الله ، وأما الأثران فأثر في سبيل الله تعالى، **وأثر** في فريضة من فرائض الله تعالى)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (هیچ شتێك لای خوا خۆشەویستر نی یە لە دوو دڵۆپ و دوو شوێنەواری شوێن پێ ، دڵۆپێ فرمێسك لە چاوو بێت لە ترسی خوا-

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی لووط پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا. ١٦٠)﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ کاتێ لووطی برایان (ﷺ) ووتی پێیان ئایا ئێوە لەخوا ناترسن خۆتانا پارێزن. ١٦١) ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە. ١٦٢)﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن‌و گوێ ڕایەڵی من بکەن. ١٦٣)﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وە من هیچ پاداشتێك لەسەر (پێغەمبەر ێتێکەم) لەئێوە داوا ناکەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاداشتی من تەنها لای پەروەردگای جیهانیانە. ١٦٤)﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ ئایا لەناو (هەموو خەڵکی) جیهانیاندا ئێوە نێر بازی دەکەن. ١٦٥)﴿وَتَذَرُونَ﴾ وە وازدێنن ﴿مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ لەو هاوسەرانەتان کەپەروەردگارتان بۆی دروست کردوون ﴿بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ نەخێر بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن دەرچوو لەسنوری ئارەزوو. ١٦٦)﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ﴾ ووتیان: بەڕاستی ئەی لووط ئەگەر واز نەهێنی (لەم کارەت) ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ﴾ بێگومان لەدەرکراوان دەبیت (لەم خاکە). ١٦٧) ﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ﴾ (لووط) ووتی بێگومان من زۆر قەڵس و بێزارم لەو کردەوەتان (نێربازی). ١٦٨) ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾ ئەی پەروەردگارم خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لە(تۆڵەی) ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن. ١٦٩)﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾ ئینجا ئێمەش لووط و هەموو خێزانەکەیمان ڕزگار کرد. ١٧٠) ﴿إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ﴾ بێجگە لەپیرە ژنێ (خێزانی لووط) کە لەجێماوان (تیاچوان) بوو. ١٧١) ﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانی ترمان لەناو برد. ١٧٢)﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا﴾ وە بارانێکمان (لەبەرد) بەسەریاندا باراند ﴿فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئینجا ئای چ خراپ بوو بارانی ترسێنراوەکان. ١٧٣)﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بەڕاستی لەمەدا (باسکرا) پەندێکی گەورە هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. ١٧٤) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان پەروەردگارت زاڵ و میهرەبانە. ١٧٥) ﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ﴾ خاوەنی باخاتە چڕو پڕەکانیش پێغەمبەرانیان بەدرۆزن دانا. ١٧٦)﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ کاتێ شوعەیب(ﷺ) پێی ووتن: ئایا خۆتان ناپارێزن‌و لەخوا ناترسن. ١٧٧)﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە. ١٧٨)﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەوابوو لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی من بکەن. ١٧٩) ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ وە من هیچ کرێ و پاداشتێ لەئێوە داوا ناکەم لەسەر پێغەمبەرایەتیەکەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاداشتی من تەنها لای پەروەردگای جیهانیانە. ١٨٠)﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ﴾ ڕێك و ڕاست پێوانە بکە ﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ﴾ وە لەزیان دەران مەبن (لەپێوانەدا ناتەواو بیپێون). ١٨١)﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ وە بەتەرازوویەکی ڕاست‌و ڕێك کێشانە بکەن. ١٨٢) ﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ و کەم و کوڕی مەکەن لەشتەکانی خەڵکیدا (هیچ ماڵێکیان زۆر پێ مەخەن) ﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾وە ڕۆمەچن لەزەویدا بەخراپەکاریتان. ١٨٣)

وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ
مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ
ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ
ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ
ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ
مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ
عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾
فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ
فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ
ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟
هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾

- دڵـڕێیی خـوێن بـڕێن لـە ڕێگـەی خوادا ، دوو شوێن پێیەکەش : شوێن پێیـەکیان ئەوەیـە لە جیهاد و ڕێگای خـوا ی گـەورەدا بێـت، شـوێن پێیەکـەی تریـان لەبـەجێ هێنـانی فـــــەرزێک لەفەرزەکانی خوای گەورەدا بێت).

**ئایەتی (١١١) سورەتی (الإسراء):** قـال رسـول الله (ﷺ): (إن الله ليرضـى عـن العبـد يأكل الأكلة فيحمده عليهـا ويـشرب الـشربة فيحمـده عليها)(رواه مسلم).

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوا لەبەندە ڕازی دەبێ بەخواردنێك دەیخوات و سوپاسی خوای لەسەر دەكات و بەخواردنەوەیەك دەیخواتەوەو سوپاسی خوای لەسەر دەكات).

**ئایەتی (٣٠) سورەتی (الكهف):** قال رسول الله (ﷺ): (ما من مسلم يغرس غرساً إلا كان ما **أكل** منه له صدقة **وما** سرق منه له صدقة ولا يرزؤه أحد إلا كان له صدقة)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ)-

﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى﴾ وە بترسن لەو زاتەی ﴿خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ کە ئێوەو خەڵکانی پێشوویشی دروست کردووە. ١٨٤)﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ﴾ ووتیان تۆ تەنها لەجادوو لێ کراوانی. ١٨٥)﴿وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ وە تۆ تەنها مرۆڤێکی وەك ئێمەی ﴿وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ و بەڕاستی ئێمە واگومانت پێ دەبەین لەدرۆزنان بیت. ١٨٦) ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەی چەند پارچەیەك لەئاسمان بخەرە خوارەوە بەسەرماندا ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانی. ١٨٧)﴿قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (شوعەیب) ووتی پەروەردگارم چاك دەزانێ بەهەر کردەوەیەك کەدەیکەن. ١٨٨)﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئینجا شوعەیب یان بەدرۆزن زانی ﴿فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ﴾ بەو هۆیەوە سزای ڕۆژی سێبەر(ی هەور) گرتنی ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بەڕاستی ئەو سزایە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بوو. ١٨٩) ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بێگومان لەمەدا (باسکرا) بەڵگەیەکی بەهێز هەیە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. ١٩٠) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگارت هەر ئەوە زاڵ و بەبەزەییە. ١٩١) ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾و بەڕاستی ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە. ١٩٢)﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴾ جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە. ١٩٣)﴿عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾ بۆ سەردڵی تۆ بۆ ئەوەی لەترسێنەران بی. ١٩٤)﴿بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ﴾ بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان. ١٩٥) ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ وە بەڕاستی (باسی قورئان) لەکتێبی پێغەمبەرە پێشووەکاندا هەیە. ١٩٦)﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً﴾ ئایا ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون نەبوو بۆیان (بۆ کافرانی قورەیش)﴿أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ کەزانایانی بەنی ئیسرائیل ئەو (دەنگ و باسی قورئان)ە دەزانن. ١٩٧)﴿وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ﴾ ئەگەر ئێمە ئەو (قورئانە)مان بناردایەتە خوارەوە بۆ سەر کەسێکی عەجەمی. ١٩٨) ﴿فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم﴾ ئینجا بیخوێنرایەتەوەبەسەریاندا (بۆ باوەڕانی مەککە) ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾ باوەڕیان پێ نەدەهێنا. ١٩٩)﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە ئەو (قورئان)مان خستۆتە ناو دڵی تاوانبارانەوە. ٢٠٠)﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ کەچی هەر باوەڕی پێ ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ هەتا سزای سەخت بەچاوی خۆیان دەبینن (جا باوەڕ دێنن). ٢٠١) ﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئەویش لە ناکاودا دێت بۆیان کەئەوان هەستی پێ ناکەن. ٢٠٢) ﴿فَيَقُولُواْ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ ئەوسا ئەڵێن ئا خۆ مۆڵەتمان پێ دەدرێ. ٢٠٣)﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ دەی ئایا ئەوان پەلەی سزای ئێمەیانە. ٢٠٤)﴿أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ﴾ تۆ پێم بڵێ ئەگەر چەند ساڵێ بەخۆشی بیان ژێنین. ٢٠٥) ﴿ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ لە پاشان ئەو سزایەی کەڵێی ترسێنرا بوون بێت بۆیان. ٢٠٦)

مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ (٢٠٧) وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ (٢٠٨) ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ (٢٠٩) وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ (٢١٠) وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ (٢١١) إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ (٢١٢) فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ (٢١٣) وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ (٢١٤) وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢١٥) فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ (٢١٦) وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ (٢١٧) ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ (٢١٨) وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ (٢١٩) إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (٢٢٠) هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ (٢٢٢) يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ (٢٢٣) وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ (٢٢٤) أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ (٢٢٥) وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ (٢٢٦) إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ (٢٢٧)

## سُورَةُ النَّمْلِ

- فەرمووی: (هەر موسولمانێك درەختێك بنێژێ چی لێ خورا خێرو چاکەیە بۆی وەچی لێ دزرا خێرو چاکەیە بۆی وەهەر کەس لێی کەم کاتەوە -بەخواردن یاهەر شتێکی تر- ئەوەی خێرو چاکەیە بۆی).

**ئایەتی (٤٥) سورەتی (الکهف):** قال رسول الله (ﷺ): (تعس عبد الدينار والدرهم والقطيفة والخميصة، إن أعطي رضي، وإن لم يعط لم يرض)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تیاچوو و دلماوە بەندەی دینار و درهەم -پارەو پول- و بەرگ و پۆشاك، ئەگەر پێی درا ڕازی دەبێت وە ئەگەر پێی نەدرا ناڕازی یەو توڕە دەبێ).

**ئایەتی (٦٦) سورەتی (الکهف):** قال رسول الله (ﷺ): (إنما مثل الجليس الصالح وجليس السوء كحامل المسك ونافخ الكير، فحامل المسك إما أن يحذيك وإما أن تبتاع منه وإما أن تجد ريحاً طيبة ونافخ-

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾

**هـــۆی هاتنــه خـوارەوەی ئایـەتی (٨) ســـورەتی (العنکبـــوت): ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً﴾** موسلیم دەگێڕێتەوە لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە ئەویش لە باوکیـەوە دەڵێـت چـەند ئایـەتێك لەقورئاندا لەسەر من هاتــەخوارەوە، دایکـی سـەعد سوێندی خوارد کەوا هـەرگیز قـسەی لەگەڵ نەکات و نان و ئـاو نـەخوات هـەتاکو پەشـیمان نەبێتــەوە لــەو ئایینەی کە باوەڕی پێ هێناوە، دایکی سەعد وتی بە سەعد تۆ دەڵێیت خوا ئامۆژگاری کردویت کە لەگەڵ دایك و باوکت دا زۆر باش بیت و گوێڕایەڵیان بکەیت، دەی من دایکتم و فەرمانی ئەوەت پێ دەکەم -واز لە ئایینەکەت بێنی- سەعد وتی دایکم سێ ڕۆژ بەو شێوەیە مایەوە لە برسێتی و تینوێتی دا بێ هۆش کەوت ، کوڕێکی تری هەبوو ناوی عەمارە بوو هەستاو هەندێ ئاوی پێ دا و پاشان دەستی کرد بە دوعاکردن لە سەعد ، جا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە-

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾ بێگومان خراپەکانیان دەسڕینەوە لێیان ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بەباشتر لەوەی کەکردوویانە پاداشتیان دەدەینەوە. ٧) ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا﴾ وە فەرمانمان داوە بەئادەمی کەچاکە لەگەڵ دایک و باوکی دا بکات ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى﴾ وە ئەگەر (دایکو باوکت) هەوڵیان لەگەڵ دای بۆ ئەوەی کەهاوبەشم بۆ بڕیار بدەی ﴿مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ کەهیچ زانیارییەکت نی یە دەربارەی ﴿فَلَا تُطِعْهُمَآ﴾ ئەوە بەگوێیان مەکە ﴿إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان (لەدوا ڕۆژدا) ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوسا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی دەتانکرد. ٨) ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە ﴿لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بێگومان دەیانخەینە ڕیزی پیاو چاکانەوە. ٩) ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ هەندێ لەخەڵکی دەڵێن باوەڕمان بەخوا هێناوە ﴿فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ﴾ ئینجا کاتێ سزا بدرێ لەپێناوی خوادا (لەلایەن کافرانەوە) ﴿جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ ئازارو سزای خەڵکی وەکو ئازارو سزای خوا دادەنێ ﴿وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگەر لەلایەن پەروەردگارتەوە سەرکەوتنێک بێت ﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ﴾ دڵنیابە ئەوانە دەڵێن بێگومان ئێمە لەگەڵ ئێوەدا بووین ﴿أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ﴾ ئایا خوا زاناو ئاگادارتر نیە ﴿بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەوەی لەدڵ و دەروونی هەموو کەس دایە. ١٠) ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ سوێند بێ خوا چاک دەزانێ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە کێن ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ وەچاک دەزانێ دووڕوانیش کێن. ١١) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی بێ بڕوابوون وتیان بەوانەی ئیمان دار بوون ﴿ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا﴾ شوێن ڕێگا و ڕێبازی ئێمە بکەون ﴿وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ﴾ و تاوانەکانتان بە ئەستۆی ئێمە ﴿وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ﴾ ئەوانە (بێ بڕوایان) هیچێک لەتاوان و گوناهی ئەوان (باوەڕداران) هەڵناگرن ﴿إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە درۆزنن. ١٢) ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ﴾ سوێند بەخوا (بێباوەڕان) باری گرانی (کوفرو تاوانی) خۆیان هەڵدەگرن ﴿وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ﴾ وەباری گرانی (خەڵکانی) تریش لەگەڵ باری گرانی خۆیان دا (هەڵدەگرن) ﴿وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ وە بەڕاستی لەڕۆژی قیامەت دا پرسیاریان لێ دەکرێ ﴿عَمَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ لەو درۆو دەلەسانەی لەدنیادا هەڵیان دەبەست. ١٣) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ سوێند بەخوا نووحمان نارد بۆلای گەلەکەی (بە پێغەمبەری) ﴿فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا﴾ ئینجا ئەویش مایەوە لەناویان دا نۆسەدو پەنجا ساڵ (هەزار ساڵ پەنجاکەم) ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ لەئاکامدا لافاو زریان لەناوی بردن لەکاتێکدا ئەوان ستەمکار بوون. ١٤)

فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١٩﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٣﴾

- ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئـەڵێت، لەیـەكێك لەغەزاكانـدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەسكەوتێكی زۆری دەستكەوت لەناویدا شمشێرێكی تێدا بوو هـەڵمگرت و هێنـام بـۆ لای پێغەمبـەری خوا(ﷺ) ووتم : ئەم شمشێرەم پـێ بدە چونكە من كەسێكم كەخۆت دەمناسی، فـەرمووی: بیگەڕێنـەرەوە بـۆ ئەو شوێنەی لێت هێناوە، منیش ڕۆشتم بۆ ئەو شوێنەی كە لێم هێنا بوو كاتێك ویستم بیخەمەوە ناو كێلانەكەی نەفسم لۆمەی كردم بۆیە گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتوندی پێ ی فەرمووم: (بیگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێت هێنـاوە)، ئـیتر خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأنفَالِ﴾ سەعد دەڵێت: پاشان نەخۆش كەوتم ناردم بەدوای پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، ئەویش هات بۆ لام ووتم:-

﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾ ئینجا ئەو (نووح)و کەسانێ لەکەشتیەکەدا بوون ڕزگارمان کردن ﴿وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ وە ئەو (کەشتی یە)مان کرد بەنیشانەیەك بۆ جیهانیـان. ١٥)﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ وە (ئـەی موحەممـەد(ﷺ) باسـی) ئیـبراهیم بکـەکاتێ بەگەلەکەی ووت ﴿ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ﴾ خوا بپەرستن ولێ ی بترسن و خۆتانی لێ بپارێزن ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە چاکترە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بزانن. ١٦)﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا﴾ بەڕاسـتی ئێـوە لـەجیاتی خـوا بتانێـك دەپەرسـتن ﴿وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا﴾ وە ئێوە درۆیەکی گـەورە هەڵدەبەسـتن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەئێوە دەیان پەرستن بێجگـە لـەخوا ﴿لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا﴾ ناتوانن ڕسقو ڕۆزی ئێوە بـدەن ﴿فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ﴾ کەواتـە داوای ڕسق و ڕۆزی لەخوا بکەن ﴿وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ﴾ وە ئەو بپەرستن و هەر سوپاسی ئەویش بکە ﴿إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تەنها بۆلای ئەو دەگەڕێنرێنەوە (لەقیامەتدا). ١٧)﴿وَإِن تُكَذِّبُوا۟﴾ وە ئەگەر ئێوە باوەڕ نەهێنن ﴿فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ﴾ ئەوە ئوممەتانی پێش ئێوەش باوەڕیان (بە پێغەمبەرەکانیان) نـەهێنا ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ وە پێغەمبـەر تـەنها ڕاگەیاندی ئاشکراو ڕوونی لەسـەرە. ١٨) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا ئەوانـە سـەرنجیان نـەداوە ﴿كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ﴾ کـە چـۆن خـوا دروسـتکراوان بـەدی دەهێنێـت ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ﴾ لەپاش (نەمان) دەیهێنێتەوە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بێگومان ئەو (زیندوو کردنەوە) بۆ خوا ئاسانە. ١٩) ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵـێ بـڕۆن بگـەڕێن بـەزەوی دا ﴿فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ﴾ و سـەرنج بـدەن کەچـۆن دروسـتکراوەکانی لەسەرەتاوە بەدی هێناوە ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ لەپاشان هەر خوا بەدی هێنـانی دوا ڕۆژیـش بـەدی دێنـێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاسـتی خـوا بەتوانایـە بەسـەر هـەموو شـتێکدا. ٢٠)﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ (خـوا) سـزای هـەر کەسێك دەدات کەبیـەوێ ﴿وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ﴾ وە ڕەحمـیش دەکـات بەهـەر کەسـێ کەبیـەوێ ﴿وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ﴾ وەتـەنها بـۆ لای خـوا دەگەڕێنرێنـەوە. ٢١)﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ وە ئێـوە نـاتوانن لەدەست خوا دەربازبن ﴿فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ نە لەزەوی دا و نـە لەئاسمانـدا ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە بۆ ئێوە نـی یـە جگـە لـەخوا ﴿مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هـیچ دۆسـت و یارمەتی دەرێك. ٢٢)﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ﴾ وە ئەوانـەی کـە بەنیـشانەکانی خواو دیداری باوەڕیان نی یە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يَئِسُوا۟ مِن رَّحْمَتِى﴾ ئائەوانـە لەبـەزەیی مـن (خـوا) نائومێد دەبن ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە ئەوانە سزای سەختیان بۆ هەیە. ٢٣)

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

-رێگەم بدە کەسامانەکەم دابەش بکەم بەویستی خۆم، بەڵام پێغەمبەری خوا نەیهێڵا، ووتم: دەی نیوەیماڵەکەم بەشکەم دەڵێت: هەر نەیهێڵا ووتم: دەبێ سێ یەکی ماڵەکەم بەشکەم بەویستی خۆم دەڵێت بێدەنگ بوو پاش ئەوە ئیتر دروست بوو سێ یەکی ماڵ دابەش کردن بۆ خاوەنەکەی ، سەعد ئەڵێت: هاتم بۆ لای چەند کەسێکی ئەنصاری و کۆچەری ووتیان : وەرە با خواردن و ئارەقت پێ بدەین (پێش ئەوەی ئارەق حەرام بێت) منیش چووم بۆ لایان لەناو باخێکدا بوون ، سەیر دەکەم گۆشتی ووشتریان برژاندووە گۆزەیە ئارەقیان داناوە، ئەڵێت: منیش خواردم و خواردمەوە لەگەڵیاندا باسی ئەنصارو کۆچەریەکانم کرد لایاندا و ووتم: کۆچەریەکان چاکترن لە ئەنصاریەکان ئیتر پیاوێکی ئەنصاری کاکیلەی ووشترەکەی هەڵگرت و کێشای پیاما و لوتم بریندار بوو منیش هاتم بۆ لای-

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟﴾ ئینجا وەڵامی گەلەکەی ئەو (ئیبراهیم) تەنها ئەوە بوو کەووتیان ﴿ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾ (ئیبراهیم) بکوژن یا بیسوتێنن ﴿فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ خواش ئەوی رزگار کرد لەو ئاگرە ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ﴾ بێگومان لەو (ڕزگار کردنی ئیبراهیم)دا ﴿لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ چەند نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێ باوەڕ دەهێنن. ٢٤) ﴿وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم﴾ وە (ئیبراهیم) ووتی بێگومان ئەوەی ئێوە هەڵتان بژاردووە ﴿مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا﴾ لەجیاتی خوا بتانێکن ﴿مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ لەبەر خۆشەویستی نێواتاندا لەژیانی دنیادا (دەیانپەرستن) ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ﴾ لەپاشان لەڕۆژی دوایی دا هەندێکتان بێزاری دەردەبڕن لەهەندێکی ترتان (دان نانێن بەیەکتری دا) ﴿وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ وە نەفرین لەیەکتری دەکەن ﴿وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێگاشتان ئاگری دۆزخە ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾ وە هیچ یارمەتی دەرێکیشتان نی یە. ٢٥)﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ﴾ ئینجا لوط باوەڕی بەو (ئیبراهیم) هێنا ﴿وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾ وە(ئیبراهیم) ووتی بێگومان من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم (لەبابلەوە بۆ شام) ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەراستی تەنها ئەو زاڵی کار دروستە. ٢٦) ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ وە بەخشیمان بەئەو (ئیبراهیم) ئیسحاق(ی کوڕی) و یەعقوب(ی کوڕەزای) ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ﴾ وە پێغەمبەرێتی و کتێبمان بڕیاردا لەنەوەکانی (ئیبراهیم)دا ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا﴾ وە لەدنیا پاداشتمان دایەوە ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ وە بەراستی ئەو لەڕۆژی دوایشدا لەپیاو چاکانە. ٢٧)﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ (باسی) لووطیش بکە کاتێ بەگەلەکەی ووت ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ﴾ بێگومان ئێوە کارێکی ناشیرین و قێزەون دەکەن (نێربازی) ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ لەجیهاندا کەس پێش ئێوە ئەو کارەی نەکردووە. ٢٨)﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ﴾ ئێوە نێربازی دەکەن ﴿وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ﴾ وە ڕێگا دەگرن (لە ڕێبواران) ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾ وە لەنادی و شوێنی کۆبونەوەتاندا هەموو خراپەیەك دەکەن ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟﴾ کەچی وەڵامی گەلەکەی تەنها ئەوە بوو کە ووتیان (بەلووط) ﴿ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ سزای خوامان بۆ بێنە ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ لەراستگۆیانی. ٢٩) ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى﴾ (لووط) ووتی ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە(و زاڵم بکە) ﴿عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بەسەر ئەو گەلە خراپەکارەدا. ٣٠)

وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾

-پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە خوای گەورە لەسەرمن دەربارەی شارەق ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿إنما الخمر و الميسر و الأنصاب و الأزلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠) سورەتی (العنكبوت): ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ﴾ ئیبن جەریر دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە کە دەڵێ: لە مەککەدا کۆمەڵێك هەبوون موسڵمان بوون و ئیسلامەتیەکەیان شارد بویەوە، موشریکەکان لەگەڵ خۆیاندا ئەمانیشیان هێنا بۆ غەزای بەدر و هەندێکیان کوژران و هەندێکی تریان بریندار بوون ، موسوڵمانان ووتیان ئەوانە موسوڵمانن و بە زۆر هێنراون بۆیە داوای لێ خۆشبونیان بۆ کردن خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم ...﴾ -

﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ﴾ وە کاتێ نێراوەکانی ئێمە مژدەی (بەخشینی ئیسماعیل)یان دا بەئیبراهیم ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مُهْلِكُوٓاْ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ﴾ ووتیان بێگومان ئێمە لەناویەری دانیشتوانی ئەم شارەین (سەدوم) ﴿إِنَّ أَهْلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ بەراستی دانیشتوانەکەی ستەمکار بوون. (٣١) ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا﴾ (ئیبراهیم) ووتی بێگومان لووط لەو (شارە) دایە ﴿قَالُواْ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا﴾ ووتیان ئێمە چاك دەزانین کێی لێیە ﴿لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾ سوێند بەخوا ئێمە لووط و ئەندامانی خێزانەکەی رزگار دەکەین جگە ژنەکەی ﴿كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ کە لەجێماوان (تیاچووان) دەبێت. (٣٢) ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا﴾ کاتێ نێراوەکانمان هاتن بۆ لای لووط ﴿سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا﴾ پێیان تێکچوو و زۆر دڵ تەنگ و نارەحەت بوو ﴿وَقَالُواْ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ﴾ ووتیان مەترسە خەم مەخۆ (چونکە) ﴿إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ﴾ بێگومان ئێمە تۆ و خێزانەکەت ڕزگار دەکەن جگەلە ژنەکەت ﴿كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ کەئەو لەجێماوان (تیاچووان) دەبێت. (٣٣) ﴿إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ﴾ بەراستی ئێمە دەبارێنین بەسەر دانیشتوانی ئەم شارەدا ﴿رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ سزایەك لەئاسمانەوە ﴿بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ لەبەر ئەوەی لەسنووری فەرمانی (خوا) دەرچوون. (٣٤) ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً﴾ سوێند بەخوا بێگومان لەو شارە (وێران کراوە)دا نیشانەو پەندێکی دیارمان بەجێ هێشت ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بۆ گەل و کۆمەڵێ کەژیرین. (٣٥) ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ وە بۆ خەڵکی مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان (نارد) ﴿فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن ﴿وَٱرْجُواْ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ﴾و بەهیواو ئومێدی ڕۆژی دوایی بن ﴿وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ وەخراپەکاری ڕۆچوو مەبن لەزەوی دا. (٣٦) ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ بەلام ئەوان باوەڕیان پێ نەهێنا ئەوسا بوومەلەرزە بەتینەکە گرتنی (لێی دان) ﴿فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە لە خانووەکانی خۆیاندا ئەژنۆیان دا دابوو مردن. (٣٧) ﴿وَعَادًا وَثَمُودَاْ﴾ وە گەلی عاد و سەموودیشمان (لەناو برد) ﴿وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ﴾ بەراستی (ئەو لە ناوبردنە) ڕوون بووتەوە بۆتان لەشوێنەوارە (وێرانە)کانیانەوە ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە ﴿فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسْتَبْصِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردن لەڕێگای ڕاست لەکاتێکدا ئەوان توانای بیر کردنەوەیان هەبوو (ژیر بوون). (٣٨)

وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾

**-عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەم ئایەتە لەنامەیەکدا نوسرا بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە لە مەککەدا مابونەوە کەهیچ بەهانەیەکیان نی یە کە لەمەککەدا بمێننەوە دەڵێت: جا هەموویان لەمەککە دەرچوون و موشریکەکانیش پێیان گەشتن و ئازاریان لێ کردن بیٚ باوەڕ بینەوە ئەمانیش بەناچاری بیٚ باوەڕ بوونەوە ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾ پاش ئەمە موسوڵمانان ئەم ئایەتەشیان نارد بۆیان ئەوانیش لەمەککە دەرچوون و بیٚ هیوا بوون لەوەی کەهیچ چاکەیەکیان لەمەککە دەست بکەوێت پاشان ئەم ئایەتە لە بارەیانەوە هاتەخوارەوە ﴿ثم إن ربك للذين هاجروا من بعدما فتنوا ثم جاهدوا و صبروا إن ربك من بعدها لغفور رحيم﴾ وە ئەم ئایەتەشیان بۆ ناردن خوای گەورە ڕێگە چارەی بۆ داناون، -**

﴿وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ﴾ **هەروەها قاروون و** فیرعەون و هامانیشمان (لەناو برد) ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ **سوێند بەخوا بەڕاستی** مووسا هات بۆ ناویان بەچەند **موعجیزەیەکەوە** ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ **بەڵام ئەوان خۆیان بەگەورە** زانی لەزەویدا ﴿وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ﴾ **نەشیانتوانی لەدەستمان دەرچن. ٣٩)** ﴿فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦ﴾ **ئەوسا ئێمە هەریەك لەوانمان بەتاوانی خۆی** سزادا (لەناومان بردن) ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبًا﴾ **جا هەندێکیان بایەکی بەهێزمان ناردە سەریان بەوردە** بەردەوە ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ﴾ **وە هەندێکی تریان پیامەڵشاخانێك و دەنگێکی گەورە لەناوی بردن** ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ **وە هەندێکیشیانمان بەناخی زەوی دا بردە خوارەوە**﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَا﴾ **وە هەندێکی ترمان لەوان** لەدەریادا نوقم کرد ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ﴾ **خوا ستەمی لێ نەکردن** ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ **بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد. ٤٠)** ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ﴾ **وێنەی کەسانێ کەبێجگە لەخوا پەرستراوانێك بۆ خۆیان دادەنێن** ﴿كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتًا﴾ **وەکو جاڵجاڵۆکە وایە کەماڵێکی (بۆ خۆی) ڕەخساندووە** ﴿وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِ﴾ **کە بەڕاستی لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە** ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ **ئەگەر بزانن. ٤١)** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ﴾ **بێگومان خوا دەزانێ** ﴿مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىۡءٍ﴾ **ئەوان لەجیاتی خوا چی دەیپەرستن و هاواری لێ دەکەن** ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ **و هەر ئەوە (خوا) زاڵی کار دروست. ٤٢)** ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾ **ئەو وێنەو** نموونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە ﴿وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ﴾ **تەنها زانایان** لەوانەتێدەگەن. ٤٣)﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ﴾ **خوا ئاسمانەکان و زەوی بەحەق و ڕاستی دروست کردووە** ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەراستی لەودا بەڵگە هەیە بۆ بڕواداران. ٤٤) ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ **بیخوێنەرەوە ئەو قورئانەی کەسرووش کراوە بۆت** ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ **وە نوێژ بکە** ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾ **بێگومان نوێژ** بەرگری (نوێژگەر) دەکات لەکاری ناشیرین و ناپەسەند **(خراپە)** ﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ وە زیکر و یادی خوا گەورەترە **(لەهەموو شتێك)** ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ﴾ **خواش بەهەر کارێك کەدەیکەن دەزانێ. ٤٥)**

۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾

**- ئەوانیش لە مەككە دەرچوون لە ڕێگە موشریكەكان گەشتن پێیان ئەمانیش شەڕیان كرد لەگەڵیان** ئەوەی كوژرا كوژرا **و ئەوەشی** ڕزگاری **بوو** ڕزگاری بوو.

**ئایەتی (٣) سورەتی (المؤمنون):** قال رسول الله (ﷺ): (من حسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لە نیشانەی جوانی و چاكی موسوڵمانێتی مرۆڤە وازهێنانی لە هەر شتێك كەپەیوەندی بەوەوە نی یە).

**ئایەتی (٥١) سورەتی (المؤمنون):** قال رسول الله (ﷺ):(أيها الناس إن الله طيب لا يقبل إلا طيباً وإن الله أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين فقال تعالى: (يا أيها الرسل كلوا من الطيبات واعملوا صالحاً) وقال تعالى:(يا أيها الذين آمنوا كلوا من طيبات ما رزقناكم) ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمد-

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ دەمەقاڵێ و موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانییەکاندا ﴿إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ مەگەر بە جوانترین شێوە ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾ جگە لەوانەیان کە ستەمیان کرد (لە ئێوە) ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا﴾ وە (بە خاوەن کتێبەکان) بڵێن باوەڕمان هێناوە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێمە ﴿وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ و (بەوەش) نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە ﴿وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ﴾ وە خوای ئێمە و خوای ئێوە یەکێکە ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ وە ئێمە بۆ ئەو (خوا) گەردن کەچین. ٤٦) ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ هەروەك (پێغەمبەرانی پێشوو) قورئانمان بۆ تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ناردەخوارەوە ﴿فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ جا ئەو کەسانەی کە کتێبمان پێداون ﴿يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ (هەندێکیان) باوەڕ بەو (قورئانە) دێنن ﴿وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦ﴾ وە لەمانەش (بت پەرستەکانی عەرەب) کەسانێ بڕوای پێ دێنن ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ تەنیا بێ باوەڕانی (ڕۆچوو) دان نانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا. ٤٧) ﴿وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ﴾ وە تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) پێش ئەم (قورئانە) هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە ﴿وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ﴾ وە بەدەستی ڕاستت نەتنوسیووە ﴿إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾ (ئەگەر وابوایە) ئەو کاتە ناڕاستەکان (بێ بڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە. ٤٨) ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ﴾ (نەخێر وا نییە گومان دەبەن) بەڵکو قورئان نیشانەکانی ئاشکران ﴿فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ لە دڵ و دەروونی کەسانێکدایە کە زانستیان پێ دراوە (لە لایەن خواوە) ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ تەنیا ستەمکاران دان نانێن بە نیشانەکانی ئێمەدا. ٤٩) ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ وە وتیان ئەوە بۆ چەند موعجیزە و بەڵگەیەك دانابەزێنرێ بۆ سەری (موحەممەد (ﷺ)) لەلایەن پەروەردگاریەوە ﴿قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ (پێیان هێنانە خوارەوەی) موعجیزەکان تەنیا لەلایەن خواوەیە ﴿وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ وە بەڕاستی من تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام. ٥٠) ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ﴾ ئایا بۆ ئەوان بەس نییە ﴿أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ ﴿يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ﴾ بەڕاستی لەم قورئانەدا بەزەیی ﴿وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ و پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ باوەڕداران. ٥١) ﴿قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ﴾ بڵێ (پێیان) خوا بەسە ﴿بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗا﴾ بۆ شایەتی دان لەنێوان من و ئێوەدا ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدایە دەیزانێ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ﴾ وە کەسانێ کە باوەڕیان هێناوە بە بەتاڵ و بێ باوەڕبوون بەخوا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ تەنیا ئەوانەن زەرەرمەندان. ٥٢)

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ فَإِيَّٰىَ فَٱعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾

=يديه إلى السماء يا رب يا رب ومطعمه حرام ومشربه حرام وغذي بالحرام فأنى يستجاب لذلك) (رواه مسلم).

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرمووی: (ئەی خەڵكینە بێگومان خوای گەورە پاك و خاوێنە هەرچیش پاك و خاوێن نەبێت وەری ناگرێ** و قەبوڵی **ناكات، وەبێگومان خوای گەورە ع فەرمانێك** بەپێغەمبەران **دەفەرمووی: (ئەی پێغەمبەرانی خوا، بخۆن لەو** خواردەمەنیانەی حەڵاڵ و پاكن و كار و كردەوەی باش بكەن) **وە بەخاوەن باوەڕانیش** دەفەرمووێ: (ئەی كەسانی كە باوەڕتان هەیە بەخوا، بخۆن لەو خواردەمەنیە پاك **و حەڵاڵانەی** كەكردومان بەڕزق و ڕۆزی ئێوە) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) باسی كەسێكی كرد كەدەچێت **بۆ سەفەری** دوور و درێژ (حەج و غەزا) و قژی گیف دەبێ و چڵك و تەپ و تۆزی لێ دەنیشێ و=

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ﴾ بە پەلە داوای (هێنانی) سزات لێ دەکەن ﴿وَلَوْلَا أَجَلٌ مُسَمًّى لَجَاءَهُمُ الْعَذَابُ﴾ ئەگەر ماوەی دیاری کراو نەبوایە (بۆ سزادانی ئەوانە) بێگومان سزاکەیان بۆ دەهات ﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ وە بەڕاستی لەناکاودا ئەو سزایەیان بۆ دێ کە ئەوان هەستی پێ ناکەن. ٥٣) ﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ﴾ بە پەلە لە تۆ داوای (هێنانی) سزا دەکەن ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ کە بەڕاستی دۆزەخ دەوری کافرانی داوە. ٥٤) ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ﴾ لەڕۆژێکدا سزا دایان دەپۆشێ ﴿مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ لە لای سەریانەوە و لە ژێر پێیانەوە ﴿وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ وە (خوا) دەفەرموێ: بچێژن تۆڵەی ئەو کردەوانەی کە لە دنیادا دەتان کرد. ٥٥) ﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی بەندەیانێکم کە باوەڕتان هێناوە ﴿إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ﴾ بێگومان زەوی من پان و فراوانە ﴿فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ﴾ کەواتە هەر من بپەرستن. ٥٦) ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ هەمووکەس مردن دەچێژێ و دەمرێ پاشان بۆ لای ئێمە دەگەڕێنرێنەوە. ٥٧) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە کەسانێ کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا﴾ سوێند بەخوا لەکۆشکە بەرزەکانی بەهەشتدا نیشتەجێیان دەکەین ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دێن و دەچن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ بێ بڕانەوە تیایدا دەمێننەوە ئای چەند چاکە پاداشتی چاکەکاران. ٥٨) ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەوانەی دانیان بە خۆیاندا گرت و تەنیا پشتیان بە پەروەردگاریان بەست. ٥٩) ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لَا تَحْمِلُ رِزْقَهَا﴾ زۆر گیان لەبەر (زیندەوەر) هەیە ڕۆزی خۆی هەڵناگرێ و کۆی ناکاتەوە (بۆ داهاتوو) ﴿اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ﴾ خوا ڕۆزی ئەو (گیان لەبەرانەو) و ئێوەیش دەدات ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ وە هەر ئەوە بیسەری زانا. ٦٠) ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار لەو (بێ باوەڕان) بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ و ڕۆژ و مانگی ڕامهێناوە ﴿لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ بێگومان دەڵێن خوا دەی کەواتە چۆن (لە پەرستنی خوا) لادراون. ٦١) ﴿اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ﴾ خوا ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەس لە بەندەکان کە بیەوێ یا بۆی کەم دەکات ﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا بەهەموو شتێك زانایە. ٦٢) ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ﴾ وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت ﴿مَنْ نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ کێ لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ ﴿فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهَا﴾ ئەدجا بەو بارانە زەوی مردووی زیندوو دەکاتەوە ﴿لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ بێگومان دەڵێن خوا ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ هەموو سوپاس هەر بۆ خوایە ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان ژیریان بەکار نامێنن. ٦٣)

وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾

=دەستی بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان و دەڵێت ئەی خودایە ئەی خوایە لەکاتێکدا ئەو خواردنەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە، پۆشاکەکەی حەرامە، بەحەرام گۆش کراوە، ئیتر چۆن دوعاو نزای ئەو جۆرە کەسە گیرا دەبێ).

**ئایەتی (٦٠) سورەتی (المؤمنون):** قالت عائشة (رضي الله عنها) يا رسول الله (ﷺ): (الذين يؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة) هو الذي يسرق ويزني ويشرب الخمر وهو يخاف الله عز وجل؟ قال: (لا يا بنت أبي بكر يا بنت الصديق ولكنه الذي يصلي و يصوم ويتصدق وهو يخاف الله عز وجل) (رواه أحمد والترمذي). عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (الذين يؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة) ئەو کەسەیە کەدزی و زینا دەکات و ئارەق دەخواتەوەو لەھەمان کاتدا لەخوای گەورە دەترسێ؟ فەرمووی:=

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ﴾ وە ژیانی ئەم دنیایە تەنها رابواردنێکی بێ هودە و یاری (مناڵانە) ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ﴾ وە بەراستی ماڵی قیامەت هەر ئەوە ژیانە (بەراستی)﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەوان بیانزانیایە. ٦٤)﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ﴾ ئەدجا کاتێ ئەو (بێ باوەڕانە) سوار کەشتی دەبن ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (و ترسان لە نوقم بوون) تەنها هاوار لە خوا دەکەن بە دڵسۆزی و گەردن کەچی یەوە ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ﴾ کەچی کاتێ خوا رزگاریان دەکات و دەگەنە وشکانی ﴿إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ﴾ کوت و پڕ ئەوان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن. ٦٥) ﴿لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ وَلِيَتَمَتَّعُواْ﴾ با دان نەنێن بەوەی ئێمە پێمان دان وە با بەهرە و لەزەت ببەن لە ژیان ﴿فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ جا لەمەولا دەزانن (ئەدجامی ئەو کردەو خراپانەیان چی دەبێ). ٦٦)﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ ئایا نەیان زانیوەو سەرنجیان نەداوە ﴿أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنٗا﴾ کە ئێمە (مەککە) مان کردۆتە جێگایەکی رێز گیراوی بێ ترس و بیم ﴿وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡۚ﴾ لە کاتێکدا لە دەوروبەری ئەوان (خەلکی مەککە) خەڵك دەفرێنرێت ﴿أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ﴾ دەی ئایا باوەڕ بە بەتاڵ دێنن ﴿وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ﴾ وەدلن نانێن بە بەهرەو چاکەکانی خوا دا. ٦٧)﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێ ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓۚ﴾ یا باوەڕ نەهێنێ بەئایینی راست کاتێ بۆی هات ﴿أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئایا جێگای مانەوەی بۆ بێ بڕوایان لە دۆزەخدا نیە. ٦٨)﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا﴾ وە کەسانێ کە لە پێناو رەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە ﴿لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ﴾ بەراستی رێنموونیان دەکەین بۆ رێبازەکانی خۆمان ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکان دایە. ٦٩)

## سورەتی ﴿الروم﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿الٓمٓ﴾ بە (ئەلیف، لام، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی(البقرة) بکە. ١)﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ رۆم شکێنران و ژێرکەوتن (فارس زاڵ بوو بە سەریاندا). ٢)﴿فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ﴾ لە نزیك ترین خاکیان (لە مەککەوە یا لە وڵاتی فارسەوە) ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ﴾ وە رۆمەکان دوای تێشکانیان ﴿سَيَغۡلِبُونَ﴾ لە داهاتوودا سەر دەکەون (بەسەر فارسەکاندا). ٣)﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ﴾ لە ماوەی چەند ساڵێکدا (لە نێوان ٣ تا ٩ ساڵدا)﴿لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ﴾ هەموو کاروبار تەنها بە دەست خوایە لەپێش(سەرکەوتن)و لە دوا (سەرکەوتن)﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ وە لەو رۆژەدا (رۆمەکان سەردەکەون) ئیمانداران دڵخۆش دەبن. ٤)﴿بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ بە سەرخستنی خوا (بۆ رۆمەکان) ﴿يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ﴾ خوا هەر کەسی بوێ سەری دەخات﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وەهەرئەوزاڵی میهرەبانە. ٥)

وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾

-(نەخێر ئەی کچی ئەبو بەکر ئەی کچی ڕاستگۆ بەڵکو ئەو کەسە ئەوەیە کە نوێژ دەکات و ڕۆژو دەگرێ و خێرو چاکە دەکات و لەهەمان کاتدا لەخوای گەورە دەترسێت).

**ئایەتی (٧٥) سورەتی (المؤمنون)**: قال رسول الله (ﷺ): (إني ممسك بحجزكم هلم عن النار هلم عن النار وتغلبونني، تتقاحمون فيها تقاحم الفراش والجنادب فأوشك أن أرسل حجزكم)(رواه أبو يعلى). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان من کەمەرتان دەگرم (دەڵێم) وەرن لەئاگرەکە دوور کەونەوە وەرن لە ئاگرەکە دوور کەونەوە کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم ڕادەپسکێنن و کۆمەڵ کۆمەڵ خۆتانی تێ فڕێ دەدەن وەك چۆن پەپولە و کوللەکان خۆیانی تێ فڕدەدەن و دەسوتێن جانزیکە منیش (توانام نەمێنێ و) کەمەرتان بەر بدەم).

﴿وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾ ئەوە بەڵێنی خوایە (کە ڕۆمەکان سەرئەکەون) خوایش پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵک نازانن. ٦) ﴿يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ تەنها ڕواڵەتی ئەم ژیانی دنیا دەزانن ﴿وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ﴾ بەڵام بێ ئاگان لە ڕۆژی دوایی. ٧) ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم﴾ ئایا ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە ﴿مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە دروستی نەکردووە ﴿إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ مەگەر بەراستی و بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ بێگومان زۆرێک لە خەڵک ﴿بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ﴾ باوەڕیان نیە بە خزمەت پەروەردگاریان بگەن (لە دوا ڕۆژدا). ٨) ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا ئەوان بەسەر زەویدا نەگەڕاون ﴿فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ بۆ ئەوەی ببینن سەرئەنجام ئەو (گەلانەی کافر بوون) لە پێش ئەمان چۆن بووە ﴿كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ کە زۆر بەهێزتر بوون لە ئەمان (لە خەلکی مەککە) ﴿وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ﴾ و زەوییان کێڵا (بۆ کشت وکاڵ) ﴿وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا﴾ و ئاوەدانیان کردەوە زیاتر لەمان ﴿وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ وە پێغەمبەرانیان بۆ هات بە موعجیزە ڕوونەکانەوە ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ بۆیە خوا ستەمی لێ نەکردوون (کە لەناوی بردوون) ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵام خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد. ٩) ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾ پاشان چارەنووسی ئەوانەی کەتاوان و خراپەیان کرد سەختترین سزایە (دۆزەخە) ﴿أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ لەبەر ئەوەی باوەڕیان نەهێنا بە ئایەتەکانی خوا ﴿وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ﴾ و هەمیشە گاڵتەیان پێ دەکرد. ١٠) ﴿ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ﴾ خوا دروست کردن (ی ئادەمی) دەست پێ دەکا ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ و لە پاش (مردن) دروستی دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ پاشان بۆ لای ئەو (خوا) دەگەڕێنەوە. ١١) ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ وە ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەسێ ﴿يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ تاوانباران غەمبار و نائومێد دەبن. ١٢) ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُا۟﴾ بێگومان لە پەرستراوەکانیان دا تکا کارانێ نیە بۆ ئەوان ﴿وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ و ئەوان بێ باوەڕ دەبن بە پەرستراوەکانیان (کە کردبوونیان بە هاوبەشی خوا). ١٣) ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەسێ ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ﴾ (خەڵک) لەو ڕۆژەدا جیادەبنەوە لەیەکتر. ١٤) ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئینجا کەسانێ کەباوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ﴾ ئەوان لە بەهەشتدا دڵخۆش دەکرێن. ١٥)

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلْأَخِرَةِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾

**ئایەتی (٩٨) سورەتی (المؤمنون):** عن أبي اليسر (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) كان يدعو: (اللهم إني أعوذ بك من الهدم وأعوذ بك من التردي، وأعوذ بك من الغرق والحرق، والهرم، وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عند الموت وأعوذ بك أن أموت في سبيلك مدبراً، وأعوذ بك أن أموت لديغاً) (رواه أبو داود). ئەبو یوسر (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە ئەم دوعایەی دەکرد: (خوایە پەنات پێ دەگرم لەوەی خانووم بەسەردا بڕوخێ، وە پەنات پێ دەگرم لەکەوتنە خوارەوە، پەنات پێ دەگرم لەخنکان و سووتان و پیری وە پەنات پێ دەگرم لەوەی شەیتان لەکاتی گیان کێشانمدا تێکم بدات و سەرم لێ بشێوێنێ، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی لەڕێگای تۆدا هەڵبێم بکوژرێم وە پەنات پێ دەگرم بە پێوەدان و گەستنی (مار و [illegible]) [illegible].

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ﴾ بەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بوون و دڵنیان نەدەمنا ﴿بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بەنیشانەکانی ئێمە و گەیشتن بەڕۆژی دوایی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ ئا ئەوانە لە سزا(ی دۆزەخ)دا ئامادە دەکرێن. ١٦) ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾ ئەنجا پاک و بێگەردی خوا بڵێن ﴿حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ﴾ کاتێ ئێوارەتان لێ دێت و کاتێ بەیانیتان لێ دێت. ١٧) ﴿وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە سوپاس هەر بۆ خوایە لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ﴾ وە(پاکی و بێگەردی خوا بڵێن) لەشەودا و کاتێ نیوە ڕۆتان لێ دێت. ١٨) ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ (خوا) زیندوو لەمردوو دەردێنێ و مردوو لەزیندوو دەردێنێ ﴿وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ﴾ وە زەوی زیندوو دەکاتەوە لەپاش مردن و وشک بوونی ﴿وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ﴾ وە هەر بەوجۆرە ئێوەش دەردەهێنرێن (لە گۆڕەکانتان). ١٩) ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ﴾ لە نیشانەکانی ئەو (خوایە) کە ئێوەی لە خاک دروست کردووە ﴿ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ﴾ لە پاش (ماوەیەک) کوت و پڕ ئێوە ئادەمین و بڵاوبوونەتەوە لە زەویدا. ٢٠) ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم﴾ وە لەنیشانەکان ئەوە (خوایە) کە بۆی دروست کردوون ﴿مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾ لە(ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێک بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایان دا ﴿وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ﴾ وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا نیشانانێک هەیە بۆ کەسانێ کەبیردەکەنەوە. ٢١) ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە لە نیشانەکانی (دەسەڵاتی) ئەوە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ﴾ و جیاوازی زمانتان و ڕەنگەتان ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (باسکرا) بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان. ٢٢) ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ وە لە نیشانەکانی ئەوە خەوتنتان بە شەو و ڕۆژدا ﴿وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ﴾ و هەوڵدانتان (لە ڕۆژدا) بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەخششی (ڕۆزی) خوا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کۆمەڵێ ببیستن. ٢٣) ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ لە نیشانەکانی ئەوە (خوایە) کەهەورە بروسکەتان نیشان دەدات بۆ ترسان و ئومێد (ترسان لە هەورە بروسکە و ئومێدی بارانبارین) ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ ﴿فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ﴾ کە زەوی دوای مردنی بە هۆی ئەو بارانەوە دەبوژێنێتەوە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەوەدا (کەباسکرا) ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ چەند رابەر و نیشانە هەیە بۆئەوانەی ژیریان بەکار دێنن. ٢٤)

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ
دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ
ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ
أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى
مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ
أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾
بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى
مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ
حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ
ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟
دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

**ئایەتی (٢) سورەتی (النور):** **قالت عائشة (رضي الله عنها) إن قريشاً أهمهم شأن المرأة المخزومية التي سرقت، فقالوا: من يكلم فيها رسول الله (ﷺ)؟ وقالوا ومن يجترىء عليه إلا أسامة بن زيد حب رسول الله (ﷺ)؟ فكلمه أسامة، فقال رسول الله (ﷺ): (أتشفع في حد من حدود الله تعالى؟) ثم قام فاختطب ثم قال: (إنما أهلك الذين قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد وايم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها)(متفق عليه).** **عائیشە** (خوای لێ ڕازی بێ) ووتی ژنێکی مەخزومی دزی کرد بوو، قورەیش زۆر بەتەنگیەوە بوون، ووتیان: **بەکێ بڵێین کە لەبارەیەوە** لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) قسە بکات ووتیان کێ **دەوێرێ لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە زۆر خۆشەویستی-**

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ وە لەنیشانەکانی ئەوە ﴿أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ﴾ کەئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو وەستاون ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ پاشان کاتێ (لەرۆژی دواییدا) لە زەوی یەوە بانگتان دەکەن ﴿إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ یەکسەر ئێوە (لە گۆڕەکانتان) دێنە دەرەوە. ٢٥) ﴿وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنیا هی خوایە ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموویان هەر بۆ ئەو (خوا) گەردن کەچن. ٢٦) ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ﴾ ئەو (خوا) زاتێکە بەدی هێنانی دەس پێکردووە ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ لەپاشان (دوا مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ﴿وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ ئەم (دروست کردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسان ترە ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ و هەر بۆ ئەوە (خوا) سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ و هەر ئەوە زاڵی کار دروست. ٢٧) ﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ (خوا) نموونەیەکتان لەخودی خۆتاندا بۆ دەهێنێتەوە ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ﴾ ئایا لە بەندەکانتان دا هاوبەشانێك هەیە بۆ ئێوە ﴿فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾ لەو ڕۆزی و سامانەی بە ئێوەمان دا بوو بە جۆرێ ئێوەو ئەو بەندانە تیایدا یەکسان بن ﴿تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ و لەوان دەترسن (حسابیان بۆ بکەن) وەکو ترستان لە کەسانی وەك خۆتان ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە نیشانەکان ڕوون دەکەینەوە (بەدرێژی باسی دەکەین) ﴿لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بۆ کەسانێ ژیریان بەکار دێنن. ٢٨) ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم﴾ (وازیان لێ بێنە) بەڵکو ئەوانەی ستەمیان کردشوێن ئارەزووی‌خۆیان کەوتن ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بێ شارەزایی‌و نەزانانە ﴿فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾ ئینجا کێ (دەتوانێ) ڕێنموونیی کەسێ بکات کە خوا گومڕای کردبێ ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ لە کاتێکدا بۆئەوان هیچ یارمەتی دەرێك نییە. ٢٩) ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا﴾ کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام پاك و ڕاست بۆ خوا ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ (شوێن ئاینی) داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسەر دروست کردووە ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ داهێنراوی خوا هیچ جۆر گۆڕانی بۆ نی یە ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ ئەو (ئایینەی باسکرا) هەر ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاست ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن. ٣٠) ﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ (شوێن ئایین بکەون) بە تۆبە کارانە بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و لەو بترسن و بەچاکی نوێژەکانتان بکەن ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ و لە هاوبەش ڕەوادەران مەبن. ٣١) ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ﴾ لەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش کرد ﴿وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ و بوون بە چەند بەشەوە ﴿كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ هەر کۆمەڵێکیان بەو (ئایینەی) خۆیان دڵخۆش بوون. ٣٢)

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۖ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾

-پێغەمبەرە (ﷺ) **جا کاتێ کە ئوسامە عەرزی کرد، فەرمووی: (چۆن تکا** دەکەی **بۆ جێ** بەجێ **نەکردنی حەدێکی شەرعی کە خوا خۆی دایناوە؟) پاشان** پێغەمبەری **خوا** (ﷺ) **هەستاو وتارێکی دا و فەرمووی: (ئەی خەڵکینە دەزانن بۆچی گەلانی پێش ئێوە لەناو چوون؟** چونکە **هەر کاتێ** پیاوێکی **خانەدان** و ناودار لە ناویاندا دزی بکردایە **حەددیان لێ نەدەدا و وازیان لێ** دەهێنا، بەڵام ئەگەر پیاوێکی بێ دەسەڵات دزی بکردایە ئەوە حەددیان لێ دەدا، **سوێندم بەخوای پاك** ئەگەر فاتمەی کچی موحەممەدیش دزی بکات دەستی دەبڕم).

**ئایەتی (١٩) سورەتی (النور)**: قال رسول الله (ﷺ): (لا يستر عبد عبداً في الدنيا إلا ستره الله يوم القيامة)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك عەیبو ئەنگی یەکێك-

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ﴾ وە هەر کاتێ زیان (گرانی و بێ بارانی) بکەوێ لەخەڵکی (هاوبەش دانەر بۆ خوا) ﴿دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾ هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە ﴿ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً﴾ پاشان کاتێ لەلایەن خۆیەوە رەحمەت و ژیانی خۆشیان پێ بدات ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم﴾ کوت و پڕ دەستەیەك لەوان ﴿بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن. ٣٣)﴿لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ با دان نەنێن بەو چاکانەدا ئێمە پێمان داوون ﴿فَتَمَتَّعُواْ﴾ جا بارابوێرن و بەهرەمەندبن لەژیان ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەنجا لەمەودوا دەزانن (چیتان بەسەر دێت). ٣٤)﴿أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا﴾ ئایا بەڵگەیەکمان بۆ ناردوون ﴿فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشْرِكُونَ﴾ کە دەربارەی ئەوەی ئەوان کردویانەتە هاوبەشی خوا بدوێ؟ ٣٥)﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً﴾ وە کاتێ رەحمەت و چاکەیەك بەخەڵك بدەین ﴿فَرِحُواْ بِهَا﴾ پێی دڵخۆش دەبن ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ﴾ وە ئەگەر زیانێکیان تووش ببێت ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهۆی کردەوەی خراپیانەوە ﴿إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾ کوت و پڕ بێ هیوا دەبن (لەبەزەیی خوا) ٣٦)﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا ئەوانە نەیان زانیوە کە بەڕاستی خوا ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ رۆزی فراوان یا کەم دەکات بۆ هەر کەس کەبیەوێ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەوەدا (باسکرا) چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕ دێنن. ٣٧)﴿فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ﴾کەواتە خزم مافی خۆی پێ بدە﴿وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ هەروەها هەژار و ڕێبوارانی کەم دەست ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بۆ کەسانێ رەزامەندی خوایان دەوێ چاکترە﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ و هەر ئەوانەن رزگار بووان. ٣٨)﴿وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا﴾ ئەوەی بەناوی سوود داوتانە (بەخەڵکی) ﴿لِّيَرْبُوَاْ فِيٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی زیاد ببێ لە ماڵ و سامانی ئەو خەڵکانەدا (زیاتر لەوە داوتانە پێیان بتان دەنەوە) ﴿فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە لای خوا هیچ زیاد ناکات (پاداشتی نییە) ﴿وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ﴾ وە هەر زەکات و خێرێك کەداوتانە و ﴿تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ﴾ مەبەستان تەنها رەزامەندی خوا بووە﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ﴾ ئا ئەوانەن (پاداشتیان) دوو چەندانە دەکەنەوە. ٣٩)﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ﴾ خوا زاتێکە ئێوەی بەدی هێناوە لەپاشان رۆزی پێ داون.﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾دواتر دەتان مرێنێ لەپاشان زیندووتان دەکاتەوە ﴿هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن﴾ ئایا هیچ یەك لەو هاوبەشانەی بۆ خواتان دائەنا هەیە ﴿يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيْءٍ﴾ هیچ شتێ لەوانە(ی خوا) بکات ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ **پاکی و بەرزی بۆ خوا لەوەی ئەوان** دەیکەنە **هاوبەشی. ٤٠)**﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ **خراپە (بەڵا** و شێوان ودەرد) لەوشکانی (زەوی) **و دەریادا دەرکەوتووە**﴿بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ﴾ بەهۆی ئەو خراپانەی خەڵکی کردویانە ﴿لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ﴾ **بۆ ئەوەی** (تۆڵەی) هەندێ لەو(خراپانەی) **کردویانە پێیان بچەژێ** ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە (لەخراپەکاری). ٤١)

قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾

-لەبەندەکانی خوا بپۆشێت لەدونیادا ئەوە خوای گەورە عەیب و نەنگیەکانی ئەو دەپۆشێت لەڕۆژی دواییدا).

**ئایەتی (٢٢) سورەتی (النور):** دعا رسول الله (ﷺ) بريرة فقال: (أي بريرة هل رأيت من شيء يريبك من عائشة؟ قالت له بريرة: لا والذي بعثك بالحق إن رأيت منها أمراً قط أغمصه عليها أكثر من أنها جارية حديثة السن تنام عن عجين أهلها فيأتي الداجن فيأكله)(متفق عليه)- پێغەمبەری خوا (ﷺ) بورەیرەی بانگ کردو فەرمووی: (ئەی بورەیرە هیچت لەعائیشە بینیوە گومانت لەپاکێتی بکەیت؟ بورەیرە وتی سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستو حەق ناردووە هیچ عەیبێکی نی یە ئەوە نەبێت کچێکی منداڵە هەندێ جار بەسەر هەویرەکەیەوە خەوی لێ دەکەوێت و مریشك و شت دێن و هەویرەکە دەخۆن).

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بەزەویدا بگەڕێن ﴿فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾ ئینجا سەرنج بدە سەرئەنجامی ئەوانەی لەپێش (ئێوەوە) بوون چۆن بوو ﴿كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ﴾ کە زۆربەیان هاوبەش دانەر بوون بۆ خوا. ٤٢) ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ﴾ کەواتە ڕووی خۆت بکەرە ئایینی ڕێك و ڕاست ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ﴾ لە پێش ئەوە ڕۆژێ بێت ﴿لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە کە گێڕانەوەی بۆ نییە ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾ لەو ڕۆژەدا خەڵکی جیائەبنەوە لەیەکتر. ٤٣) ﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ﴾ هەر کەس بێ باوەڕ بووبێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕیی یەکەی لەسەرە ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا﴾ هەرکەسیش کردەوە چاکی کردبێ ﴿فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ ئەوە شوێن بۆ خۆیان (لە بەهەشتدا) ئامادە دەکەن. ٤٤) ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بۆ ئەوەی کەسانێ کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە پاداشتیان بداتەوە ﴿مِن فَضْلِهِ﴾ لە میهرەبانی و چاکەی خۆی ﴿إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) بێ باوەڕانی خۆش ناوێ. ٤٥) ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ﴾ وە لە نیشانەکانی ئەو (خوایە) ﴿أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ﴾ کە چەند بایەکی مژدەدەر (بەبارینی باران) دەنێرێ ﴿وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِ﴾ بۆ ئەوە هەندێ لە (بارانی) بەزەیی خۆیتان پێ بچەژێ ﴿وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ﴾ و بۆ ئەوەی کەشتییەکان بەفەرمانی خوا(بەو بایە) بڕۆن و بگەڕێن ﴿وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ﴾ و بۆ ئەوەی بەدوای ڕۆزی ئەو (خوا)دا بگەڕێن (لە دەریادا) ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تا شوکرانە بژێری خوا بن. ٤٦) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی پێش تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ناردومانە ﴿رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ﴾ پێغەمبەرانێك بۆ لای گەلەکانیان ﴿فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ ئەنجا موعجیزە و بەڵگە ڕوونەکانیان بۆ هێنان (بەڵام باوەڕیان نەهێنا) ﴿فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا﴾ ئنجا تۆڵەمان سەند لەوانەیان تاوانیان کرد ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وە یارمەتی دانی باوەڕداران مافێکە لەسەرمان. ٤٧) ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ﴾ خوا زاتێکە ئەو بایانە دەنێرێت ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ بۆ ئەوەی هەورەکان بجوڵێنن (بگەڕێنن) ﴿فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ ئنجا ئەو(هەورە خوا) چۆن بیەوێ بڵاوی دەکاتەوە بەئاسماندا ﴿وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا﴾ وە ئەو (هەورە) دەکاتە پارچەیەك (کۆیان دەکاتەوە لەسەر یەکتر) ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾ ئینجا دەبینی قەترە قەترەی باران لە نێوانی هەورەکەوە دەبارێت ﴿فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ ئنجا کاتێ (خوا) ئەو بارانە ببارێنێ بۆ (وڵات زەوی) هەر کام لەبەندەکانی کەبیەوێ ﴿إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ کوت و پڕ دڵخۆش و شادمان دەبن (بەو بارانە). ٤٨) ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِ﴾ ئەگەر چی پێش ئەوەی باران بەسەریاندا بباریێ ﴿لَمُبْلِسِينَ﴾ بێ هیوا و نائومێد بوون. ٤٩) ﴿فَانظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ﴾ ئنجا سەیری ئاسەواری (پەیدا بوان بە) بارانی خوابکە (وەك کشتوکاڵ و گژو گیا و درخت) ﴿كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردن و ووشك بوونی ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ﴾ بەڕاستی هەر ئەو خوایە زیندوو کەرەوەی مردووانیشە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ و هەرە ئەویش بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا. ٥٠)

وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾

**ئایەتی (٢٧) سوورەتی (النور):** سأل رجل رسول الله (ﷺ): أي الإسلام خير؟ قال (تطعم الطعام وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف)(متفق عليه). پیاوێك لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسی: كام شت لەئیسلامەتی دا زۆر خێرە، فەرمووی: (نان بدە بەخەڵكی و سڵاویش بكە لەو كەسەی بیناسیت و لەو كەسەش نەیناسیت).

**ئایەتی (٣٢) سوورەتی (النور):** قال رسول الله (ﷺ): (یا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فلیتزوج فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فإنه له وجاء) (متفق علیه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی كۆمەڵی گەنجان هەر كام لە ئێوە توانای هەیە با ژن بهێنێ چونكە ژن هێنان چاكترین پارێزەرە بۆ چاوی مرۆڤ لەسەیر كردنی ئافرەت (ی نامەحرەم) و باشترین پارێزەریشە بۆ عەورەت ، وە هەر-

﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا﴾ سوێند بەخوا ئەگەر بایەکی توندی (زەرمەند) بنێرین ﴿فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا﴾ جا ئەو (هەورە یا کشتوکاڵەکەیان) دەبینن بەزەرد بوویی ﴿لَّظَلُّوا مِن بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ﴾ لەپاش ئەو (زیانە) هەر نا شوکری دەکەن. ٥١) ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ﴾ چونکە بەراستی تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) ناتوانی بە مردووان (کافران) ببیستێنی ﴿وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ﴾ و ناتوانی بانگەوازت بەکەڕان (کافران) ببیستێنی ﴿إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ﴾ کاتێ روو وەردەگێڕن لێت بەپشت تێکردنەوە. ٥٢) ﴿وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ﴾ وە تۆ رێنموونیی کەری نابینایان نیت (رزگاریان کەیت) لە گومڕایی یان ﴿إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا﴾ تۆ تەنیا بە کەسانێ دەشنەوێنی کە بەنیشانەکانی ئێمە باوەڕ دێنن ﴿فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾ چونکە ئەوانە گەردن کەچن (بۆ بانگ و فەرمانی تۆ). ٥٣) ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ﴾ خوا زاتێکە ئێوەی دروست کردووە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرە خۆر..) ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً﴾ پاشان دوای لاوزی بەهێزی کردون (بوون بە لاو) ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً﴾ لەدوا بەهێز کردنتان لاوازی و پیری بۆ دانان ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات ﴿وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾ وە هەر ئەوە زانای بە دەسەڵات. ٥٤) ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ﴾ وە رۆژی قیامەت هەڵدەسێ ﴿يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ﴾ تاوانباران سوێند دەخۆن (لە دنیادا یا لەبەرزەخ دا) ﴿مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾ تەنها ساتێ ماونەتەوە (لەدنیادا) ﴿كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ﴾ هەر بەو وێنە ئەوان لە دنیادا لادران لە راستی. ٥٥) ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ﴾ وە کەسانێ کەزانیاری و ئیمانیان پێ دراوە ووتیان ﴿لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ﴾ سوێند بەخوا بەراستی ئێوە لە (بەرزەخدا بە پێی بڕیاری) نوسراوی خوا تا رۆژی زیندووبوونەوە ماونەتەوە ﴿فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ﴾ ئینجا ئەمە رۆژی زیندوو بوونەوەیە ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ بەڵام ئێوە نەتان دەزانی (راستە و دێتە دی). ٥٦) ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ﴾ جا لەو رۆژەدا کەسانێ کە ستەمیان کردووە بەهانە هێنانەوە سوودیان پێ ناگەیەنێ ﴿وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ وە ئەوان داوایان لێ ناکرێ خوا لە خۆیان رازی بکەن. ٥٧) ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ﴾ سوێند بەخوا بەراستی هێناومانەتەوە بۆ خەڵکی ﴿فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە نموونە و باسێك ﴿وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ﴾ ئینجا بەراستی ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بێنی ﴿لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ دڵنیابن ئەو بێ بڕوایانە دەڵێن ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ﴾ ئێوە هەر ناڕاست و بەتاڵن (ئەمە سیحرە). ٥٨) ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ﴾ ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێت ﴿عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەسەر دڵی ئەوانەی کەبێ ئاگا و نەزانن. ٥٩) ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ جا دڵن بەخۆدا بگرە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾ باتەوانەی بێ باوەڕن لە (ئایینی) ڕاست لات نەدەن و بێزارت نەکەن. ٦٠)

## سُورَةُ لُقْمَانَ

ترتيبها ٣١ — آياتها ٣٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

-کەسێکیش نەیتوانی (لێ بێنێ) با بەپێشوو بێت چونکە بەپێشوو بوون ئارەزووی کەم دەکاتەوەو نایهێڵێت).

**ئایەتی (٥٥) سورەتی (النور):** قال رسول الله (ﷺ):لعدي بن حاتم حين وفد عليه: (أتعرف الحيرة؟) قال: لم أعرفها ولكن قد سمعت بها. قال (فو الذي نفسي بيده ليتمن الله هذا الأمر حتى تخرج الظعينة من الحيرة حتى تطوف بالبيت في غير جوار أحد ولتفتحن كنوز كسرى بن هرمز) قلت: كسرى بن هرمز؟ قال: (نعم كسرى بن هرمز وليبذلن المال حتى لا يقبله أحد)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەعەدی کوڕی حاتیم کاتێك کەعەدی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ): (ئایا تۆ حیرەت دەناسی یان دەزانیت کوێ یە؟ ووتی: نەم دیوە بەڵام ناویم بیستووە. فەرمووی: (سوێند بێت بەوزاتەی کەگیانی منی-

## سورەتی ﴿لقمان﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿الٓمٓ﴾ بە (ئەلیف، لام، میم)، دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە. ١)﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ﴾ ئەم ئایەتانە لەئایەتەکانی قورئانی پڕلە حیکمەت و دانایی یە. ٢)﴿هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ﴾ (هۆی) ڕێنموونیی و بەزەیین بۆ چاکەکاران. ٣) ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانەی کەنوێژ بەجێ دێنن و زەکات دەدەن ﴿وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ هەروەها باوەڕی پتەویان بەڕۆژی دوایی هەیە. ٤) ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوانە لەسەر ڕێنموونیین لەلایەن پەروەردگاریانەوە﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوان ڕزگارن. ٥) ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾ هەندێ لەخەڵکی هەیە قسە و باسی بێهودە دەکڕێ (وەك ئەفسانە و گۆرانی و مۆسیقا) ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بۆ ئەوەی بەنەزانی خەڵك لەڕێگای خوا گومڕا بکات ﴿وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا﴾ وە ڕێگای خوا دەکاتە جێگای گاڵتەو لاقرتی ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ئەوانە سزای ڕیسواکەر یان بۆ هەیە. ٦)﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا﴾ وە هەر کاتێ ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە ﴿وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا﴾ ڕوو وەردەگێڕێ بەخۆ بەگەورە زانی یەوە ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا﴾ هەروەك نەیبیستبێ، یا هەروەك لە هەردوو گوێچکەیدا کەڕی ببێ ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ دەی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) مژدەی بدەرێ بەسزایەکی سەخت. ٧)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە ﴿لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾بۆئەوانە بەهەشتانی پڕنازونیعمەت. ٨) ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا﴾ هەتا هەتایە دەمێننەوە تێیدا ئەوە بەڵێنێکی ڕاستە لەخواوە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەو زاڵی کاربەجێ یە. ٩)﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ (خوا) ئاسمانەکانی دروست کردووە بەبێ هیچ کۆڵەکەو ئەستوونێك کە ئێوە ببینن ﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ﴾ وە لە زەوی دا شاخانی لەنگەر داکوتاوی داناوە ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ بۆ ئەوەی نەتانلەرزێنێ و نەجوڵێ لەژێرتاندا ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ لەهەموو جۆرە ڕەوودندەیەکی (زیندەوەرێکی) تێدا بڵاوکردۆتەوە ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وە لەئاسمانەوە بارانمان باراندوە ﴿فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ بەهۆی ئەو (بارانەوە) لەزەویدا هەموو جۆرە ڕووەکێکی بەکەڵك و جوانمان ڕواندووە. ١٠)﴿هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ﴾ ئەمە (باسکرا) دروست کراوی خوایە ﴿فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ﴾ دەی نیشانم بدەن ئەوانە (بت و پەرستراوانە)ی بێجگە لەخودان چییان دروست کردووە ﴿بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ (هیچیان دروست نەکردووە) بەڵکو ستەمکاران لە گومڕایی یەکی ئاشکرادان. ١١)

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَـٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَـٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَـٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَـٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَـٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾

**هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتی (١٣) سـورەتی (لوقمـان): قـال تعالى ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾** بوخـاری **دەگێڕێتـەوە لـە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە(ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتـە** دابـەزی﴿الـذينَ **آمَنوا و لَمْ يلبِسُوا إيمـانهم بظلـم﴾ هـاوەڵانی پێغەمبـەری** خوا(ﷺ) **ووتیان: ئایا کێ لە ئێمـە** هەیـە سـتەمی لـەخۆی نـەکردبێ؟ خوای **گەورەش ئەم** ئایەتەی دابەزاند﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾.

-بەدەستە خوای گەورە ئەم ئاینە سەردەخات هەتا وەکو وای لێ دێت کەژنی ناو کەژاوە لەحیرەوە دێت **تەوافی کەعبە** دەکات (جگە لەخوا لەکەسی تر ناترسێت) بۆ ئەوە لەپەنای هیچ کەسێکدا بێت وەئێوە سەروەت و گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورمز دەگرن. ووتم: کیسرای کوڕی هورمز!-

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی دانای و حیکمەتماندا بە لوقمان ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾ (وپێمان ووت) سوپاسی خوا بکە ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ جا هەرکەس شوکرانە بژێری خوا بکات ئەوە بێگومان شوکرانە بژێری (بۆ قازانج و سوودی) خۆی دەکات ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ هەرکەسیش ناسوپاسی کردبێ (زیانی بەخوا نەگەیاندووە) ئەوە بێگومان خوا بێ نیازی سوپاس کراوە. ١٢)﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) باسی ئەوکاتە بکە کە لوقمان بەکوڕەکەی ووت کە ئامۆژگاری دەکرد ﴿يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ (ووتی) ئەی کوڕە شیرینەکەم هاوبەش بۆ خوا دامەنێ ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە. ١٣)﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ﴾ وە فەرمانمان داوە بەئادەمی (بەچاکی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ) دایك و باوکیدا ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ﴾ دایکی هەڵی ئەگرێ بەسووکیانی (پێی لاواز دەبێ) لاوازی لەدوای لاوازی ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ و بڕینەوەی لەشیر لە (دوا تەمەنی) دووساڵیەوە ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ﴾ (وەفەرمانمان بەئادەمی دا) کە سوپاسگوزاری من (خوا) و باوك و دایکت بکە ﴿إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ تەنها بۆلای منە گەڕانەوەتان. ١٤)﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى﴾ وەئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆئەوەی شتێ بکەیت بەهاوبەشی من ﴿مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ کەهیچ زانیاری یەکت پێی نی یە ئەوە گوێڕایەڵییان مەکە ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ بەڵام لەدنیادا زۆر بەچاکی هاوڕێیەتیان بکە ﴿وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ﴾ وشوێن ڕێبازی کەسێك بکەوە کەبەدڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆلای من ﴿ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆلای منە ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئنجا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کەکردوتانە. ١٥) ﴿يَٰبُنَىَّ﴾ (لقمان ووتی) ئەی کوڕە شیرینەکەم ﴿إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ﴾ بەڕاستی ئەو (چاکە و تاوانە) ئەگەر کێشی تۆو وە خەرتەلەیەکیش بێت ﴿فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەناو بەردێکدا یا لەناو ئاسمانەکان یا لەزەوی دا بێت ﴿يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾ خوا (لەقیامەت دا) دەیهێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا ووردبین و ئاگادارە. ١٦)﴿يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بێنە ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ و فەرمان بکە بەچاکە و بەرگری بکە لەخراپە ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ خۆگر و بەئارام بەلەسەر هەر بەڵاو ناخۆشی یەك تووشت دێ ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ بێگومان ئەوە لەوکارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردووە. ١٧)﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ ڕوو لەخەڵك وەرمەگێڕە ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ و بەکەشخە و خیزەوە مەڕۆ بەزەویدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ چونکەبەڕاستی خوا هیچ خۆبەزل زانێکی شانازیکەری خۆش ناوێ. ١٨)﴿وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ﴾ وە لەڕۆشتندا مام ناوەندی بە (نەهێواش بە نەپەلە) ﴿وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ (لەقسەکردندا) دەنگت نزم بکەرەوە ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ بەڕاستی ناخۆش ترینی دەنگەکان دەنگی (سەرەی) گوێدرێژە. ١٩)

أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

-فەرمووی: بەڵێ کیسرای کوڕی هورمز وە ماڵ و سامان (ئەوەندە زۆر دەبێت) دەبەخشرێتەوە کەس نی یە وەری بگرێت).

**ئایەتی (٦١) سورەتی (النور)**: قال رسول الله (ﷺ): (أيها الناس أفشوا السلام وأطعموا الطعام وصلوا الأرحام وصلوا والناس نيام تدخلوا الجنة بسلام)(رواه الترمذي).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (**ئەی خەڵکینە** لەنێوان خۆتاندا سەلام کردن بڵاوبکەنەوەو نان بدەن و خزم و کەس و کاری خۆتان **بەسەر** بکەنەوەو کاتێك کەخەڵکی لەگەرمەی خەودان ئێوە هەستن‌و شەو نوێژ بکەن، (ئەگەر ئەم **کارانە بکەن) ئەوە** بەئاسوودەیی دەچنە بەهەشتەوە).

**ئایەتی (٦٣) سورەتی (النور)**: قال رسول الله(ﷺ): (مثلي ومثلكم كمثل رجل استوقد ناراً فلما ٠

﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم﴾ ئایا ئەتان زانیوە کە بەڕاستی خوا ڕامی هێناوە بۆتان ﴿مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوەی لەئاسمانەکان و ئەوەی لەزەوی دایە ﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ﴾ وە نیعمەتەکانی ڕشتووە بەسەرتاندا ﴿ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ چ دیار و ئاشکرا و چ پەنهان و نادیارە ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ﴾ هەندێ لەئادەمی موجادەلە و دەمەقاڵێ دەکات لەبارەی خواوە ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ بەبێ هیچ زانیاریەك یا ڕێنموونی یەك یا کتێبێکی ڕوون کەرەوە. ٢٠) ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ وەکاتێ پێیان بوترێ ﴿اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ شوێن ئەو (ئایینە) بکەون خوا ناردوویەتی یە خوارەوە ﴿قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ دەڵێن نەخێر بەڵکو ئێمە شوێن ئەو (ئایینە) دەکەوین کە باو باپیرانمان لەسەری بوون ﴿أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ﴾ ئەگەرچی شەیتان بانگیان بکات ﴿إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ بۆ سزای ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ. ٢١) ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ﴾ هەرکەسێك بەڕاستی ڕوویکاتە خوا (خۆی بداتە دەست خوا) ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ و چاکەکار بێ (لەگوفتار و کردارا) ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ ئەوە بێگومان دەستی گرتووە بە بەهێزترین دەستە گیرەوە ﴿وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ وە سەرئەنجامی هەموو کارێك تەنها بۆلای خوایە. ٢٢) ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ﴾ وە هەرکەس بێ بڕوا بوو بابێ بڕوایی یەکەی خەفەتبارت نەکات ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ گەڕانەوەیان تەنها بۆلای ئێمەیە ﴿فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا﴾ ئنجا هەواڵیان دەدەینێ بەوەی کردوویانە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا بەوەی لەناو دڵەکاندایە ئاگادارە. ٢٣) ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾ کەمێ ناز و نیعمەتیان پێ دەدەین (لە دنیادا) ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ لەپاشان ناچاریان دەکەین کە بڕۆنە ناو سزای سەختەوە. ٢٤) ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ بێگومان دەڵێن: خوا (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: سوپاس بۆ خوا (کەدان بەو ڕاستی یەدا دەنێن) ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن. ٢٥) ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەر هی خوایە ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی دایە ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ بەڕاستی هەر خوایە بێ نیازی ستایش کراو. ٢٦) ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ﴾ بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لەزەوی دایە قەڵەم و پێنووس بێت ﴿وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ﴾ هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب ﴿مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ﴾ حەوت دەریای تر دوای ئەو(ەی باسکرا)ببێت بەمرەکەب﴿مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾ ووتە و زانراوەکانی خوا دوایی نایەن و تەواو نابن ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زاڵی کار دروستە. ٢٧) ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ﴾ دروست کردنی هەمووتان (لەسەرەتاوە) و زیندووکردنەوەتان ﴿إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ وەك (دروست کردن و زیندوکردنەوەی) تەنیا کەسێك وایە﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾بەڕاستی خوا بیسەری بینایە. ٢٨)

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾




-أضاءت ما حولها جعل الفراش وهذه الدواب اللاتي يقعن في النار يقعن فيها وجعل يحجزهن ويغلبنه فيتقحمن فيها قال: فذلك مثلي ومثلكم أنا آخذ بحجزكم عن النار هلم عن النار فتغلبوني وتتقحمون فيها)(متفق عليه).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (وێنەی من و وێنەی ئوممەتی من وەك پیاوێك وایە ئاگرێکی کردبێتەوە جاکاتێك کەچوار دەوری خۆی ڕۆشن کردەوە جانەوەر پەپولەیەکی زۆری تێ دەکەوێ لەپەیتا پەیتا تێی بکەوێن و بسوتێن و ئەویش زۆر زۆر دووریان بخاتەوە لەئاگرەکە بەڵام ئەوان زۆری بۆ دەهێنن و دەکەونە ناویەوە، فەرمووی ئەوە نموونەی من و نموونەی ئێوەیە ئەوە ئاتێ من کەمەرتان دەگرم و بەزۆر دوورتان دەخەمەوە لەئاگرەکە کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لەدەستم ڕادەپسکێنن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن).

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ﴾ ئایا نەتزانیوە کەبەڕاستی خوا شەو دەکات بەناو ڕۆژدا ﴿وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ وە ڕۆژ دەکات بەناو شەودا ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ وە خۆرو مانگی ڕام هێناوە ﴿كُلٌّ يَجْرِي إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ هەر یەکەیان تاماوەی دیاری کراو (بۆیان) دەگەڕێن ﴿وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە بەڕاستی خوا بەوەی دەیکەن خەبەردارە. ٢٩) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ﴾ ئەمە لەبەر ئەوەیەکە بێگومان تەنها خوا ڕاستە و حەقە ﴿وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الْبَاطِلُ﴾ و بەڕاستی ئەوەی هاواری لێ دەکەن و دەیپەرستن بێجگە لەو(خوا) بەتاڵ و ناڕاستە ﴿وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ وە بێگومان هەر خوا بڵندو گەورەیە. ٣٠) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوە (نەت دیوە) ﴿أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ﴾ کە کەشتیەکان بە چاکەو فەزڵی خوا دەڕۆن لەدەریادا ﴿لِيُرِيَكُمْ مِنْ آيَاتِهِ﴾ بۆ ئەوەی هەندێ لەنیشانەکانی خۆیتان نیشان بدات ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ﴾ چونکە بەڕاستی لەمەدا (کەباسکرا) چەند بەڵگەیە هەیە ﴿لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بۆ هەموو ئارام گرێکی شوکرانە بژێر. ٣١) ﴿وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ﴾ وە هەرکاتێ (لەدەریادا) شەپۆلێکی وەك هەورەکان دایان پۆشێ ﴿دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ (ترسی نوقم بوونیان ببێ) هاوار لەخوا دەکەن دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو ملکەچ دەبن ﴿فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ﴾ ئنجا کاتی (خوا) ڕزگاری کردن بۆ ووشکانی ﴿فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ﴾ ئەوسا هەندێکیان مام ناوەندی یە (هەندێکی تریان کافرە وەدان نانێ بەچاکەی خوادا) ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ کەس نیشانەکانی ئێمە ئینکار ناکات جگە لە پەیمان شکێنانی ناشوکر (سپلە). ٣٢) ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ﴾ ئەی ئادەمی خۆبپارێزن لە (تۆڵەی) پەروەردگارتان ﴿وَاخْشَوْا يَوْمًا﴾ لەو ڕۆژەش بترسن ﴿لَا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ﴾ هیچ باوکێ تاوانی ڕۆڵەکەی هەڵناگرێ ﴿وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا﴾ و هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێك لە تاوانی باوکی هەڵناگرێ ﴿إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ کەواتە با ژیانی دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ وە با شەیتانی فریودەر بە(بیانوی بەزەیی و لێ بوردنی)خوا نەتان خەڵەتێنێ. ٣٣) ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ بەراستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی ﴿وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ﴾ وە هەر خوا باران دەبارێنێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ﴾ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لەمنداڵدانی (دایکان) دایە ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ وە هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوی یەکدا دەمرێ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بەراستی خوا زانا و ئاگادارە. ٣٤)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۚ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ ۚ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾

**ئایەتی (٣٢) سورەتی (الفرقان): قال رسول الله (ﷺ): (ما أذن الله لشيء ما أذن لنبي** حسن **الصوت يتغنى بالقرآن يجهر به)(متفق عليه) پێغەمبەری** خوا(ﷺ) **فەرمووی: (خوا بۆ هیچ شتێك رێگەی نەداوە ئەوەندەی رێگەی بەپێغەمبەرێکی دەنگ خۆش داوە بەدەنگی خۆش قورئان بخوێنێ و دەنگی بەخوێندنی بەرز بکاتەوە).**

**ئایەتی (٥٨) سورەتی (الفرقان): قال رسول الله(ﷺ):** (لو أنكم تتوكلون على الله حق توكله لرزقكم كما يرزق الطير تغدو خماصاً وتروح بطاناً) (رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئێوە پشت بەخوا ببەستن بەو **شێوەی شیاوی پشت** بەستنە بەخوا بێگومان رۆزیتان دەدات وەك چۆن رۆزی باڵندە دەدات سەرلەبەیانیان **بەسکی** قوپاو (برسی) دەرچێ (لە هێلانەکەی) و سەر لەئێوارە بەسکی پڕ (تێری) دەگەڕێتەوە).

## سورەتی ﴿ السجدة ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿الٓمٓ﴾ بە (ئەلیف، لام، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆزانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە. ١) ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانی تێدانی یە ﴿مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە. ٢) ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ ئایا (بێ بڕواکان) دەڵێن: موحەممەد (ﷺ) خۆی ئەم (قورئانەی) هەڵبەستووە ﴿بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ (نەخێر هەڵی نەبەستووە) بەڵکو ئەو (قورئانە) راستە لەلایەن پەروەردگارتەوە (هاتووە) ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا﴾ بۆ ئەوەی بەو (قورئانە) بترسێنی خەڵکێ ﴿مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ کە لە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتووە ﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ بەڵکو ڕێنموونی وەرگرن. ٣) ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ خوا زاتێکە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەدی هێناوە ﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لە شەش ڕۆژدا ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ پاشان بەرز بوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت (ئیمانمان پێیەتی و چۆنیەتیەکەی نازانین) ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ﴾ بێجگە لەو (خوا) هیچ پشتیوان و تکا کارێکتان نی یە ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ دەی بۆ بیرناکەنەوە و پەند وەرناگرن. ٤) ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ خوا هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبات لە ئاسمانەوە تا زەوی (هەتا ڕۆژی دوای) ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾ لە پاشان هەموو ئەو کاروبارە بەرز دەبێتەوە بۆلای خۆی ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ لە ڕۆژێکدا (قیامەتدا) کەئەندازەکەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن. ٥) ﴿ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ ئەو (خوا) زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بە دەسەڵات و میهرەبانە. ٦) ﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ﴾ زاتێکە هەموو شتێکی بەجوانترین شێوە دروست کردووە ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ﴾ جا مرۆڤی لە سەرەتاوە لە قوڕ دروست کرد. ٧) ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ لەپاشان نەوەی مرۆڤی لە پوختەیە لە ئاوی بێ نرخ و قێزەون دروست کردووە. ٨) ﴿ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ﴾ لەپاشان ڕێك و پێکی کرد (بەشێوەی ئادەمی) و فوی کرد بە بەریدا لەڕۆحێك کە خۆی دروستی کرد (دانە پاڵی ڕۆح بۆ لای خوا بۆ ڕێزو تەشریفە) ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ گوێ و چاو و دڵی پێبەخشیوون ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ بەڵام زۆر کەم سوپاسی خوا دەکەن. ٩) ﴿وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (بێ بڕواکان) دەڵێن: ئایا کاتێ (مردین و لەشمان ڕزاو) لە ناو زەویدا گوم بووین ﴿أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ﴾ ئایا (زیندوو دەکرێینەوەو) دروست کردنێکی تازەمان دەبێ ﴿بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ﴾ (وانیە) بەڵکو ئەوان باوەڕیان نی یە بەخزمەت پەروەردگاریان بگەن (بۆ دادگایی قیامەت). ١٠) ﴿قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ فریشتەی گیان کێشان کە گیان کێشانی ئێوەی پێ سپێراوە دەتان مرێنێ ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ لە پاشان بۆ لای پەروەردگارتان دەگەڕێنرێنەوە. ١١)

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ
رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ
﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ
مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾
فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ
وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ
بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ
رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ
عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ
يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ
بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ
لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ
جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟
فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ
لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٦) سورەتی (السجدة):** ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ تورمزی دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ دەڵێت لەسەر چاوەڕوانی کردنی نوێژی عیشا هاتەخوارەوە.

**ئایەتی (٦٧) سورەتی (الفرقان):** قال رسول الله(ﷺ): **(اليد العليا خير من اليد** السفلى وابدأ بمن تعول، وخير الصدقة ما كان عن ظهر غنى ومن يستعفف **يعفه الله ومن يستغن يغنه** الله)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (دەستی سەرەوە **(بەخشەر) چاکترە** لەدەستی خوارەوە (داواکەر) لەوانەوە (بەخشین) دەست پێ بکە کە بەخێویان **دەکەیت. وەچاکترین** ماڵ بەخشین ئەو ماڵ بەخشینەیە لەسەرو پێویستی خۆیەوە بێت، جا هەر-

﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئەگەر دەبینی کاتێ (لەقیامەت دا) تاوانباران ﴿نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لەحوزووری پەروەردگاریاندا (لەخەجاڵەتی دا) سەریان داخستووە ﴿رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾ (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان و بیستمان ﴿فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیاتا) کردەوەی چاك بکەین ﴿إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە دڵنیاین (لەقیامەت). ١٢) ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا﴾ ئەگەر بمانویستایە ڕێنموونیمان بەهەموو کەسێ دەدا ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى﴾ بەڵام بەڵێنی من چەسپاو و جێگیر بووە ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ﴾ کە بێگومان دۆزەخ پڕدەکەم ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ لەپەری و ئادەمی تێکڕا. ١٣) ﴿فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ﴾ کەواتە (سزای دۆزەخ) بچەژن چونکە گەیشتن بەم ڕۆژەتان لەبیرکرد بوو ﴿إِنَّا نَسِينَٰكُمْ﴾ بەڕاستی ئێمەش ئێوەمان لەبیرخۆمان بردەوە ﴿وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ﴾ و سزای بەردەوام بچێژن ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی دەتانکرد (لەدنیا). ١٤) ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ﴾ تەنها کەسانێ باوەڕ بەئایەتەکانی ئێمە دێنن ﴿إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا﴾ هەر کاتێ بەو (ئایەتانە) ئامۆژگاری بکرێن ئەکەون بە ڕوودا بەسوژدە بردنەوە ﴿وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ و بەپاکی ستایشی پەروەردگاریان دەکەن ﴿وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ و خۆیان بەگەورە دانانێن. ١٥) ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ هاوار و نزا لەپەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داوون دەبەخشن. ١٦) ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ﴾ ئینجا هیچ کەس نازانێ ﴿مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئەم پاداشتە (دەدرێتەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەوەی کە کردوویانە. ١٧) ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا﴾ دەی ئایا کەسێ ئیماندار بووبێ ﴿كَمَن كَانَ فَاسِقًا﴾ وەك کەسێکە دەرچووبێ لە ئیمان (فاسق بووبێ) ﴿لَّا يَسْتَوُۥنَ﴾ هەرگیز چونیەك نین ١٨) ﴿أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا﴾ ئەوە بەهەشتانێکی پڕ ڕێزو خۆشیان بۆ هەیە ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کەدەیان کرد. ١٩) ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟﴾ وە ئەوانەی کە فاسق بوون ﴿فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ ئەوە جێگایان ئاگرە ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ﴾ هەر کاتێ بیانەوێ لە دۆزەخ دەرچن ﴿أُعِيدُوا۟ فِيهَا﴾ دووبارە دەیانگێڕنەوە ناو دۆزەخ ﴿وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ و پێیان دەوترێ بچەژن سزای ئەو ئاگرەی ﴿ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد. ٢٠)

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾




-کـەس خـۆی بپـارێزێ لـەدلوا و سوالکردن خـواش دەیپارێزێ وە هەر کەس بێ نیاز بێ لەدلوا کردن خواش بێ نیـازی دەکـات لێی).

ئایەتی (٧٢) سـورەتی (الفرقـان): قـال رسـول الله(ﷺ): (ألا أنبـئكم بـأكبر الكبائر؟ قلنا: بلى يا رسول الله، قال: الإشـراك بـالله وعقـوق الوالـدين، وكان متكئاً فجلس فقـال: ألا وقـول الزور وشهادة الزور، فما زال يكررهـا حتـى قلنـا ليتـه سكت)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا پێتان بڵێم کەگەورەترین گوناهی گەورە چی یە، ئێمەش ووتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی، هاوبەش دانان بۆ خوای گەورەو سەرپێچی دایک و باوک، پێغەمبەر(ﷺ) شانی دادا بوو جا ڕاست دانیشت و فەرمووی: ئاگاداربن هەروەها قسەی شایەتی دانی درۆ، ئینجا ئەوەندە ئەم ووتەیەی دووبارە کردەوە هەتا ووتمان خۆزگە بێدەنگ دەبوایە).

﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ﴾ وە بەڕاستی ئێمە سزای دنیایان پێ دەچێژین ﴿دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾ جگەلە سزای هەرە گەورە(ی دۆزەخ) ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تابگەڕێنەوە (بۆ لای خوا). ٢١) ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ﴾ وە کێ ستەمکارترە لەو کەسەی بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری بکرێت ﴿ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ﴾ دوا ئەوە ڕووی وەرگێڕێ ﴿إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆڵە سێنەرین لە تاوانباران. ٢٢) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە تەوراتمان دا بەمووسا ﴿فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾ ئینجا گومانت نەبێ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لە گەشتنت بە مووسا (یاگومانت نەبێ لەگەیشتنی تەورات بە مووسا) ﴿وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ وە ئێمە ئەو (تەوراتە)مان کرد بەڕێنموونیی کەری نەوەی ئیسرائیل. ٢٣) ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً﴾ وە لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ﴿يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا﴾ ڕێنموونیی (خەڵك) یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە ﴿لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾ کاتێ خۆیان گرت و بەئایەتەکانی ئێمە دڵنیا بوون (باوەڕی بتەویان هێنا). ٢٤) ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ﴾ بێگومان پەروەردگارت بڕیار دەدات لەنێوان (بەندەکانی دا) ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەڕۆژی قیامەتدا ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی ئەوان تێیدا جیاواز بوون. ٢٥) ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ ئایا (ڕێگای ڕاست) ڕوون نەبۆتەوە بۆیان ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ کە ئێمە پێش ئەمان زۆر گەل و نەوەمان لەناو بردووە ﴿يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ﴾ ئەمان (بێ باوەڕانی مەککە) بەشوێن و خانووە (وێران کراوە) کانی ئەواندا هاتوو چۆ دەکەن ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەڕاستی لە (تیاچوونی) ئەواندا چەند بەڵگەی گەورە هەیە ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە (ئەو ڕاستییانە) نابیستن. ٢٦) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا نابینن و نازانن ﴿أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ﴾ کە ئێمە ئاو دەنێرین بۆ زەوی ووشکی بێ ڕووەك ﴿فَنُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا﴾ ئنجا بە هۆی ئەو (ئاوەوە) کشتوکاڵ و گژوگیا دەڕوێنین ﴿تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ﴾ کە ئاژەڵیان لێ دەلەوەڕێ و خۆشیان لێی دەخۆن ﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە نابینن. ٢٧) ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ﴾ وە(بێ باوەڕانی مەککە بە موسڵمانان) دەڵێن ئەم حوکم و بڕیاردانی قیامەتە،کەی دەبێ ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن. ٢٨) ﴿قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ڕۆژی بڕیاردانی قیامەت باوەڕ هێنان سوود ناگەیەنێ بەوانەی بێ باوەڕ بوون لە دنیادا ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ و مۆڵەتیشیان پێ نادرێ. ٢٩) ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ جا (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ڕوویان لێ وەرگێڕە و گوێیان مەدەرێ ﴿وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾ وە تۆ چاوەڕوانی بکە بێگومان ئەوانیش چاوەڕوانن. ٣٠)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن
رَّبِّكَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ
وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي
جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ
وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ
يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ
هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ
فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم
بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا
﴿٥﴾ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ
وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم
مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥) سورەتی (الأحزاب): ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ﴾ بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئێمە زەیدی کوڕی حارثەی خزمەتکاری پێغەمبەری خوامان (ﷺ) هەر** بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرد هەتا ئایەتی ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ﴾ **هاتە خوارەوە.**

**ئایەتی (٧٤) سورەتی (الفرقان):** قال رسول الله(ﷺ): (من سن في الإسلام سنة حسنة فله أجرها **وأجر من عمل بها بعده** من غير أن ينقص من أجورهم شيء، ومن سن في الإسلام سنة سيئة كان عليه وزرها **ووزر من عمل** بها من بعده من غير أن ينقص من أوزارهم شيء) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك لەئیسلامدا ڕێباز و باوێکی چاك دابهێنێ ئەوە پاداشتی-

## سورەتی ﴿ الاحزاب ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) (بەردەوام) لە خوا بترسە ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ بە گوێی کافران و دووڕووەکان مەکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بێگومان خوا زانای کار بەجێیە. ١) ﴿وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ وە شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە سرووش کراوە بۆت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بەراستی خوا بەوەی کەدەیکەن ئاگادارە. ٢) ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ پشت هەر بەخوا ببەستە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ وە خوا بەسە پارێزەر بێت. ٣) ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ﴾ خوا دایینەناوە بۆ هیچ پیاوێك (ئادەمییەك) ﴿مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦ﴾ دوو دڵ لە ناوسنگیدا ﴿وَمَا جَعَلَ أَزۡوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي﴾ وە(خوا) ئەو هاوسەرانەتانی نەکردۆتە﴿تُظَٰهِرُونَ مِنۡهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمۡ﴾ دایکتان کە (ظهار) یان لەگەڵ دەکەن (پێیان دەڵێن ئێوە وەك پشتی دایکمان وان بۆ ئێمە) ﴿وَمَا جَعَلَ أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾ وەخوا بە کوڕ کراوەکانتانی نەکردۆتە کوڕتان ﴿ذَٰلِكُمۡ قَوۡلُكُم بِأَفۡوَٰهِكُمۡ﴾ ئەوە قسەی سەر زارەکی تانە ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلۡحَقَّ﴾ خواش ووتەی راست دەڵێ ﴿وَهُوَ يَهۡدِي ٱلسَّبِيلَ﴾ هەر ئەویش رێنموونیی(خەڵك) دەکات بۆ رێگای راست. ٤) ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ﴾ (ئەو بە کوڕکراوانە) بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن ﴿هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە راسترە بەلای خواوە ﴿فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ﴾ ئینجا ئەگەر باوکیان نەناسن(تابەناویانەوە بانگیان بکەن) ﴿فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ﴾ ئەوانە برای ئایینی و دۆست و خۆشەویستانن ﴿وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە لەو (بانگ کردنەدا) کە بە نەزانین گوتبێتان (پێش هاتنی ئەم ئایەتە) ﴿وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡ﴾ بەڵام (گوناهبار دەبن) ئەگەر بەدڵ و بەدەس ئەنقەست بیکەن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا﴾ وە خوا لێبووردەی میهرەبانە. ٥) ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾ پێغەمبەر (ﷺ) لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە ﴿وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ﴾ خێزانەکانیشی دایکی باوەڕدارانن ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ﴾ و ئەوانە (بە نەسەب) خزمی یەکترن (ئەگەر موسڵمان بن) ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ لەقورئانی خودا بۆیەکتری لە پێشترن (میرات لە یەکتر بەرن) ﴿مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾ لە ئیمانداران و کۆچەران (کە خزم نین)﴿إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗا﴾ مەگەر خۆتان چاکەیەك (بەخشین یا وەسێتێ) بە دۆست و خۆشەویستانتان بکەن ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا﴾ ئەو بڕیارە لە قورئاندا (لوح المحفوظ دا) نووسراوە. ٦)

وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾
لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا
﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ
جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ
مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ
وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟
زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم
مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ
مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ
مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا
فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ
لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟
ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾

-ئەو دڵهێنانەی بۆ هەیە لەگەڵ پاداشتی ئەوانەی لەدوا خۆی کاری پێ دەکەن بێ ئەوەی هیچ لەپاداشتی ئەوان کەم بکاتەوە، وەهەر کەسێك لەئیسلامدا باوو ڕێبازێکی خراپ دابهێنێ ئەوە گوناهی ئەو دڵهێنانەی لەسەرە لەگەڵ گوناهی ئەوانەی دوا خۆی کاری پێ دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ لەگوناهی ئەوانە کەم بکاتەوە).

**ئایەتی (٨٧) سورەتی (الشعراء):**

**قال رسول** الله(ﷺ): **(يلقى إبراهيم ربه** فيقول: يا رب إنك وعدتني أن لا تخزني يوم يبعثون فيقول الله تعالى: إني حرمت الجنة على **الكافرين)(رواه البخاري).** پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئیبراهیم پێغەمبەر(ﷺ) بەخزمەت بەپەروەردگاری **دەگاتو پێ ی** دەفەرموێت: ئەی پەروەردگارم تۆ بەڵێنت پێ دام کەسەر شۆڕم نەکەیت (باوکم بخەیتە دۆزەخەوە) **لەڕۆژی زیندوو** بونەوەدا خوای گەورە دەفەرموێت: من بەهەشتم لە بێ بڕوایان حەرام کردووە).

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ) بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران ﴿وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ هەروەها لە تۆ و نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسای کوڕی مەریەم ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا﴾ وە لە هەموویان پەیمانی بەهێزو بتەومان وەرگرت. ٧) ﴿لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) پرسیار لەراست گۆیان بکات دەربارەی راستییان ﴿وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ و سزای پڕ ئێش و ئازاریشی ئامادە کردووە بۆ بێ باوەڕان. ٨) ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُوا نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیر لەچاکە و بەهرەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ﴾ کاتێ لە شکرێکی زۆرتان بۆ هات (لە جەنگی خەندەقدا) ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا﴾ ئینجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆ ناردن ﴿وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ و لەشکری (فریشتەش) کە ئێوە نەتان بینین ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ وەخوا بەوەی ئێوە دەیکەن بینایە. ٩) ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾ کاتێ (بێ باوەڕان) هێرشیان بۆ هێنان لە سەرووتانەوە و لە خوارتانەوە (چوار دەوری مەدینەیان گرت) ﴿وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ﴾ وە چاوەکان ئەبڵەق بوون ﴿وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ﴾ و دڵەکان (لە ترسا) گەیشتبوونە گەروو ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا﴾ و گومانی جۆریە جۆرتان بە خوا دەبرد. ١٠) ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوە ﴿وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ و راوەشێنران بەراوەشاندنێکی توند. ١١) ﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ (بیربکەنەوە) کاتێ دوو رووەکان و ئەوانەی لە دڵیاندا نەخۆشی هەبوو ووتیان ﴿مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾ خواو پێغەمبەرەکەی بێجگە لە تەفەرەدان هیچ بەڵێنێکیان پێ نەداین. ١٢) ﴿وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ﴾ وە کاتێ دەستەیە لەو (دووڕووانە) ووتیان: ﴿يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا﴾ ئەی دانیشتوانی مەدینە ئێرە جێی مانەوەتان نی یە دەی بگەڕێنەوە ﴿وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ﴾ وە کۆمەڵێ تر لەوان مۆڵەتی گەڕانەوە لەپێغەمبەر (ﷺ) دەخوازن ﴿يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ﴾ دەیان ووت: خانووەکانمان بێ پارێزەر و رووت و کەلێناویە ﴿وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ﴾ لەکاتێکدا واش نەبوو (کەدەیان ووت) ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ ئەوان تەنها مەبەستیان هەڵهاتن بوو. ١٣) ﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا﴾ وە ئەگەر هێرش بهێنرایەتە سەریان لە هەموو لایەکی (مەدینە)وە ﴿ثُمَّ سُئِلُوا ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا﴾ ئنجا داوای کافربوون و جەنگ کردنیان لێ بکرایە (دژ بەتۆ ئەی موحەممەد (ﷺ)) داواکەیان بەجێ دەهێنا (و بەگوێیان دەکردن) ﴿وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا﴾ وە ئەم داوایان دوانەدەخست ماوەیەکی کەم نەبێت. ١٤) ﴿وَلَقَدْ كَانُوا عَـٰهَدُوا ٱللَّهَ مِن قَبْلُ﴾ بێگومان ئەوانە لەپێش ئەم (روداوە) پەیمانیان بە خوا دابوو ﴿لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ﴾ کە (لە غەزادا) پشت هەڵناکەن و راناکەن ﴿وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا﴾ وە پەیمانێ درا بە خوا (خاوەنەکەی) لێپرسراو دەبێ. ١٥)

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُواْ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّواْ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ وَلَوْ كَانُواْ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓاْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

ئایەتی (٢١٤) سورەتی (الشعراء): قال رسول الله(ﷺ): (لما أنزلت هذه الآية ﴿وأنذر عشيرتك الأقربين﴾ دعا رسول الله(ﷺ) قريشاً فاجتمعوا فعم وخص فقال: يا بني كعب بن لؤي أنقذوا أنفسهم من النار، يا بني مرة بن كعب أنقذوا أنفسكم من النار، يا بني عبد شمس أنقذوا أنفسكم من النار، يا بني عبد مناف أنقذوا أنفسهم من النار، يابني هاشم أنقذوا أنفسكم من النار، يا بني عبد المطلب أنقذوا أنفسكم من النار، يا فاطمة أنقذي نفسك من النار، فإني لا أملك لكم من الله شيئاً غير أن لكم رحماً سأبلها ببلالها)(رواه مسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزایی خوای لێ بێ) دەڵێت کەئایەتی ﴿وأنذر عشيرتك الأقربين﴾ هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموو قورەیشی بانگ کرد ئەوانیش کۆبوونەوە، جا بەگشتی و بەتایبەتی ئاگاداری کردن فەرمووی ئەی نەوەی-

﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ﴾(ئەی موحەممەد (ﷺ) بەدووڕووەکان) بڵێ هەڵهاتن سوودتان پێ ناگەیەنێ﴿إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ﴾ ئەگەر لەمردن یاکوشتن هەڵبێن (خۆتان بدزنەوە)﴿وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾جا لەوکاتەدا بەهەرحاڵ خۆشی ژیانتان پێ نادرێ ماوەیەکی کەم نەبێ. ١٦)﴿قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ کێیەئەو کەسەی ئێوە لەخوا دەپارێزێ ﴿إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً﴾ئەگەر خوا زیان و خراپە یا بەزەیی و رەحمەتی بۆ ئێوە بوێ ﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا بۆ ئەوان نی یە ﴿وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾هیچ پشتیوان و یارمەتی دەرێك. ١٧)﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ﴾بێگومان خوا دەزانێ بەو کەسانەتان کەساردکەرەوە و گەڕێنەرەوەی (موسڵمانان لەجیهاد)﴿وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا﴾کەبە برادەرەکانیان دەڵێن:وەرن بۆلای ئێمە(وخۆیان دەدزییەوە لەجیهاد)﴿وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ئەوانەنایەن بۆ جەنگ و غەزا زۆر بەکەمی نەبێ. ١٨)﴿أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ﴾لەئاستی ئێوەدا (موسڵمانان) چرووکن ﴿فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ﴾ئنجا کاتێ (بەهۆی جەنگەوە) ترس و بیم پەیدا بێت ﴿رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ﴾ دەیان بینی بەجۆرێ سەیرت دەکەن (لەترسی جەنگ) ﴿تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ﴾ چاویان بەم لاولادا دەسوڕێ ﴿كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ﴾ بەوێنەی کەسێ لەسەرەمەرگدا بێهۆشی بەسەردا بێ ﴿فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ﴾ بەڵام کاتێ ترسەکە ڕۆشت و نەما ﴿سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ بەزمانی تیژ زمانتان لێ درێژ دەکەن (وە داوای غەنیمەتتان لێ دەکەن) ﴿أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ﴾ کەچی چرووك و رژدەن لەسەرماڵ و غەنیمەت ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟﴾ ئائەوانە باوەڕیان نەهێنا بوو ﴿فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ بۆیە خوا کردەوەیانی پوچەڵ کردەوە ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ وەئەمە بەلای خواوە (کارێکی) ئاسانە. ١٩)﴿يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟﴾ وایان دەزانی کۆمەڵەکان (لەشکریان هێنابوو) نەڕۆشتوون ﴿وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ﴾ وە ئەگەر ئەو کۆمەڵانە بگەڕێنەوە (بۆسەر مەدینە) ﴿يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ﴾ ئاواتیان دەخواست کە لەناو عەرەبی دەشتەکی یەکان بەدوو بوونایە (لەترسی جەنگ) ﴿يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ﴾ لەدوورەوە پرسیاریان لەهەواڵی ئێوە بکردایە ﴿وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم﴾ وە ئەگەر لەناو ئێوەدا بوونایە ﴿مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا﴾ جەنگیان نەدەکرد زۆر بەکەمی نەبێ. ٢٠)﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆ ئێوە هەیە﴿أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾سەرمەشقی وپێشەوایەتی چاك ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ﴾ بۆکەسێ بەهیوای خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی یە ﴿وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ وە زۆر یادی خوا دەکات. ٢١)﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ﴾وەکاتێ ئیمانداران ئەو کۆمەڵانەیان دی (لەشکریان هێنا بوو بۆ سەر مەدینە) ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ ووتیان ئەمە ئەو بەڵێنەیە خوا و پێغەمبەرە کە بە ئێمەیان دابوو ﴿وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾ (ئەو هەموو هێزی کوفرە) تەنها ئیمان و ملکەچیان پێی زیادی کرد. ٢٢)

مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾

**هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتی (٢٣) سـورەتی (الأحزاب): ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾ بوخـاری لـە ئەنەسەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت)** دەگێڕێتـەوە دەڵێت: ئەنەسی کـوڕی نـەضـری مـامم بەشـداری شەڕی بەدر نەبوو وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) من ئامـادە نەبووم لە یەکـەم شەڕێ کە کردت لە دژی کافران سوێند بێ ئەگەر خوای گەورە بەشدارم بکات لە جـەنگ دژی بێ باوەڕان، خوای گەورە نیشانت دەدات چی یان لێ دەکـەم ، ئنجا کـاتێ غـەزای ئوحـود ڕووی داو موسوڵمانان شکان مامم وتی: ئەی خوایە من مەعزەرەتت بۆ دەکەم لە هەڵهاتنی ئەو موسوڵمانانەو دورە پەرێزیشم لەو لەو کارانەی کە ئەو کافرانە ئەنجامی دەدەن و پاشان بەرەو پێش –

﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ﴾ لەناو باوەڕداران دا پیاوانێک هەن ﴿صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ﴾ ڕاستیان کرد لە ئەو پەیمانەی کە دابویان بەخوا ﴿فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ﴾ ئنجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو) ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ﴾ هەندێکیشیان چاوەڕوانن ﴿وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا﴾ هیچ گۆڕانێکیان (لەبەڵێنی خۆیان دا) نەکردووە. ٢٣) ﴿لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) پاداشتی ڕاست گۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستی یەکەیانەوە ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ﴾ وە سزای دوو ڕووەکان بدات ئەگەر بیەوێ ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ یاتەوبەیان لێ وەرگرێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە. ٢٤) ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ﴾ وە خوا کافرەکانی (قوریش لەشکریان هێنابوو بۆ سەر مەدینە) گەڕاندەوە بەرق و مەراقەوە (بۆ وڵاتی خۆیان) ﴿لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ﴾ هیچ خێر و ئاواتێکیان (لەناوبردنی ئیمانداران) دەست نەکەوت ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ﴾ خوا ئیمان دارانی لەجەنگ پاراست (بەهۆی بای توند و فریشتەوە کافرانی پرژو بڵاوکرد) ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا﴾ وەخوا هەمیشە بەهێزی بەدەسەڵاتە. ٢٥) ﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ خوا (بەنی قورەیزە) کەپشتگیری ئەوان (قورەیش و غەطفان)یان کرد هێنانی یە خوارەوە ﴿مِن صَيَاصِيهِمۡ﴾ لەقەڵاکانیان ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ﴾ وە ترسی خستە ناو دڵیانەوە ﴿فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ﴾ کۆمەڵێکیان دەکوژن ﴿وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا﴾ وە کۆمەڵێکی تریان بەدیل دەگرن. ٢٦) ﴿وَأَوۡرَثَكُمۡ أَرۡضَهُمۡ وَدِيَٰرَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُمۡ﴾(دوای تیاچوونی ئەوان خوا) زەوی و خانوو سامانی ئەوانی دا بەئێوە ﴿وَأَرۡضٗا لَّمۡ تَطَـُٔوهَاۚ﴾ هەروەها زەوی یەکیش کەپێتان پیانەنابوو ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا﴾ وەخوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ٢٧) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەخێزانەکانت بڵێ ﴿إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا﴾ ئەگەر ئێوە ژیانی دنیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێ ﴿فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ﴾ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم (موتعە پارە و شتومەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاق دراو) ﴿وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾ وە طەڵاقتان بدەم بە طەڵاق دانێکی چاك و بێ زیان. ٢٨) ﴿وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی دوایی تان دەوێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ﴾ ئەوە بێگومان خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکەکاران لەئێوە ﴿أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ پاداشتێکی گەورە. ٢٩) ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾ هەر کام لە ئێوە گوناهێکی گەورە بکات ﴿يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ﴾ سزای بۆ دوو بەرابەر دەکرێتەوە بەدوو قاتی (خەڵکی تر) ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ وەئەم دووقات کردنەوە بۆ خوا ئاسانە. ٣٠)

۞ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾

-ڕۆیشت بۆ بێ باوەڕان و سەعدی کوڕی موعاذ هاتە بەردەمی ووتی: ئەی سەعد بەهەشت لە بەردەممانداییە سوێند بێت بە خوای نەضر بۆنی دێت بەسەرمدا لە نزیک کێوی ئوحودەوە سەعد ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو جەنگەی ئەو کردی من نەم دەتوانی بیکەم جا ئەنەسی کوڕی مالیک ووتی: کاتێک دۆزیمانەوە هەشتاو ئەوەندە برینداری پێوە بوو لە شمشێر و ڕم و تیر وە دوای ئەوە کە شەهیدیان کردبوو لووت و گوێیان بڕی بوو بە جۆرێ تەنها خوشکەکەی بەسەر پەنجەیدا ناسیەوە ئەنەس ووتی: ئێمە پێمان وا بوو کە ئەم ئایەتە لە ئەنەسی کوڕی نەضر و هاو شێوەکانی دا دابەزی ﴿مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾.

﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (ئەی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)) هەر کام لەئێوە لەسەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بەردەوام بێت ﴿وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ وە کردەوەی چاکیش بکات ﴿نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾ دووجار پاداشتی پێ دەدەین ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ وە ڕۆزییەکی چاکیش خۆشمان بۆ ئامادە کردووە (لەبەهەشت دا). ٣١) ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەی ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ ئێوەوەک هیچ یەک لەئافرەتانی دیکە نین ﴿إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ﴾ ئەگەر خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ﴾ کەواتە بەخەمزەو نازەوە قسە مەکەن (وەک ئافرەتانی ڕەوشت نزم) ﴿فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ﴾ نەوەکو ئەوەی کەدڵی نەخۆشە (دەروون نزمە) نیازی خراپ بکات ﴿وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ وە قسەی چاکو بەجێ بکەن. ٣٢) ﴿وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ﴾ وە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾ وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لەناو خەڵکی نامەحرەمدا) وەکو خۆ دەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەکەم (پێش ئیسلام) ﴿وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی خوا دەیەوێ ﴿لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ ئەی ئاڵو بەیتی (پێغەمبەر (ﷺ) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لەئێوە دووربخاتەوە ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ و پاك و خاوێنتان بکاتەوە بەتەواوی. ٣٣) ﴿وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ﴾ وە بیربکەنەوە لەوەی دەخوێنرێت لەماڵەکانتاندا ﴿مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ﴾ لەئایەتەکانی خواو دانایی (فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا وردبینی ئاگادارە. ٣٤) ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾ بەڕاستی پیاوەموسڵمانەکان و ئافرەتە موسڵمانەکان ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾ و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾ و پیاوە ڕاست گۆکان و ئافرەتە ڕاست گۆکان ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾ و پیاوان و ئافرەتانی خۆگر و بەئارام ﴿وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾ وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لەخوا ترس ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ﴾ و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾ و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾ پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾ پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کەزۆر یادی خوا دەکەن ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان ﴿مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ لێخۆشبوون و پاداشتێ گەورە. ٣٥)

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (٢٥) سورەتی (الأحزاب): ﴿وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ﴾ نەسائی لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی سەعیدەوە ئەویش لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: لە کاتی غەزای خەندەق دا هاوبەش پەیداکەرەکان سەرگەرمیان کردین لە ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ هەتا** خۆرئاوا بوو ئەم ڕووداوەش پێش هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە بوو **﴿وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ﴾** جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە بیلال ئەویش قامەتی کرد بۆ **نوێژی نیوەڕۆ ئیتر** پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆکەی کرد (پاش خۆرئاوا بوون)وەك چۆن **لە کاتی خۆیدا دەیکرد** پاشان قامەتی کرد بۆ نوێژی عەسرو نوێژی عەسریشی کرد هەروەك-

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾ بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی باوەڕدار نییە ﴿إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا﴾ کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ (بۆیان نی یە) کەسەرپشك بن لەکارەکەیاندا ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ وە هەر کەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕا بونێکی ئاشکرا. ٣٦) ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێ دەدووت بەکەسێ (زەیدی کوڕی حاریثە) کەخوا بەهرەی بەسەردا ڕشتبوو تۆیش چاکەت لەگەڵدا کردبوو (بەئازاد کردنی و پەروەردەکردنی) ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾ خێزانت (زەینەب) لای خۆت ڕاگرەو بیهێڵەوە ﴿وَٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسە ﴿وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ لەدڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کەخوا ئاشکرای دەکات ﴿وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ وە لە(قسەی) خەڵك دەترسی لەکاتێکدا خوا شیاوترە کەلێی بترسی ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا﴾ ئینجا کاتێ زەید پێویستی بەو (زەینەب)نەما و تەڵاقی دا ﴿زَوَّجْنَٰكَهَا﴾ ئێمە ئەو (زەینەب)مان لێ مارەکردی ﴿لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ﴾ بۆ ئەوەی هیچ نارەحەتی (وتاوانێ) نەبێت لەسەر ئیمانداران ﴿فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾ لە(مارەکردنی) ژنانی بەکوڕ کراوەکانیاندا ﴿إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾ کاتێ پێویستیان پێیان نەماو تەڵاقیان دان ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ وە فەرمانی خوا (بەمارە کردنی زەینەب بۆت) دراوە و بڕاوەیە. ٣٧) ﴿مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ﴾ هیچ نارەحەتی (تاوان) ێك لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) نییە ﴿فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾ لە(مارە کردنی زەینەب) کەخوا بڕیاری داوە بۆی ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ﴾ باوو ڕێگای (دانراوی) خوایە ﴿فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ﴾ لە ناو پێغەمبەرانی لەمەوپێشدا ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ وە فەرمانی خواش بڕیارێکی بڕیار دراوە. ٣٨) ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەسانێ کەپەیامەکانی خوا ڕادەگەیەنن ﴿وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ﴾ وە لە(خوا) دەترسن و بێجگە لەخوا لەکەسی تر ناترسن ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ خوا بەسە بەچاودێر. ٣٩) ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ موحەممەد (ﷺ) باوکی هیچ یەك لەپیاوەکانتان نییە ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّۦنَ﴾ بەڵکو ئەو نێردراوی خواو کۆتا هەمینی پێغەمبەرانە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ وە خوا بەهەموو شتێك زانایە. ٤٠) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ زۆر یادی خوا بکەن. ٤١) ﴿وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ بەپاکی یادی خوا بکەن بەبەیانیان و ئێواراندا. ٤٢) ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ﴾ ئەو زاتێکە بەزەیی خۆی دەڕژێنێ بەسەرتاندا ﴿وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ﴾ و فریشتەکانی داوا لێبوردنتان بۆ دەکەن ﴿لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ بەو هۆیەوە (خوا) لەتاریکی یەکانەوە دەرتان دێنێ بەرەو نورو ڕووناکی (ئیمان و ئیسلام) ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران. ٤٣)

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾

**-چۆن لە کاتی خۆیدا دەیکرد پاشان بیلال بانگی مەغریبی دا و** پێغەمبەری **خوا** (ﷺ) نوێژی مەغریبی کرد **هەروەك چۆن لە کاتی خۆیدا ئەنجامی دەدا.**

**هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایـەتی** (٢٨، **٢٩) سورەتی (الاحزاب): ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ** ....﴾موسلیم لە **عەبدوڵای کوڕی** جابیرەوە دەگێڕێتەوە کە ووتویەتی : ئەبوبەکر ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) داوای مۆڵەتی کرد بچێتە ژورەوە **بینی** خەڵك لە بەردەرگاکەیدا دانیشتوون مۆڵەت بە هیچ کەسێکیان نەدراوە بۆ چونە ژورەوە جابیر ووتی: **مۆڵەت درا** بە ئەبوبەکر و ڕۆشتە ژورەوە پاشان عومەر هات مۆڵەتی چونەژورەوەی خواست ئەویش مۆڵەتی پێ درا بینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتووە و خێزانەکانیشی -

﴿تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞۚ﴾ ڕۆژێ باوەڕداران دەگەنە خزمەت ئەو (خوا) بەخێرهاتنیان بە(ووشەی) سەلامە﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَرِيمٗا﴾ وە خوا پاداشتی چاکی بۆ ئامادە کردوون. ٤٤﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان ئێمە تۆمان ناردووە (بۆ خەڵکی)﴿شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ بەشایەتو مژدە دەرو ترسێنەر. ٤٥﴿وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ﴾ و بەبانگ خوازێ بۆ (ڕێگەی) خوا بەفەرمانی ئەو﴿وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا﴾ و چرایەکی ڕووناك کەرەوە. ٤٦﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم﴾ وە مژدە بدە بەئیمانداران کەبێگومان بۆ ئەوان هەیە﴿مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا﴾ بەهرەو بەخششێکی گەورە لەلایەن خواوە. ٤٧﴿وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ گوێڕایەڵی کافرانو دوو ڕووان مەکە﴿وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ﴾ گوێ مەدە بەئازار دانی ئەوان (بۆ تۆ) ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ وپشت هەر بەخوا ببەستە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾ وە خوا بەسە کەپشتیوان بێت. ٤٨﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ کاتێ ئافرەتانی ئیماندارتان مارە کرد ﴿ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ لەپاشان لەپێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاقتان دان ﴿فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ﴾ ئەوە لەسەریان نییە بۆ ئێوە هیچ عیددەیەك هەڵ ژمێرن ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ﴾ کەواتە موتعەیان (پۆشاك و نوێن بۆ دڵخۆشیان) بدەنێو طەڵاقیان بدەن ﴿سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾ بەطەڵاقدانێکی جوان و پیاوانە. ٤٩﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان ئێمە حەڵاڵمان کرد بۆ تۆ ﴿أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەو هاوسەرانەت کەمارەییت پێ داوون ﴿وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ﴾ هەروەها ئەو کەنیزەکانەی خوا دەست تۆی خست (بەهۆی زاڵ بوونت بەسەر کافراندا) ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ﴾ و (بۆمان حەڵاڵ کردویت) کچانی مامت و کچانی پورت (خوشکی باوکت) ﴿وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ﴾ و کچانی خاڵت و کچانی پورت (خوشکی دایکت) ﴿ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ﴾ ئەوانەی کەکۆچیان کرد لەگەڵت ﴿وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾ هەروەها ئافرەتێکی ئیماندار ئەگەر خۆی ببەخشێ بەپێغەمبەر (بەبێ مارەیی) ﴿إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا﴾ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) ویستی مارەی بکات ﴿خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ﴾ (ئەمەیان) تەنیا بۆ تۆ دروستە بەجیا لەئیماندارانی تر ﴿قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ﴾ بەڕاستی ئێمە دەزانین چیمان پێویست کردووە لەسەر ئیمانداران ﴿فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ﴾ دەربارەی هاوسەرەکانیانو کەنیزەکەکانیان ﴿لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ﴾ لەبەر ئەوەی هیچ لەلات زەحمەت و گران نەبێ (کەشتانێکت بەجیا لە موسڵمانان بۆت دروستە)﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾وە خوا لێبوردەی میهرەبانە. ٥٠)

۞ تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ وَلَا يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبۡدُواْ شَيۡـًٔا أَوۡ تُخۡفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٥٤﴾

=بە خەفەتباری و بە بێ دەنگی بەدەوریدا دانیشتوون پاشان عومەر ووتی: سوێند بەخوا قسەیەك دەكەم پێغەمبەر (ﷺ) پێ بكەنێ ووتی: خۆزگە ئەی پێغەمبەر چاوت لێ بوایە خێزانم داوای نەفەقەی لێ دەكردم منیش هەڵسامەوە بۆی و دام بەگەردنیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ كەنی ووتی: (ئەم هاوسەرانەی منیش كە دەیان بینی بەدەوری مندان داوای نەفەقەم لێ دەكەن) ئەبوبەكر هەستا بۆ عائیشە ماڵی بەگەردنیدا هەروەها عومەریش ماڵی بەگەردنی حەفصەداو هەردووكیان دەیان ووت پێیان داوای شتێك دەكەن لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) كەنیەتی؟ ئەوانیش ووتیان سوێند بەخوا هەرگیز داوای شتێك ناكەین لەپێغەمبەر (ﷺ) كە نەیبێت پاشان مانگێك یان بیست و نۆ رۆژ دوور كەوتەوە لێیان و جێی لێ جیاكردنەوە جا ئەم =

﴿تُرۡجِی مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ) سەرەی) هەریەکێ لەخێزانەکانت ویست دوای بخە ﴿وَتُـٔۡوِیۤ إِلَیۡكَ مَن تَشَآءُ﴾ و هەر یەکێ لەوانت ویست (پێشی بخەو) بیهێنە بۆ لای خۆت ﴿وَمَنِ ٱبۡتَغَیۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ﴾ وە هەر کامت بوێ (بێتە لات) لەوانەی وازت لـێ هێناون ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَیۡكَ﴾ هیچ گوناهێکت لەسەر نییە ﴿ذَ ٰلِكَ أَدۡنَىٰۤ أَن تَقَرَّ أَعۡیُنُهُنَّ﴾ ئەو (سەرپشك کردنە) نزیك ترە کەچاوو دڵیانی پـێ گەش بێتەوە ﴿وَلَا یَحۡزَنَّ﴾ و خەفەت نەخۆن ﴿وَیَرۡضَیۡنَ بِمَاۤ ءَاتَیۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾ و هەموویان رازی بن بەوەی کەپێت داوون ﴿وَٱللَّهُ یَعۡلَمُ مَا فِی قُلُوبِكُمۡ﴾ وە خوا دەزانێ بەوەی کە لەدڵتاندایە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِیمًا حَلِیمًا﴾ وە خوا زانای لەسەر خۆیە. ٥١) ﴿لَّا یَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَاۤءُ مِنۢ بَعۡدُ﴾ دوای ئەمانە (کە هاوسەرتن) هیچ ئافرەتێکت بۆ حەڵاڵ نییە ﴿وَلَاۤ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَ ٰجࣲ﴾ و ناشتوانی بیان گۆڕی بەهاوسەرانی تر ﴿وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ﴾ هەرچەندە بە جوانیان سەرسام بیت (رێکەو پێکییان سەرنجت رابکێشێ) ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتۡ یَمِینُكَ﴾ مەگەر وەك کەنیزەك ببیتە خاوەنی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَیۡءࣲ رَّقِیبࣰا﴾ وەخوا بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە. ٥٢) ﴿یَـٰۤأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُوا۟﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تَدۡخُلُوا۟ بُیُوتَ ٱلنَّبِیِّ﴾ مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ﴿إِلَّاۤ أَن یُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ﴾ مەگـەر رێگـەتان پـێ بـدرێ بـۆ نـان خواردنێك ﴿غَیۡرَ نَـٰظِرِینَ إِنَىٰهُ﴾ بـێ ئـەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن ﴿وَلَـٰكِنۡ إِذَا دُعِیتُمۡ فَٱدۡخُلُوا۟﴾ بەڵام ئەگەر بانگ کران (بۆنان خواردن) ئەوسا برۆنـە ژوورەوە ﴿فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُوا۟﴾ ئینجا ئەگـەر خواردنەکـەتان خـوارد بڵاوەی لێ بکەن ﴿وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِینَ لِحَدِیثٍ﴾ وە مەمێننەوە بۆ قسە کردن ﴿إِنَّ ذَ ٰلِكُمۡ كَانَ یُؤۡذِی ٱلنَّبِیَّ﴾ چـونکە بەڕاسـتی ئـەو (مانـەوەتان) ئـازاری پێغەمبـەر (ﷺ) دەدات ﴿فَیَسۡتَحۡیِۦ مِنكُمۡ﴾ ئەویش شەرم دەکات لێتان (کە بـێ دەنگـە) ﴿وَٱللَّهُ لَا یَسۡتَحۡیِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾ بەڵام خوا لە(ووتنی) هەق شـەرم ناکات ﴿وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَـٰعࣰا﴾ وە هەر کاتێ داوای شتێکی ناوماڵتان کرد لە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)) ﴿فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَاۤءِ حِجَابࣲ﴾ ئەوە لەپشـتی پەردەوە لێیان داواکـەن ﴿ذَ ٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ ئـەو (شـێوە داوا کردنە)تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوەو ئـەوانیش ﴿وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ بـە هیچ شـێوەیە بۆ ئێوە دروست نی یە ئـازاری (دڵـی) پێغەمبـەری خــوا بـدەن ﴿وَلَاۤ أَن تَنكِحُوۤا۟ أَزۡوَ ٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۤ أَبَدًا﴾ وە هـەرگیز نـابێ خێزانـەکانی پـاش خۆی مارە بکەن ﴿إِنَّ ذَ ٰلِكُمۡ﴾ بەڕاسـتی ئەو (ئازاردانی دڵ و مـارە کـردنە)تان ﴿كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِیمًا﴾ بــەلای خـــواوە (گونـــاهێکی) زلد گـــەورەیە. ٥٣) ﴿إِن تُبۡدُوا۟ شَیۡـًٔا﴾ ئەگـەر هـەر شـتێك ئاشـکرا بکەن (بیڵێن) ﴿أَوۡ تُخۡفُوهُ﴾ یا بی شـارنەوە (لە دڵتاندا) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَیۡءٍ عَلِیمࣰا﴾ ئـەوە بەڕاسـتی خـوا زانایە بـەهەمـوو شتێك. ٥٤)

لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ
إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ
أَيْمَٰنُهُنَّۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ شَهِيدًا
﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا
مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ
بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ
عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَۗ وَكَانَ
ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ
فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِي ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ
بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَۖ
أَيْنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي
ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾

-ئایەتەی بۆ هاتەخوارەوە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ﴾ تا دەگاتە ﴿لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ جابیر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لەعائیشەوە دەستی پێ کردو فەرمووی: ئەی عائیشە دەمەوێت کارێك بخەمە بەر دەستت پێم خۆشە پەلەی تێدا نەکەیت هەتا پرس و ڕا بەباوك و دایکت دەکەیت؟ عائیشەش ووتی ئەو کارە چی یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە عائیشەش ووتی : ئایا دەربارەی تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پرس و ڕا بە باوك و دایکم بکەم ، نەخێر وا ناکەم بەڵکو خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی دواڕۆژ هەڵدەبژێرم وە داوات لێ دەکەم ئەم قسەی من کردم بە هیچ کام لە خێزانەکانت نەڵێیت ، پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: هەر ئافرەتێك لەوان پرسیارم لێ بکات پێی دەڵێم کە خوا منی بە نارەحەت کارو نارەحەت هێنەر نەناردووە بەڵکو بە فێرکەر و ئاسانکار ناردومی.

﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ﴾ (هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ)) هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە ﴿فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ﴾ (ئەگەر بێ حیجاب بن) لای باوکیان و کوڕانیان و برایانیان ﴿وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ﴾ و برازاکانیان و خوشکەزاکانیان ﴿وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ﴾ و لای ئافرەتانی هاو دینیان و لای غولام و کەنیزانی خۆیان ﴿وَاتَّقِينَ اللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ بەڕاستی خوا چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا. ٥٥)﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ﴾ بەڕاستی خواو فریشتەکانی سەلاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ ئێوەش سەلاتو سەلامی زۆری لەسەر بدەن. ٥٦)﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ بەڕاستی کەسانێ کەئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن ﴿لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ خوا نەفرینی لێ کردوون لەدنیا و لەدواڕۆژدا ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُهِينًا﴾ وە سزای ریسواکەری بۆ ئامادەکردوون. ٥٧)﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ وە کەسانێ کەئازاری پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار ئەدەن ﴿بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا﴾ بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێ ﴿فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتۆتە ئەستۆ. ٥٨) ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ بە هاوسەرانت ﴿وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ و بەکچانت و بە ئافرەتانی بڕواداران ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ﴾ با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان و جوانیانی پێ داپۆشن) ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَنْ يُعْرَفْنَ﴾ ئەوە نزیکترە بناسرێن (بەداوێن پاک) ﴿فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. ٥٩)﴿لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ الْمُنَافِقُونَ﴾ بەڕاستی ئەگەر کۆتایی نەهێنن دوو ڕووان ﴿وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ وە کەسانێ لەدڵیاندا نەخۆشی هەیە ﴿وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ﴾ و پڕوپاگەندەچییەکان لەمەدینەدا ﴿لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ﴾ ئێمە تۆ هان دەدەین (بەجەنگ کردن) لەدژیان ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا﴾ پاشان ماوەیەکی کەم نەبێ(لەمەدینەدا) دراوسێت نابن (دەردەکرێن). ٦٠)﴿مَلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوا﴾ (ئەوانە) نەفرین لێ کراون لەهەر کوێ بەر دەست کەوتن ﴿أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا﴾ بەتوندی دەگیرێن و بەکوشتن دەکوژرێن. ٦١)﴿سُنَّةَ اللَّهِ﴾ خوا (ئەوەی کردووە) بەسوننەت و باو ﴿فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ﴾ لەناو کەسانێ کەپێشتر بوون﴿وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ هەرگیز باوو سوننەتی خوا گۆڕانی بۆ نییە. ٦٢)

يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَـٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقَـٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَـٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ﴿٧٣﴾

**هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی (٣٥) سـورەتی (الأحزاب): ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ....﴾** ئورمزی لە ئوم و عـەمارەی ئەنـصاریەوە دەگێڕێتـەوە کـە دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبـەر (ﷺ) ووتـم: هەرچـی شـت دەبینم تەنها بۆ پیاوانە نابینم بە هیچ جۆرێ باسی ئافرەتـان کرابـێ ئیتر ئـەم ئایەتـە هاتـەخوارەوە ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ....﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (٣٧) سورەتی (الأحزاب): ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ....﴾** بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ ئەم ئایەتە ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ....﴾ دەربارەی زەینەبی کچی جەحش و زەیدی کوڕی حارثە دابەزی.

﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خەڵك پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی (بەرپابوونی) ڕۆژی دوایی ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ بڵێ زانینی (بەرپا بوونی) ئەو ڕۆژە تەنیا لای خوایە ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾ تۆ چوزانیت ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیك بێت (بەڵام خەڵك نازانن). ٦٣) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا نەفرینی لە بێ باوەڕان كردووە ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا﴾ و ئاگری هەڵگیرساوی بۆ ئامادە كردوون. ٦٤) ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ هیچ پشتیوان و یاری دەدەرلێكیان نییە. ٦٥) ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ﴾ ڕۆژێ كەدەم و چاویان لەئاگری دۆزەخ دا ئەم دیوو ئەو دیو دەكرێت ﴿يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ﴾ دەڵێن: خۆزگە كاشكای ﴿أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠﴾ گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بكردایە. ٦٦) ﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ﴾ وە دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا﴾ بەڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەكانمان كرد ﴿فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾ ئیتر لەڕێگای ڕاست گومڕایان كردین. ٦٧) ﴿رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئەی پەروەردگارمان دوو بەرابەر سزایان بدە ﴿وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾ و بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخەیت. ٦٨) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ﴾ وەك ئەو كەسانە مەبن كە مووسایان ئازاردا (تۆمەتیان بۆ كرد) ﴿فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟﴾ جا خوا مووسای پاك كردەوە لەوەی دەیان ووت ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا﴾ (مووسا) لای خوا ڕێزو پلەی هەبوو. ٦٩) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن و پارێزكار بن ﴿وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴾ و قسە ڕاست و دروست بكەن. ٧٠) ﴿يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ كردەوەكانتان چاك دەكات ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ و لەتاوانەكانتان خۆش دەبێ ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ و هەر كەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكات ﴿فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ ئەوە بەڕاستی سەركەوتنێكی گەورەی بەدەست هێناوە. ٧١) ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ﴾ بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ﴿عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ﴾ ئاسمانەكان و زەوی و چیاكان دا(هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان پێشنیار كرد بۆیان) ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون كەهەڵیگرن و ترسان لەو (ئەمانەتە) ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ كەچی ئادەمی ئەو(سپاردەی) هەڵگرت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ بەڕاستی ئەو (ئادەمی) زۆر ستەمكار و نەزانە. ٧٢) ﴿لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ﴾ بۆ ئەوەی خوا سزای بدات پیاوان و ئافرەتانی دوو ڕوو ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾ و پیاوان و ئافرەتانی هاوەڵ دانەر ﴿وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە لە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار تەوبە وەرگرێ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا﴾ وەخوا لێبوردەی میهرەبانە. ٧٣)




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣٧) سورەتی (الأحزاب): ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ....﴾ موسلیم لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێ عیددەی زەینەبی کچی جەحش تەواو بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە زەیدی کوڕی حارثەی فەرموو (هیچ کەس نی یە لای من بەقەدەر تۆ ئەمین و جێ ی متمانە بێت بڕۆ بۆ لای زەینەب و خوازبێنی بکە بۆ من) ئەنەس دەڵێت: زەید ڕۆشت بۆ لای لە کاتێکدا زەینەب هەویری دەشێلا دەڵێت کە بینیم لە دڵ و دەروونمدا زۆر گەورە بوو بە جۆرێ نەمدەتوانی سەیری بکەم کاتێ کە زانیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی خوازبێنی کردووە منیش پشتم تێ کرد و هاتمە دواوە و ووتم: ئەی زەینەب مژدەت لێ بێ پێغەمبەر (ﷺ) باسی خوازبێنی تۆی کردووە ناردوویش ووتی: هیچ کارێک -

## سورەتی ﴿ سبأ ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي﴾ هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایە ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ کەهەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە تەنیا هی ئەوە ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ﴾ وە لە دوارۆژیشدا ستایش هەر بۆ ئەوە ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ وە ئەو (خوا) دروست کاری وردبینە. ١) ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ﴾ (خوا) دەزانێ چی دەچێ بەناو زەویدا ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ و چی لێ دەردەچێ ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ﴾ و چی دێتە خوارەوە لەئاسمان ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ و چی بۆ سەر دەکەوێ ﴿وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ﴾ وە خوا میهرەبانی لێبوردەیە. ٢)﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێ باوەڕان وتیان: ﴿لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ﴾ ڕۆژی دواییمان (بەسەردا) نایەت ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ (وانیە) سوێند بەپەروەردگارم ئەو (قیامەتە)تان بۆ دێ ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ﴾ (خوا) زانای هەموو پەنهانەکانە ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ﴾ لەخوا گوم نابێ ﴿مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ قورسایی گەردیلەیەک لەئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ﴾ وە بچوکترو گەورەتر لەوە نییە ﴿إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ ئیللا لەکتێبێکی ئاشکراو ڕوونداییە. ٣) ﴿لِّيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە بداتەوە ﴿أُولَٰئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ بۆ ئەوانەیە لێبوردن ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ و پاداشت و ڕۆزی یەکی چاک. ٤)﴿وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا﴾ وە کەسانێ کەهەوڵ دەدەن باوەڕ بەنیشانەکانی ئێمە نەکرێ ﴿مُعَاجِزِينَ﴾ دەستە پاچەن و هیچیان پێ ناکرێ ﴿أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانەیە سزای زۆر خراپ وسەخت. ٥) ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ﴾ ئەوانە زانیاریان پێ دراوە دەزانن ﴿الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە ﴿هُوَ الْحَقَّ﴾ تەنها ئەوە ڕاستە ﴿وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ و ڕێنموونی (خەڵک) دەکات بۆ ڕێگای خوای زاڵی ستایش کراو. ٦)﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیان وت ﴿هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ﴾ ئایا پیاوێکتان نیشان بدەین﴿يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾کە هەواڵتان پێ دەدات کاتێ (مردن و) بە تەواوی ڕزین و پارە پارە بوون ﴿إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾بەڕاستی ئێوە (دروست دەکرێنەوە)بەدروست کردنێکی تازە. ٧)

أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢ ۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾

**-ناکەم تا پرس بە پەروەردگارم نەکەم ئینجا هەستا ڕاستە شوێنی جێگای نوێژەکەی و ئەم ئایەتە** دابەزی ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا .....﴾.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥١) سورەتی (الأحزاب):** ﴿تُرْجِي مَن تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاء ...﴾ بوخاری لە عائیشەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من ڕقم هەڵدەستا و توڕە دەبووم لەو ئافرەتانەی خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دەم ووت : ئایا ئافرەت خۆی دەبەخشێ ؟ جا کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿تُرْجِي مَن تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاء وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ ووتم وا دەبینم ئەوەی حەزت لێ ی بوو پەروەردگارت زوو بۆی بەدی هێناوی.

﴿أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئایا ئەو (پێغەمبەر (ﷺ)) بەدەم خواوە درۆ دەكات ﴿أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ﴾ یا شێتە ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ (نەخێر وانییە) بەڵكو ئەوانەی بێ باوەڕن بەدوا رۆژ ﴿فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ﴾ لەناو سزاو گومراییەكی دوور (لەڕاستی)دان. ٨) ﴿أَفَلَمْ يَرَوْا۟﴾ دەی ئایا سەرنج نادەن ﴿إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم﴾ بۆ ئەوەی لەبەردەم و لەپشتیانەوەیە ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ لەئاسمان و زەویدا ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ﴾ ئەگەر بمانەوێ دەیان بەین بەناخی زەویدا ﴿أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ﴾ یا دەیخەینە خوار بەسەریاندا ﴿كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ چەند پارچەیەك لەئاسمان ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً﴾ بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو پەند هەیە ﴿لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ بۆ هەر بەندەیەكی ڕوو لەخوا. ٩) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی لەلایەن خۆمانەوە بەهرەیەكی گەورەمان بەداوود بەخشیبوو ﴿يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ﴾ ئەی چیاكان و باڵندەكان لەگەڵ داوود زیكرو تەسبیح بڵێنەوە ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ﴾ وە ئاسنمان بۆ نەرم كردبوو. ١٠) ﴿أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ﴾ (فەرمانمان پێ كرد) كەپۆشاكانی داپۆشەری (هەموو لەشی لێ) دروست بكە ﴿وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ﴾ و لەچنینی زرێدا ئەندازەیی ئەڵقەكان وەك یەك بن ﴿وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا﴾ و كردەوەی چاك بكەن ﴿إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی من بەوەی كەدەیكەن بینام. ١١) ﴿وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ﴾ وە بۆ سولەیمان بامان رام هێنا ﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ﴾ بەیانیان (تا نیوەڕۆ یا) مانگێك ڕێگای دەبڕی ﴿وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ وە (نیوەڕوان تا) ئێوارانیش مانگێك ڕێگەی دەبڕی ﴿وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ﴾ وە مسمان بۆ تواندەوە وەك كانیا و (دەڕۆی) ﴿وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ و هەندێ لەپەرییەكانمان رام هێنا بوو لەبەر دەستی دا كاریان دەكرد ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِۦ﴾ بەفەرمانی پەروەردگاری ﴿وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا﴾ و ئەگەر هەر كام لەوان لەفەرمانی ئێمە لابدا ﴿نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ سزای ئاگری هەڵگراوی پێ دەچێژین. ١٢) ﴿يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ﴾ (سولەیمان) هەرچی بویستایە بۆیان دروست دەكرد ﴿مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ﴾ لەپەرستگاو پەیكەرو ﴿وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ﴾ چەندین قاپی (نان خواردن) وەك حەوزی گەورەو ﴿وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ﴾ چەند قازانو مەنجەڵی دامەزراو (نەدەجوڵان لەبەر گەورەییان) ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾ ئەی ئالی داوود شوكرانە بژێری خوا بكەن ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ﴾ بەڵام كەمێ لەبەندەكانم (بۆ خوا) سوپاسگوزارن. ١٣) ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ﴾ ئینجا كاتێ سولەیمانمان مراند ﴿مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ﴾ هیچ شتێك مردنی ئەو (سولەیمان)ی نیشان نەدان ﴿إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ﴾ بێجگە لەخۆرەو مورویانەی زەوی ﴿تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ﴾ كە داردەستەكەی (سولەیمان) یان دەخوارد (كەسولەیمان خۆی دابوو بەسەریدا) ﴿فَلَمَّا خَرَّ﴾ ئینجا كاتێ (سولەیمان) كەوت ﴿تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ﴾ بۆ پەرییەكان ڕوون بویەوە ﴿أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ﴾ كە ئەگەر غەیبیان بزانیایە ﴿مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ لەو سزا ریسواكەرەدا نەدەمانەوە. ١٤)

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِى مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ
كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ
﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ
جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ
﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾
وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً
وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾
فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ
أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ
شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا
فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ
إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ وَرَبُّكَ
عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى
ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی** ئایەتی (٥٣) سورەتی (الاحزاب): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) **نانی شایی** دروست کردو خەڵکی تێر کرد لە نان و گۆشت کاتێ زەینەبی کچی جەحشی گوێزایەوە پاشان لە بەیانی یەکەمدا ڕۆشت بۆ ماڵی خێزانەکانی و سەلامی لێ کردن و دوعای بۆ کردن وەك ڕۆژانی پێشوو ئەوانیش سەلامیان لێ کردو دوعایان بۆ کرد جا کاتێ، پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوو پیاوی بینی پێکەوە قسەیان دەکرد کە پێغەمبەر ئەوانی دی نەڕۆشتەوە بۆ ماڵەوە و گەڕایەوە جا کاتێ دوو پیاوەکە پێغەمبەریان (ﷺ) بینی لە ماڵی خۆی گەڕایەوە بەپەلە ڕۆشتن ئەنەس دەڵێ نازانم من یا کەسێکی تر-

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لەو شوێنی ژیانەیاندا نیشانەیەك (لەسەر دەسەڵاتی خوا) هەبوو ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ دوو باخات لای ڕاستو لای چەپی (شوێنەکەیانەوە) هەبوو ﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ﴾ (پێیان وترا) لەرزقی پەروەردگارتان بخۆن ﴿وَاشْكُرُوا لَهُ﴾ و سوپاسی ئەو بکەن ﴿بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ وڵاتێکی پاك و خۆش و پەروەردگارێکی لێبوردە(یان هەیە). ١٥) ﴿فَأَعْرَضُوا﴾ ئینجا ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ﴾ بەو هۆیەوە لافاوی وێرانکارمان بۆ ناردن ﴿وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ﴾ دوو باخاتی (چاکی بەروو بووم دار) ئەوانمان گۆڕی بەدوو باخاتی ﴿ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ﴾ (خراپی) خاوەن بەرێکی تفت و تاڵ و دار گەز ﴿وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ و کەمێ لەداری نەبگ (تاوگ). ١٦) ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا﴾ ئا بەو جۆرە تۆڵەمان لێ سەندن بەهۆی نا سوپاسییانەوە ﴿وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ﴾ و ئایا جگە لەوانەی زۆر سپڵەن تۆڵە لەکەس ئەسەنین. ١٧) ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ وە لەنێوان (ڕێگای) ئەوان و ئەو شارانەی پیتو بەرەکەتمان تێ خستبوون (لەشام) سازاندبوومان ﴿قُرًى ظَاهِرَةً﴾ چەند شاروچکە و دێهاتی نزیك لەیەکەوە دیار ﴿وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ﴾ و ڕێگەی نزیکمان بۆ ڕۆشتن لەنێوان (ئەو دێهاتانە)دا دانابوو ﴿سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ﴾ (ووتمان پێیان)چەند شەوو ڕۆژ بەو (ڕێگایانە)دا بڕۆن بەئارامی و بێ ترس. ١٨) ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا﴾ کەچی (خەڵکی سەبەء) ووتیان ئەی پەروەردگارمان ماوەی (ڕێگەی) سەفەرەکانمان دور بخەرەوە ﴿وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ و ستەمیان لەخۆیان کرد ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ﴾ ئێمەش کردمانن بەداستانێ لەناو خەڵکدا بیگێڕنەوە ﴿وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ پرژ و بڵاومان کردن (بەوڵاتاندا) بەو پەڕی پرژو بڵاو کردن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا ﴿لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ چەند نیشانە هەیە بۆ هەموو زۆر خۆ گری شوکرانە بژێر. ١٩) ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی شەیتان گومانی خۆی لەواندا بەدی هێنا ﴿فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆیە ئیمانداران نەبێت هەموویان شوێنی شەیتان کەوتن. ٢٠) ﴿وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ﴾ وە شەیتان هیچ دەسەڵاتی بەسەر ئیمانداران دا نەبوو ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ﴾ تەنها بۆ ئەوەی بزانرێت کێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ﴾ و کێ لەوان دەربارەی (دواڕۆژ) لەگوماندایە ﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە. ٢١) ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ هاوار بکەن لەوانەی کەبێجگە لەخوا بەپەرستراوتان دەزانین ﴿لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ بەقەدەر هەرە وردیلەیەکیان بەدەست نییە ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ نە لە ئاسمانەکان و نە لەزەویدا ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾ وە ئەو پەرستراوانە هاوبەشی (خوا) نەبوون (لە دروست کردنی) ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾ و هیچ یەك لەوان یارمەتی دەری خوا نەبوون. ٢٢)

وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن
قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ
﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ
وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل
لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ
يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ
﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ
بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾
قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ
﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا
بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ
رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

-ـمـەوالی دەرچوونی ئەو دوو پیاوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) دا، پێغەمبەر یش گەڕایەوە و ڕاستە مالەوە پەردەکەی لەنێوان من و خۆیدا دادایەوە و ئایەتی حیجاب هاتەخوارەوە، هەروەها طەبەرانی لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) خورما و ڕۆنم دەخوارد لە تاوەیەکدا، عومەر تێپەڕی و پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کرد و ئەویش دەستی بە نان خواردن کرد لەگەڵماندا ئەوجا پەنجەی عومەر بەر پەنجەی من کەوت عومەر ووتی ئاه ئاه ئەگەر بە گوێ ی من بکرایە دەربارەی ئێوە کەس چاوی پێتان نەدەکەوت لەو کاتەدا ئایەتی حیجاب دابەزی.

-کەعبی کوڕی لوئەی خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن، ئەی نەوەی مورەی کوڕی کەعب خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن، ئەی نەوەی (عبد شمس) خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن ئەی نەوەی-

﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ﴾ وە تکا کردن لای خوا سوودی نییە ﴿إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾ مەگەر بۆ کەسێ ئەو (خوا) رێگە بدات ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾ هەتا کاتێ ترس و بیم لەدڵی (تکاکاران) لادەبرێ (بەهۆی رێگەپێدانی شەفاعەت) ﴿قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾ (بە یەکتر) دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێکی فەرموو ﴿قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ﴾ دەڵێن: ووتە راستەکەی فەرموو (کەرێگە دانە بەتکا کردن) ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ وە تەنها (خوا) بەرزو بڵندو گەورەیە. ٢٣) ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بڵێ کێ رۆزیتان دەدات لەئاسمانەکان و زەویدا ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ خوا (رۆزیمان دەدات) ﴿وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ﴾ بێگومان ئێمە یا ئێوە (یەکێکمان) ﴿لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ لەسەر رێنموونین یا لەگومڕاییەکی ئاشکرادائین. ٢٤) ﴿قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا﴾ (بڵێ) پرسیارتان لێ ناکرێ لەتاوانێ کەئێمە کردوومانە ﴿وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئێمەش پرسیارمان لێ ناکرێ لەوەی ئێوە دەیکەن. ٢٥) ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا﴾ بڵێ پەروەردگارمان ئێمەو ئێوە کۆدەکاتەوە ﴿ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ﴾ لەپاشان بڕیار دەدات لەنێوانماندا بەهەق و راستی ﴿وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە هەر ئەوە دادوەری زانا. ٢٦) ﴿قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ﴾ بڵێ ئادەی نیشانم دەن ئەو هاوبەشانەی بردوبووتاننە ریزی خواوە ﴿كَلَّا بَلْ هُوَ ٱللَّهُ﴾ وانییە بەڵکو زاتی خوایە ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ زاڵی دروست کارە. ٢٧) ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ﴾ وە ئێمە تۆمان نەناردوە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بەمژدەدەرو ترسێنەر ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەلام زۆریەی ئادەمی نازانن. ٢٨) ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾ وە دەڵێن ئەم بەڵێنی (رۆژی دوایی یە) کەی دێ ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە راست گۆن. ٢٩) ﴿قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ﴾ بڵێ بەڵێنی ئێوە رۆژێکە ﴿لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ﴾ نەساتێك دوا دەکەون لێی و نەپێشیش دەکەون. ٣٠) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ووتیان ﴿لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ﴾ ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین بەم قورئانە ﴿وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ و بەو کتێبانەش پێش ئەم (قورئانە) هاتوون ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ خۆزگە دەت دی کاتێ ئەو ستەمکارانە ﴿مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ رادەگیرێن لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا ﴿يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ﴾ قسەو تاوان ئاراستەی یەکتر دەکەن ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟﴾ لاوازو ژێردەستە کراوان دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ بەوانەی خۆیان بەگەورە دەزانی (دەسەڵاتدارەکان) ﴿لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە نەبوونایە بێگومان ئێمە باوەڕدار دەبووین. ٣١)

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ۚ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾

=(عبد مناف) خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن، ئەی نەوەی هاشیم خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن ئەی نەوەی (عبد المطلب) خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن، ئەی فاتیمە(ی کچم) خۆت بپارێزە لەئاگری دۆزەخ، چونکە **من هیچم** بەدەست نی یە بۆتان لای خوا جگە لەوەی کەخزمایەتی یەکتان لەگەڵم هەیە من پەیوەستی دەکەم و نابچڕێنم. **ئایەتی (٢١٥) سورەتی (الشعراء)**:

قال رسول الله(ﷺ): (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد واحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: (وێنەی باوەڕداران لەخۆشەویستی و بەزەیی دڵسۆزیان بۆ یەکتری وەك لاشەیەك وایە گەر ئەندامێکی ئازاری ببێت هەموو لاشەی خەوی لێ ناکەوێت و تادای دەگرێت) قال رسول الله (ﷺ): (ابغوني في الضعفاء=

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ﴾ ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنا دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ﴾ بەوانەی ژێردەستە و لاواز کرابوون ﴿أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ﴾ ئایا ئێمە بەرگریمان کردن لەڕێنموونی ﴿بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم﴾ دوای ئەوە بۆتان هات ﴿بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون. ٣٢) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ﴾ ژێر دەستەو چەوساوەکان دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ﴾ بەوانەی خۆ بەزل زان بوون ﴿بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو پیلانی (ئێوە) بەشەو و بەڕۆژ (چەواشەی کردین) ﴿إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ﴾ کاتێ فەرمانتان پێ دەدایین کە بێ بڕوا بین بەخوا ﴿وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا﴾ و وێنەو هاوبەشانی بۆ دابنێین ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ﴾ هەموویان پەشیمانی دەشارنەوە ﴿لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ﴾ کاتێ کەسزای دۆزەخ دەبینن ﴿وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە زنجیرو تەوقمان کردە گەردنی بێ باوەڕان ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ ئایا تۆڵەیان لێ ئەسەنرێ جگە لەوەی دەیان کرد. ٣٣) ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ﴾ وە لەهیچ شارێکدا پێغەمبەری ترسێنەرمان نەناردووە ﴿إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ﴾ مەگەر خاوەن نازو نیعمەتەکانی (دەوڵەمەندەکانی) ووتوویانە ﴿إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە باوەڕمان نی یە بەو (ئایینە)ی ئێوەی پێ نێردراون. ٣٤) ﴿وَقَالُواْ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا﴾ وە ووتیان ئێمە سامان و منداڵمان زۆرترە (لەئێوە) ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ وە ئێمە قەت سزا نادرێین. ٣٥) ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّى﴾ بڵێ بەڕاستی پەروەردگارم ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ ڕۆزی فراوان دەکات و دەیگرێتەوە بۆ هەر کەسێ بیەوێ ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆر بەی خەڵک نازانن. ٣٦) ﴿وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى﴾ وە سامان و منداڵتان شتێك نین ﴿تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ﴾ لای ئێمە پلەو پایەتان نزیك بکەنەوە ﴿إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ مەگەر ئەوەی باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ﴾ بۆ ئەوانە پاداشتی دوو بەرامبەر هەیە ﴿بِمَا عَمِلُواْ﴾ بەهۆی ئەو چاکانەی کەکردوویانە ﴿وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ﴾ ئەوان لەکۆشکە بەرزەکانی (بەهەشتدا) لەئاسایش دان. ٣٧) ﴿وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانەی هەوڵی پوچەڵ کردنەوەی نیشانەکانی ئێمە دەدەن ﴿مُعَٰجِزِينَ﴾ دەستە پاچەنو هیچیان پێ ناکرێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾ ئەوانە لەسزای دۆزەخدا ئامادە کراو دەبن. ٣٨) ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّى﴾ بڵێ بێگومان پەروەردگارم ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ﴾ ڕۆزی هەرکام لەبەندەکانی بیەوێ فراوان یا کەمی دەکات بۆی ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ﴾ وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ﴿فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ﴾ ئەوە خوا جێگەی پڕدەکاتەوە ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وە ئەو (خوا) چاکترینی ڕۆزی دەرانە. ٣٩)

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟
يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟
يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ
بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ
ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ
قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ
وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا
جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ
يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ۖ
فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن
تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم
مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾
قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾

فإنما تنصرون وترزقون بضعفائكم)(رواه أبو داود) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەواڵی منتان پرسی لەناو نەدارولاوازەکاندا هەواڵم بپرسن چونکە بەراستی بەبۆنەی نەدارو هەژارەکانتانەوە سەر دەخرێن و ڕزق و ڕۆزی دەدرێن).

**ئایەتی (٢١٩) سوورەتی (الشعراء):** سأل جبريل رسول الله(ﷺ): عن الإحسان فقال: (ﷺ) (أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك)(رواه مسلم). جوبرەئیل پرسیاری لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد زۆر چاکی (إحسان) چی یە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: (ئەوەیە کەبەجۆرێ خوا بپەرستی وەك خوا ببینیت خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوە بەراستی خوا تۆ دەبینێت).

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ وە ڕۆژێ (خوا) هەموویان کۆ دەکاتەوە ﴿ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ پاشان بەفریشتەکان دەفەرموێ ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ﴾ ئایا ئەوانە (لەدنیا) ئێوەیان دەپەرست. ٤٠)﴿قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ﴾ (فریشتەکان) دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم﴾ تەنیا تۆ گەورەی ئێمەی نەك ئەوان ﴿بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ﴾ بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾ زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆکە) هەبوو. ٤١)﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا﴾ ئێنجا ئەمڕۆ ناتوانن هیچ سوودو زیانێك بەیەکتری بگەیەنن ﴿وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ وە بەستەمکاران دەڵێین: ﴿ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ سزای ئاگری دۆزەخ بچەژن ﴿ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو. ٤٢)﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ کاتێ بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ نیشانە روونەکانی ئێمە ﴿قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ﴾ دەڵێن: ئەمە (پێغەمبەر (ﷺ)) هیچ نییە جگە لەپیاوێك ﴿يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ﴾ دەیەوێ بەرگریتان بکات ﴿عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ﴾ لەوە کەباوو باپیرانتان دەیان پەرست ﴿وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ﴾ وە دەڵێن: ئەمە (قورئان) شتێك نییە ﴿إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى﴾ بێجگە لە درۆیەکی هەڵبەستراو بەناوی خواوە ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ وە بێ باوەڕان بەڕاستی (قورئان)یان دەووت کەبۆیان هاتبوو ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە تەنها جادوویەکی ئاشکرایە. ٤٣)﴿وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا﴾ پێشتر چەند کتێبێکمان پێ نەدابوون کە بیانخوێننەوە ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ﴾ و بۆمان نەناردبوون ﴿قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ﴾ پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی ترسێنەر. ٤٤)﴿وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە کەسانێ پێش ئەمان (قوڕەیشییەکان) باوەڕیان بەپێغەمبەرانیان نەهێنا ﴿وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ ئەمان (قوڕەیش) نەگەیشتبوونە دەیەکی ئەوەی بەوانمان دابوو ﴿فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى﴾ ئێنجا ئەوان باوەڕیان بەپێغەمبەرانی من نەهێنا ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵە سەندنی ئێمە (لەوان). ٤٥)﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ﴾ بڵێ من تەنیا بەیەك شت ئامۆژگاریتان دەکەم ﴿أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ﴾ کەدوو دوو یەك یەك لەبەر خوا هەڵسن ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ پاشان بیر بکەنەوە هاوڕێکەتان(پێغەمبەر (ﷺ)) شێت نییە ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم﴾ ئەو (پێغەمبەر(ﷺ)) تەنیا ترسێنەرە بۆ ئێوە ﴿بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ لەپێش هاتنی سزای سەختی (قیامەت). ٤٦)﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾ بڵێ هەرکرێ و پاداشتێکم لێ داوا کردوون ئەوە بۆ خۆتان ﴿إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ پاداشتی من تەنها لەسەر خوایە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ وە ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە. ٤٧)﴿قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ﴾ بڵێ بەڕاستی پەروەردگارم بەتوندی هەق دەدات بەسەر (بەتاڵدا) ﴿عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ (خوا) زانایە بە نهێنی و شاراوەکان. ٤٨)

قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾

**ئایەتی (١٦) سورەتی (النمل):** قال رسول الله (ﷺ): (نحن معاشر الأنبياء لا نورث ما تركناه فهو صدقة)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێت پاش خۆمان هەر چیەك بەجێ بهێڵین ئەوە خێرە بۆ موسوڵمانان).

**ئایەتی (١٩) سورەتی (النمل):** قال رسول الله (ﷺ): (قرصت نبيًا من الأنبياء نملة فأمر بقرية النمل فأحرقت فأوحى الله إليه : أن أن قرصتك نملة أهلكت أمة من الأمم تسبح؟ فهلا نملة واحدة)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (مێرولەیەك یەكێك لە پێغەمبەرانی پێشووی (ﷺ) گەست ئەویش فەرمانی دا بەسوتاندنی شارە مێرولەكە، خوای گەورەش نیگای بۆ كرد ئایا بەهۆی ئەوەی یەك مێرولە تۆی گەست فەرمانتدا یەك ئومەتت لەناو برد كەبەتەسبیحاتیان دەكرد؟ دەبا تەنها ئەو مێرولەیەت (بسوتاندایە)).

﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ (ئایینی) ڕاست هات ﴿وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ و بەتاڵ (نەما) و دروست نابێتەو دووبارە ناگەڕێتەوە. ٤٩)﴿قُلْ إِن ضَلَلْتُ﴾ بڵێ ئەگەر من گومڕابم ﴿فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِي﴾ ئەوە زیانەکەی تەنیا بۆ خۆمە ﴿وَإِنِ اهْتَدَيْتُ﴾ وە ئەگەر ڕێنموونبم ﴿فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي﴾ ئەوە بەهۆی ئەو(قورئانە)وەیە کەپەروەردگارم بۆی ناردووم ﴿إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾ بەڕاستی خوا بیسەرو نزیکە. ٥٠)﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ فَزِعُوا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ئەگەر دەبینی کاتێ (بێ باوەڕان) زۆر دەترسن ﴿فَلَا فَوْتَ﴾ ئینجا بەهیچ جۆرێ ڕزگار بوونیان نییە ﴿وَأُخِذُوا مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ﴾ وە لەشوێنێکی نزیك (دۆزەخەوە) دەبرێن بۆ ناوی ٥١)﴿وَقَالُوا آمَنَّا بِهِ﴾ لەو کاتەدا دەڵێن باوەڕمان هێنا بەو (قورئانە) ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ چۆن (باوەڕیان) دەست دەکەوێ لەشوێنێکی دوورەوە. ٥٢) ﴿وَقَدْ كَفَرُوا بِهِ مِن قَبْلُ﴾ کەبەڕاستی ئەوان لەدنیادا بێ باوەڕ بوون پێی ﴿وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ و بە نەزانی قسەیان لەپەنهانیەکان دەکرد لەشوێنێکی دورەوە (کەدنیایە).٥٣) ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ بەر بەست دەخرێتە نێوان ئەوان و ئەوەی ئارەزووی دەکەن (کەبڕوا هێنان و تەوبە کردنە) ﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ﴾ هەر وەکو بەها و شێوەکانیان کرا لەپێش ئەماندا ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ﴾ بەڕاستی ئەوان لەگومانێکی دوو دڵ کەردان. ٥٤)

## سورەتی ﴿ فاطر ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەموو ستایش بۆ خوایە کەبەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا﴾ فریشتەکانی کردووە بەنێراوانێك ﴿أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾ خاوەنی (چەند جۆرە) باڵن: دووان و سیانو چوار ﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ﴾ (خوا) هەرچی بیەوێ لەدروست کردندا زیادی دەکات ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ١)﴿مَّا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ﴾خوا هەر بەهرەو چاکەیەك بۆ خەڵك بەرەڵا بکات و بیکاتەوە ﴿فَلَا مُمْسِكَ لَهَا﴾ ئیتر بەرگری کەرێکی بۆ نییە ﴿وَمَا يُمْسِكْ﴾ وەخوا هەر بەهرەیەك بگرێتەوە﴿فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ﴾ ئیتر لەپاش گرتنەوەی خوا بەرەڵاکەر و نێرەری بۆ نییە ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە خوا زاڵی کار دروستە. ٢)﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە﴿اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیربکەوە لەبەهرەی خوا بەسەرتانەوە﴿هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ﴾ ئایا بێجگە لەخوا دروست کەرێکی تر هەیە ﴿يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ کەڕۆزیتان بدات لەئاسمانو زەویدا ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لەخوا ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ دەی چۆن وا ڕوو وەردەگێڕن. ٣)

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾

**ئایەتی (٤٠) سورەتی (النمل):** قال رسول الله(ﷺ): (يقول الله تعالى: يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أتقى قلب رجل منكم مازاد ذلك في ملكي شيئاً، ياعبادي لو أن أولكم و آخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل منكم ما نقص ذلك من ملكي شيئاً، يا عبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم ثم أوفيكم إياها، فمن وجد خيراً فليحمد الله ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەندەكانم ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان و مرۆڤ و جنۆكەتان لەسەر دڵی پیاو چاكترین كەستان بن ئەوە هیچ لەموڵكی من زیاد ناكات، ئەی بەندەكانم ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان و مرۆڤ و جنۆكەتان لەسەر دڵی خراپترین كەستان بن ئەوە لەموڵكی من هیچ شتێك كەم ناكاتەوە،-

﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ ئەگەر باوەڕیان پێ نەهێنایت (دڵگران مەبە) ﴿فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ چونكە بەڕاستی پێغەمبەرانی پێش تۆش باوەڕیان پـێ نـەهێنرا ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ هەموو كارو بارەكان تـەنها بۆ لای خـوا دەگەڕێتـەوە. ٤)﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ ئەی خەڵكینە بێگومان بەڵێنی خـوا ڕاسـتە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ دەی كەواتـە بـا ژیـانی دنیـا فریوتـان نـەدات ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ وە باشـەیتان بـە(بـەزەیی و لێبوردەی) خوا فریوتان نەدات. ٥)﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ بەڕاستی شـەیتان دوژمنـی ئێوەیە ﴿فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ دەی كەواتە ئێـوەش بـەدوژمنی خۆتـانی دابنـێن ﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ﴾ بێگومان ئـەو (شـەیتان) تـاقم و كۆمەڵەكـەی بـانگ دەكـات ﴿لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ بۆ ئەوەی ببەنـە مـاوەڵانی ئـاگری هەڵگیرسـاوی (دۆزەخ). ٦)﴿الَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی بێ بـاوەڕ بـوون سـزای بـەتینیان بـۆ هەیـە ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كـردوە ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ لێبوردن و پاداشتی گـەورەیان بـۆ هەیـە. ٧)﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ﴾ دەی ئایـا كەسێ كەكردەوەی خراپی خـۆی بـۆ جـوان كـراوە ﴿فَرَآهُ حَسَنًا﴾ و بەچـاكو جـوانی دەبینێ (وەك كەسێكە پێوەری چاكەو خراپەی ئایین بێت) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ﴾ وە بەڕاستی خوا هەركەسێكی بوێ گومڕای دەكـات ﴿وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ وە هەركەسـێكی بوێ ڕێنموونی دەكات ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ دەی كەواتە بەخەفەت خـواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ بەڕاستی خوا بەوەی كەئـەوان دەیكـەن ئاگـادارە. ٨) ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ﴾ خـوا زاتێكـە باكـانی ناردووە ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ بۆ ئەوەی هەورەكان بگەڕێنێ (بڵاویان بكەنـەوە) ﴿فَسُقْنَاهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئینجا ئەو (هەورانە) دەنێرین بۆ سەر وڵاتێكی مردوو ﴿فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ جا (بارانی لێ دەبارێ و) زەوی پێی زیندوو دەكەینەوە لەپاش ووشك بوونو مردنی ﴿كَذَٰلِكَ النُّشُورُ﴾ زیندوو كردنەوە(ی مردووانیش لەقیامەتدا) هەر بەو شێوەیە. ٩)﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ﴾ هەر كەسێ گەورەیی و سەربەرزی دەوێ (لەخوای بـوێ) ﴿فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ چونكە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەڵات هەر بۆ خوایە ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾ ووتەی پاك و چاك تەنها بۆ لای ئـەو (خـوا) سـەر دەكـەوێ ﴿وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ وە (ووتەی پـاك) كردەوەی چـاك بـەرزی دەكاتـەوە ﴿وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ وە ئەوانـەی كەپیلانە خراپەكان دەگێڕن ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ سزایەكی توندو بەتینیان بۆ هەیە ﴿وَمَكْرُ أُولَٰئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ و فێڵ و پیلانی ئەوانە لەناو دەچێ. ١٠)﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ خوا (باوكی) ئێـوەی لـەخاك دروسـت كـردووە ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ لەپاشـان (نـەوەكانی دروسـت كـرد) لەنوتفەیەك ﴿ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا﴾ ئینجا (خوا) كردوونی بەچەند جـووت (نێـر و مـێ) ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ وە هیچ مێینەیەك (ئافرەتێك) دوو گیان نابێ و سكەكەی دانانی (نابێت) مەگەر بەئاگاداری خوا ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ﴾ وە هیچ تەمەن درێژ كـراوێ تەمەنی درێژ نـاكرێ ﴿وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ﴾ وە لەتەمـەنی كـەم نـاكرێ مەگـەر لەكتێبێكدا نوسراوە ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەم كارە بۆ خوا ئاسانە. ١١)

وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۚ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ۞ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ ۚ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾

-ئەی بەندەکانم ئەوە هەر کردەوەکانی خۆتانە کەبۆتان دەژمێرم و دەتان دەمەوە، ئەگەر کەسێ لەڕۆژی دواییدا خێرو چاکەی دەست کەوت باسوپاسی خوا بکات وەئەگەر خراپەی دەست کەوت ئەوە تەنها لۆمەی خۆی بکات).

**ئایەتی (٦٢)**

**سورەتی (النمل):** قال رسول الله (ﷺ): (ما على الأرض مسلم يدعو الله تعالى بدعوة إلا آتاه الله إياها أو صرف عنه السوء مثلها ما لم يدع بإثم أو قطيعة رحم فقال رجل من القوم: إذاً نكثر، قال: الله أكثر)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر موسوڵمانێك لەسەر ئەم زەمینە هەر داوایە لەخوا بکات خوای گەورە ئەو داوایەی جێ بەجێ دەکات و دەیداتێ یان بەئەندازەی داواکەی خراپەی لێ لا دەدات بەمەرجێ دوعایە نەکات تاوان بێ یا بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی بێ،) پیاوێ-

﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ﴾ ئەو دوو (جۆرە) دەریا وەك یەك نین ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ ئەمەیان سازگار و شیرینە ﴿سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ﴾ و خواردنەوەی ئاسانە و خۆشە ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەوی تریان سوێرو تاڵ و تفتە ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ و لەهەردووکیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ و خشڵی (مرواری و سەدەف و دوڕ لەدەریا) دەرئەهێنن و دەیپۆشن خۆتانی پێ دەڕازێننەوە ﴿وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾ و کەشتی یەکان دەبینی ئاوەکە لەت دەکەن (کاتێ بەناویدا دەڕۆن) ﴿لِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی هەندێ ڕسق و ڕۆزی خوا پەیدا بکەن ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ وە تا ستایشی خوا بکەن (لەسەر بەهرەکانی). ١٢) ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾ (خوا) شەو دەکات بەناو ڕۆژدا ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾ و ڕۆژ دەکات بەناو شەودا ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ وە خۆرو مانگی رام هێناوە ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەریەکەیان تا ماوەی دیاری کراو (بۆیان) دەگەڕێن ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەوەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾ پادشایەتی تەنها بۆ ئەوە ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ و ئەوانەی ئێوە هاواریان لێ دەکەن بێجگە لەخوا ﴿مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾ خاوەنی توێکڵە سپێکەی ناوکی خورمایش نین. ١٣) ﴿إِن تَدْعُوهُمْ﴾ (بتەکان) ئەگەر نزاو هاواریان لێ بکەن ﴿لَا يَسْمَعُواْ دُعَآءَكُمْ﴾ هاوارەکەتان نابیستن ﴿وَلَوْ سَمِعُواْ مَا ٱسْتَجَابُواْ لَكُمْ﴾ و ئەگەر بیشی بیسن وەڵامتان نادەنەوە ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾ و لەڕۆژی قیامەتیشدا بێ باوەڕ دەبن بەهاوبەش دانانەکەتان (و بەدرۆتان دەخەنەوە) ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ وە دڵنیابە کەس وەك (خوای) ئاگادار ئاگادارت ناکات (لەسەر ئەنجامتان). ١٤) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ وە تەنیا خوایە بێ نیازی ستایش کراو. ١٥) ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئەگەر (خوا) بیەوێ لەناوتان دەبات ﴿وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ وە خەڵکی تازە دێنێ. ١٦) ﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ وە ئەمەش بۆ خوا کارێکی گران نییە. ١٧) ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسی تر هەڵناگرێ ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا﴾ وە ئەگەر بارگرانێ (گوناهباری) بانگی کەسێ تر بکات بۆ هەڵگرتنی (بارە گوناهەکەی) ﴿لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ﴾ هیچ لەو (بارە گوناهە) هەڵناگرێ ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾ هەرچەندە (داوا لێ کراوەکە) خزمیشی بێت ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) تەنها ئەوانە بێدار دەکەیتەوە ﴿يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ﴾ کە بەپەنهانی لەپەروەردگاریان دەترسن ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و نوێژەکانیان بەرێکی بەجێ دێنن ﴿وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ﴾ وە هەر کەس خۆی پاك ڕاگرێ (لە تاوان) ئەوە بەڕاستی (سوودی) خۆ پاك ڕاگرتنەکەی هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ و گەڕانەوەش تەنها بۆ لای خوایە. ١٨)

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾

- لەیاران ووتی: کەواتە زۆر دوعا دەکەین، فەرمووی: (دەی خوای گەورە زۆر تری لەدەست دێ).

**ئایەتی (٨٢) سورەتی (النمل):** قال رسول الله(ﷺ): **(لا تقوم الساعة** حتى تروا **عشر آيات:** طلوع **الشمس من** مغربها **والدخان والدابة و خروج يأجوج ومأجوج وخروج عيسى ابن** مريم(عليه السلام) **والدجال وثلاثة خسوف** خسف **بالمغرب وخسف بالمشرق وخسف بجزيرة العرب** و نار تخرج من قعر عدن تسوق أو تحشر الناس تبيت معهم حيث باتوا وتقيل معهم **حيث قالوا)(رواه مسلم).** پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (قیامەت نایەت و هەڵناسێ هەتا دە نیشانە نەبینن: هەڵهاتنی خۆر لەڕۆژئاواوەو دووکەڵەکەو ئەوگیاندارەی (قسە لەگەڵ مرۆڤەکان دەکات) و دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج (لە بەربەستەکەیان) و دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام)-

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ﴾ نەکوێرو بینا یەکسانن. ١٩)﴿وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ﴾و نە تاریکستان و ڕووناکی (وەك یەکن). ٢٠)﴿وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ﴾ و نەسێبەرو خۆرەتاو (وەك یەکن). ٢١)﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ﴾ نەزیندووان و مردووان بەرانبەرن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ﴾ بەڕاستی خوا (بانگی خۆی) دەبیستێنێ بەهەر کەس کەبیەوێ ﴿وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ بەڵام تۆ ناتوانی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) پەیامەکەت ببیستێنی بەوانەی لەگۆڕەکاندان (مردوون). ٢٢)﴿إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ تۆ تەنها ترسێنەری. ٢٣)﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان بە(ئاینی) ڕاست ناردووە مژدە دەرو ترسێنەر بیت ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ هەر گەل و ئوممەتێك (پێغەمبەرێکی) ترسێنەری تێدا هاتووە. ٢٤)﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ وە ئەگەر باوەڕت پێ نەهێنن ﴿فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەوە بێگومان لەپێش ئەوانیشەوە کەسانێك باوەڕیان نەهێنا (بە پێغەمبەرەکانیان) ﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان بەموعجیزەکان ﴿وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ﴾ و پەڕاوو کتێبە ڕوون کەرەوەکانەوە. ٢٥) ﴿ثُمَّ أَخَذْتُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ پاشان ئەوانەیان بێ باوەڕ بوو قارم لێ گرتن ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو تۆڵە سەندنی ئێمە (لەوان). ٢٦) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتدی ﴿أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ کەبەڕاستی خوا لەئاسمانەوە بارانی باراندووە ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ﴾ ئینجا ڕواندمان بەو بارانە هەموو جۆرە میوەیەك ﴿مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا﴾ کەشێوەو ڕەنگەکانیان جیاوازە ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ﴾و لەچیاکاندا چەند ڕێگا هەیە ﴿بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا﴾ کەڕەنگیان سپی و سورە (سپی و سورەکانیش) جیاوازن ﴿وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾و هەشیانە ڕەشێکی تۆخە. ٢٧) ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ﴾ وە لەئادەمی و زیندەوەرو ئاژەڵ وماڵاتیشدا ﴿مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ﴾ ڕەنگی جۆراو جۆر هەیە بەوێنەی جیاوازی میوەهات﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودا تەنیا زانایان (وەك پێویست) لەخوا دەترسن﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ بێگومان خوا زاڵی لێبوردەیە. ٢٨) ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ﴾ بەراستی ئەوانەی کەکتێبی خوا دەخوێننەوە﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾و بەچاکی نوێژیان بەجێ هێناوە ﴿وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ وە لەوەی کەپێمان داون بەنهێنی و ئاشکرا دەبەخشن ﴿يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ﴾ چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز زەرەر ناکات. ٢٩)﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) بەتێرو تەواوی پاداشتیان بداتەوە ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ﴾ و لەبەهرەی خۆی زیاتریشیان پێ بدات ﴿إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بە ڕاستی خوا لێبوردەی سوپاس وەرگرە. ٣٠)

وَٱلَّذِىٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ
يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ
ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم
مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ
ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ
فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾
وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ
شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا
فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ
نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ
عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِى كُلَّ كَفُورٖ ﴿٣٦﴾ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ
فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعۡمَلُۚ
أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ
فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ
غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾

- و هاتنی دەجال و سێ ڕۆچوون بەناخی زەویدا یەکیان لە ڕۆژئاوا و یەکیان لە ڕۆژهەڵات ئەوی تریان لە نیوەدورگەی عەرەبدا و ئاگرێک کەلە ژێرەوەی عەدەن (لەیەمەن) سەرهەڵدەدات و خەڵکی دەداتە بەر پاڵیان دەکاتەوە لەهەر کوێ شەو بکەنەوە لەگەڵیان شەو دەکاتەوەو لەهەر کوێ ڕۆژ بکەنەوە لەگەڵیان ڕۆژ دەکاتەوە).

ئایەتی (٨٢) سورەتی (النمل): قال رسول الله(ﷺ): (إن الله أوحى إلي أن تواضعوا حتى لا يفخر أحد على أحد ولا يبغي أحد على أحد)(رواه مسلم). (قال رجل: يارسول الله(ﷺ): إني أحب أن يكون ردائي حسناً ونعلي حسنة أفمن الكبر ذلك؟ فقال لا، إن الله جميل يحب الجمال)(رواه أبو داود) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە سرووشی بۆ ناردووم کەخۆتان بەکەم بگرن، بەجۆرێکی وا کەکەس شانازی-

﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە ئـەوەی لەقورئانـدا نیگامـان کـردوە بـۆ تـۆ ﴿هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ﴾ هـەر ئـەوە راسـتەو پـشتیوانی کتێبـەکانی پـێش خۆیـەتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ بێگومان خوا بەبەندەکانی ئاگادارو بینایە. ٣١)﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ﴾ لەپاشـان ئـەم قورئانـەمان بەخـشی بەکەسـانێ ﴿ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ﴾ کـە لـەناو بەندەکانمانـدا هـەڵمان بـژاردن ﴿فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾ ئینجـا هەنـدێکیان سـتەمکارن لەخودی خۆیان ﴿وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ﴾ وهەندێکیان مام ناوەندین ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾ و هەندێکی تریان بەفەرمانی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ ئەم (قورئان پێدانە) لەخۆیدا بەهرەیەکی گەورەیە. ٣٢)﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا﴾ ئەوانە دەچنە نا بەهەشتانی جێگـای مانـەوەی هەمیـشەیی ﴿يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ﴾ لـەوێ دا بـە بـازنی ئـاڵتونی و مـرواری دەڕازێنرێنـەوە ﴿وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ﴾ وپۆشاکیشیان تێیدا ئاوریشمە. ٣٣)﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ﴾ وە ئـەوان دەڵـێن: هـەموو سوپاس بۆ ئەو خوایە ﴿أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ﴾ کەخەفەتی لابردین و نەیهێشت ﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ﴾ بەراستی پـەروەردگارمان لێبـوردەی شایـستەی سوپاسـە. ٣٤)﴿ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئەو (خوایە) کە بەچاکەو بەهرەی خـۆی نیشتەجێی کـردین لـەماڵی هەمیشەیی دا (بەهەشت دا) ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ﴾ لەوێدا نەهیچ ماندوو بوونێکمان تووش دەبێ ﴿وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ﴾ ونەهیچ ئەرك و زەحمـەتێکمان دووچـار دەبـێ. ٣٥)﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ﴾ ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوانەیـە بـێ بـاوەڕ بـوون ﴿لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ﴾ بڕیاری مردن نادرێ بەسەریاندا تـا بمـرن ﴿وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ﴾ هـەروەها هەندێ لەسزای (دۆزەخ)یـان لـێ سـووك نـاکرێ ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ﴾ ئـا بـەو جۆرە تۆڵە ئەسەنین لەهەموو بێ باوەڕێك. ٣٦)﴿وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا﴾ وە ئەوانـە لەدۆزەخدا هاوار دەکەن ﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ (دەڵێن) ئەی پـەروەردگارمان (لەدۆزەخ) دەرمان بێنە تا کردەوەی چاك بکەین ﴿غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ جیـاواز لەوەی دەمان کرد ﴿أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم﴾ (وەڵام دەدرێنەوە) ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ﴿مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ ئەوەنـدەی ئـەوەی دەیـەوێ بـیر بکاتـەوە تیایـدا بـیر بکاتـەوە ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾وە ترسـێنەرتان بـۆ نـەهات ﴿فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ دەی (ئەو سزا) بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێك بۆ (بێ باوەڕە) ستەمکارەکان نییە. ٣٧)﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ بەراستی خوا بەنهێنی ئاسمانەکان و زەوی زانایە ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾بێگومان خوا بەنهێنی دڵان ئاگادارە. ٣٨)

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا
يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ
كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ
بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ
إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن
جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ
مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ
وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ
ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا
﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾

=بەسەر کەسدا نەکات و کەس دەس درێژی نەکاتە سەر کەس) (پیاوێک ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من حەز دەکەم پۆشاك و پێڵاوم جوان بن ئایا ئەمە لەخۆ بەگەورە زانینە؟ فەرمووی: نەخێر خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆش دەویت). ئایەتی (٨٧) سورەتی (النمل): قال رسول الله (ﷺ): (من دل على خير فله مثل أجر فاعله) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك خێرێك نیشانی کەسێك بدات خۆیشی بەئەندازەی خێر کەرەکە پاداشتی بۆ هەیە)؛ ئایەتی (٨) سورەتی (القصص): عن ابن مسعود (ﷺ) سألت النبي(ﷺ): (أي العمل أحب إلى الله تعالى؟ قال: الصلاة على وقتها، قلت ثم أي؟ قال بر الوالدين، قلت ثم أي؟ قال: الجهاد في سبيل الله) (متفق عليه).=

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ﴾ هەر ئەو زاتە ئێوەی کردە جێنشین(ی پێشوان) لەزەویدا﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ﴾ ئەوسا هەر کەس بێ باوەڕ بێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕییەکەی هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾و بێ باوەڕی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات لای پەروەردگاریان ﴿إِلَّا مَقْتًا ۖ﴾ جگە لەخەشم و ڕقی تۆڵە ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ وە بێ باوەڕیی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات بێجگە لەزەرەرمەندی. ٣٩)﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ هەواڵم بدەنێ ﴿شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەو هاوبەشانەی لەجیاتی خوا دەتانپەرستن (هاواریان لێ دەکردن) ﴿أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ نیشانم بدەن لەزەویدا چیان دروست کردووە؟ ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ یا لەبەدی هێنانی ئاسمانەکاندا بەشداری (خوا)یان کردووە؟ ﴿أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا﴾ یا کتێبێکمان پێ داون ﴿فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ﴾ جا بەڵگەیان لەو کتێبەدا هەیە (کەبتەکان هاوبەشی خوان) ﴿بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو ستەمکاران هیچ بەڵێنێ بەیەکتری نادەن جگە لەفریودان (هەڵخەڵەتاندن). ٤٠)
﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات ﴿أَن تَزُولَا ۚ﴾ بۆ ئەوەی لەڕێڕەوی خۆیان لانەدەن ﴿وَلَئِن زَالَتَآ﴾ بەڕاستی ئەگەر لەڕێڕەوی (خۆیان) لابدەن ﴿إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ﴾ کێ هەیە جگە خوا ڕایان بگرێت ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ بێگومان ئەو (خوا) لەسەر خۆی لێبووردەیە. ٤١)﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾(بت پەرستان) بەسوێندی هەرە گەورەیان سوێندیان دەخوارد بەخوا ﴿لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ (دەیان ووت) ئەگەر پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ بێت ﴿لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ﴾ بەڕاستی ئەوان لەهەر یەك لە ئوممەتانی تر ڕێنموون تر دەبن﴿فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ ئینجا کاتێ پێغەمبەری ترسێنەریان بۆ هات﴿مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ زیاتر دوور کەوتنەوە(لەڕێگەی ڕاست). ٤٢) ﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾لەبەر خۆ بەزل زانی لەزەویدا﴿وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ﴾و فێڵ وپیلانی خراپ کردن﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ﴾وە فێڵ و پیلانی خراپ تەنیا زیان بەخاوەنەکەی دەگەیەنێ ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ﴾ دەی کەواتە ئەوان جگە لەچارەنووسی پێشینان چاوەڕوانی شتێ تر دەکەن؟ ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ﴾ چونکە یاوی خوا هەرگیز گۆڕانی بۆ نییە ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا﴾ و یاوی خوا لادانی بۆ نییە. ٤٣)﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا ئەوان بەزەویدا نەگەڕاون ﴿فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ تا سەیر بکەن سەر ئەنجام گەلانی پێش خۆیان چۆن بووە ﴿وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ﴾ کە ئەوان لەمان بەهێزتر بوون ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ﴾ هیچ شتێك ناتوانێ لەدەستی خوا دەربچێ ﴿فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ﴾ نە لەئاسمانەکان ونەلەزەویدا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ بەڕاستی خوا زانا و توانایە. ٤٤)

وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ ۖ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٢) سورەتی (یس): ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ...﴾ بەزار لەئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: بەنی سەلەمە لای پێغەمبەر (ﷺ) گلەیی دووری ماڵەکانیان کرد لەمزگەوتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوسا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ...﴾ ئیتر ئەوان لەشوێنی خۆیان مانەوە.

-عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێت: لەپێغەمبەری خوام پرسی(ﷺ): (کام کردەوە لەلای خوای گەورەوە زۆر خۆشەویستە؟ فەرمووی: نوێژکردن لەسەرەتای کاتەکەیدا، ووتم: لەپاش ئەو چی تر زۆر خۆشەویسترە لەلای خوا؟ فەرمووی: بەجوانی هەڵس وکەوت کردن لەگەڵ باوک و دایکدا، ووتم: ئەی لەپاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: جیهادو تێکۆشان لەرێگەی خوادا).

﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ﴾ وە ئەگەر خوا قار بگریٚ لەخەڵکی (تۆڵەیان لیٚ بسەنیٚ) ﴿بِمَا كَسَبُوا﴾ لەبەر ئەو (خراپانەی) کردویانە ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ﴾ هیچ گیاندارێکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ بەڵام (خوا) مۆڵەتی ئەوان دەدات تا ماوەی دیاری کراو ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ﴾ ئینجا کاتیٚ ماوەکەیان (کۆتایی) هات (دەیان مرێنیٚ) ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيرًا﴾ جا بێگومان خوا بە بەندەکانی ئاگادارو بینایە. ٤٥)

## سورەتی ﴿یس﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يس﴾ بە(یاء، سین) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە. ١)﴿وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ﴾ سوێند بە قورئانی پڕ لەدانایی. ٢) ﴿إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بەراستی تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لە پێغەمبەرانی خوای. ٣)﴿عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ لەسەر ڕێبازی راستی. ٤)﴿تَنزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾ (قورئان) دابەزێنراوە لەلایەن خوای زاڵی میهرەبانەوە. ٥) ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ﴾ بۆ ئەوەی گەلیٚ بترسێنی (لەسزا) کەباوو باپیرانیان نەترسێنرابوون ﴿فَهُمْ غَافِلُونَ﴾ بۆیە ئەوان بیٚ ئاگا بوون. ٦)﴿لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَىٰ أَكْثَرِهِمْ﴾ سوێند بەخوا بەراستی بەڵێنی خوا چەسپاو هاتە دی لەسەر زۆربەیان ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ چونکە ئەوان باوەڕ ناهێنن. ٧)﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلَالًا﴾ (وەك کەسانیٚ وان کە) تەوقمان کردبێتە گەردنیان ﴿فَهِيَ إِلَى الْأَذْقَانِ﴾ جا ئەو (تەوقانە) تا چەناکەیان هاتبیٚ (گەردنیانی بەتەواوی گرتبێتەوە) ﴿فَهُم مُّقْمَحُونَ﴾ ئینجا سەریان بەرز کرابێتەوە (نەتوانن بۆ خوارو ئەم لاو لا بیجوڵێنن). ٨)﴿وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا﴾ وە بەربەستمان لەبەردەم و پشتیانەوە داناوە ﴿فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ پەردەشمان داوە بەسەر چاویان دا بۆیە ئەوان (راستی) نابینن. ٩) ﴿وَسَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾ وە بۆ ئەوان یەکسانە چ بیان ترسێنی یا نەیان ترسێنی ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ باوەڕ ناهێنن. ١٠)﴿إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ﴾ تۆ تەنیا کەسیٚ دەترسێنی کە شوێن قورئان دەکەویٚ ﴿وَخَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ﴾ و لە خوای میهرەبان دەترسیٚ کەنادیارە ﴿فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ﴾ بەهۆی (ئەو شوێن کەوتن و ترسانەوە) مژدەی بدەریٚ بە لیٚ خۆشبوونی (گوناهەکانی) و پاداشتی چاك (بەهەشت). ١١)﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَىٰ﴾ بەراستی هەر ئێمە مردووان زیندوو دەکەینەوە﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾ و هەرچی پێشتر کردویانە و شوێنەواری پاش خۆشیان دەنوسین ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ وە هەموو شتێکمان لە کتێبی روون کەرەوەدا هەژمار دووە (بەنووسین). ١٢)

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَالِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾

**ئایەتی (١٢) سورەتی (القصص): قال رسول الله (ﷺ): (من سن في الإسلام سنة حسنة كان له أجرها وأجر من عمل بها من بعده من غير أن ينقص من أجورهم شيء ومن سن في الإسلام سنة سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها من بعده من غير أن ينقص من أوزارهم شيء) (رواه مسلم).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێ لەئیسلامدا کارو بارێکی چاك و جوان دا بهێنێ پاداشتی ئەو چاکە داهێنانەی بۆ دەنووسرێت وە پاداشتی ئەوانەش بۆ دەنووسرێت کەکاری پێ دەکەن بێ ئەوەی لەپاداشتی ئەو کەسەی کاری پێ کردووە هیچ کەم بکات، وە هەر کەسێ کارو بارێکی خراپ دابهێنێ ئەوە گوناهی ئەو داهێنانە خراپەی بۆ دەنووسرێ و گوناهی ئەوانەش کەکاری پێ دەکەن بۆی دەنووسرێ بەبێ ئەوەی لەگوناهی ئەوان هیچ کەم بکاتەوە).**

﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) نموونەیان بۆ بێنەرەوە بەخەڵکی شاری (أنطاكية) ﴿إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ کاتێ کەپێغەمبەرانیان بۆ هات. ١٣) ﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا﴾ کاتێ دوو (پێغەمبەر)مان نارد بۆ لایان باوەڕیان پێنەکردن ﴿فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ ئەنجا بە(ناردنی پێغەمبەری) سێیەم بەهێزمان کردن ﴿فَقَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ﴾ جا (هەموویان) وتیان بێگومان ئێمە نێردراوین بۆ سەر ئێوە. ١٤) ﴿قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ (خەڵکەکە) وتیان ئێوە هەر ئادەمییەکی وەك ئێمەن ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ﴾ و خوای میهرەبان هیچ شتێکی (لەنیگا) نەناردۆتە خوارەوە ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ﴾ ئێوە تەنها درۆزنن و درۆ دەکەن. ١٥) ﴿قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ (پێغەمبەرەکان) وتیان پەروەردگارمان دەزانێ بەراستی ئێمە (بەپێغەمبەرێتی) نێردراوین بۆ سەر ئێوە. ١٦) ﴿وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ و ئێمە تەنیا گەیاندنی (ئایینەکە)مان لەسەرە بەڕوونی. ١٧) ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ﴾ (خەڵکەکە) وتیان بێگومان ئێمە بەهۆی ئێوەوە دووچاری شوومی و بەدبەختی بووین ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر واز نەهێنن (لەو کارەتان) بەرد بارانتان دەکەین ﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ و بەراستی لەلایەن ئێمەوە دووچاری سزایەکی پڕ ئێش و ئازار دەبن. ١٨) ﴿قَالُوا۟ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم﴾ (پێغەمبەرەکان) وتیان شوومی ئێوە بەخۆتانەوەیە چونکە ئێوە ئەگەر ئامۆژگاری بکرێن (هەست بەشوومی دەکەن) ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ (نەخێر وانیە) بەڵکو ئێوە گەلێکی لەسنوور دەرچوون. ١٩) ﴿وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ﴾ وە لەو پەڕی شارەکەوە پیاوێك بەپەلە هات ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ وتی ئەی گەلەکەم شوێن ئەم پێغەمبەرانە بکەون. ٢٠) ﴿ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا﴾ شوێن کەسانێ بکەون داوای هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ ناکەن ﴿وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ کەخۆشتان ڕێنموونیی کراون. ٢١) ﴿وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾ وە من بۆچی زاتێ نەپەرستم کەمنی بەدی هێناوە ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بۆ لای ئەوە دەگەڕێنەوە. ٢٢) ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ ئایا بێجگە لەو (خوا) پەرستراوانێك بۆ خۆم بڕیار دەم ﴿إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ﴾ ئەگەر خوای میهرەبان زیانی بۆ من بوێ ﴿لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا﴾ تکای ئەوان هیچ سوودێك بەمن ناگەیەنێ ﴿وَلَا يُنقِذُونِ﴾ و (لەسزای خوا) ڕزگارم ناکەن. ٢٣) ﴿إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ بێگومان من (ئەگەر هاوبەش دابنێم) ئەو کاتە لەگومراییەکی زۆر ئاشکرادام. ٢٤) ﴿إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ﴾ بەراستی من باوەڕم هێنا بەپەروەردگارتان و دە ئێوەش گوێتان لێبێ. ٢٥) ﴿قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ﴾ (ئەم پیاوەیان شەهید کرد) پێی وترا: بڕۆرە بەهەشتەوە ﴿قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ﴾ (ئەو پیاوەش) وتی خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە. ٢٦) ﴿بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى﴾ بەوەی کەپەروەردگارم لێم خۆشبووە ﴿وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ﴾ و بردمیە ڕیزی ڕێز گیراوانەوە. ٢٧)

۞ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾

**ئایەتی (٢٦) سورەتی (القصص)؛ قال عبد الله بن مسعود(رضي الله عنه) أفرس الناس ثلاثة: أبو بكر حين تفرس في عمر، وصاحب يوسف(عليه السلام) حين قال (أكرمي مثواه) وصاحبة موسى(عليه السلام) حين قالت: (يا أبت استأجره إن خير من استأجرت القوي الأمين)(رواه الطبراني والحاكم).** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رضي الله عنه) ووتی: سەرناس ترین کەس **سێیان** بوون ئەبو بەکر کاتێك کەعومەری دەس نیشان کرد (بۆ پێشەوایەتی موسوڵمانان)و خاوەنی یوسف (عليه السلام) کاتێك کەووتی بەخێرایی شوێنی حەوانەوەی چاکی بۆ ئامادە بکە وە خێزانی مووسا (عليه السلام) **کاتێ ووتی** ئەی باوکە بیگرە بەکرێ بۆ شوانیو رەنجبەری بەڕاستی چاکترین کەسە کەبەکرێ ی بگری (بۆ شوانی) چونکە بەهێزو دەست پاکە).

﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ وە لە دوا ئەو ئەمان ناردەخوارەوە بۆ سەر گەلەکەی ﴿مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ هیچ لەشکرێك لەئاسمانەوە ﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ وئێمە دابەزێنەر نەبووین. ٢٨) ﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً﴾ (هۆی تیاچوونیان) تەنیا قریشکەیەکی بەهێز بوو ﴿فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ﴾ جا کوت و پڕ ئەوانە هەموو جوڵەیان نەما و مردن. ٢٩) ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ﴾ ئای پەشیمانی دڵخی سەخت بۆ ئەو بەندانەی (کەبێ باوەڕن) ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ هەر پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە تەنیا گاڵتەیان پێ دەکرد (و هیچ تر). ٣٠) ﴿أَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا نەیان زانیوە ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ لە پێش ئەواندا چەند گەلی (تاوانبار) مان لە ناو بردووە ﴿أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ کەبێگومان ناگەڕێنەوە بۆ لای ئەمان. ٣١) ﴿وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ هەر هەموو (لە ناوبراوان) کۆ دەکرێنەوە لای ئێمە (و لەقیامەت دا) ئامادە دەکرێن. ٣٢) ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ﴾ وە نیشانەو بەڵگەیەك بۆ ئەوان ئەم زەوییە مردووەیە ﴿أَحْيَيْنَٰهَا﴾ کە زیندوومان کردەوە ﴿وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ﴾ و دانەوێڵەمان لێ دەرهێنا (لێ رواند) کە لێی دەخۆن. ٣٣) ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾ وە لەو (زەوییە) دا چەند باخ لەخورما و ترێمان بەدی هێنا ﴿وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ﴾ و چەند کانیاومان تیادا هەڵقوڵاندوە. ٣٤) ﴿لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ﴾ بۆ ئەوەی لە بەرووبومی (میوەکانی) بخۆن کە دەستی ئەوان پێکی نەهێناوە ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن. ٣٥) ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا﴾ پاك و بێگەردە زاتێك کە هەموو جووتەکانی (نێر و مێی) دروست کردووە ﴿مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ لەوەی کە زەوی دەیرووێنێ و لە (ئادەمی) خۆیان ﴿وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ و لەو شتانەش کە نایزانن. ٣٦) ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ﴾ شەویش بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەوان کە ئێمە ڕۆژی لێ دەردەهێنین ﴿فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾ ئەوجا لەناکاودا تاریکی هەموویان دەگرێتەوە. ٣٧) ﴿وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ خۆریش بەرەو بنکەی خۆی (لەگەڕاندایە و) دەڕوا ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ ئەوە بڕیاردراوی (خوای) زاڵی زانایە. ٣٨) ﴿وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ﴾ وەبۆ مانگیش چەند قۆناغێکمان داناوە ﴿حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ﴾ (دوای تەواو کردنی قۆناغەکانی) هەتا وەکو لقی دار خورمای کۆنی (وشک بووی) لێ دێت. ٣٩) ﴿لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ﴾ خۆر بۆی نییە (ناتوانێ) بگات بەمانگ ﴿وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ﴾ و شەویش ناتوانێ پێشکەوێ لەڕۆژ ﴿وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ و هەر یەکەیان (خۆرو مانگ)لە خولگەیەکدا مەلە دەکەن و دەسوڕێنەوە.٤٠)

وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُواْ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَاۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾

**ئایەتی (٤٥) سورەتی (العنكبوت):** قال رسول الله (ﷺ): (أرأيتم لو أن نهراً بباب أحدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات هل يبقى من درنه شيء؟) قالوا لا يبقى من درنه شيء قال: (فذلك مثل الصلوات الخمس يمحو الله بهن الخطايا)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (پێم بڵێن ئەگەر ڕووبارێك لەبەر دەرگای ماڵی هەر كام لەئێوەدا بێت هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێ بشوات ئایا هیچ چڵك و پیسی یەك بەلاشەیەوە دەمێنێت؟ وتیان: نەخێر هیچ چڵك پیسی یەك بەلاشەیەوە نامێنێت، فەرمووی (ئەوە وەك پێنج نوێژە فەرزەكە وایە خوای گەورە تاوانەكانی پێ لا دەبات و نایهێڵێ).

**ئایەتی (٤٦) سورەتی (العنكبوت):** عن أبي هريرة(ﷺ) قال: كان أهل الكتاب يقرؤون التوراة-

﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ﴾ وەبەڵگەیەكی ئاشكرای تر بۆ ئەوان ئەمەیە ﴿أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾كەبێگومان ئێمە نەوەكانی ئەوانمان لەكەشتی پڕكراو (لەخۆیان و كەل و پەلیان) دا هەڵگرتووە. ٤١)﴿وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾ وە بە وێنەی كەشتی شتانێكی تریشمان بۆ دروست كردوون كە سواری بن. ٤٢)﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ﴾ وە ئەگەر بمانەوێ نوقمیان دەكەین﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾جا هیچ كەس نایەت بە هاواریانەوە و ڕزگاریش ناكرێن(لە نوقم بوون). ٤٣)﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ مەگەر بەزەیی ئێمە (ڕزگاریان بكات) و تا كاتی دیار كراو بیان ژێنین. ٤٤)﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾وە كاتێ پێیان بوترێ ﴿ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ﴾ خۆتان بپارێزن (لەو سزای كە) لە بەردەمتان دایە و لەوەش لەپشتانەوەیە (لە ڕۆژی دوایی) ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾تارەحمتان پێ بكرێ. ٤٥)﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ﴾ وە هەر بەڵگەو ئایەتێكیان لە ئایەتەكانی پەروەردگاریان بۆ بێت﴿إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئەوان هەر ڕوو وەردەگێڕن لەو(ئایەتانە). ٤٦)﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ وە هەر كاتێ پێیان بوترێ لەوەی خوا پێی داون ببەخشن ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەڵێن بەوانەی ئیمانیان هێنا بوو﴿أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ﴾ئایا خواردن بدەین بە كەسێ ئەگەر خوا بیویستایە خواردنی پێ دەدا ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ئێوە تەنیا لە گومراییەكی ئاشكرادان. ٤٧)﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾وەدەڵێن ئەم بەڵێنەكەی دێت ئەگەر ئێوە ڕاست كۆن. ٤٨)﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ﴾ ئەمانە چاوەڕوانی هیچ ناكەن مەگەر شریخە و دەنگێكی بەهێز(فوو كردن بە كەڕەنادا)بیان گرێت ﴿وَهُمْ يَخِصِّمُونَ﴾لە كاتێكدا لە نێو خۆیاندا دەمە قاڵێ دەكەن. ٤٩)﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ئەوسا ناتوانن هیچ وەسیەتێك بكەن یا بگەڕێنەوە لای كەس و كاریان. ٥٠)﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ وە (جارێ تر) فوو دەكرێ بە كەڕەنادا ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ﴾ ئەدجا ئەوان كوت و پڕ لە گۆڕەكان دێنەدەروەو﴿إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾بە پەلە دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان. ٥١) ﴿قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا﴾ دەڵێن ئەی هاوا بۆ ئێمە كێ زیندووی كردینەوە لە گۆڕەكانمان دا ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ئەمە ئەو بەڵێنەیە خوای میهرەبان پێ ی دابن و پێغەمبەرەكان ڕاستیان كرد. ٥٢)﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً﴾ تەنها شریخە ودەنگێكی گەورە دێت﴿فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ئیتر كوت و پڕ هەموویان (بە كۆمەڵی) لای ئێمە ئامادە كراون. ٥٣)﴿فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ئەمڕۆش هیچ جۆرە ستەمێك لە كەس ناكرێ﴿وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾وە جگە لەوەی كەدەتان كرد پاداشت و سزا نادرێنەوە. ٥٤)

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

-بالعبرانية ويفسرونها بالعربية لأهل الإسلام ، فقال رسول الله(ﷺ) : (لا تصدقوا أهل الكتاب ولا تكذبوهم، وقولوا : آمنا بالله وما أنزل إلينا وما أنزل إليكم، وإلهنا وإلهكم واحد ونحن له مسلمون) (رواه البخاري). ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێ: جولەکەکان تەوراتیان بە زمانی عیبری دەخوێندەوەو بە زمانی عەرەبی مانایان دەکرد بۆ موسڵمانان جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( نە باوەڕ بە جولەکە بکەن نە بە درۆشیان بخەنەوە وە بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە خوا و ئەو قورئانەی کەبۆمان هاتووەو ئەوەی بۆ ئێوەش هاتووەو پەروەردگاری ئێمەو ئێوە یەکێکەوە ئێمە تەنها بۆ ئەو گەردن کەچین).

ئایەتی (٥٩) سورەتی (العنكبوت): قال رسول الله(ﷺ): (إذا أراد الله بعبده الخير عجل له العقوبة-

﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ﴾ بەڕاستی بەهەشتی یەکان ئەمڕۆ ﴿فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ لەخۆشی و شادیدا سەرقاڵن. ٥٥) ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ خۆیان و هاوسەرەکانیان لە سێبەرکاندا لە سەر تەخت (ی ڕازاوە) پاڵیان داوەتەوە.٥٦) ﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾لەو(بەهەشتە)دا بۆیان ئامادەیەمیوەهات وهەرچی داوا بکەن. ٥٧) ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ سەلام (یان لێ دەکرێ) بە ووتەیە لە لایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە. ٥٨) ﴿وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئێوەش ئەی تاوانباران ئەمڕۆ جیا ببنەوە (لە ئیمانداران). ٥٩) ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا وەسێتم بۆ نەکردن ﴿أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ﴾ کە شەیتان نەپەرستن ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە. ٦٠) ﴿وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾ وە(ئایا وەسێتم بۆ نەکردن) کەمن بپەرستن ئەمە ڕێگای ڕاستە. ٦١) ﴿وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ﴾ سوێند بەخوا بێگومان (شەیتان) خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕا کرد ﴿أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا بۆ ژیر نەبوون. ٦٢) ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ ئەمەئەودۆزەخەیە کەبەڵێنتان پێ درابوو. ٦٣) ﴿ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ ئەمڕۆ بڕۆنە ناوی یەوە بە هۆی بێ باوەڕ بوونتانەوە. ٦٤) ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ ئەمڕۆ مۆر دەنێین بەسەر دەمیاندا ﴿وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ﴾ و دەستیان قسەمان لەگەڵدا دەکەن ﴿وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ و قاچیان شایەتی دەدەن بەوەی کە کردویانە. ٦٥) ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ﴾ وە ئەگەر بمانەوێ ڕووناکی چاویان نامێڵین (کوێریان دەکەین) ﴿فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ﴾ ئەوسا دەیانەوێ بەرەو ڕێگای ڕاست پێشبڕکێ بکەن جا چۆن دەبینن. ٦٦) ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ﴾ خۆ ئەگەر بمانەوێ لەشوێنی خۆیاندا شێوەی ئادەمییان دەگۆڕین (دەیان کەین بە شتێکی خراپ) ﴿فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ﴾ بەهۆی ئەو (گۆڕینەوە) نەیان دەتوانی نەبڕۆن نەبگەڕێنەوە. ٦٧) ﴿وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ﴾ وە تەمەنی هەر کەس درێژ کەین لاشەی لاواز و ناتەوان دەکەین دەی ئایا ژیر نابن. ٦٨) ﴿وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ﴾ ئێمە ئەو (موحەممەد (ﷺ)) مان فێر شیعر نەکردووە و شیعر ووتن شیاوی ئەو نی یە ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ﴾ و ئەوەی (موحەممەد (ﷺ)) دەیڵێ پەند و ئامۆژگاری و قورئانی ڕونکەرەوەی (ڕاستی یە). ٦٩) ﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا﴾ بۆ ئەوەی ئەوانەی (دڵ) زیندوون بیان ترسێنێ ﴿وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ و بەڵێنی (سزا) بسەپێ بەسەر بێ باوەڕاندا.٧٠)

أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

## سُورَةُ الصَّافَّاتِ

ترتيبها ٣٧ — آياتها ١٨٢

**هـــۆی هاتنـــە خوارەوەی ئایەتی (٧٧ تـــا ٨٢) ســورەتی (یــس):** ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ، وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ...﴾ حاکیم و ئیبن ئەبی حـــاتیم لـــە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباســـەوە دەگێڕنـــەوە کـــە وتـــی: عاصـــی کـــوڕی وائیـــل ئێسکێکی کۆنی لە بەطحا هـەڵگرت و بەدەســـتی وردی کرد پاشان بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) ووت : ئایا خوا ئـەم ئێسکە پـاش ئـەوەی کـە ڕزیوە زیندووی دەکاتەوە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ خوا دەتمرێنێ و زیندووت دەکاتەوە خوای ئەوە دەتخاتە دۆزەخەوە ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ، وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ...﴾ تا کۆتایی سورەتەکە.

﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ﴿أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا﴾ کە بێگومان ئێمە ئاژەڵمان بۆ ئەوان دروست کردووە ﴿فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ﴾ ئەنجا ئەوان خاوەنیانن. ٧١) ﴿وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ﴾ وە رامان هێناون بۆیان ﴿فَمِنۡهَا رَكُوبُهُمۡ وَمِنۡهَا يَأۡكُلُونَ﴾ ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن و (گۆشتی) هەندێکیشیان دەخۆن. ٧٢) ﴿وَلَهُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُۚ﴾ وە زۆر سوودیان لێ دەبینن و شتی خواردنەوەشیان لێ وەردەگرن ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ﴾ دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن. ٧٣) ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ﴾ وە بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە ﴿لَّعَلَّهُمۡ يُنصَرُونَ﴾ بەو هیوایەی یارمەتی بدرێن. ٧٤) ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ﴾ (ئەو پەرستراوانە) ناتوانن یارمەتیان بدەن ﴿وَهُمۡ لَهُمۡ جُندٞ مُّحۡضَرُونَ﴾ بەڵام ئەمان سەربازی ئامادەن لە خزمەتیاندان. ٧٥) ﴿فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ﴾ جا قسەکانیان غەمبارت نەکات ﴿إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوەی دەی شارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن دەیزانین. ٧٦) ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئایا ئادەمی نەیزانیوە ﴿أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ﴾ کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ﴾ کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار (دەمقاڵێ کەرێکی ئاشکرایە). ٧٧) ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥ﴾ و نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیر چۆتەوە ﴿قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ﴾ (ئەو بێ بڕوایە) دەڵێ کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە رزیون. ٧٨) ﴿قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بە دی هێناون ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾ و ئەو بە هەموو دروست کراوێك زانا و ئاگایە. ٧٩) ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا﴾ زاتێ کە لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردوون ﴿فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ﴾ ئیتر ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە. ٨٠) ﴿أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ ئایا زاتێ کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ﴿بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ﴾ ناتوانێ وێنەیان دروست بکات؟ ﴿بَلَىٰ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بەڵێ دەتوانێ و هەر ئەوەیش دروست کەری زانایە ٨١) ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا﴾ بەراستی کاری ئەو (خوا) ئەمەیە هەر کاتێ بیەوێ شتێك بە دیبێنێ ﴿أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ پێی دەڵێ: ببە دەست بەجێ (ئەو شتە) دەبێت. ٨٢) ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ جا پاك و بێگەردە خوایە کە مولکایەتی هەموو شتێك بەدەست ئەوە ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ و بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە. ٨٣)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾

-في الدنيا، وإذا أراد الله بعبده الشر أمسك عنه بذنبه حتى يوافي به يوم القيامة)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ بەندەکەی بووێ تۆڵەی (تاوانەکانی) لەدنیادا بۆ پێش دەخات وەئەگەر خوای گەورە نیازی خراپی بەبەندەکەی بێت تۆڵەی تاوانەکانی رادەگرێ تا لەرۆژی دوایی دا بەتەواوی تۆڵەی لێبکاتەوە).

ئایەتی (٦٤) سورەتی (العنکبوت): قال رسول الله(ﷺ): (يؤتى بأنعم أهل الدنيا من أهل النار يوم القيامة فيصبغ في النار صبغة ثم يقال: يا ابن آدم هل رأيت خيراً قط؟ هل مر بك نعيم قط؟ فيقول: لا والله يا رب، ويؤتى بأشد الناس بؤساً في الدنيا من أهل الجنة فيصبغ صبغة في الجنة فيقال: يا ابن-

## سورەتی ﴿ الصافات ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا﴾ سوێند بەو فریشتانە ریز بوون (لە کاتی عیبادەتدا). ١) ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا﴾ وە سوێند بەوانە کە دەخوڕن بەسەر هەورەکاندا. ٢) ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا﴾ وە سوێند بەخوێنەرانی قورئان. ٣) ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ﴾ بەراستی پەرستراوی ئێوە تاك و تەنهایە. ٤) ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە ﴿وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ﴾ و پەروەردگاری خۆر هەڵاتەکان. ٥) ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ﴾ بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بەجوانی ئەستێرەکان رازاندۆتەوە. ٦) ﴿وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ﴾ وە لەهەموو شەیتانێکی سەر کەش پاراستوومانە. ٧) ﴿لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ ناتوانن گوێ بگرن بۆ ئەو فریشتانەی لە بەرزترین پلەدان ﴿وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ﴾ وە (ئەگەر بچن گوێ بگرن) لە هەموو لایەکی (ئاسمانەوە) ئاگر باران دەکرێن. ٨) ﴿دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾ راو دەنرێن زۆر بە توندی و (لە قیامەتدا) سزایان بەردەوامە و سەختە. ٩) ﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ﴾ (شەیتانەکان ناتوانن گوێ بگرن) مەگەر یەکێکیان بە دزیەوە هەواڵێك (لە فریشتەیەك ببیستێ و) بە پەلە بیفڕێنێ ﴿فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ ئەویش ئەستێرەیەکی ڕووناك شوێنی دەکەوێ (و دەی سوتێنێ). ١٠) ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا﴾ ئەنجا لەوانە (ی بێ باوەڕن ئەی موحەممەد (ﷺ)) بپرسە ئایا ئەوان دروستکراوێکی بەهێزن ﴿أَم مَّنْ خَلَقْنَآ﴾ یا ئەوەی ئێمە دروستمان کردووە (لە ئاسمان و خۆر و زەوی و ..) ﴿إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ﴾ بەراستی ئێمە ئەوان (ئادەمی) مان دروست کرد لە قوڕێکی لینجی جیڕ. ١١) ﴿بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ﴾ بەڵام (سەیرە) تۆ سەرت سورماوە (چۆن باوەڕ ناهێنن) کەچی ئەوان گاڵتە دەکەن (بە تۆ کە دەڵێن زیندوو بوونەوە هەیە). ١٢) ﴿وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ﴾ وە کاتێ ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەر ناگرن. ١٣) ﴿وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾ وە کاتێ موعجیزەیەك ببینن دەیکەنە گاڵتەجار. ١٤) ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ وە دەڵێن ئەم (قورئانە) هیچ نییە جگە لە جادوویەکی ئاشکرا. ١٥) ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا﴾ (دەڵێن) ئایا ئێمە کە مردین و بووین بەخۆڵ و ئێسکە رزیو ﴿أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟! ١٦) ﴿أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ لەگەڵ باوو باپیرانی پێشینانمان. ١٧) ﴿قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بەڵێ (هەمووتان زیندوو دەکرێنەوە) و لەو کاتەدا ئێوە زەلیل و سەر شۆڕن. ١٨) ﴿فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ﴾ چونکە ئەو (زیندوو بوونەوەیە) هەر یەك دەنگە ئیتر دەست بەجێ زیندوون و دەڕوانن. ١٩) ﴿وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾ وە دەڵێن: وای بۆ خۆمان ئەمە ڕۆژی تۆڵەسەندن و پاداشتە. ٢٠) ﴿هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ (پێیان دەوترێ) ئەمە ئەو ڕۆژی بڕیاردانەیە کە باوەڕتان پێی نەبوو. ٢١) ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ﴾ (خوا بەفریشتەکان دەفەرموێ) ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە لەگەڵ هاوڕێ **کانیان** (هاو وێنەکانیان) ﴿وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ﴾ لەگەڵ ئەوانەش دەیان پەرستن ٢٢) ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ جگە **لە** خوا ﴿فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەنجا ڕێگای دۆزەخیان نیشان دەن. **٢٣)** ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ﴾ وە ئەوانە راوەستێنن بێگومان پرسیاریان لێ دەکرێ. ٢٤)

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾

-آدم هل رأيت بؤساً قط؟ هل مر بك شدة قط؟ فيقول: لا والله ما مر بي بؤس قط ولا رأيت شدة قط)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لەڕۆژی دوایی دا ج کەسێک لەو پەڕی نازو نیعمەتدا بووە بەڵام لەڕۆژی دوایی دا دۆزەخی یە دەیهێنن و یەک جار لەئاگر هەڵی دەکێشن (وەکو جلێک هەڵی بکێشیت لەڕەنگاو) پاشان پێ ی دەوترێ ئەی ئادەمیزاد ئایا هیچ چاکەیەکت بینیوە؟ ئایا خۆشیت بەسەردا هاتووە؟ دەڵێ: نەوەڵا ئەی پەروەردگارم، وە بەهەشتیەکیش دەهێنرێ کە لەدنیادا لەهەموو کەس زیاتر لەتەنگانە و ناخۆشیدا بووە هەڵی دەکێشن لەناز و خۆشی بەهەشتدا پاشان پێ ی دەڵێن: ئایا هەرگیز ناخۆشیت دیوە؟ هیچ سەختی و تەنگانەیەکت هاتۆتە ڕێ؟ دەڵێ: نەوەڵا نە ناخۆشیم تووش بووەو نەتەنگانەم دیوە).

﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ (پێیان دەوترێ) ئەوە چیتانە یارمەتی یەکتر نادەن. ٢٥)﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ (نەخێر یارمەتی یەکتر نادەن) بەڵکو ئەوان هەموو (بەندەو پەرستراوەکانیان) لەو ڕۆژەدا گەردن کەچن بۆ خوا. ٢٦)﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ و (لەو ڕۆژەدا) ڕوو دەکەنە یەکترو پرسیار لەیەکتر دەکەن. ٢٧)﴿قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ﴾ (گومڕاکراوەکان بەگومڕاکەرەکان) دەڵێن بەڕاستی ئێوە بوون لەلای ڕاست و حەقەوە هاتنە لامان (ئەتان هێڵا شوێنی کەوین). ٢٨)﴿قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (گومڕاکەرەکان) دەڵێن (نەخێر ڕاست ناکەن) بەڵکو ئێوە خۆتان ئیمان دار نەبوون. ٢٩)﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ﴾ وە ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوو ﴿بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ﴾ بەڵکو خۆتان گەلێکی لە خوا یاخی بوون. ٣٠) ﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ﴾ ئەوەتە بڕیاری پەروەردگارمان (بەسزا دانمان) سەپا بەسەرماندا کە بەڕاستی دەبێ بیچەژین. ٣١)﴿فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ﴾ بەڵێ ئێمە ئێوەمان گومڕا کرد، چونکە بەڕاستی خۆشمان گومڕا بووین. ٣٢)﴿فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ جا بەڕاستی هەموویان (گومڕاکراو و گومڕاکار) لەو ڕۆژەدا لەسزادا هاوبەشن. ٣٣)﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە تاوانباران بەو جۆرە لێ دەکەین. ٣٤)﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ بەڕاستی هەر کاتێ بەوانە بوترایە ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لە خوا خۆیان بە گەورە دەزانی (و ملکەچی نەدەبوون). ٣٥)﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا﴾ وە دەیان ووت: ئایا ئێمە پەرستراوەکانمان واز لێ بێنین؟ ﴿لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ﴾ لە بەر شاعیرێکی شێت. ٣٦)﴿بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (نەخێر وانییە) بەڵکو ئەو (پێغەمبەرە) هەقی هێناوەو باوەڕی بە پێغەمبەرانی پێشوو هەیە. ٣٧) ﴿إِنَّكُمْ لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ﴾ بەڕاستی ئێوە سزای سەخت دەچەژن. ٣٨) ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ و ئێوە تەنها تۆڵەی ئەو (خراپانە)تان لێ ئەسەنرێ کەکردوتانە. ٣٩)﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾بەڵام بەندە پاك و هەڵبژاردەکانی خوا. ٤٠)﴿أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ﴾ ئەوانەن ڕسق و ڕۆزی دیار کراویان بۆ هەیە. ٤١)﴿فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ کەمیوە هاتی جۆراو جۆرە وە ئەوان ڕێز لێ گیراون. ٤٢)﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾لە بەهەشتانی پڕ ناز و نیعمەتدا. ٤٣)﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ لەسەر تەخت و کورسی یە ڕازاوەکان بەرامبەر یەکتر دانیشتوون. ٤٤) ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾لە پەرداخی ناپابدا سەرچاوەی ڕەوان دەگەڕێنرێ بە سەریاندا. ٤٥)﴿بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ زۆر سپی یەوە بۆ ئەوانەی دەی خۆنەوە بەلەزەتە. ٤٦)﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾(ئەو شەرابە)نەمێشکیان تێك دەدات نەسەر خۆشیان دەکات ٤٧) ﴿وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ﴾ وە ئافرەتانی چاو جوان و گەورەیان لایە کە جگە لە مێردەکانیان سەیری کەس ناکەن. ٤٨)﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ وەکو هێلکەی ناو هێلانەن (یا ئەڵێی مرواری ناو سەدەفن). ٤٩)﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ ئەجا ڕوو دەکەنە یەكو پرسیار لە یەکتر دەکەن. ٥٠)﴿قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ﴾یەکێ لەوان دەڵێ: من (لە دنیا) هاوەڵێکم هەبوو. ٥١)

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِيٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَأَكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْاْ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾

**ئایەتی (١٧) سورەتی (الروم):** قال رسول الله(ﷺ): (من قال حين يصبح ﴿سبحان الله حين تمسون وحين تصبحون وله الحمد في السموات والأرض وعشياً وحين تظهرون﴾ إلخ الآية، أدرك ما فاته في يومه، ومن قالها حين يمسي أدرك ما فاته من ليلته) (رواه أبوداود) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك کاتێ ڕۆژ دەبێتەوە بڵێ: (سبحان الله حين تمسون و حين تصبحون الحمد في السموات والأرض وعشياً وحين تظهرون) تا کۆتایی ئایەتەکە، هەر کارێکی چاکەی لە دەست چووبێ لەو ڕۆژەدا بۆی دەنوسرێ، وە هەر کەس کاتێك ئێوارە دادێت بیڵێ ئەوا هەر کارێکی چاکەی لە دەست چووبێ لەو شەوەدا بۆی دەنوسرێ).

**ئایەتی (٢٧) سورەتی (الروم):** قال رسول الله(ﷺ): (يقول الله تعالى: كذبني ابن آدم ولم يكن له ذلك،–

﴿يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ﴾ دەی ووت: ئایا بەڕاستی تۆ لەوانەی باوەڕت هەیە (بەزیندوو بوونـەوە؟!). ٥٢)﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا﴾ ئایـا کـاتێ مـردین و بـووین بـە خـاك و ئێسقانی ڕزیوو ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾ ئایا بەڕاستی ئێمە(زیندوو دەکرێینەوەو) سزا دەدرێن. ٥٣)﴿ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ﴾ (پیاوە بەهەشتییەکە) ووتی ئایا ئێوە تەماشا (ی دۆزەخ) ناکـەن. ٥٤)﴿فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئـەنجا خـۆی سـەیری کـرد کـوت و پـڕ لـە ناوەڕاستی دۆزەخدا ئەو (هاوڕێی) دی. ٥٥)﴿ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ﴾ پێـی ووت سوێند بـەخوا نزیـك بـوو منـیش هەڵـدێری. ٥٦)﴿ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ وە ئەگـەر میهرەبانی پـەروەردگارم فریـام نەکەوتایـە منـیش لـە ئامـادەکراوان (ی نـاو دۆزەخ) دەبووم. ٥٧)﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ﴾دەی ئایائێمە نامرین؟! ٥٨)﴿إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ﴾ جگـە لـە مردنەکەی یەکەم (ی دنیا)مان. ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ وەئێمە سزا نادرێین؟! ٥٩)﴿إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ بەڕاستی ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە. ٦٠)﴿لِمِثْلِ هَـٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَـٰمِلُونَ﴾ با تێکۆشـەران بـۆ پاشـەڕۆژی وا تێبکۆشـن. ٦١)﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ﴾ ئایـا ئـەو (نیعمەتانەی باسکرا) ڕێزگرتنو میوان دارییە باشە یا(بـەری) درەختـی ژەقنـەمووت. ٦٢)﴿ إِنَّا جَعَلْنَـٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّـٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە ئەو (دارە)مان کردە هۆی تاقی کردنەوەی ستەمکاران (کە لە دنیـادا گاڵتـەیان پـێ دەکـرد). ٦٣)﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ بەڕاستی ئەو (ژەقنەمووتـە) درەختێکـە لـە بێخـی دۆزەخ دا دەڕوێ. ٦٤)﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَـٰطِينِ﴾ بەرووبوومەکەی دەڵێ ی سەری شەیتانەکانە (ناشـیرین و چڵ چڵاوی یە). ٦٥)﴿فَإِنَّهُمْ لَـَٔاكِلُونَ مِنْهَا﴾ جا بێگومان ئەو (دۆزەخیانە) لەو درەختە دەخۆن ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ و سکیان لە (بەری) ئەو درەختە پـڕ دەکـەن. ٦٦)﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾لە پاشان بە ڕاستی ئاوێکی لێڵی زۆر گەرمی بەسـەردا دەخۆنـەوە. ٦٧)﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ﴾ بێگومـان دواتـر گەڕانـەوەیان بـۆ دۆزەخـە. ٦٨)﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ﴾بەڕاستی ئەوان باو و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی بینی. ٦٩)﴿ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾ ئینجا ئەوان ماندەدران بۆ شوێن کەوتنیان (لە گومڕاییدا). ٧٠)﴿ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێش ئەو (گومڕایانـەی قـوڕەیش) زۆربـەی گەلـە پێشینەکان گومڕا بوون. ٧١) ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە ناو خۆیاندا (پێغەمبەرانی) ترسێنەرمان بۆ ناردن ٧٢) ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ ئینجا (ئەی موحەممەد(ﷺ)) سەرنج بدە سەرئەنجامی ترسێنراوەکان چۆن بوو. ٧٣) ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ بێجگە لـە بەنـدە هەڵبـژێراوەکانی خـوا. ٧٤)﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ﴾ سـوێند بەخوا بەڕاسـتی نووح (ﷺ) هاواری لێ کردین ئینجا ئێمـەش زۆر چاك وەڵامـی (هـاوارەکەی) ئەومانـە دایەوە. ٧٥)﴿وَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾ خۆی و کەس و کاری (باوەڕداری) مان لـە تەنگانە گەورەکە ڕزگار کرد. ٧٦)

وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

-وشتمني ولم يكن له ذلك، فأما تكذيبه إياي فقوله: لن يعيدني كما بدأني وليس أول الخلق بأهون علي من إعادته، وأما شتمه إياي فقوله: اتخذ الله ولداً، وأنا الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يكن له كفواً أحد)(رواه البخاري) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (خوای بەرزو بلند دەفەرموێ ئادەمی باوەڕ بەمن ناكات ئەدەبوو باوەڕم پێ نەكات، وە جنێوم پێ دەدات كەمافی ئەوەی نی یە جنێوم پێ بدات جاباوەڕ نەكردنی بەمن ئەوەیە كەدەڵێ خوا جارێكی تر زیندووم ناكاتەوە وەك لەسەرەتاوە دروستی كردووم لەكاتێكدا دروست كردنی یەكەم جار ئاسان تر نی یە (قورس تره) بەلای منەوە لەزیندوو كردنەوەی جاری دووەم وە جنێودانی بە من ئەوەیە كە دەڵێ: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیار داوە لەكاتێكدا من تەنهاو بێ نیازم كەلەكەس نەبووم و كەسیشم لێ نەبووە كەسیش هاوتاو وێنەم نی یە).

﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ وە تەنیا نەوەکانی ئەومان (لەسەر زەوی) هێشتەوە. ٧٧) ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ﴾ وە باسی و ناوبانگی(باشی) ئەومان لەناو گەلە پاشینەکاندا هێشتەوە (کە ئەمەیە). ٧٨)﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ سەلام و درووود لەسەر نووح لە لایەن هەموو جیهانیانەوە. ٧٩)﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ بەراستی ئێمە ئا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. ٨٠)﴿إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئەو لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمە بوو. ٨١)﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ﴾ لە پاشان ئەوانی تر (دوژمنان) مان نوقم کرد. ٨٢ ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم لە پەیڕەوان و شوێنکەوتوانی نووح بوو (لە بنەماکانی ئاییندا). ٨٣)﴿إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ کاتێ بە دڵێکی ساغەوە بەرەو پەروەردگاری هات. ٨٤)﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ﴾ کاتێ کە بەباوکی و گەلەکەی ووت چی دەپەرستن. ٨٥) ﴿أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ﴾ ئایا بێجگە لە خوا پەرستراوێکی درۆ و هەڵبەستراوتان دەوێ (بیپەرستن). ٨٦)﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئاخۆ گومانتان چۆنە بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهانیان؟. ٨٧)﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ﴾ ئینجا سەیرێکی ئەستێرەکانی کرد. ٨٨) ﴿فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ﴾ جا ووتی من نەخۆشم (نایەم بۆ جەژنەکەتان لە دەرەوەی شار). ٨٩)﴿فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ ئەوانیش پشتیان تێ کرد و ڕۆشتن (بۆ دەرەوەی شار بۆ جەژنەکەیان). ٩٠)﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ جا (ئیبراهیم) بە نهێنی ڕۆشت بۆ لای پەرستراوەکانیان (بە گاڵتەوە) پێی ووتن ئەوە بۆ شت ناخۆن. ٩١)﴿مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ﴾ئەوە چیتانە قسە ناکەن. ٩٢)﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ﴾ ئینجا بەدەستی ڕاستی (بە تەور) دەستی کرد بەلێدانیان (ورد وردی کردن جگە بتە گەورەکەیان). ٩٣)﴿فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾ (گەلەکەی زانیان) یەکسەر بە پەلە بەرەو ئیبراهیم هاتن. ٩٤) ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ئایا ئێوە بتانێك دەپەرستن کە خۆتان دەیتاشن و دروستی دەکەن؟ ٩٥)﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ لە کاتێکدا خوا بەدیهێنەری خۆتان و ئەو بتانەشە دروستان کردوون. ٩٦) ﴿قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ﴾ ووتیان بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکەن (پڕی کەن لە ئاگر) و فڕێ ی بدەنە ناو ئاگرەکەوە. ٩٧)﴿فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾ ویستیان (بیکوژن) بە پیلان بەڵام ئێمە ئەوانمان ژێر خست. ٩٨)﴿وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ﴾ (ئیبراهیم) ووتی من دەڕۆم بۆ لای پەروەردگارم دڵنیام ڕێنموونیم دەکات. ٩٩)﴿رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەی پەروەردگارم منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە. ١٠٠)﴿فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ﴾ ئێمەش مژدەی کوڕێکی لەسەرخۆمان پێ دا. ١٠١)﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ﴾ جا کاتێ ئەو (کوڕەکەورە بوو تا) گەشتە ئەوەی ئیش و کار بکات لەگەڵ (ئیبراهیم)دا. ﴿قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ﴾ (ئیبراهیم) ووتی ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم بەڕاستی من لە خەودا دیم کە سەرت دەبڕم ﴿فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ﴾ جا سەرنج بدە دەڵێ ی چی و ڕات چی یە ؟ ﴿قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ (کوڕەکە) ووتی بابەگیان ئەوەی فەرمانت پێ دراوە بیکە ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ دڵنیابە دەمبینی بە ویستی خوا لە خۆگران دەبم. ١٠٢)

فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾

**ئایەتی (٣٦) سورەتی (الروم):** قال رسول الله (ﷺ): (عجباً **للمؤمن لا** يقضي له قضاء إلا كان **خيراً له** إن أصابته **سراء شكر** فكان خيراً له وإن أصابته **ضراء صبر** فكان خيراً **له) (رواه** أحمد). **پێغەمبەری** خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاری **موسڵمان** سەیرو سەر سوڕهێنەرە، هەموو کارێکی **هەر** مایەی خێرە **بۆی، چونکە** ئەگەر تووشی خۆشی بهات سوپاسی خوای لەسەر دەکات ئەوە بەچاکە دەنوسرێت بۆی، **وەئەگەر تووشی ناخۆشی هات ئارام دەگرێ ئەوە** ئەویش بەچاکە دەنوسرێت بۆی).

**ئایەتی (٥٤) سورەتی (الروم):** قال رسول الله (ﷺ): (يبعث كل عبد على ما مات عليه) (رواه **مسلم). پێغەمبەری خوا** (ﷺ) فەرمووی: **(لە رۆژی دوایی دا** هەموو کەس لەسەر **ئەو شتە زیندوو دەکرێتەوە کە لەدونیادا لەسەری مردووە).**

﴿فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ﴾ ئینجا کاتێ هەر دووکیان ملکەچ بوون (بۆ فەرمانی خوا) و ئیبراهیم ئیسماعیلی بەروودا خستەسەر زەوی. ١٠٣) ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ﴾ ئێمەش بانگمان کرد ئەی ئیبراهیم. ١٠٤) ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ﴾ بێگومان خەوەکەت بەجێ هێنا ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەراستی ئێمە تا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. ١٠٥) ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ﴾ بێگومان ئەمە تاقی کردنەوەی ئاشکرابوو. ١٠٦) ﴿وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ﴾ وە بەرانێکی گەورەمان کردە قوربانی ئەو (ئیسماعیل). ١٠٧) ﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە باسکردن بەچاکەی ئیبراهیمان لەناو گەلانی داهاتوودا هێشتەوە. ١٠٨) ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ درود و سەلام لەسەر ئیبراهیم. ١٠٩) ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ تا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. ١١٠) ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بەراستی ئەو لەبەندە ئیمان دارەکانی ئێمەیە. ١١١) ﴿وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ مژدەی ئیسحاقمان پێدا (کە دەبێتە) پێغەمبەرێك لەچاکان. ١١٢) ﴿وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ﴾ جا فەڕ و بەرەکەتمان رشت بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاق دا ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ﴾ و لە نەوەی هەردووکیان کار چاك و ستەمکار لەخۆی بەئاشکرا هەبوو. ١١٣) ﴿وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان منەتمان نا بەسەر مووساو هاروون دا. ١١٤) ﴿وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ هەردووکیان و گەلەکەیانمان لە تەنگانە گەورەکە رزگار کرد. ١١٥) ﴿وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ﴾ وە یارمەتیمان دان بۆیە هەر ئەوان سەرکەوتن (بەسەر فیرعەون و کۆمەڵەکەیدا). ١١٦) ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ﴾ وە کتێبی روونکەرەوەمان دا بە هەردووکیان (مووسا و هاروون). ١١٧) ﴿وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ وە رێنموونی هەردووکیانمان کرد بۆ رێگای راست. ١١٨) ﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ وە ناوبانگی چاکی هەردووکیانمان لە ناو گەلە پاشینەکاندا هێشتەوە. ١١٩) ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ سەلام لەسەر مووسا و هاروون بێت. ١٢٠) ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەراستی ئێمە تا بەو جۆرە پاداشتی کار چاکان دەدەینەوە. ١٢١) ﴿إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان هەردووکیان لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەن. ١٢٢) ﴿وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ بەراستی ئیلیاس (پێغەمبەرێك بوو) لەپێغەمبەران. ١٢٣) ﴿إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ کاتێ بە گەلەکەی ووت ئەوە لەخوا ناترسن (خۆتان ناپارێزن). ١٢٤) ﴿أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾ ئایا (بتی) بەعل دەپەرستن و واز دێنن لە (پەرستنی) چاکترینی دروست کاران. ١٢٥) ﴿ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کەخوای پەروەردگاری ئێوە و باوو باپیرە پێشینەکانتانە. ١٢٦)

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ
نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا
لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا
فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم
مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ
الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ
مِنَ الْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَا أَنَّهُ
كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾
۞ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً
مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ
وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ
شَاهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ
اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾

**ئایەتی (١٤) سورەتی (لقمان):** جاء رجل إلى رسول الله (ﷺ) فقال يارسول الله: (من أحق الناس بحسن صحابتي؟ قال: أمك قال: ثم من؟ قال: أمك قال: ثم من؟ قال: أمك قال ثم من؟ قال: أبوك)(متفق عليه). پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ووتی: (ئەی پێغەمبەری خوا کێ شیاوترین کەسە کەبەچاکی هاوڕێیەتی بکەم؟ فەرمووی: دایکت، ووتی: ئینجا کێ ی تر؟ فەرمووی: دایکت، ووتی: ئینجا کێ ی تر؟ فەرمووی: دایکت ، ووتی: ئینجا کێ ی تر؟ فەرمووی: باوکت)

**ئایەتی (١٧) سورەتی (لقمان):** قال رسول الله (ﷺ): (ما يزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه وولده حتى يلقى الله تعالى وماعليه خطيئة) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەردەوام پیاوو ئافرەتی ئیماندار تووشی تاقی کردنەوە دەبێت لەخۆی و منداڵ و خێزانی دا-

﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ کەچی باوەڕیان نەهێنا بە ئیلیاس کەوابوو بێگومان ئەوان ئامادە دەکرێن(لە دۆزەخ دا). ١٢٧)﴿ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ جگە بەندە هەڵبژێراوەکانی خوا. ١٢٨)﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ وە باسی چاکی ئەو (ئیلیاس) مان لەناو گەلە پاشینەکان دا هێشتەوە. ١٢٩)﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ﴾ سەلام لەسەر ئیلیاس بێت (ئیلیاسین ئیلیاس هەر یەك کەسە). ١٣٠)﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ١٣١)﴿ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئەو (ئیلیاس) لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمەیە. ١٣٢)﴿ وَإِنَّ لُوطًا لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بەڕاستی لووط (پێغەمبەرێك بوو) لە پێغەمبەران.١٣٣)﴿ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾ کاتێ خۆی و هەموو کەسەکانی و شوێن کەوتووانیمان رزگار کرد. ١٣٤)﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ﴾ بێجگە لەپیرەژنێك (خێزانی نووح) کە لە تیاچووەکان بوو. ١٣٥) ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانی ترمان لەناو برد. ١٣٦)﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ﴾ بەراستی ئێوە (قوڕەیشییەکان) دەڕۆن بەسەر (شوێنەکان)یاندا بە بەیانیاندا (بە ڕۆژ). ١٣٧)﴿ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ و بەشەودا ئایا ئیتر ژیر نابن. ١٣٨)﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ وە بە ڕاستی یونس (پێغەمبەرێك بوو) لەپێغەمبەران. ١٣٩)﴿ إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ کاتێ ڕای کرد بۆ لای کەشتیەکی پڕ (لە خەڵك). ١٤٠) ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾ ئینجا قورعە کێشی کرد (لەگەڵ خەڵکی ناو کەشتییەکە) و ئەو لە دۆڕاوان بوو. ١٤١)﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ (خرایە دەریاکەو) ئینجا نەهەنگێك قووتی دا ئەویش شایانی سەرزەنشت بوو. ١٤٢)﴿ فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ﴾ خۆ ئەگەر بەراستی ئەو لە یاد کارانی (خوا) نەبوایە. ١٤٣)﴿لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تا ڕۆژێ زیندوو دەکرێنەوە لەناو سکی ئەو (نەهەنگەدا) دەمایەوە. ١٤٤)﴿ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴾بە هۆی ئەوەوە فڕێمان دایە زەویەکی ڕووت (بێ دار و درەخت) نەخۆشیش بوو. ١٤٥)﴿ وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴾ وە ڕووەکێکی کولەکەمان بەسەریدا ڕواند. ١٤٦)﴿ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ ئەوسا بە پێغەمبەرێتی ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس یا زیاتر. ١٤٧)﴿ فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ گەلەکەش باوەڕیان هێنا و بەو هۆیەوە بەهرەمەندمان کردن لەژیان تا ماوەیەك. ١٤٨)﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ﴾ ئینجا (ئەی موحەممەد (ﷺ)) پرسیاریان لێ بکە ئایا کچان بۆ پەروەردگارتە و کوڕانیش هی ئەوانە؟ ١٤٩)﴿أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ﴾یا ئەوان بە دیارەوە بوون کە ئێمە فریشتەکانمان بە مێینە دروست کرد. ١٥٠)﴿ أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ﴾بێدار بن بەڕاستی ئەوان لە دەس هەڵبەسی خۆیانەوە دەڵێن. ١٥١)﴿ وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾خوا مندالی بووەو بێگومان ئەوانە درۆزنن. ١٥٢) ﴿أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ﴾ئایا (خوا) کچانی هەڵبژاردووە(بۆ خۆی)بەسەر کوڕان دا. ١٥٣)

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُّبِينٌ
﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ
نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا
يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾
مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّا إِلَّا
لَهُ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ
﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا
عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا بِهِ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ
سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ
جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ
يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ
صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ
يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾
وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٢﴾




-مەتاوای لێ دێ کەدەگاتە خزمەتی پەروەردگار (لەڕۆژی دواییدا) هیچ تاوانێکی لەسەر نەماوە هەمووی سڕاوەتەوە بە بەلاو ناڕەحەتی).

**ئایەتی (٣٣) سورەتی (لقمان):** قال رسول الله (ﷺ): (اللهم لا عيش إلا عيش الآخرة)(متفق عليه) وقال رسول الله (ﷺ) (ما الدنيا في الآخرة إلا مثل ما يجعل أحدكم إصبعه في اليم فلينظر بم يرجع). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەی پەروەردگار ژیانی ڕاستەقینە نییە جگە لەژیانی دواڕۆژ، هەر ئەوەیە ژیان لەڕاستیدا) وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەم دونیایە لەچاو دوا ڕۆژدا وەك ئەوە وایە کە یەکێکتان پەنجەیەکی بکات بەناو ئاوی دەریادا جا پاشان سەرنج بدات کەپەنجەکەی چەندێ -ئاو لەو دەریایە- لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ).

﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ چیتانە چۆن بڕیاری وا دەدەن. ١٥٤)﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا بیر ناکەنەوە؟ ١٥٥)﴿أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُبِينٌ﴾ یان بەڵگەیەکی ڕوونتان (لەم بارەیەوە) هەیە. ١٥٦)﴿فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ دەی کتێبەکەتان (بەڵگەکەتان) بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن. ١٥٧)﴿وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا﴾ وە ئەو (بێ باوەڕانە) لە نێوان خواو جنۆکەدا خزمایەتی یان بڕیار داوە. ﴿وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان جنۆکەکان دەیان زانی کە بەڕاستی ئەوان ئامادە دەکرێن (لەڕۆژی دواییدا). ١٥٨)﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاك و بێگەردە خوا لەوەی ئەو (بێ باوەڕانە) دەیڵێن. ١٥٩)﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ (هەموویان سزا دەدرێن) بێجگە بەندە خاوێن کراوەکانی خوا. ١٦٠)﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ﴾ ئینجا بەڕاستی ئێوە ئەو (بتانە) یش کە دەیپەرستن. ١٦١)﴿مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ﴾ ئێوە ناتوانن لەبەرانبەری خوادا گومڕاکەری (کەس) بن. ١٦٢)﴿إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾ بێجگە ئەو کەسەی (خوا دەزانێ) دەچێتە دۆزەخەوە. ١٦٣)﴿وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَعْلُومٌ﴾ (فریشتەکان دەڵێن) هیچ کام لەئێمە نییە مەگەر پلەو شوێنێکی دیاری کراوی خۆی هەیە. ١٦٤)﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە هەموومان بەڕیز وەستاوین (بۆ عیبادەت و بەجێ هێنانی فەرمانی خوا). ١٦٥)﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ﴾ وە بێگومان ئێمەین هەمیشە پاکی و بێگەردی ئەو دەڵێین. ١٦٦)﴿وَإِنْ كَانُوا لَيَقُولُونَ﴾ بێگومان هەر چەندە بت پەرستان دەیان ووت. ١٦٧)﴿لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا ذِكْرًا مِنَ الْأَوَّلِينَ﴾ بەڕاستی ئەگەر کتێبێك (ی ئاسمانی وەك کتێبی) پێشینانمان هەبوایە. ١٦٨)﴿لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە لە بەندە پاك و خاوێنەکانی خوا دەبووین. ١٦٩)﴿فَكَفَرُوا بِهِ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئینجا (کە کتێبیان بۆ هات) باوەڕیان پێ نەهێنا و بەزوویی دەزانن (سەر ئەنجامی بێ بڕواییەکەیان چۆن دەبێ). ١٧٠)﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێشتر بڕیارمان داوە بۆ بەندە نێردراوەکانمان. ١٧١)﴿إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنْصُورُونَ﴾کە بێگومان هەر ئەوان سەر دەخرێن.١٧٢)﴿وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾ دیاریشە هەر سەربازانی ئێمە سەردەکەوون. ١٧٣)﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ﴾ تۆش وازیان لێ بێنە تا ئەو ماوەی(دیاریکراوە بۆ لەناویردنیان). ١٧٤)﴿وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ وە بیان بینە(سەرنجامیان چۆن دەبێت) ولەمەولا ئەوانیش دەبینن (چییان بەسەر دێت). ١٧٥)﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ جا ئایا بەپەلە داوای سزای ئێمە دەکەن. ١٧٦)﴿فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ﴾ هەر کاتێ سزای ئێمە هاتە خوارەوە بۆ ناوماڵەکانیان. ﴿فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئەوسا ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپ و تەنگیان دەبێ. ١٧٧) ﴿وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ﴾ وە وازیان لێ بێنە تا ئەو ماوەی (دیاری کراوە بۆیان). ١٧٨)﴿وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ وە ببینە ئینجا لەمەولا ئەوانیش دەبینن. ١٧٩)﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾پەروەردگارت پاك و بێگەردە پەروەردگاری باڵا دەست لەوەی بێ باوەڕان دەیڵێن (دەربارەی). ١٨٠)﴿وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ﴾سڵاو و درودیش بۆ گشت پێغەمبەران. ١٨١)﴿وَالْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ سوپاس و ستایشیش بۆ خوای ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پەروەردگاری هەموو جیهانیان. ١٨٢)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾

ئایەتی (١٦) سورەتی (السجدة): قال رسول الله (ﷺ): (يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم إذا هو نام ثلاث عقد، يضرب على كل عقدة: عليك ليل طويل فارقد، فإن استيقظ فذكر الله تعالى انحلت عقدة فإن توضأ انحلت عقدة فإن صلى انحلت عقدة كلها فأصبح نشيطاً طيب النفس، وإلا أصبح خبيث النفس كسلان)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (هەریەکە لەئێوە کاتێک دەخەوێت شەیتان سێ گرێ دەدات لەپشتی سەرتانەوە بەهەریەکەیان دەست دەدات و دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژت لەپێشدایە، جا ئەگەر خەبەری بوویەوەو یادی خوای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە وە ئەگەر دەست نوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە وەئەگەر نوێژیشی کرد ئیتر هەموو گرێکان دەکرێنەوە جا بەگورج و گۆڵی و-

## سورەتی ﴿ص﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿صٓ﴾ بە (صاد) دەخوێنرێتەوە خوازاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاتر سەیر سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە. ﴿وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ﴾ سوێند بە قورئانی خاوەن ڕێز و پەند و ئامۆژگاری. ١)﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾ بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕن ڕۆ چوون لە خۆبەگەورە زانین و دژایەتیدا (بەرانبەر ئیسلام و شوێن کەوتووانی). ٢)﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ﴾ چەندەها گەلمان پێش ئەوان (کافرانی مەککە) لەناو برد ﴿فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ ئنجا هاواریان کرد لە حاڵێکدا کاتی ڕزگار بوون نەمابوو. ٣)﴿وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ﴾ سەریان سوڕدەماکە ترسێنەرێکیان لە خۆیان بۆ هاتووە ﴿وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾ وە بێ باوەڕان دەیان ووت ئەم (پێغەمبەرە) جادوو گەرێکی زۆر درۆزنە. ٤)﴿أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا﴾ ئایا ئەو (پێغەمبەرە) هەموو خواکانی کردۆتە یەك خوا. ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ﴾ بەڕاستی ئەمە (کەیەك خوا ببێ) شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە. ٥)﴿وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ﴾ وە گەورەکانی (قوڕەیش لەگەڵ پێغەمبەر قسەیان کرد و هەڵسان) بە پەلە دەرچوون ﴿أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ﴾ (بەخەڵکیان ووت) بڕۆن و خۆ گر بن لەسەر (پەرستنی) خواکانتان ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ﴾ بەڕاستی ئەمە(ی موحەممەد(ﷺ)) دەیڵێ) شتێکە لە ئێوە داوا کراوە (تا ببێتە گەورەی هەموو عەرەب). ٦)﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئەمەمان نەبیستووە لە کۆتا ئاییندا (کە نەسرانی یە). ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ﴾ ئەمە تەنیا شتێکی هەڵبەستراوە. ٧)﴿أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا﴾ ئایا چۆن وەحی لە ناو هەموومان دا بۆ ئەو (موحەممەد (ﷺ)) دابەزێنراوە﴿بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى﴾ (نەخێر ڕاست ناکەن) بەڵکو ئەوانە لە گوماندان لە قورئانەکەی من ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ﴾ (نەخێر وا نیە) بەڵکو ئەوانە هێشتا سزای منیان نەچەشتووە (بۆیە باوەڕ ناهێنن). ٨)﴿أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ﴾ یا غەزنەکانی بەزەیی پەروەردگارت لای ئەوانە کە زاڵی بەخشندەیە. ٩)﴿أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ یا دەسەڵات و پاشایی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە هی ئەوانە ﴿فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ﴾ (ئەگەر وایە) دەبا بەرز ببنەوە لە ناو هۆکارەکانی بەرز بوونەوەدا (تا دەگەنە عەرش ئینجا وەحی دابەزێنن بۆ هەر کەسێ خۆیان دەیانەوێت). ١٠)﴿جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ﴾ (بێ بڕوایانی قوڕەیش) لەشکر و کۆمەڵێکی بێ نرخن لەو کۆمەڵانەی (دژی پێغەمبەرانن بەزوویی) دەشکێنرێن و سەر شۆڕ دەبن. ١١)﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ﴾ پێش ئەوان گەلی نووح و عاد و فیرعەونی خاوەن مێخەکان باوەڕیان بە (پێغەمبەرەکانیان) نەهێنا. ١٢)﴿وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ﴾ وە (گەلی) سەموود و گەلی لووط و خاوەن باخە چڕو پڕەکان ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ﴾ ئەوانە تاقم و کۆمەڵانێك بوون. ١٣)﴿إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾ هەر هەموویان باوەڕیان بە پێغەمبەران نەهێنا بۆیە سزای منیان بەسەرا چەسپا (و لە ناو چوون). ١٤)﴿وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً﴾ ئەمانە تەنیا چاوەڕوانی دەنگێکی زۆر گەورە دەکەن ﴿مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ﴾ ئەو دەنگە (فوو کردن بە کەڕەنادا) کەمترین ماوە دوا خستنی نییە. ١٥)﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ وە ووتیان: ئەی پەروەردگارمان پێش ڕۆژی لێ پرسینەوە بەشەکەمان (لە سزا یا پاداشت) پێ بدە. ١٦)

ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾

-دڵخۆشـــی پێ دەکاتەوە ئەگەر وانەکات بەپەستی و دڵگرانـــی و تەمبـــەڵی پێ دەکاتەوە).

ئایەتی (١٧) ســـورەتی (السجدة)؛ قـال رسـول الله (ﷺ) (قـال الله تعـالى: أعـددت لعبـادي الـصالحين مـالا عـين رأت ولا أذن سمعـت ولا خطـر علـى قلـب بـشر اقـرؤا إن شئتم: فلا تعلم نفس مـا أخفي لهم من قـرة أعــين)(متفــق عليه). پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) فـەرمووی: (خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ئامـادەم کردووە بۆ بەندە چاکەکانم بـەهرەو نیعمـەتی وا کەچاو نـەی بینیوە و گوێ نەی بیستووە و بە دڵی کەسدا نـەهاتووە ئەگەر ویستان (ڕاستی ئـەم قـسەیەم بزانن) ئـەم ئایەتـە بخوێنن کەدەفـەرمووێ: (کـەس نازانێ چی بـەهرەو خۆشیان بۆ شاراوەتەوە کە مایەی خۆشی چاو دڵ و ڕوونیەتە)...

﴿ اصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) دان بە خۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەن.﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ ۖ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾بیری بەندەمان داوودی خاوەن هێز و توانا بکەرەوە بێگومان ئەو هەمیشە گەڕاوە بوو بۆ لای خوا ١٧)﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ﴾ بەڕاستی ئێمە چیاکانمان رام هێنا بوو تەسبیحاتی خوایان دەکرد لەگەڵ ئەو(داوود). ﴿بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾بەئێواران و بەیانیاندا. ١٨)﴿ وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُ أَوَّابٌ﴾ وە باڵندەکان کە لەدەوری ئەو (داوود) کۆدەکرانەوە هەمووی(بۆ تەسبیحات) بۆلای ئەو دەگەڕانەوە(تا لەگەڵ داوود یادی خوا بکەن). ١٩)﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ﴾ وە پاشایەتیەکەی ئەومان بەهێز کرد ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾ دانایی و گوفتاری جیاکەرەوەمان پێ بەخشی. ٢٠) ﴿وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ﴾ وە ئایا هەواڵی داوا چییەکانت پێ گەیشتووە کاتێ بەدیواری خەڵوەتگاکەدا سەر کەوتن. ٢١) ﴿ إِذْ دَخَلُوا عَلَىٰ دَاوُودَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ﴾ لە ناکاودا چوونە ژوورەوە بۆ لای داوود ئەویش داچڵەکا و ترسا لێیان ﴿قَالُوا لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ﴾ وتیان: مەترسە(ئێمە)دووداواچین﴿بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ یەکێکمان ستەمی لەوی تر کردووە﴿فَاحْكُم بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ﴾ جا لە نێوانماندا بەهەق وڕاستی بڕیار بدەولە ڕاستی لامەدە(لە بڕیارەکەتدا).﴿وَاهْدِنَا إِلَىٰ سَوَاءِ الصِّرَاطِ﴾ وە ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای راست. ٢٢)﴿إِنَّ هَٰذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً ﴾(یەکێکیان وتی) بێگومان ئەمە برامە نەوەدو نۆ مەڕی هەیە ﴿وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ﴾ و منیش یەك مەڕم هەیە ﴿فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ﴾ کەچی دەڵێ ئەو مەڕەش بدە بەمن (بیسپێرە بە من) و لە قسە کردن دا زاڵە بەسەرمدا. ٢٣)﴿ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِ﴾ (داوود)وتی سوێندبەخوا بەڕاستی ستەمی لێکردوی کە داوات لێ دەکات تاقە مەڕەکەت بخاتە ناو مەڕەکانی خۆی﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ و بێگومان زۆر لەشەریك و هاوبەشان ستەم لەیەکتری دەکەن ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ﴾بێجگە لەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە ئەوانەش زۆر کەمن﴿وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ﴾ داوود زانی کە ئێمە تەنیا تاقیمان کردۆتەوە ﴿فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ بۆیە داوای لێبووردنی کرد لە پەروەردگاری وکەوت بە روودا بە سوژدە بردنەوە و تۆبەی کرد.٢٤) ﴿فَغَفَرْنَا لَهُ ذَٰلِكَ﴾ ئێمەش لەو هەڵەی ئەو خۆش بووین ﴿وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَآبٍ﴾ بەڕاستی ئەو (داوود) پلە و پایەی بەرزەو نزیکە لە ئێمەوە و دوا ڕۆژێکی چاکیشی هەیە. ٢٥)﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ﴾ ئەی داوود بێگومان ئێمە تۆمان کرد بەجێ نشین(ی پێغەمبەرانی پێش خۆت) لە زەویدا ﴿فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ﴾ کەوابوو تۆش لە نێوان خەڵکدا بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکە ﴿وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ شوێن هەوا و ئارەزووات مەکەوە با لەڕێگای خوا لات نەدات ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بێگومان ئەوانەی لەڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾ سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لە بیرکردبوو. ٢٦)

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ ۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾

**ئایەتی (٥) سورەتی (الأحزاب)**: قال رسول الله (ﷺ): (إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران وإن اجتهد فأخطأ فله أجر) (رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کار بەدەستی موسوڵمانان ئیجتهادی کرد و راستی پێکا و حوکمەکەی تەواو بوو ئەوە دوو پاداشتی هەیە وە ئەگەر ئیجتهادی کرد و هەڵەی کرد و نەی پێکا ئەوا یەک پاداشتی هەیە).

**ئایەتی (٢٥) سورەتی (الأحزاب)**: كان رسول الله (ﷺ) يقول: (لا إله إلا الله وحده صدق وعده ونصر عبده وأعز جنده وهزم الأحزاب وحده فلا شيء قبله ولا شيء بعده) (متفق عليه)، ودعا رسول الله (ﷺ) على الأحزاب فقال: (اللهم منزل الكتاب سريع الحساب اهزم الأحزاب اللهم اهزمهم وزلزلهم)-

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا﴾ ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیانایە بەبێهودە دروستمان نەکردووە ﴿ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە بێ باوەڕ بوون ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ ٱلنَّارِ﴾ سا هاوار بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەئاگری دۆزەخ. ٢٧) ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دانێین (لە دوا ڕۆژدا، نەخێر وانییە) ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ یا پارێزکاران وەك بەد کرداران لێ دەکەین. ٢٨) ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ﴾ (ئەم قورئانە) کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ ﴿لِّيَدَّبَّرُوٓا ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُوا ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لەئایەتەکانی وە خاوەنانی بیر و ژیری پەندی لێ وەربگرن. ٢٩) ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ﴾ ئێمە سولەیمانمان بەخشی بە داوود (علیهما السلام) ﴿نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ ئەو (سولەیمان) بەندەیەکی چاك بوو بێگومان ئەو زۆر ڕوو لەخوا بوو ٣٠) ﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ﴾ سەر لە ئێوارە وەختێ ئەسپانی ڕەسەن و خێرا نیشانی سولەیمان درا. ٣١) ﴿فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى﴾ جا (سولەیمان) ووتی خۆشەویستی ئەم ئەسپانەم باودا بەسەر یاد و عیبادەتی پەروەردگارم دا (کە نوێژی عەسر بوو) ﴿حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ﴾ (سەیری ئەسپەکانی دەکرد) هەتا لەچاوو گوم بوون. ٣٢) ﴿رُدُّوهَا عَلَىَّ﴾ (ووتی) جارێکی تر ئەو ئەسپانەم بۆ بگێڕنەوە ﴿فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ﴾ ئینجا دەستی هێنا بە دەست و قاچ و گەردن و یالی (ئەو ئەسپانەدا). ٣٣) ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ﴾ سوێند بەخوا بەراستی سولەیمانمان تاقی کردەوە ﴿وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا﴾ و لاشەی (لەتە کوڕی)کمان فڕێدا بەسەر تەختەکەیدا ﴿ثُمَّ أَنَابَ﴾ پاشان تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا. ٣٤) ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا﴾ (سولەیمان) ووتی ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبەو دەسەڵات و پاشایەتێکم پێ ببەخشە ﴿لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ﴾ کەدوای من دەس نەدا بۆ کەسی تر ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾ بێگومان تەنها تۆی بەخشندەی (هەموو شتێکی). ٣٥) ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ﴾ (دوا نزاکەی) با مان بۆ رام هێنا ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ بەفەرمانی ئەو بەنەرمی دەڕۆیی بۆ هەر جێگایەك بیویستایە. ٣٦) ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ﴾ وە هەموو (پەری و) شەیتانەکانمان بۆ رام هێنا بوو کە بینا سازو مەلەوانی ژێر دەریا بوون. ٣٧) ﴿وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ وە هەندێکی تریان (کە سەرپێچی سولەیمانیان کردبوو راممان هێنان بۆی) بە پێکەوە بەستراوی لە کۆت زنجیردا. ٣٨) ﴿هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەمە (کە باسکرا) بەخششی ئێمەیە (بۆ تۆ) ئینجا بەویستی خۆت بیبەخشە یا بیگرەوە و مەیبەخشە بەبێ پرسینەوە (لێت). ٣٩) ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ وە بەراستی ئەو (سولەیمان) پلەی بەرزی هەیە لای ئێمە وە سەر ئەنجامی چاکی هەیە. ٤٠) ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ وە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) باسی بەندەی ئێمە ئەیوب بکە کاتێ هاواری لە پەروەردگاری کرد ﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ (ووتی) بەراستی شەیتان تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی و ئازاری کردووم. ٤١) ﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ (پێ ی وترا) پێت بدە بە زەویدا ئەوە کانیاوێکی ساردە بۆ خۆشتن و خواردنەوە (خۆی شت و ئاوی خواردەوە لە نەخۆشییەکەی چاك بوویەوە). ٤٢)

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾

=(متفق عليه). **پێغەمبەری خوا(ﷺ)** دەیفەرمووی: (هیچ **پەرستراوێکی ڕاست نی یە** جگە لەخوای **تاك و** تەنها **بەڵێنەکەی** بردە **سەرو بەندە (پێغەمبەرە)کەی سەرخست و سەربازانی زاڵ** کرد **تەنها ئەو هەموو لەشکرو کۆمەڵەکانی تێکشکاند** هیچ شتێك **پێش** ئەو نەبووەو هیچیش **پاش ئەو** نابێ) (وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای کرد لەو لەشکرو تاقمانە(ی هاتبوونە سەر مەدینە) و فەرمووی: (ئەی پەروەردگارم دابەزێنەری قورئان و موحاسەبەکەری بە پەلە ئەو لەشکر و تاقمانە تێکشکێنە ئەی خوایە تێکیان شکێنەو تەفرو تونایان کە (ترس و بیم بخەرە دڵیانەوە).

**ئایەتی (٣٥) سورەتی (الأحزاب):** قال رسول الله (ﷺ): (على كل مسلم صدقة، قال:أرأيت إن لم يجد؟ قال: يعمل بيديه فينفع نفسه ويتصدق قال: أرأيت إن لم يستطع؟ قال يعين ذا الحاجة الملهوف قال:=

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ وە ژن و منداڵەکانی و ئەوەندەی تریشمان لەگەڵیان دا بەو (ئەیوب) بەخشی ﴿رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بەمیهرەبانی لە لایەن خۆمانەوە (بە ئەیوب) و بۆ پەند و ئامۆژگاری بۆ خاوەنانی ژیری و بیرو هۆش. ٤٣)﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ﴾ (پێمان ووت) چەپکێ شووڵ (داری زۆر باریك) بە دەستەوە بگرە و پێی بدە (لەخێزانت یەك جار) و سوێندەکەت مەشکێنە (کە لە خێزانت خوارد بوو سەد داری لێ بدەی) ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو (ئەیوب)مان بەخۆگر بینی ﴿نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ چ بەندەیەکی چاك بوو بەراستی ئەو زۆر گوێڕایەڵ و روو لە خـوا بـوو. ٤٤)﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ وە باسی بەندکانی ئێمە بکە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب ﴿أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ﴾ کە خاوەنی هێزو توانا و بینایی بوون. ٤٥)﴿إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ﴾بەراستی لەبەر ئەوەی هەمیشە رۆژی دواییان لەبیردابوو ئێمـە (بـە بەنـدەی تایبـەتی خۆمـان) هـەڵمان بـژاردن. ٤٦)﴿وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ﴾وە بەڕاستی ئەوانە (هەر سیانیان) لای ئێمە لەبەند هەڵبژێردراوە چاکەکانن. ٤٧)﴿وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ﴾ وە باسی (بەندەکانی ئێمە بکە) ئیسماعیل و ئەلیەسەع و ذو لکیفل ﴿وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ﴾ کەهەموویان لە چاکانن. ٤٨)﴿هَٰذَا ذِكْرٌ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ ئەم (باسی پێغەمبەرانە) باس و ناوبانگی چاکیانە لە دونیـادا و بێگومـان پارێزکـاران سـەرئەنجامێکی چـاکیان هەیـە. ٤٩)﴿جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ﴾(کـە بریتـی یـە لـە) بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمیشەیی کەدەرگاکانی کراوەتەوە بۆیـان. ٥٠)﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا﴾ لەوێدا (لەسەر کورسی رازاوە) پاڵیـان داوەتـەوە ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ﴾ تێیـدا داوای میوەهـاتی زۆر و جۆرەهـا خواردنـەوە دەکـەن. ٥١)﴿وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ﴾ و حۆرییانی هاوتەمەنیان لایە (خێزانیـانن) کەچاویان بڕیوەتـە مێردەکانیـان. ٥٢)﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ ئەمە ئەو (نازو نیعمەتانە)یە کە بەڵێنتان پێ درا بوو بۆ رۆژی لێپرسینەوە(ی قیامەت). ٥٣)﴿إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ﴾ بەڕاستی ئەمە رسق و رۆزی ئێمەیە هەرگیز تەواو بوونی بۆ نییە. ٥٤)﴿هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ﴾ ئـا ئەمـە (پاداشتی پارێزکارانە) و بێگومان سەرکەشانیش خراپترین پاشـە رۆژیـان هەیـە. ٥٥)﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ دۆزەخە کەدەچنە ناویەوە ئای چ جێگایەکی بەدو خراپە. ٥٦)﴿هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ﴾ ئەمە و ئاوی لەکوڵ و کێم و زووخە دەبا بیچەژن. ٥٧)﴿وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ﴾ وە چـەند جـۆری تـر سـزایان هەیـە لـەو شـێوە. ٥٨)﴿هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ﴾ (بە گومراکەرەکان دەوترێ) ئەمە کۆمەڵێکە لەگەڵ ئێوەدا دێنە دۆزەخ ﴿لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ﴾ (گومراکەرەکانیش دەڵێن) بەخێر نەیەن ﴿إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ﴾ بێگومان ئەوانە دەچنە ناو ئـاگری دۆزەخ. ٥٩)﴿قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ﴾ ئـەوان (بـە گومراکـەرەکان) دەڵـێن بەڵکو ئێوە بەخێر نەیەن ﴿أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا﴾ ئێوە (لـە دنیـا گومڕاتـان کـردین و) ئـەم سـزاتان پێش هێنا بۆمان ﴿فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾ ئای چ جێگاو مەنزڵێکی خراپە. ٦٠)﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا﴾ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هـەر کەس (هۆی) پێش هێنانی ئەم سزایە بوو بۆ ئێمە ﴿فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ﴾ ئەوە سـزای ئەو لەدۆزەخ دا دوو چەندانە بکە. ٦١)

وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾

-أرأيت إن لم يستطع، قال: يأمر بالمعروف أو الخير قال: أرأيت إن لم يفعل؟ قال: يمسك عن الشر فإنها صدقة)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەموو موسلمانێك بەخشینێکی لەسەرە ، پیاوێ ووتی: پێم بڵێ (چی بکات) ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی ئیش بکات و (بەپارەکەی) سوود بەخۆی بگەیەنێت و بیشی بەخشێ ووتم پێم بڵێ ئەگەر نەیتوانی ئیش بکات؟ فەرمووی یارمەتی کەسێك بدات کە بۆ پێویستی یەك هاتای بۆ بێتێ ووتم پێم بڵێ ئەگەر ئەمەشی نەتوانی؟ فەرمووی: بافەرمان بکات بەخێرو چاکە ووتی پێم بڵێ ئەگەر ئەمەشی نەکرد؟ فەرمووی لەخراپە کردن خۆی بگرێ چونکە بێگومان ئەوە خێرو چاکەیە).

ئایەتی (٤١) سورەتی (الأحزاب): عن عبد الله بن بسر قال رجل: يا رسول الله (ﷺ): (إن شرائع-

﴿ وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا﴾ وە (گومڕاکەرەکان) دەڵێن ئەوە چیمانە بۆچ پیاوانێك نابینین ﴿كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ﴾ کە ئێمە لە خراپەرکارانمان دەژماردن. ٦٢)﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا﴾ ئایا ئەوانەن کە گاڵتەمان پێ دەکردن؟ ﴿أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ یا (لێرەن بەڵام) چاوەکان لێیان کەلا بووە (و نایان بینن). ٦٣)﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ﴾ بێگومان ئەوە (کە باسکرا) ئاژاوە و هەڕە قسەی دۆزەخیانە ڕاستە(و دێتەدی). ٦٤)﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ من تەنیا ترسێنەرێکم ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ﴾ و هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لە خوای تەنهای بەدەسەڵات. ٦٥)﴿ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ﴾ زاڵی لێ بووردە. ٦٦)﴿ قُلْ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئەوە هەواڵێکی زۆر گەورەیە. ٦٧)﴿أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾ کە ئێوە گوێ ی پێ نادەن. ٦٨)﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ﴾ (بڵێ ئەگەر وەحیم بۆنەهاتایە) من هیچ ئاگام لەکۆمەڵی هەرە بڵند (فریشتەکان) نەبووە ﴿إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ کاتێ دەمە قاڵێ یان دەکرد (دەربارەی ئادەم). ٦٩)﴿ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ نیگا بۆ من ناکرێ ﴿إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ مەگەر بەوەی کە من ترسێنەرێکی ڕوون کەرەوەم. ٧٠)﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ ئەو کاتەی (دەمەقاڵێ یان بوو) پەروەردگارت بەفریشتەکانی فەرموو ﴿إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ﴾ بەڕاستی من بەشەرێك لە قوڕ دروست دەکەم. ٧١)﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى﴾ ئینجا کاتێ شێوەکەیم ڕێك خست و فوم پێدا کردووە گیانم کرد بە بەریدا لە گیانێك کە خۆم دروستم کردووە. ﴿فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ ئەوسا هەموو بە سوژدە بردن بۆی بکەون بە ڕوودا. ٧٢)﴿فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ جافریشتەکان هەر هەموویان سوژدەیان برد. ٧٣)﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ﴾ بێجگە لە شەیتان کە خۆی بە گەورە دانا ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ و لە بێ باوەڕان بوو. ٧٤)﴿قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ﴾ (خوا) فەرمووی ئەی ئیبلیس ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ﴾ چ شتێك بەرگری کردی (لەوەی) کە سوژدە ببەیت بۆ کەسێ کە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کردووە ﴿أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ﴾ ئایا خۆت بەگەورە زانی یاخو لەبەرزو بڵندەکانی. ٧٥)﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾(شەیتان) ووتی من لەو (ئادەم) چاکترم ﴿خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾ چونکە منت لەئاگر دروست کردووە بەڵام ئەو لەقوڕ. ٧٦)﴿قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ (خوا) فەرمووی کەواتە لەو (بەهەشتە) دەرچۆ و بڕۆ چونکە بێگومان تۆ دەرکراوی لەرەحمەتی من. ٧٧)﴿وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾وە بەڕاستی نەفرینی منت لەسەر بێ تا ڕۆژی (پاداشت و تۆڵە) قیامەت. ٧٨) ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ (شەیتان) ووتی ئەی پەروەردگارم دەی مۆڵەتم بدە (نەمرم) تا ڕۆژێ (مردوان) زیندوو دەکرێنەوە. ٧٩)﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ﴾ (خوا) فەرمووی: دەی بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانی. ٨٠) ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ﴾ تاڕۆژی کاتی دیاری کراو. ٨١)﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (شەیتان) ووتی ئینجا سوێند بەعیزەتت هەر هەموویان گومڕا دەکەم. ٨٢)﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ ئەوانەیان نەبێ کەبەندەی پاك و هەڵبژاردەی تۆن. ٨٣)

قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٤﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٥﴾

-الإسلام قد كثرت علي فاخبرني بشيء أتشبث به، قال: (لا يزال لسانك رطبا من ذكر الله) (رواه الترمذي). عەبدوڵڵای کوڕی بوسر وتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یاسا و فەرمانەکانی ئیسلام زۆر بوون لەسەرم (هەموویانم بۆ ناکرێ) دەی شتێکم پێ بفەرموو: کەدەستی پێوە بگرم، فەرمووی (با هەمیشە زوبانت پاراو بێت بەیادی خوا).

ئایەتی (٥٣) سووڕەتی (الأحزاب): قال رسول الله (ﷺ): (إياكم والدخول على النساء فقال رجل من الأنصار: أفرأيت الحمو؟ قال: الحمو الموت)(متفق عليه) قال رسول الله (ﷺ): (لا يخلون أحدكم بامرأة الا مع ذي رحم محرم)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هۆشیار بن (بەتەنیا)-

﴿قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ﴾ (خوا) فەرمووی: من حەقم هەر حەقیش دەڵێم. ٨٤)﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بەراستی دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆ (نەوەکانت) و ئەوانەی (لە ئادەمیان) شوێنت دەکەون تێکڕا. ٨٥)﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ من هیچ کرێ و پاداشتێك لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە لە ئێوە داواناکەم ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ و من لەو کەسانەش نیم کە درۆ هەڵبەستم و زۆر لە خۆم بکەم. ٨٦)﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەم (قورئانە) تەنها پەند و ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهانیان. ٨٧)﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ بەراستی پاش ماوەیەك لە هەواڵی ئەو (قورئانە) دەزانن. ٨٨)

## سورەتی ﴿الزمر﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾ ئەم قورئانە هێنراوەتەخوارەوە ﴿مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ لە لایەن خوای بالادەستی کار بەجێوە. ١)﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ بێگومان ئێمە بەحەق و راستی قورئانمان بۆ تۆ هێناوەتە خوارەوە ﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ﴾ کەواتە خوا بپەرستە و بە تەنها هەر بۆ ئەو ملکەچ بە. ٢)﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ بێدار بە ئایینی (گەردن کەچی) پاك و خاوێن هەر بۆ خوایە ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ وە کەسانێ جگە لەو (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ﴾ (دەڵێن) تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خوا ﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ بێگومان خوا بڕیار دەدات لە نێوانیاندا ﴿فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ لەو شتانەدا کەئەوان تیایا جیاواز بوون. ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ بەراستی خوا رێنموونیی کەسێ ناکات کە درۆزنی زۆر بێ باوەڕە. ٣)﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە منداڵێك بۆ خۆی بڕیار بدات ﴿لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ ئەوە لەناو دروست کراوەکانیدا کامەی بویستایە هەڵی دەبژارد﴿سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ پاك و بێگەردە هەر ئەوە خوای تەنیای زاڵ و بە دەسەڵات. ٤)﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾(خوا) ئاسمانەکان و زەوی بەهەق دروست کردووە﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ﴾شەو دەهێنێ بەسەر ڕۆژدا ﴿وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ و ڕۆژ دەهێنێ بەسەر شەودا ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ و خۆر و مانگی رام هێناوە ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەر یەکیان تا ماوەی دیاری کراو (بۆیان) دەگەڕێن﴿أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ بێدار بە هەر ئەو (خوا) زاڵی لێ بووردەوە. ٥)

خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿١٠﴾

-مەچنە ماڵەوە بۆ لای ئافرەتان، پیاوێ لەیاریدەدەران ووتی: قوربان ئەی ئەگەر خزمی مێردەکەی بوو؟ فەرمووی: خزمی مێرد مردنە (ئەو لەهەموو خراپترە)). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەستان لەگەڵ ژنی بێگانەدا بەتەنها کۆنەبنەوە مەگەر ژنەکە کەسێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵ دابێ). ئایەتی (٥٦) سورەتی (الأحزاب)؛ قال رسول الله (ﷺ): (رغم أنف رجل ذكرت عنده فلم يصل عليّ) (رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لوتی ئەو کەسە بەخۆڵدا چێ و بتەوسێتەوە ناوی من ببرێت لەلایا و صەڵاوام لەسەر نەدات).

**ئایەتی ( ٥٨ ) سورەتی ( الأحزاب )؛ قال رسول الله** (ﷺ): (المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده والمهاجر من هجر ما نهى الله عنه) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ:-

﴿خَلَقَكُمْ مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ (خوا) ئێوەی لە تاکە کەسێك (ئادەم) دروست کردووە ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ پاشان لەو (کەسە) هاوسەرەکەی (حەووای) بەدی هێناوە ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾ وە بۆ ئێوە هەشت جووتی (نێر و مێ) لە ئاژەڵ بە دی هێناوە ﴿يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾ ئێوە دروست دەکات لەناو سکی دایکتاندا ﴿خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ﴾ بە بەدی هێنانی یەك لە دوای یەك ﴿فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ﴾ لە ناو سێ تاریکی (ناو سك، منداڵدان، پەردەی کۆرپەلە)دا ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾ ئا ئەوە پەروەردگاری ئێوەیەکە دەسەڵات و پاشایی هەر هی ئەوە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست جگە لە زاتی ئەو نییە کەواتە ئێوە چۆن لە ئایینی ڕاست لادەدرێن. ٦) ﴿إِن تَكْفُرُوا۟﴾ ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ﴾ ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لەئێوە ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ﴾ و ڕازی نییە بە بێ باوەڕی بۆ بەندەکانی ﴿وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن (گەردن کەچ بن) بەوە لێتان ڕازی دەبێت ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ گوناهبارێ گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ﴾ پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆ لای پەروەردگارتانە ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوسا هەواڵتان دەداتێ بەوەی کە دەتان کرد ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارە بە نهێنی دڵان. ٧) ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ﴾ وە کاتێ ئادەمی زیانێکی لێ بکەوێ ﴿دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری و هاواری لێ دەکات ﴿ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ﴾ پاشان ئەگەر لەلایەن خۆیەوە بەهرەیەکی دایە ﴿نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ﴾ ئەوەی لەبیر دەچێ کە لەپێشترا هاواری لە پەروەردگاری دەکرد ﴿وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ وهاوتایانێ بۆ خوا دادەنێ ﴿لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی (خەڵك) لە ڕێگای ئەو گومڕاکات ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ) بە هەڕەشەوە) بڵێ بە بێ باوەڕێکەت کەمێ بەهرەمەند ببە لە ژیان ﴿إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ لەهاوەڵانی ئاگری دۆزەخی. ٨) ﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ﴾ (هاوبەش دانەران چاکترن) یا کەسێ ملکەچ و پەرست کارە (بۆ خوا) ﴿ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا﴾ لە کاتەکانی شەودا بە سوژدە بردن و ڕاوەستان (لە شەو نوێژدا) ﴿يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ﴾ کە لە (سزای) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن. ٩) ﴿قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بەو بەندەیانەم کە باوەڕیان هێناوە ﴿ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ لە (سزای) پەروەردگارتان خۆ بپارێزن ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ کەسانێ لەم دنیایەدا چاکەیان کردووە پاداشتی چاکیان بۆ هەیە ﴿وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ﴾ وە زەوی خوا فراوانە ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەڕاستی تەنها دان بەخۆدا گران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە. ١٠)

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾

-قل ما أسألكم عليه من أجر وما أنا من المتكلفين)(رواه البخاري). عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (ئەی خەڵکینە هەر کەس شتێکی زانی باپێی هەڵسێت و بیڵێ وە هەر کەس شتێکی نەزانی با بڵێ خوا دەیزانێ. چونکە بەڕاستی ئەوەش لە زانینەوەیە مرۆڤ بڵێت دەربارەی ئەوەی نایزانێ خوا دەزانێ، ئەوە تاخوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمووە: (ئەی موحەممەد بەخەڵکی) بڵێ من لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە داوای هیچ کرێ یەکتان لێ ناکەم وەمن لەو کەسانەنیم کە بەزۆر لەخۆکردن شت دەکەن).

**ئایەتی (٩) سورەتی (الزمر):** قال رسول الله (ﷺ): (إن من إجلال الله تعالى إكرام ذي الشيبة المسلم، وحامل القرآن غير الغالي فيه والجافي عنه وإكرام ذي السلطان المقسط)(رواه أبو داود) قال رسول الله (ﷺ):-

﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ سوێند بەخوا بێگومان پێشتر یوسف پێغەمبەرتان بۆهات بەبەڵگە روونەکانەوە ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ﴾ کەچی ئێوە هەر لەگوماندا بوون ﴿مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ﴾ لەو بەڵگانەی بۆی هێنابوون ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ﴾ تا کاتێ (یوسف) وەفاتی کرد ﴿قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾ ووتتان ئیتر دوای ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ﴾ ئا بەو جۆرە خوا گومرای دەکات ﴿مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾ ئەو کەسەی زیادە ڕەوی دوو دڵە. ٣٤) ﴿ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی دەربارەی نیشانەکانی خوا دەمەقاڵێ دەکەن ﴿بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ﴾ بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ﴾ (ئەو دەمەقاڵەیان) هۆی تووڕەی یە لای خوا﴿وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وەلای ئەوانەش باوەڕیان هێناوە ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ﴾ ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێ ﴿عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ بەسەر دڵی هەموو خۆبەزل زانێکی زۆرداردا. ٣٥) ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ﴾ فیرعەون ووتی ئەی هامان ﴿ٱبْنِ لِى صَرْحًا﴾ کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە ﴿لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ﴾ بەڵکو بگەمە ئەو ڕێگایانە. ٣٦) ﴿أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ کەڕێگاکانی (بەرز بوونەوەن بۆ) ئاسمانەکان ﴿فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ بۆ ئەوەی (لەوێوە) سەیری خواکەی مووسا بکەم ﴿وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا﴾ وە بەڕاستی من وا گومان دەبەم ئەو (مووسا) درۆزنە ﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ﴾ ئابەو جۆرە ڕازێنرایەوە بۆ فیرعەون ﴿سُوٓءُ عَمَلِهِۦ﴾ کردەوەی خراپی ﴿وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە (بە هۆیەوە) بەرگری کرا لەڕێگای ڕاست ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ﴾ وە هەر فێڵ و پلانێکی فیرعەون هەبوو بەفیڕۆ چوو. ٣٧) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ﴾ وە ئەو (پیاوەی) باوەڕی (بە مووسا) هێنا بوو ووتی ﴿يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ﴾ ئەی گەلەکەم شوێن من بکەون ﴿أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ ڕێگای ڕاستتان نیشان دەدەم. ٣٨) ﴿يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ﴾ ئەی گەلەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمە ﴿وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ﴾ وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەیی یە. ٣٩) ﴿مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً﴾ هەر کەسێك کاری خراپەی کردبێ ﴿فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا﴾ هەر بەئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا﴾ هەر کەسیش چاکەی کرد بێت ﴿مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ ئافرەت بێ یا پیاو و باوەڕدار بێ ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ﴾ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە ﴿يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ لەوێدا بێ ژمار ڕسق و ڕۆزییان پێ دەدرێ. ٤٠)

۞ وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٩﴾

-(ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويعرف شرف كبيرنا)(رواه ابو داود). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بەڕاستی لە گەورەیی و بەرزی دانان بۆ خوای گەورەیە قەدر و ڕێزگرتنی موسڵمانی پیر(موو سپی بوو) و قورئان خوێن کە زیادەڕەوی تیا ناکات، لە خوێندنەوەی کاری پێ کردنی دوور نییە، وە ڕێز و قەدر گرتنی کاربەدەستی دادگەرە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسەی بەزەیی نایەتەوە بە بچووکەکانماندا و ڕێز و قەدری گەورەکانمان نەگرێت لە ئێمە نییە).

**تێبینی (٢٠) سورەتی (الزمر):** قال رسول الله (ﷺ):(إن في الجنة لغرفاً يرى بطونها من ظهورها، وظهورها من بطونها، فقال أعرابي: لمن هي يا رسول الله؟ فقال (ﷺ): لمن أطاب الكلام وأطعم الطعام-

﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ﴾ وە ئەی گەلەکەم ئەوە چی یە من بانگتان دەکەم بۆ ڕزگاربوون ﴿وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ کەچی ئێوە من بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ. ٤١) ﴿تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ﴾ بانگم دەکەن بۆ ئەوەی بێ باوەڕیم بەخوا ﴿وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ﴾ وە شتێ بکەمە هاوبەشی خوا کەهیچ زانیاری یەکم لێ ی نیە ﴿وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ﴾ لەکاتێکدا من بانگتان دەکەم بۆلای خوای بەدەسەڵاتی لێبوردە. ٤٢) ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ﴾ ڕاستە و گومانی تێدا نی یە ئەوەی ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن ﴿لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ شیاوی بانگ کردن نی یە نە لەدنیا نەلە دوا ڕۆژدا ﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە بەڕاستی گەڕانەوەمان هەر بۆلای خوایە ﴿وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ و بێگومان زیادەڕەوانن هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ. ٤٣) ﴿فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡ﴾ جا لەمەودوا ئەوەی من پێتان دەڵێم بیرتان دەکەوێتەوە ﴿وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە من کاری خۆم بەخوا دەسپێرم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بەبەندەکانی. ٤٤) ﴿فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ﴾ جا خوا ئەو (پیاوە ئیمانداره)ی پاراست لەزیانی ئەو فڕو فێڵانەی دەیان کرد ﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ﴾ وە سزای سەخت هات و دارودەستەی فیرعەونی گرتەوە. ٤٥) ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗا﴾ بەیانیان و ئێواران دەبرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾ ڕۆژێکیش قیامەت هەڵدەسێت ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ (فەرمان دەدرێ) داروده‌ستەی فیرعەون بخەنە سەختترین سزاوە. ٤٦) ﴿وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ﴾ وەکاتێ (دۆزەخیەکان) لەناو ئاگرەکەدا دەمە قرە دەکەن ﴿فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ لاوازەکان بەوانەی خۆ بەزل زان بوون دەڵێن ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا﴾ بەڕاستی ئێمە شوێن کەوتووی ئێوە بووین ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا﴾ دەی ئایا ئێوە لەجیاتی ئێمە لەئەستۆ دەگرن ﴿نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ بەشێك لەم ئاگرە. ٤٧) ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی خۆ بەزل زان و زۆردار بوون دەڵێن: ﴿إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ﴾ بەڕاستی هەموومان لەئاگرداین ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ﴾ بێگومان خوا لەنێوان بەندەکانیدا دادوەری کردووە. ٤٨) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ﴾ وە ئەوانەی لەئاگری دۆزەخ دان بەدەرگاوانەکانی دۆزەخ دەڵێن ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ﴾ داوا لەپەروەردگارتان بکەن ﴿يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ﴾ تەنها یەك ڕۆژ سزامان لەسەر سووك بکات. ٤٩)

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ
بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ
﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ
وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى
ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ
وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾
وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾

-وصلى بالليل والناس نيام)(رواه الترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەڕاستی لە بەهەشتدا چەند کۆشکێکی تیایە لە دەرەوە ناوەوەی دەبینرێت و لە ناوەوە دەرەوەی دەبینرێت پیاوێکی دەشتەکی وتی ئەوە بۆ کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بۆ کەسێکە گوفتار شیرین بێت و نان دەر بێت و کاتێک کە خەڵکی لە گەرمەی خەودان ئەو شەو نوێژ بکات).

**ئایەتی (٣١) سورەتی (الزمر):** قال الزبير (رضي الله عنه) : (أي رسول الله، أيكرر علينا **ما كان بيننا في الدنيا مع خواص الذنوب؟ قال** رسول الله (ﷺ) : (نعم ليكررن عليكم حتى يؤدي كل ذي حق حقه) قال **الزبير:** والله إن الأمر لشديد) (رواه أحمد والطبراني) زوبەیر(ڕەزای خوای لێ بێ) وتی ئەی پێغەمبەر(ﷺ)-

﴿قَالُوٓاْ﴾ دەڵێن: ﴿أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم﴾ ئایا پێغەمبەرانتان بۆیان نەهێنا بوون ﴿بِٱلْبَيِّنَـٰتِ﴾ بەڵگە ڕوونەکان ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ دەڵێن، بەڵێ (هێنا بوویان) ﴿قَالُواْ فَٱدْعُواْ﴾ پێیان دەڵێن دەی خۆتان بپارێنەوە ﴿وَمَا دُعَـٰٓؤُاْ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ﴾ بێگومان پاڕانەوەی بێ باوەڕان وون دەبێ و بێ سوودە. ٥٠) ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین ﴿فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ لەژیانی دنیادا ﴿وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ﴾ وە لەو ڕۆژەی (قیامەت) کە شایەتەکان هەڵدەستنەوە. ٥١) ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ﴾ ڕۆژێك پاکانە کردنی بێ باوەڕان سوودیان پێ ناگەیەنێ ﴿وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ هەموویان نەفرەتیان لێ کراوەو خراپترین جێگایان هەیە. ٥٢) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە تەوراتمان دا بەمووسا ﴿وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ وە نەوەکانی ئیسرائیلمان کردە میرات گری تەورات. ٥٣) ﴿هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُوْلِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ (کەهۆی) ڕێنموونیی و پەندو بیرخەرەوەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان. ٥٤) ﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ ئینجا (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خۆگربە بێگومان بەڵێنی خوا هەقەو دێتە دی ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ﴾ وە داوای لێبووردنی گوناهت بکە ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ وە تەسبیحات بکە بەستایشی پەروەردگارت ﴿بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَـٰرِ﴾ بەئێواران و بەبەیانیاندا. ٥٥) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی دەمەقاڵێ و کێشە دەکەن ﴿فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ دەربارەی نیشانەکانی خودا ﴿بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ﴾ بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ ﴿إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ﴾ هیچ لەدڵیاندا نیە بە جگە لەخۆبەزل زانی ﴿مَّا هُم بِبَـٰلِغِيهِ﴾ هەرگیز ئەوان بە (مەبەستیان) ناگەن ﴿فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ﴾ کەواتە پەنا بەخوا بگرە ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو بیسەرو بینایە. ٥٦) ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ﴾ بەڕاستی بەدی هێنانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە ﴿مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ﴾ لەبەدی هێنانی خەڵکی ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی مەردووم ئەمە نازانن. ٥٧) ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾ وە نابینا و بینا یەکسان نین ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ وە کەسانێ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ﴾ لەگەڵ بەدکاران وەك یەك نین ﴿قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾ زۆر کەم بیر دەکەنەوە. ٥٨)

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾

-ئایا ئەو تاوانە تایبەتانەی لەدنیادا لەنێوانماندا بوو دووبارە دەکرێتەوە لەسەرمان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ دووبارە دەکرێتەوە لەسەرتان هەتا هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێ دەدرێ، نوبەیەیرووتنی بەڕاستی کارەکە زۆر سەختە).

**ئایەتی (٤٢) سورەتی (الزمر):** قال عليه الصلاة والسلام (إذا أوى أحدكم إلى فراشه... يقول: باسمك ربي وضعت جنبي وبك أرفعه إن أمسكت نفسي فارحمها وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (کاتێ هەریەك لەئێوە چووە ناوجێگەی خەوتنی... ئەم دوعایە بڵێ: بەناوی تۆ وە ئەی پەروەردگارم تەنیشتم خستۆتە زەوی و بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە ئەگەر (لەکاتی خەودا) گیانی-

﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ﴾ بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت ﴿لَّا رَيْبَ فِيهَا﴾ هیچ گومانی تێدا نی یە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناکەن. ٥٩) ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِي﴾ وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە ﴿أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ وەڵامتان دەدەمەوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي﴾ بەڕاستی ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن کە بمپەرستن ﴿سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ بێگومان بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە. ٦٠) ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ﴾ خوا ئەو زاتەیە شەوی داناوە بۆ ئێوە ﴿لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ﴾ تائارامی تێدا بگرن ﴿وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾ وە ڕۆژیشی ڕوناک کردۆتەوە (بۆ ژیان پەیدا کردن) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بەڕاستی خوا خاوەن چاکەو میهرەبانی یە بەسەر خەڵکەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی سوپاس گوزار نین. ٦١) ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ دروستکەری هەموو شتێکە ﴿لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەو ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ دەی کەواتە چۆن لادەدەن لەڕاستی. ٦٢) ﴿كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ﴾ تا بەم جۆرە لادەدرێن ﴿ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ ئەوانەی کەدان نانێن بەبەڵگەو نیشانەکانی خوادا. ٦٣) ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾ خوا زاتێکە کەزەوی بۆ کردونەتە نیشتەجێ (ئارامگا) ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ وە ئاسمانیشی بۆ کردوون بەسەربان ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ و بەجوانترین شێوە ئێوەی دروست کردووە ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ لەوەش حەڵاڵ و پاکە ڕۆزی داوون ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەرزی و پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان. ٦٤) ﴿هُوَ ٱلْحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هەر زیندووە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەو ﴿فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ کەواتە خوا بپەرستن بەدڵسۆزی تەنها بۆ ئەو ملکەچ بن ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان. ٦٥) ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ﴾ بڵێ: بەڕاستی من بەرگری کراوم لەپەرستنی ﴿ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی ئێوە دەیان پەرستن جگە لەخوا ﴿لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي﴾ دوای ئەوەی بەڵگەی ڕوونم بۆ هاتووە لەپەروەردگارمەوە ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ﴾ وە فەرمانم پێ کراوە کە گەردن کەچ بم ﴿لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بۆ پەروەردگاری جیهانیان. ٦٦)

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ
يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟
شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى
وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا
قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟
بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ
﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾
فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ
مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ
نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾
ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ
تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ
مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا
نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾

-منت کێشاو مردم ئەوە ڕەحمی پێ بکە خۆ ئەگەر بەرەڵایشت کرد ئەوە بیپارێزە هەر چۆنێ بەندە چاکەکانی خۆت دەپارێزی).

**ئایەتی (٥٣) سورەتی (الزمر):**

قال رسول الله (ﷺ): (یقول الله عز وجل: من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها وأزید ومن جاء بالسیئة فجزاؤه سیئة مثلها أو أغفر ومن تقرب مني شبراً تقربت منه ذراعاً ومن تقرب مني ذراعاً تقربت منه باعاً ومن أتاني یمشي أتیته هرولة ومن لقیني بقراب الأرض خطیئة لا یشرك بي شیئاً لقیته بمثلها مغفرة)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمووێ: هەر کەسێک چاکەیەک بکات ئەوا خوای گەورە دە بەرامبەری چاکەکەی دەداتێ یان زیاتری دەداتێ وە هەر کەسێک خراپەیەک بکات سزاکەی بە ئەندازەی خۆیەتی یان لێ ی خۆش دەبم، ئەگەر کەسێک بستێ لەمن نزیک-

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ ئەو خوایەیە کەئێوەی لەخاك دروست کردووە ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ لەپاشان لەدڵۆپێك ئاو ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ پاشان لەخوێن پارە ﴿ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾ لەپاشان بەمنداڵی (ساوایی) دەتان هێنێتە دەر (لەسکی دایك) ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ﴾ لەپاشان تا دەگەنە تینی هێزو لاویتان ﴿ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخًا﴾ لەپاشان تاپیر دەبن ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾ وە هەندێکتان پێش پیربوون دەمرێنرێن ﴿وَلِتَبْلُغُوٓاْ أَجَلًا مُّسَمًّى﴾ هەتا دەگەنە ئەو کاتەی کەبۆتان دیاری کراوە ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە. ٦٧)﴿هُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ ئەو خوایەیە کەدەژێنێ و دەمرێنێ ﴿فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا﴾ جا هەرکاتێ (بیەوێ) بڕیارێ بدا ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ تەنیا پێی دەفەرمووێ ببە دەست بەجێ دەبێ. ٦٨) ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە سەبارەت بەنیشانانی خوادەمە قاڵێ دەکەن ﴿أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ﴾ چۆن لەرێ لادەدرێن. ٦٩)﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەوانەی باوەڕیان بەقورئان نەهێنا ﴿وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا﴾ وە بەو (پەڕاوانەی) بەپێغەمبەرەکانماندا ناردومانە ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوە لەمەو پاش (سەرئەنجامی خۆیان) دەزانن. ٧٠) ﴿إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ﴾ کاتێ زنجیرو تەوقیان لەگەردندایە ﴿يُسْحَبُونَ﴾ پێ ی ڕادەکێشرێن. ٧١)﴿فِى ٱلْحَمِيمِ﴾ لەناو ئاوی زۆر گەرمدا ﴿ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ﴾ پاشان لەدۆزەخدا دەسوتێنرێن. ٧٢)﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ﴾ لەپاشان پێیان دەوترێ: ﴿أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ لەکوێن ئەو هاوبەشانەی بۆ خواتان دادەنان. ٧٣)﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بێجگە لەخوا ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾ دەڵێن: وون بوون لێمان ﴿بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُواْ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا﴾ (وا نی یە) بەڵکو ئێمە لەدنیا (بێجگە لەخوا) شتێکمان نەدەپەرست ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ئابەم جۆرە خوا بێ باوەڕان لەڕێگە لادەدات. ٧٤)﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ﴾ ئەمەتان لەبەر ئەوەیە کەئێوە ﴿تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ بەناڕەوا شادی و کەیفتان دەکرد لەزەویدا ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ﴾ وە لەبەر ئەوەی کەئێوە فیزو کەشخەتان دەکرد لەزەویدا. ٧٥) ﴿ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ دەی لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بڕۆنە ژوورەوە تیایا دەمێننەوە بە ئێجگاری ﴿فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئای چەند خراپە شوێنی خۆ بەزل زانان. ٧٦)﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾دە کەواتە خۆڕاگربە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ﴾ جا یا هەندێك لەو بەڵێنانەی پێیان دەدەین نیشانت دەدەین ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یا تۆ دەمرێنین (بەڵێنەکان نابینی) ﴿فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ ئەوسا هەمووتان هەر بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە. ٧٧)

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِي ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾

-ببيتـــەوە مـــن گەزێ لەئـەو نزيك دەبمـەوە، ئەگـەر كەسێك گەزێ لەمن نزيك ببێتـەوە من باڵێ لەئـەو نزيـك دەبمـەوە، ئەگـەر كەسێك بەڕێشتنى ئاسايى بێت بـۆ لام، مـــن بەچەسپانى دەچم بۆ لاى ئەو، ئەگەر كەسێك پڕ بەزەوى تاوانى هەبێت و بەو هـەموو تاوانـەوە بێت بۆ ديوانى من منـيش بـەپڕى زەوى لـــێ خۆشـــبوونەوە دەچـم بەپيريـەوە. بەمەرجێ هاوبەشم بۆ دانەنێ).

**ئايەتى (٧٣) سورەتى (الزمر):** قال رسول الله(ﷺ): (إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم)(رواه أبو داود).پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرمووى: (بەڕاستى برِوادار بەهۆى خوى شيرين و ڕەوشتى جوانەوە دەگاتە پلەى كەسێكى بەردەوام بەڕۆژوى شەو نوێژ كەر).

**ئايەتى (١٤) سورەتى (غافر):** قال عبد الله بن الزبير: كان رسول الله (ﷺ) يقول في دبر كل-

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ﴾ **سوێند بەخوا بەڕاستی بەر لەتۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووە** ﴿مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ﴾ **بەسەرهاتی هەندێکیانمان بۆ باس کردوی** ﴿وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾ **وە هەندێکیانمان بۆ باس نەکردوی** ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ﴾ **وە هیچ پێغەمبەرێ ناتوانێ موعجیزەیەك بێنێ** ﴿إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ **مەگەر بەئیزنی خوا** ﴿فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ﴾ **جاکاتێ فەرمانی خوا هات (بەسزادانیان)** ﴿قُضِيَ بِالْحَقِّ﴾ **بەهەق دادوەری دەکرێ** ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ﴾ **وە لەوێدا ناڕاستان زەرەرمەند دەبن. ٧٨)** ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ﴾ **خوا ئەو زاتەیە ئاژەڵو ماڵاتی بۆ ئێوە بەدی هێناوە** ﴿لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ **بۆ ئەوەی سواری هەندێکیان بن و (گۆشتی) هەندێکیشیان بخۆن. ٧٩)** ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ﴾ **وە لەو (ئاژەڵ)انەدا چەند سوودو کەڵك بۆ ئێوە هەیە** ﴿وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ﴾ **وە تابەهۆی ئەوانەوە بگەنە پێویستی یەك کە لەدڵ و دەروونتان دایە** ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ **وە لەسەر پشتی ئەو (وڵاخانە)و لەسەر کەشتی ئێوە سوار دەکرێن. ٨٠)** ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ﴾ **خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات** ﴿فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ **جا ئێوە کام لەنیشانەکانی خوادان پیانانێن. ٨١)** ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا﴾ **دەی ئایا بەزەویدا نەگەڕاون تا ببینن** ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ **سەرەنجامی کەسانێ کەبەر لەوان بوون چۆن بووە** ﴿كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً﴾ **کەلەمان زۆر ترو بەهێزتریش بوون** ﴿وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ﴾ **وە شوێنەواریشیان لەزەویدا (زیاتر بوو)** ﴿فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ **ئەنجا ئەوەی کرد بوویان (لەدنیادا) سوودی پێ نەگەیاندن. ٨٢)** ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ **جا کاتێ پێغەمبەرەکانیان بەبەڵگە ڕوونەکانەوە هاتنە لایان** ﴿فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ﴾ **دڵخۆش بوون بەو زانینەی هەیان بوو** ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ **ئەو (سزای) گاڵتەیان پێ دەکرد چوار دەوری دان. ٨٣)** ﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ **ئەنجا کاتێ سزای بەتینی ئێمەیان بینی** ﴿قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ **ووتیان: باوەڕمان بەخوای تاك و تەنیا هێنا** ﴿وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ﴾ **وە بێ باوەڕین بەو شتانەی کردبوومانە هاوبەشی خوا. ٨٤)** ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ﴾ **جا باوەڕ هێنانەکەیان هیچ سوودی نەبوو بۆیان** ﴿لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ **لەکاتێکدا سزای ئێمەیان دی** ﴿سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ﴾ **باوو سوننەتی خوا هەر وا بووە پێشتر لەگەڵ بەندەکانی دا** ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾ **وە لەوێدا بێ باوەڕان زەرەرمەند بوون. ٨٥)**

سُورَةُ فُصِّلَتْ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾

-صلاة حين يسلم: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا حول ولا قوة إلا بالله، لا إله إلا الله ولا نعبد إلا إياه، له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن، لا إله إلا الله مخلصين له الدين ولو كره الكافرون)(رواه مسلم). عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپاش هەموو نوێژێك كاتێ سەلامی دەدایەوە ئەم نزایەی دەکرد: (هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لە خوای تاک و تەنها و بێ هاوەڵ و سەروەری و ستایش هەمووی هەر بۆ ئەوە، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ گۆڕان و هێزێك نییە بەدەسەڵاتی خوا نەبێت، هیچ پەرستراوێکی ڕاستی نییە جگە لەخوا تەنها ئەو دەپەرستین، هەموو چاکە و بەهرەیە تەنها هی ئەوە، وە ستایشی جوان هەر بۆ ئەوە، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە-

## سورەتی ﴿فصلت﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ **بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.** ﴿حم﴾ بە(حا، میم) **دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بەواتای، سەیری** سەرەتای سورەتی (البقرة)ش بکە. ١) ﴿تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ **قورئان لەلایەن خوای بەخشندەی** میهرەبانەوە نێردراوەتە خوارەوە. ٢) ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ﴾ **پەڕاوێکە بەلگەکانی ڕوون** کراوەتەوە (لێک جیاکراوەتەوە) ﴿قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ قورئانێکە بەزمانی عەرەبی بۆ گەلێك **کەشارەزان و دەزانن. ٣)** ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ **مژدەدەرو ترسێنەرە** ﴿فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ **کەچی زۆربەیان گوێ ی پێ نادەن و بۆیە** (قورئان) نابیستن. ٤) ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ﴾ **دەڵێن دڵەکانمان لەناو چەند** پەردەیەکدایە (تێ ناگەین) ﴿مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾ **لەئەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەیت** ﴿وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ﴾ **وە لەگوێیەکانماندا گرانی و کەڕی هەیە** ﴿وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ﴾ **وە لەنێوان ئێمەو تۆدا پەردەیەك هەیە** ﴿فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ﴾ **کەواتە تۆ کاری خۆت بکە و بێگومان ئێمەیش کاری خۆمان دەکەین. ٥)** ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ **بڵێ: بەڕاستی من مرۆڤێکم وەك ئێوە** ﴿يُوحَىٰ إِلَيَّ﴾ **بەڵام نیگام بۆ دەکرێت** ﴿أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ **کە بەڕاستی پەرستراوی ئێوە خوایەکی** تاك و تەنیایە ﴿فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ﴾ **کەواتە بارووتان هەر بەرەو خوا** بێ (بەپەرستنەکانتان) **و داوای لێبوردنی لێ بکەن** ﴿وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ﴾ **وە سزاو لەناوچوون بۆ هاوبەش دانەران. ٦)** ﴿الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ **ئەوانەی کەزەکات نادەن و** ﴿وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ **باوەڕیشیان بەڕۆژی دوایی نی یە. ٧)** ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بەڕاستی **ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە** ﴿لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ **پاداشتی بێ بڕانەوەیان بۆ هەیە. ٨)** ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي﴾ **بڵێ: ئاخۆ بەڕاستی ئێوە باوەڕتان بەو** زاتە نی یە؟ ﴿خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ **کەزەوی لەدوو ڕۆژدا دروست کردووە** ﴿وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا﴾ **وە هاوبەشانی بۆ دادەنێن** ﴿ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ **هەر ئەوە پەروەردگاری جیهانیان. ٩)** ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا﴾ **وە لەسەر زەویدا شاخی زۆری داناوە** ﴿وَبَارَكَ فِيهَا﴾ **وە پیت و فەڕی تێ خستووە** ﴿وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا﴾ **وە بژێوی (هەموو گیاندارێکی) لەزەویدا دیاری کرد** ﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ﴾ **لەماوەی چوار ڕۆژدا** ﴿سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ﴾ **بەیەکسانی بۆ گشت داواکەران. ١٠)** ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ **لەپاشان ڕووی کردە ئاسمان لەکاتێکدا کەدوکەڵ بوو** ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا﴾ **ئەنجا بەئاسمان و بەزەوی فەرموو: وەرن** ﴿طَوْعًا أَوْ كَرْهًا﴾ بەویستی خۆتان یا بە ناچاری (بێنە **ژێر فەرمانم)** ﴿قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ **هەر دووکیان وتیان بەویستی خۆمان هاتین. ١١)**

فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةًۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَخْزَىٰۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾

ـلـەخوا هەموو ملكەچین بۆی بەدڵسۆزی با بێ باوەڕانیش پێیان ناخۆش بێت).

**ئایەتی (١٨) سورەتی (غافر):** قال رسول الله (ﷺ): (اتقوا الظلم فإن الظلم ظلمات يوم القيامة واتقوا الشح فإن الشح أهلك من كان قبلكم، حملهم على أن سفكوا دماءهم واستحلوا محارمهم)(رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خۆتان لەستەم بپارێزن بەڕاستی ستەم تاریكستانی ڕۆژی دوایی یە وەخۆشتان لەچرووكی و پیسكەی بپارێزن چونكە چرووكی و پیسكەیی خەڵكانی پێش ئێوەیان لەناو برد وای لێ كردن كەخوێنی یەكتری بڕێژن و ئەو ئافرەتانەی حەڵاڵ نین بۆیان بەحەڵاڵی بزانن).

**ئایەتی (١٩) سورەتی (غافر):** قال أنس(رضي الله عنه): (إنكم لتعملون أعمالاً هي أدق في أعينكم من الشعر،-

﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ ئەوسا حەوت ئاسمانی لەدوو ڕۆژدا دروست کرد ﴿وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ﴾ وە هەر ئاسمانەی فەرمانی کاری خۆی بۆ نارد ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ﴾ وەئاسمانی دونیامان بەچرایانێك (ئەستێرەکان) ڕازاندەوەو پارێزراوە (لەگوێ گرتنی شەیتانەکان) ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوە بڕیاری خوای زاڵی بەدەسەڵاتە. ١٢) ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ﴾ جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ﴾ ئەوە بڵێ بەهەورە تریشقەیەك (بروسکەیەك) دەتانترسێنم ﴿مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ﴾ وەك هەورە تریشقەی (گەلی) عادو سەموود. ١٣) ﴿إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ﴾ کاتێ پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان ﴿مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ لەبەردەمیان و لە پشتیانەوە (لەهەموو لایەکەوە) ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ﴾ (پێیان ووتن) کەجگە لەخوا نەپەرستن ﴿قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ﴾ ووتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بیویستایە مەلائیکەی دەناردە خوارەوە ﴿فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بۆیە بەڕاستی ئێمە بەوەی ئێوەی پێ نێرراون باوەڕ ناکەین. ١٤) ﴿فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ ئەنجا (گەلی) عاد بەناڕەوا خۆیان بەگەورە زانی لەزەویدا ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ﴾ وە ووتیان: کێ لەئێمە بەهێز ترە ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ ئایا نەیان زانی بوو ﴿أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ﴾ بێگومان ئەو خوایەی کەئەوانی دروست کردووە ﴿هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ﴾ ئەو لەئەوان بەهێز ترە ﴿وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ﴾ وە ئەوان دانیان نەدەنا بەبەڵگەکانی ئێمەدا. ١٥) ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا﴾ ئەوسا ئێمە بایەکی زۆر بەهێزی ساردمان بۆ ناردن ﴿فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ﴾ لەڕۆژانێکی بەردەوام (شوم)دا ﴿لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ﴾ بۆ ئەوەی سزای ئابڕو بەریان پێ بچەژێن ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ لەژیانی دونیادا ﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ﴾ بێگومان سزای پاشە ڕۆژیان ئابڕو بەر (ڕیسواکەر) ترە ﴿وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ﴾ وە ئەوان یارمەتی نادرێن. ١٦) ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ﴾ وە (هۆزی) سەموودمان ڕێنموونی کرد ﴿فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾ بەڵام ئەوان زیاتر حەزیان لەکوێری کرد ئاشارەزایی و ڕێنموونی ﴿فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ﴾ جا بۆیە هەورە بروسکەی سزای ڕیسواکەر لێی دان ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو (خراپانەوە) کەدەیانکرد. ١٧) ﴿وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ وە ئەو کەسانەشمان ڕزگارکرد کەباوەڕیان هەبوو پارێزکار بوون. ١٨) ﴿وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ وە ڕۆژێك هەموو دوژمنانی خوا بەرەو ئاگری دۆزەخ کۆدەکرێنەوە ﴿فَهُمۡ يُوزَعُونَ﴾ جا ئەوان (لە پێش کەوتن و دواکەوتن) بەرگری دەکرێن (تا هەموو پێکەوە بەڕیز بڕۆن). ١٩) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا﴾ تا کاتێ دەگەنە لای ئاگری دۆزەخ ﴿شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ﴾ شایەتی دەدات لە دژیان ﴿سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم﴾ گوێ و چاو و پێستی لەشیان ﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەو کردەوانەی کە کردویانە. ٢٠)

وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ ۖ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٢) سوورەتی (فصلت): ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ....﴾ بوخاری لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت دوو پیاوی قوڕەیشی و ئاوایەکیان کەخەڵکی ثەقیف بوو لەماڵێکدا بوون بە یەکتریان ووت لاتان وایە وادەزانن خوا گوێ ی لە قسەی ئێمە بێت ، یەکێکیان ووتی: گوێ ی لەهەندێکێتی، یەکێکی تریان ووتی ئەگەر گوێ ی لەهەندێکی بێت بێ گومان گوێ ی لەهەمووی دەبێت بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ...﴾

-كنا نعدها على عهد رسول الله (ﷺ) من الموبقات) (رواه البخاري) ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ)-

﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ﴾ وە بەپێستەکانیان دەڵێن: ﴿لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا﴾ بۆچی شایەتییتان دا لەدژمان ﴿قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ﴾ دەڵێن: ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە زمان ﴿أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ کە هەموو شتێکی هێناوەتە زمان (قسەکردن) ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەر ئەویش یەکەم جار ئێوەی دروست کردوە﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە. ٢١) ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ﴾ وە ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە (نەدەپاراست لەگوناه) ﴿أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَـٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ لەشایەتی دانی گوێ و چاوو پێستی لەشتان لەدژتان ﴿وَلَـٰكِن ظَنَنتُمْ﴾ بەڵکو وا گومانتان دەبرد ﴿أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ کەخوا نازانێ بەزۆرێك لەو کارانەی کەدەیکەن. ٢٢) ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ﴾ ئا ئەوە گومانتان بوو کەدەتان برد بەپەروەردگارتان ﴿أَرْدَىٰكُمْ﴾ ئێوەی هەڵدێرا (لەناوی بردن) ﴿فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ و چوونە ریزی زیانباران. ٢٣) ﴿فَإِن يَصْبِرُواْ﴾ ئەنجا ئەگەر ئارام بگرن ﴿فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾ ئەوە ئاگر شوێنی مانەوەیانە ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُواْ﴾ وە ئەگەر داوای لێبوردن و ڕازی بوونی خوا بکەن ﴿فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ﴾ ئەوە خوا هەرگیز ڕازی نابێ (خۆش نابێ لێیان). ٢٤) ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ﴾ وە چەند دۆست (هاودەم)مان لەدنیا بۆ دانان ﴿فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ کە خراپەکردنی دنیاو (بێبڕوایی) ڕۆژی دوایی بۆ ڕازاندنەوە ﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ﴾ وە بەڵێنی (سزادانیان) بەسەردا درا ﴿فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم﴾ لە(ریزی) ئەو گەلانەی ڕابوردن پێش ئەمان ﴿مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ لەجنۆکە و ئادەمی ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ خَـٰسِرِينَ﴾ بەڕاستی زەرەرمەند بوون. ٢٥) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ﴾وەبێباوەڕان (بەیەکتریان) دەووت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە ﴿وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ وە قسەی پڕو پوچی تێکەڵ بکەن بەڵکو سەرکەون (بەسەریدا). ٢٦) ﴿فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ دەی سوێند بەخوا بێگومان ئەوانەی بێباوەڕ بوون پێیان دەچێژین ﴿عَذَابًا شَدِيدًا﴾ سزایەکی سەخت ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾وە تۆڵەیان لێ دەسەنین (بەتۆڵەی) خراپترینی تاوانێ کەدەیان کرد. ٢٧) ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ﴾ ئەوەی (باسکرا) سزای دوژمنانی خوایە کەئاگری دۆزەخە ﴿لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ﴾ ماڵی هەمیشەی ئەوان لەو ئاگرەدایە ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ ئەو سزایە (دەدرێن) چونکە دانیان نەدەنا بەنیشانەکانی ئێمەدا. ٢٨) ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وە ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەو دوانەمان نیشان بدەن کە گومڕایان کردین ﴿مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ لە جنۆکە و ئادەمی ﴿نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾ تا بیانخەینە ژێر پێمان ﴿لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾ تا لە ژێری ژێرەوەی دۆزەخ بن. ٢٩)

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ
ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ
وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾
وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ
إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ
ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ
وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ
إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ
فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ
ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ
وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ
إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ
رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾

-دەڵێت: (گەلێک شت هەیە کەئێستا ئێوە زۆر بەئاسانی دەیکەن و لەبەرچاوتان لە موو بارێکترە بەڵام ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) (کردنی) ئەوانەمان بەلەوتێنەرو تاوانی گەورە دادەنا).

**ئایەتی (٤٦) سورەتی (غافر):** قال رسول الله (ﷺ): (إن أحدكم إذا مات عرض عليه مقعده بالغداة و العشي إن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة وإن كان من أهل النار فمن أهل النار، فقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله عز وجل إليه يوم القيامة)(رواه البخاري ومسلم) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (هەر یەک لەئێوە ئەگەر مرد بەیانیان و ئێواران جێگای خۆی نیشان دەدرێت ئەگەر بەهەشتی بوو لەبەهەشتدا و ئەگەر دۆزەخی بوو لەدۆزەخدا، پێ ی دەوترێت: ئەمە جێگای تۆیە تا خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا زیندووت دەکاتەوە بۆی).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ووتیان خوا پەروەردگارمانەو ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟﴾ لەپاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بوون ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندوو بوونەوە) ﴿أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟﴾ (پێیان دەڵێن) کەمەترسن‌و خەفەت مەخۆن ﴿وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ وە مژدەبێ لێتان ئەو بەهەشتەی کەبەڵێنتان پێ درابوو. ٣٠)﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئێمە لەژیانی دنیا و لەڕۆژی دواییدا پشتیوانی ئێوەین ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ﴾ وە لەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بکەن بۆتان ئامادەیە ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ وە هەرچی داوا بکەن لەوێدا لەخزمەتتاندایە. ٣١)﴿نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ ڕێزلێنان و میوانداریە لەلایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە. ٣٢)﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ کێ ووتەی چاکترو بەجێترە لەوکەسەی (خەڵك) بۆلای خوا بانگ دەکات ﴿وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ وەکاری چاکە دەکات و دەڵێ بێگومان من لەپێڕی موسڵمانانم. ٣٣)﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ﴾ چاکە و خراپە چوون یەك نین ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ بەچاکترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە ﴿فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ﴾ ئەوسا کەسێ کە لەنێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی هەیە ﴿كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ﴾ وەك دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بەگیانی یە لێ دێت. ٣٤)﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟﴾ بەم ئاستە ناگات کەسانێ نەبێ کە خۆڕادەگرن و بەئارامن ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ وە پێی ناگات مەگەر کەسێ خاوەنی بەشی هەرە گەورە بێت (لەپاداشت). ٣٥)﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ﴾ وە ئەگەر لەشەیتانەوە تووشی خەتەرەو خەیاڵی نادروست بوویت ﴿فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ﴾ ئەوە پەنا بگرە بەخوا ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ چونکە بەڕاستی هەر ئەو بیسەری‌زانایە. ٣٦) ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ لەنیشانەکانی (دەسەڵاتی) خوایە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ ﴿لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ﴾ سوژدە مەبەن نەبۆ خۆرو نەبۆ مانگ ﴿وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ﴾ بەڵکو سوژدە بەرن بۆ ئەو خوایەی ئەوانی بەدی هێناوە ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرستن. ٣٧) ﴿فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ جا ئەگەر خۆیان بەگەورە زانی (من بپەرستن) ﴿فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ دەی ئەوانەی لای پەروەردگارتن (فریشتەکان) ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ﴾ بەشەو و بەڕۆژ عیبادەتی ئەو دەکەن و ماندوو وەڕەز نابن. ٣٨)

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

**ئایەتی (٦٠) سورەتی (غافر):** قال رسول الله (ﷺ): (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد، فأكثروا الدعاء)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاریەوە ئەوکاتەیە کە لە سوژدەدا بێت کەواتە دوعاو نزا زۆر بکەن لەوە کاتەدا).

**ئایەتی (٨) سورەتی (الشورى):** قال رسول الله (ﷺ): (من ظلم قيد شبر من الأرض طوقه من سبع أرضين) (متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك بستێ لە زەوی بەستەم داگیر بکات لەرۆژی دواییدا هەر حەوت چینەکەی زەوییەوە وەك کەڵەمە دەکرێ بە تەوق و دەکرێتە ملی).

**ئایەتی (١٠) سورەتی (الشورى):** قالت أم سلمة (ﷺ): كان النبي إذا خرج من بيته قال: (اللهم إني-

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً﴾ لەنیشانەکانی(دەسەڵاتی) خوایە کەزەوی دەبینی وشك و ماتە﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ﴾ کەچی کاتێ بارانمان باراند بەسەریدا ﴿ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾(بەڕوانی ڕوەك) دەکەوێتە جوڵەو دەبوژێتەوە(بەرز دەبێتەوە) ﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ﴾ بێگومان ئەوەی (زەوی وشك) دەبوژێنێتەوە زیندوو کەرەوەی مردووەکانیشە ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ٣٩) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ بێگومان ئەوانەی لەئایەتەکانی ئێمە لادەدەن ﴿لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ﴾ لەئێمە شاراوە نین ﴿أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ﴾ دەی ئایا کەسێ دەخرێتە ناو ئاگرەوە چاکترە ﴿أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ یا ئەو کەسەی لەڕۆژی قیامەت دا بێ ترس دێت﴿ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ﴾ هەرچیتان ویست (حەزتان لێ کرد) بیکەن ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەوەی دەیکەن بینایە. ٤٠) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کەقورئانیان بۆ هات باوەڕیان پێ نەهێنا (سزایان دەدەین) ﴿وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ﴾ کەبەڕاستی کتێبێکی زۆر بەرزو جێگەی ڕێزە. ٤١) ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ﴾ بەتاڵ ڕوی تێ ناکات ﴿مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ﴾ نە لەئێستا و نەلە دووا ڕۆژدا (نە بەلێکەمکردن نە بەلێزیادکردن) ﴿تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ چونکە نێردراوەتە خوارەوە لەلایەن (خوای) کاردروستی ستایش کراوەوە. ٤٢) ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ﴾ هیچ شتێ بەتۆ ناوترێ ﴿إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ﴾ مەگەر ئەوەی بەپێغەمبەرانی بەرلەتۆ ووتراوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت خاوەن لێبوردنە (بۆ ئیمانداران)﴿وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ وە خاوەن تۆڵەی سەختە (بۆبێ باوەڕان). ٤٣) ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا﴾ ئەگەر ئەم قورئانەمان بەزمانێ جگە لەعەرەبی بناردایە ﴿لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ﴾ بێ باوەڕان دەیان ووت بۆچی ئایەتەکانی بەڕوونی شینەکراونەتەوە ﴿ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ﴾ (چۆن دەبێ) قورئانی عەجەمی و پێغەمبەری عەرەبی ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێ باوەڕیان پێی هێناوە ڕێنیشاندەرو شیفایە﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ﴾ وە ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لەگوێیاندا گرانی و کەڕی هەیە(لەبیستنی حەق) ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾ هەروەها لەئاست ئەو قورئانەدا کوێرن ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾ ئەوانە لەشوێنێکی زۆر دورەوە بانگ دەکرێن. ٤٤) ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی تەوراتمان دا بەمووسا ﴿فَٱخْتُلِفَ فِيهِ﴾ بەڵام جیاوازی تێدا کرا ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگەر پێشتر بڕیار نەدرایە لەلایەن پەروەردگارتەوە (کە سزایان دوا بخرێت) ﴿لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ لەنێوانیاندا داوەری دەکرا (بەسزا دانیان لەدنیا) ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ وە بەڕاستی ئەوان لەدوو دڵی و بەدگومانی دان دەربارەی قورئان. ٤٥) ﴿مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ﴾ هەر کەسێ کاری چاکە بکات (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾ هەر کەسیش خراپە بکات (زیانەکەی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ وە پەروەردگارت ستەم لەبەندەکانی ناکات. ٤٦)

۞ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾

-أعوذ بك أن أَضِلَّ أو أُضَلَّ أو أزل أو أُزل أو أظلم أو أظلم أو أجهل أو يُجهَلَ عليَّ)(رواه أبو داود والترمذي).

ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەماڵ دەردەچوو دەیفەرموو: (ئەی خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی کەسێ گومڕا بکەم یا گومڕا بکرێم یا کەسێ بە هەڵەدا ببەم یا بەهەڵەدا ببرێم یا ستەم بکەم یاستەمم لێ بکرێت یا نەفامی بەرامبەر کەسێ بکەم یا کەسێك نەفامیم بەرامبەر بکات).

**ئایەتی (٢٠) سورەتی (الشورى):** قال رسول الله (ﷺ): (بشر هذه الأمة بالسناء والرفعة والنصر والتمكين في الأرض فمن عمل منهم عمل الآخرة للدنيا لم يكن له في الآخرة من نصيب)(رواه أحمد).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (مژدە بدە بەم ئوممەتە بە بەرزی پلە و پایەو بڵندی و سەرکەوتن-

﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ زانینی ڕۆژی دوایی تەنیا بۆ لای خوا دەگەڕێنرێتەوە ﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا﴾ وە هەر بەروبوومێك كە لە پێست و قەباغەكەی دێتە دەرەوە ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ﴾ و هەر مێینەیەك ئاوس دەبێ ﴿وَلَا تَضَعُ﴾ و (سكەكەی) دادەنێت ﴿إِلَّا بِعِلْمِهِۦ﴾ ئەو(خوا) ئاگای لێ یە ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ﴾ وە ڕۆژێ خوا (هاوبەش پەیدا كەران) بانگ دەكات ﴿أَيْنَ شُرَكَآءِى﴾ هاوبەشانی (كەدلتان نابوو بۆ) من لەكوێن ﴿قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ﴾ دەڵێن پێمان ڕاگەیاندی ﴿مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ﴾ كەس لەێمە شایەت نین (تۆهاوبەشت هەبێ). ٤٧) ﴿وَضَلَّ عَنْهُم﴾ وە وون بوولێیان ﴿مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ﴾ ئەوانەی پێشتر دەیانپەرستن ﴿وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ وە زانیان كە هیچ پەنایەكیان نی یە. ٤٨) ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ﴾ ئادەمی ماندو نابێ ﴿مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ﴾ لە داواكردنی خێرو خۆشی ﴿وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ وە ئەگەر ناخۆشی یەك دووچاری ببێ ﴿فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾ ئەوە بێ هیوا و نائومێد دەبێ. ٤٩) ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ﴾ وە ئەگەر پێمان بەخشی ﴿رَحْمَةً مِّنَّا﴾ میهرەبانی یەك لەلایەن خۆمانەوە ﴿مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ﴾ لەپاش زیانێك لێی كەوتووە ﴿لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى﴾ دەڵێت: ئەمە هی خۆمە ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾ وەگومان نابەم ڕۆژی دوایی بەرپا بێت ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾ وە ئەگەر گەڕێندرامەوە بۆلای پەروەردگارم (زیندووبونەوە هەبوو) ﴿إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ﴾ بێگومان لای خوا (پاداشتی) زۆر چاكم هەیە ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ جا سوێند بەخوا هەواڵ دەدەین بەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿بِمَا عَمِلُوا۟﴾ بەوەی كردوویانە (لەدونیا) ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم﴾ وە سوێند بەخودا پێیان دەچەژێن ﴿مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ سزایەكی بەهێز و بەتین. ٥٠) ﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ﴾ وە كاتێ چاكە و خۆشیمان ڕشت بەسەر ئادەمی دا ﴿أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾ ڕوو وەردەگێڕێ و بە خۆبەزل زانینەوە دوور دەكەوێتەوە ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ بەڵام كاتێ ناخۆشی تۆش بێت ﴿فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ﴾ ئەوە نزاو هاواری زۆر دەكات. ٥١) ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ بڵێ پێم بڵێن ﴿إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر (قورئان) لەلایەن خواوە بوو ﴿ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ﴾ پاشان ئێوەش باوەڕتان پێ نەكرد ﴿مَنْ أَضَلُّ﴾ كێ گومڕا ترە ﴿مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ لەو كەسەی كەلە دژایەتی یەكی دوور لەڕاستیدا بێت. ٥٢) ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ لەمەودوا بەڵگە كانی خۆمانیان نیشان دەدەین ﴿فِى ٱلْءَافَاقِ﴾ لە ئاسۆی دونیا ﴿وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ وە لە خودی خۆیاندا ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ﴾ هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە ﴿أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە ﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ﴾ ئایا پەروەردگارت بەس نی یە ﴿أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ كە بەڕاستی ئاگاداره بەسەر هەموو شتێكدا. ٥٣) ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ﴾ ئاگادابن بەڕاستی ئەوانە لە دوو دڵیدان ﴿مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ﴾ لەدیداری پەروەردگاریان ﴿أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ﴾ ئاگاداربە بەڕاستی (زانینی) خوا دەوری هەموو شتێكی داوە. ٥٤)



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّۚ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِۚ فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحْمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِيُّ وَهُوَ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾

-و جێگیربوون لە زەویدا (لە لایەن خوای گەورەوە) وە هەر کەسێکیان کردەوە و عیبادەتێک بۆ قیامەت دەکرێ بۆ دونیای بکات ئەوا لە ڕۆژی دواییدا هیچ پاداشتێک وەرناگرێ).

**ئایەتی (٤٢) سورەتی (الشوری)**: عن أبي عبد الله ابن الأرت (رضي الله عنه) قال: شكونا إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وهو متوسد بردة له في ظل الكعبة، فقلنا: ألا تستنصر لنا؟ ألا تدعو لنا؟ فقال: (قد كان من قبلكم يؤخذ الرجل فيحفر له في الأرض فيجعل فيها ثم يؤتى بالمنشار فيوضع على رأسه فيجعل نصفين ويمشط بأمشاط الحديد ما دون لحمه وعظمه ما يصده ذلك عن دينه والله ليتمن الله هذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضرموت لا يخاف إلا الله والذئب على غنمه ولكنكم تستعجلون)(رواه البخاري). خەبابی کوڕی ئەرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)-

## سورەتی ﴿الشورى﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿حم﴾ بە (حا , میم) دەخوێنرێتەوە. ١) ﴿عسق﴾ بە (عەین، سین، قاف) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی بۆ زانیاری زیاترو واتاکەشیان سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە. ٢) ﴿كَذَٰلِكَ يُوحِي إِلَيْكَ﴾ ئا بەو جۆرە خودا نیگا دەکات بۆ تۆ ﴿وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ﴾ وە بۆ ئەو (پێغەمبەر)انەی پێش تۆش ﴿اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خوای زاڵی کاردروست. ٣) ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ هەر بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان ﴿وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ وە هەرچی لە زەوی دایە ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ وە ئەو (خوا) بڵند و گەورەیە. ٤) ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ﴾ نزیکە ئاسمانەکان پارچە پارچەبن ﴿مِن فَوْقِهِنَّ﴾ لە سەروویانەوە ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ وە فریشتەکان بەپاکی یادو سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ﴾ وە داوای لێبوردن دەکـــەن ﴿لِمَن فِي الْأَرْضِ﴾ بۆ ئەوانەی لەزەویدان ﴿أَلَا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ ئاگادارین کە بێگومان تەنها خوا لێبوردەی میهرەبانە. ٥) ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ وە ئەوانەی جگە لەخوا دۆستانێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە ﴿اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ﴾ خوا ئاگادار و چاودێرە بەسەریانەوە ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ وە تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بریکار نیت بەسەریانەوە. ٦) ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ هەروەها نیگامان کردووە بۆت ﴿قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾ قورئانێك (بەزمانی) عەرەبی ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی مەککەو کەسانی دەوروو بەری بترسێنی ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ﴾ وە (خەڵك) بترسێنی لەڕۆژی کۆکردنەوە ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ کە هیچ گومانی تێدا نیە ﴿فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ﴾ کۆمەڵێك لە بەهەشتدان ﴿وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾ وە کۆمەڵێك لە ئاگری بڵێسە داردان. ٧) ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ دەیکردن بەیەك نەتەوە (باوەڕداریان بێ باوەڕ) ﴿وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ﴾ بەڵام هەرکەسێکی بوێ دەیخاتە ناو میهرەبانی خۆیەوە ﴿وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ستەمکارەکانیش هیچ دۆست و یارمەتی دەرێکیان نی یە. ٨) ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ ئایا ئەوان جگە لەخوا پشتیوان و دۆستانێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە؟ ﴿فَاللَّهُ هُوَ الْوَلِيُّ﴾ هەر خوا پشتیوانی و دۆستە ﴿وَهُوَ يُحْيِي الْمَوْتَىٰ﴾ وە تەنها ئەو مردووان زیندوو دەکاتەوە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە ئەو بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا. ٩) ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ﴾ وە هەرشتێك کە تێیدا جیاواز بوون ﴿فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ﴾ ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي﴾ ئەو خوایە پەروەردگاریی منە ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ تەنها پشتم بەو بەستووە ﴿وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە. ١٠)

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٢﴾ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾

-جارێکیان لە سێبەری کەعبەدا پاڵکشا بوو عاباکەی خۆی لەباتی سەرین خستبوە ژێر سەری ئێمەش سکالامان لەخزمەتیا کردو عەرزمان کرد: ئەوە بۆ دوای کۆمەکی و سەرکەوتنمان بۆ ناکەی لەخوا بۆ بۆمان ناپارێیتەوە فەرمووی: (بێگومان وابووە لەپێشینانی ئێوە پیاوی موسڵمانیان دەگرت و دەیان هێناو ئەوسا لەزەویدا چاڵیان بۆ هەڵدەکەند و بەزیندوویی تێیان دەخست و ئینجا مشاریان دەهێنا و لەسەر تەوقی سەری دایان دەناو بەرە بەرە بەشەقە مشار دایان دەهێنا وەك پارچە تەختە؛ هەبوو بەشانەی ئاسنین وەکو موو شانە بکرێ ئاوا لەشانەیان دەداو گۆشت و ڕەگ و ئێسکیان بەڕنەی ئاسن ئەنجن ئەنجن دەکرد بەڵام ئەمە کۆڵی پێ نەدەداو وازی پێ نەدەهێنا لەئاینەکەی سوێند بەخوا من لێم-

﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (خوا) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویی یە ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾ بۆی بەدی هێناون هاوسەران لەخودی خۆتان ﴿وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا﴾ هەروەها لە ئاژەڵیشدا جووتی (داهێناوە) ﴿يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ﴾ لەجووت بووندا ژمارەتان زۆر دەکات ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ هیچ شتێك بەوێنەی خوانی یە ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ وە ئەوە بیسەری بینایە. ١١) ﴿لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەر بۆ ئەوە (کلیلەکانی) دەسەڵاتداریی ئاسمانەکان و زەوی ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ ڕسق و ڕۆزی فراوان دەکات و دەیگرێتەوە بۆ هەرکەسێ کە بیەوێت ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارە بەهەموو شتێك. ١٢) ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ﴾ ئەو ئایینەی بۆ داناوون ﴿مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا﴾ کە فەرمانی داوە بە نووح و ﴿وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆ و ﴿وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ﴾ ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و مووسا و عیسا ﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾ کە لەسەر ئەو ئایینەبن بەڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن ﴿كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ زۆر قورس وگرانەبەلای هاوبەش دانەرانەوە ﴿مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾ ئەوەی ئەوانی بۆ بانگ دەکەیت ﴿ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ﴾ خوا هەرکەسی بوێ هەڵی دەبژێرێ بۆ(موسڵمان بوون) لای خۆی ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ وە ڕێنموونیی کەسێك دەکات بۆ لای خوا بگەڕێتەوە. ١٣) ﴿وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟﴾ وە جیاواز نەبوون ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ﴾ مەگەر لەپاش ئەوەی کەزانست و زانیاریان بۆ هات ﴿بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ بەهۆی دژایەتی و حەسوودی نێوانیانەوە ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ وە ئەگەر فەرمانێك پێشتر لە پەروەردگارتەوە دەرنەچوایە ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تا کاتێ دیاری کراو (دەبێ بژین) ﴿لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەوە بڕیار لەنێوانیاندا دەکرا (بەسزادانیان) ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ وە بەڕاستی ئەوانەی لەدوا ئەوان نامەیان پێ درا ﴿لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ لە گومان و دوو دڵیدا بوون لێی. ١٤) ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ﴾ کەواتە تۆ بۆ ئەوە بانگەوازبکە و ﴿وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ﴾ ڕاست بە لەسەر ئایینەکەت بەو جۆرەی فەرمانت پێ کراوە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ وە شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە ﴿وَقُلْ ءَامَنتُ﴾ وەبڵێ باوەڕم هێناوە ﴿بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ﴾ بەهەرنامەیەك کە خوا ناردویەتیە خوارەوە ﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ وە فەرمانم پێ دراوە کە داد پەروەربم لە نێوانتاندا ﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ خوا پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە ﴿لَنَآ أَعْمَٰلُنَا﴾ (پاداشتی) کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە و ﴿وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ (پاداشتی) کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە ﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾ هیچ بەڵگەیەك نەماوە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا (باس نەکرابێ) ﴿ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا﴾ خوا (لەڕۆژی دوایی دا) کۆمان دەکاتەوە ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە. ١٥)

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾

=ڕوون و ئاشکرایە کە خوای گەورە ئەم ئاینی ئیسلامە بە ئەنجامی دەگەیەنێ و سەری دەخات هەتا وای لێ دێ سوار بە تەنها لە صەنعاوە دەڕوات بۆ حەضرەمەوت لە ڕێگە و لەهەموو لایەك وابێ ترس دەبێ لە خوا نەبێ لە کەسی تر ناترسێ مەگەر ترسی گورگی هەبێ کە بنێتە ڕانەکەی بەڵام ئێوە پەلە دەکەن).

**ئایەتی (٥٢)**

**سورەتی (الشوری):** قال رسول الله (ﷺ): (مثلي ومثلكم كمثل رجل أوقد ناراً فجعل الجنادب والفراش يقعن فيها وهو يذبهن عنها: وأنا آخذ بحجزكم عن النار وأنتم تفلتون من يدي)(رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (وێنەی من و وێنەی ئێوەی ئوممەتی من وەك پیاوێ وایە ئاگرێکی کردبێتەوە جانەوەر و پەپولەیەکی زۆر ڕژابن و پەیتا پەیتا تێ ی بکەون بسوتێن و ئەویش خۆش=

﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی دەمەدەمێ دەکەن لەبارەی خواوە ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ﴾ لەدوای ئەوەی (خەڵکی بانگەوازی) ئەویان وەڵام دایەوە (موسڵمان بوون) ﴿حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بەڵگە کانیان پوچ و بەتاڵە لای پەروەردگاریان ﴿وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ﴾ وە خەشم و ڕقی خوایان لەسەرە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ وە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە. ١٦) ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئەم قورئانەی بەڕاستی ناردووەتە خوارەوە ﴿وَٱلْمِيزَانَ﴾ وە تەرازووی ناردووە (بۆ جیاکردنەوەی حەق و بەتاڵ) ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾ وە تۆ چوزانیت ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ لەوانەیە هاتنی ڕۆژی دوایی زۆر نزیك بێت. ١٧) ﴿يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا﴾ ئەوانەی باوەڕیان پێ ی نی یە پەلەی هاتنی دەکەن ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا﴾ بەڵام ئەوانەی باوەڕیان پێی هەیە دەترسن لێی ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ﴾ وە دەزانن ڕۆژی دوایی ڕاستە ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ﴾ بێدارین بەڕاستی ئەوانەی کە گومانیان هەیە لەڕۆژی دوایی ﴿لَفِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾ ئەوە بەڕاستی لە گومراییەکی زۆر دوور لەڕاستی دان. ١٨) ﴿ٱللَّهُ لَطِيفٌۢ بِعِبَادِهِۦ﴾ خوا دڵسۆزە بەبەندەکانی ﴿يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ﴾ هەرکەسی بوێ ڕسق و ڕۆزی دەدات ﴿وَهُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ﴾ وە هەر ئەو بەهێزو بە دەسەڵاتە. ١٩) ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ هەرکەس بەرهەمی دوا ڕۆژی بوێ ﴿نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ﴾ ئێمە بەرهەمەکەی بۆ زیاد دەکەین ﴿وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا﴾ وە هەرکەسێك بەرهەمی دونیای بوێ ﴿نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾ هەندێ لەدنیای پێ دەدەین ﴿وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ بەڵام لەڕۆژی دوایی دا هیچ بەشێکی نی یە. ٢٠) ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟﴾ ئاخۆ ئەو (بێ باوەڕ)انە هاوبەشانێکیان هەیە ﴿شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ﴾ ئاینێکیان بۆ داناوون ﴿مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ کە خوا ڕێگەی پێ نەداوە ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ﴾ وە ئەگەر بڕیاری یەکجاری دەرنەچوایە ﴿لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ لەنێوانیان دا بڕیار دەدرا (بە لە ناوبردنیان) ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بەڕاستی بۆ ستەم کاران سزای سەختی ئازار دەر هەیە. ٢١) ﴿تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا۟﴾ تۆ ستەمکاران دەبینی زۆر دەترسن لەتاو ئەوەی کردوویانە ﴿وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ﴾ بێگومان ئەو سزایە هەر دووچاریان دەبێت ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و چاکەکانیان کردووە ﴿فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ﴾ لە ناوی باخچەکانی بەهەشتانێکدان ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لە لایەن پەروەردگاریانەوە هەرچییان بوێ بۆیان ئامادەیە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ﴾ ئەوەیە چاکەو بەخششی زۆر گەورە. ٢٢)

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِي ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٣) سورەتی (الشورى): ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ ئیمامی ئەحمەد لە طاووسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێک هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و پرسیاری مانای ئەم ئایەتەی لێ کرد ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: مەبەستی خزمانی پێغەمبەرە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس وتی: پەلەت کرد چونکە هیچ تیرەیەک نی یە لە قورەیشدا پێغەمبەر (ﷺ) خزمی تیایدا نەبێ؛ ئینجا ئەم ئایەتە بەو هۆیەوە دابەزی ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ واتە: من داوام لەتانەوە تەنها بەردەوام بوونی خزمایەتی نێوانمانە.

﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ﴾ ئەو (بەخشە) ئەوەیە کە خوا موژدە دەدات بە بەندەکانی ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو چاکەکانیان کردووە﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری ﴿إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ مەگەر خۆشویستنی خزمایەتی ﴿وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا﴾ هەر کەس هەر چاکەیەك بکات چاکەی بۆ زیاد دەکەین (بە چەند بەرانبەر) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بەڕاستی خوا لێ بوردەی سوپاسگوزارە. ٢٣)﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ یا ئەو (بێ باوەڕانە) دەڵێن پێغەمبەر درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ﴾ خۆ ئەگەر خوا بیەوێ ﴿يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ مۆر دەنێ بەسەر دڵت دا ﴿وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ﴾ وە خوا بەتاڵ لە ناو دەبات ﴿وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ﴾ وە بە ووتەکانی (قورئان) ڕاستی جێگیر دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا زانایە بەوەی لە ناو دڵاندایە. ٢٤)﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ﴾ وە ئەو خوا زاتێکە تەویە لە بەندەکانی وەردەگرێت ﴿وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ وە لە کردەوە بەدەکان چاوپۆشی دەکات ﴿وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ وە دەزانێ بە هەرچی کەئێوە دەیکەن. ٢٥)﴿وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەیی باوەڕیان هێناوە و چاکەکانیان کردووە (داوایان) وەردەگرێت ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ وە لە بەهرەو بەخشی خۆیی زیاتریان دەداتێ ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بەڵام بێ باوەڕان سزای سەختیان بۆ هەیە. ٢٦)﴿وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ﴾ خۆ ئەگەر خوا ڕسق و ڕۆزی فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی ﴿لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لە زەویدا ستەمیان دەکرد ﴿وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ﴾ بەڵام (خوا) ڕسق و ڕۆزی بەو ئەندازە دەنێرێتەخوارەوە کە خۆی بیەوێ ﴿إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بە ئاگا و بینایە بەبەندەکانی. ٢٧)﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ﴾ وە خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟﴾ لە پاش ئەوەی کە خەلکی بێ ئومێد بوون ﴿وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ﴾ وە (بارانی) ڕەحمەتی خۆی بڵاو دەکاتەوە ﴿وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ وەهەر ئەو پشتیوان و سوپاسکراوە. ٢٨)﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ وە لە بەڵگەکانی (دەسەڵاتی) خوایە ﴿خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ﴾ و ئەوەی بڵاوی کردۆتەوە لە هەر دووکیاندا لە گیانلەبەران ﴿وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ وە خوا هەر کاتێ بیەوێ بە توانایە بەسەر کۆکردنەوەیاندا. ٢٩)﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ﴾ وە هەر ناخۆشی یەکتان تووش بووبێ ﴿فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ ئەوە بەهۆیی کردەوەیی (خراپی) خۆتانەوەیە ﴿وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ﴾ وە لە زۆرێکیش چاوپۆشی کردووە. ٣٠)﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە ئێوە ناتوانن لە زەویدا قوتاربن ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ وە نیتانە بێجگە لە خوا ﴿مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ هیچ پشتیوان و یارمەتی دەرێك. ٣١)

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٧) سورەتی (الشورى): ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ﴾ ئیبن جەریر لەعەمری کوڕی حورەیثەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئایەتی ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ﴾ لەسەر ئەو هاوەڵە هەژارانەی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی کە لەمزگەوتدا دەمانەوە، چونکە ئەوان دەیان ووت ئەگەر فڵان شتمان هەبوایە، ئاواتی دونیایان دەخواست.

-خۆش دووریان بخاتەوە لە ئاگرەکە، ئەوە تانێ من کەمەرم گرتوون و بە زۆر دووریتان دەخەمەوە لە ئاگرە کە کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم ڕادەپسکێنن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن).

ئایەتی (١٥) سورەتی (الجاثية): قال أبوذر: قال لي رسول الله (ﷺ): (لا تحقرن من المعروف-

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ﴾ وە لە بەڵگەکانی (دەسەڵاتی) خوایە کەشتیانی وەك شاخەکان لە دەریادا دەڕۆن ٣٢) ﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ﴾ ئەگەر خوابیەوێ با رادەگرێ ﴿فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ﴾ ئیتر کەشتیەکان بەسەر پشتی دەریاکەوە دەوەستان ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ بەڕاستی ئەوەی (کەباس کرا) چەندین بەڵگە و نیشانە هەیە. ﴿لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بۆ هەموو ئارام گرێکی سوپاسگوزار. ٣٣) ﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ یا بەهۆی کردەوەکانیانەوە نوقمیان دەکات ﴿وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ لەزۆرێکیش (لە گوناهیان) چاوپۆشی دەکات. ٣٤) ﴿وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ ئەوانەی کەدەمە قاڵی دەکەن دەربارەی بەڵگەکانی ئێمە دەزانن ﴿مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ هیچ پەنا یەکیان نی یە. ٣٥) ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ﴾ جا هەرشتێ کتان پێ بەخشراوە ﴿فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوە تەنها خۆشی ژیانی ئەم دونیایە ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ وە ئەوەی لای خوایە چاکتر و بەردەوامترە ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ وە تەنها پشت بەپەروەردگاریان دەبەستن. ٣٦) ﴿وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ﴾ وە ئەوانەی لە گوناهە گەورەکان و خراپە زۆر ناشیرینەکان دور دەکەونەوە ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟﴾ وە کاتێ رق و قینیان هەڵسێت ﴿هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ ئەوان لێ دەبوورن. ٣٧) ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ﴾ وە ئەوانەی کە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان کردووە ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ وە کارو باریی خۆیانیان بەپرس و مەشورەتە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ وە لەو ڕۆزیەی پێمان داوون دەیبەخشن. ٣٨) ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ﴾ وە ئەوانەی کاتێ دەست درێژیان لێ دەکرێت ﴿هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ تۆڵەی خۆیان دەستێنن (و سەردائاخەن). ٣٩) ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾ وە تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەکە بەوێنەی خۆیی ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ﴾ جا هەرکەسێ ببورێ و ئاشتی بکات ﴿فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئەوە پاداشتی ئەو لە لای خوایە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ. ٤٠) ﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ﴾ وە هەرکەس تۆڵە بسەنێ لە پاش ئەوەی ستەمی لێکراوە ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾ ئا ئەوانە هیچ خەتایەکیان لەسەر نیە. ٤١) ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ﴾ خەتا هەر لەسەر ئەو کەسانەیە کەستەم لەخەڵکی دەکەن ﴿وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ وە بە ناهەق خراپەکاریی دەکەن لە زەویدا ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە. ٤٢) ﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ﴾ وە هەرکەس خۆگرو لێ بوردە بێ ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ بەڕاستی ئەمە لەکارە پڕ بایەخ و پەسەندەکانە. ٤٣) ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هەر کەس خوا گومڕایی بکات ﴿فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ﴾ ئەوە پاش ئەوە هیچ دۆست و یارمەتی دەرێکی نی یە ﴿وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ وە ستەم کارەکان دەبینی کاتێ سزای (خوا) دەبینن ﴿يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ دەڵێن ئایا ڕێگەیەك هەیە بگەڕێینەوە بۆ دونیا. ٤٤)

وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴿٥١﴾

-شيئاً ولو ان تلقى أخاك بوجه طلق)(رواه مسلم). ئەبو زەری غیفاری (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم: (ئەی ئەبو زەڕ ئەوەی پێی بگوترێ چاکە بەکەمی مەزانە و بەسووك مەیگرە تەنانەت ئەوەش بێت بەڕوویەکی خۆش و گەشەوە بەبراکەی خۆت بگەیت).

ئایەتی (١٣) سورەتی (الأحقاف)؛ قال رسول الله (ﷺ): (قاربوا وسددوا واعلموا أنه لن ينجو أحد منكم بعمله) قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: (ولا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمة منه وفضل)(رواه مسلم) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ملی ڕێگەی ڕاست بگرن ئەوەندەی بۆتان دەکرێ و نزیکی مەکەن لەچاکە کردن و چاك بزانن کەستان لەبەر کردەوەی خۆی ڕزگاری نابێت لە قیامەتدا بەهۆی کردەوەکانیەوە ڕزگاری نابێت، عەرزیان کرد-

﴿وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا﴾ وە دەیان بینی پیشانی دۆزەخ دەدرێن ﴿خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ﴾ بەمل کەچی و زەلیلی و داماوی ﴿يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ﴾ بەگۆشەی چاوو بەدزیەوە دەڕوانن ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ وە ئەوانەیی کە باوەڕیان هێناوە دەڵێن ﴿إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ بەڕاستی زیانبارەکان ئەوانەن کە خۆیان و کەس و کاریان لەڕۆژی هەستانەوەدا لەدەس داوە ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ﴾ بیدارین بەڕاستی ستەمکارەکان لە سزایەکی هەمیشەیی دان. ٤٥)﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ﴾ وە ئەوانە هیچ پشتیوانێکیان نی یە ﴿يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەیارمەتیان بدەن بێجگە لەخوا ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ﴾ وە هەرکەسێك خوا گومڕایی بکات ﴿فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ﴾ ئەوە هیچ ڕێگەیەکی ڕزگار بوونی بۆ نی یە. ٤٦) ﴿ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم﴾ گوێڕایەڵ بن بۆ پەروەردگارتان ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ﴾ پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت ﴿لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە کە گەڕانەوەیی بۆ نی یە ﴿مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ﴾ ئەو ڕۆژە هیچ پەناگایەکتان نابێت ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ﴾ وە هیچ ئینکاری یەکتان پێ ناکرێ. ٤٧)﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا۟﴾ جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ ئەوە ئێمە تۆمان بەپارێزەر نەناردووە بۆ سەریان ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ﴾ تۆ تەنها ڕاگەیاندت لەسەرە ﴿وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً﴾ وە بەڕاستی کاتێ ئێمە لەلایەن خۆمانەوە بەهرەیەك بە کەسێ بچەژێن ﴿فَرِحَ بِهَا﴾ پێی دڵخۆش دەبێ ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ﴾ وە ئەگەر ناخۆشیەکیان تووش ببێت ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهۆی کردەوەیی خۆیانەوە ﴿فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ﴾ ئەوە بەڕاستی ئادەمی پێ نەزان و سپڵەیە. ٤٨)﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوایە پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ هەرچی بیەوێ بەدی دەهێنێ ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا﴾ بۆ هەرکەسێ بیەوێ کچی پێ دەبەخشێت ﴿وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ وە بۆ هەرکەس بیەوێ کوڕی پێ دەبەخشێت. ٤٩)﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا﴾ یان کوڕ و کچی بەیەکەوە پێ دەبەخشێت ﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا﴾ وە هەرکەسی بوێ نەزۆکی دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا زانایی دەسەڵاتدارە. ٥٠)﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ﴾ بۆ هیچ کەس نەبووە کەخوا قسەی لەگەڵدا بکات ﴿إِلَّا وَحْيًا﴾ مەگەر بە سرووش ﴿أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ﴾ یان لەپشت پەردەوە ﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا﴾ یان نێرراوێك بنێرێت ﴿فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ﴾ و بەفەرمانی خۆی ئەوەی کە بیەوێ سرووشی دەکات ﴿إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بڵندی کاربەجێیە. ٥١)

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾

-تەمانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (هەتتا منیش مەگەر خوای گەورە بەڕەحم و فەزڵی خۆی بمگرێتەوە ڕزگارم ببێ).

**ئایەتی (١٩) سورەتی ( محمد ):** قال رسول الله (ﷺ): (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله تعالى فيغفر لهم)(رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە گوناهتان نەکردایە ئەوە خوای گەورە ئێوەی لەناو دەبرد و کەسانێکی تری دەهێنا کەگوناه بکەن ئەوسا داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بکەن خوایش لێیان خۆش ببێ).

**ئایەتی (٣١) سورەتی ( محمد ):** قال رسول الله (ﷺ): (ما يصيب المسلم من نصب ولا وصب ولا هم ولا حزن ولا أذى ولا غم حتى الشوكة يشاكها إلا كفر الله بها من خطاياه)(متفق عليه) پێغەمبەری خوا(ﷺ)-

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا﴾ هەر بەو شێوە (كە وەحی پێ دێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿مِّنْ أَمْرِنَا﴾ بە فەرمانی خۆمان ﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ﴾ کەتۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چی یە ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا﴾ بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکی یەك ﴿نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ﴾ ڕێنموونی هەر کەسێکی پێ دەکەین کەبمانەوێت ﴿مِنْ عِبَادِنَا﴾ لەبەندەکانمان ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ وە بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست. ٥٢) ﴿صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي﴾ ڕێگەی ئەو خوایەی ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ کە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە هی ئەوە ﴿أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الْأُمُورُ﴾ بێدارین هەموو کارەکان هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە. ٥٣)

## سورەتی ﴿الزخرف﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿حم﴾ بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە واتاکەیی. ١) بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ سوێند بەم پەراوە ڕوون کەرەوەیە. ٢) ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان بەعەرەبی داناوە ﴿لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی تێ بگەن. ٣) ﴿وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە لەتابلۆیی پارێزراو دایە لای ئێمە ﴿لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ کەزۆر بڵندەو پڕە لەدانایی. ٤) ﴿أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحًا﴾ دەی ئایا ئێمە ئەم قورئانەتان لێ دوور بخەینەوە ﴿أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ﴾ لەبەر ئەوەی ئێوە گەلێکی زیادەڕەوون. ٥) ﴿وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ﴾ وە زۆر پێغەمبەرمان لە گەلە پێشوەکان ناردووە. ٦) ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ﴾ وە هەر پێغەمبەرێکیان بۆ هاتبێ ﴿إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەوان هەر گاڵتەیان پێ کردووە. ٧) ﴿فَأَهْلَكْنَا أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا﴾ جا کەسانێ کە لەمان بەهێزتر بوون لەناومان بردن ﴿وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ﴾ وە بەسەرچوو سەرگوزشتەیی پێشینان. ٨) ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیی کێ ئاسمانەکان و زەویی بەدی هێناوە؟ ﴿لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان دەڵێن خوای بەدەسەڵاتی زانا دروستی کردوون. ٩) ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا﴾ ئەو خوایەی زەوی کردووە بەلانکە بۆتان ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ وە چەند ڕێگایەکی تیادا دروست کردووە بۆتان ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەن بە مەبەستەکانتان. ١٠)

وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنۡ عِبَادِهِۦ جُزۡءًاۚ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخۡلُقُ بَنَاتٖ وَأَصۡفَىٰكُم بِٱلۡبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحۡمَٰنِ مَثَلٗا ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢٢﴾

-فەرمووی: (هەرچی تووشی موسڵمان دەبێت لەماندوویەتی و نەخۆشی و پەژارە و خەفەت و زیان و خەم، تاپیاچەقینی درکێکیش بێت، ئەوە خوای گەورە بەمانە لەگوناهەکانی خۆش دەبێت و دەیان سڕێتەوەڵێی).

**ئایەتی (١٠) سورەتی (الفتح):** قال عبادة بن الصامت (رضي الله عنه): بايعنا رسول الله (ﷺ) على السمع والطاعة في العسر واليسر والمنشط والمكره وعلى أثرة علينا وعلى أن لا ننازع الأمر أهله إلا أن تروا كفراً بواحاً عندكم من الله تعالى فيه برهان، وعلى أن نقول بالحق أينما كنا لا نخاف في الله لومة لائم) (متفق عليه).

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پەیمانمان دا بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری لەتەنگانەو ئاسوودەیی دا وە لەخۆشیو ناخۆشی دا ئەگەر چی فەرمان-

﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ﴾ وە ئەو خوایەی کە لەئاسمانەوە بەئەندازە بارانی بۆ باراندوون ﴿فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ جا وڵاتێکی ووشك و مردووی پێ زیندوو دەکەینەوە ﴿كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ ئابەو جۆرە ئێوەش زیندوو دەکرێنەوە. ١١)﴿وَالَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا﴾ وە ئەو خوایەی کە هەموو جووتەکانی بەدی هێناوە ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ﴾ وە کەشتی وڵاخی بۆ فەراهەم هێناون کە سواریان دەبن. ١٢)﴿لِتَسْتَوُوا عَلَىٰ ظُهُورِهِ﴾ بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن ﴿ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ﴾ لەپاشان بیر لە بەهرەی پەروەردگارتان بکەنەوە ﴿إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ﴾ کاتێ سواریان بوون ﴿وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا﴾ وەبڵێن پاك و بێ گەردی بۆ ئەو (خوایە)ی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین ﴿وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾ کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو. ١٣)﴿وَإِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. ١٤)﴿وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا﴾ وە بێگومان لەناو بەندەکانی خوادا هەندێ (منداڵیان) بۆ دانا ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾ وە بەڕاستی مرۆڤی (کافر) پێ نەزانو سپڵەی ئاشکرایە. ١٥)﴿أَمِ اتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ﴾ ئایا لەناو دروست کراوەکانیدا کچانی بۆ خۆی هەڵبژاردوە ﴿وَأَصْفَاكُم بِالْبَنِينَ﴾ وە کوڕانی تایبەت کردووە بەئێوەوە. ١٦)﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم﴾ وە کاتێ مژدە بەیەکێ لەوان بدرێ ﴿بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا﴾ بەوەی بەنموونە بۆ خوایی دادەنا ﴿ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ و پیش دەخواتەوە. ١٧)﴿أَوَمَن يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ﴾ ئایا ئەو (کچە)ی لەناو ئاڵتون و خشڵا بەخێو کرابێ و ﴿وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ لەکاتی دەمەقاڵێ دا ناتوانێ مەبەستی خۆی دەببڕێ (بۆ خوای بڕیار دەدەن). ١٨)﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا﴾ وەئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بەمێینەیان دادەنان ﴿أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ﴾ ئایا ئەوان بەدیاری دروستکردنیانەوە بوون ﴿سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾ بێگومان ئەو شایەتی یانەی دەنوسرێت و پرسیاریان لێ دەکرێ. ١٩)﴿وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَاهُم﴾ وە دەڵێن ئەگەر خوا بیویستایە ئێمە ئەو (فریشتا)ئەمان نەدەپەرست ﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ﴾ هیچ زانیاری یەکیان نی یە لەو بارەیەوە ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ ئەوانە هەردرۆ دەکەن. ٢٠) ﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا مِّن قَبْلِهِ﴾ یا لە پێش قورئان پەرتوکێکمان پێ داون ﴿فَهُم بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ﴾ کە ئەوان دەستیان پێوە گرتبێ. ٢١)﴿بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ﴾ (نەخێر وانی یە) بەڵکو دەیان ووت بەڕاستی ئێمە باو و باپیرانمان لەسەر ئاینێك دیووە ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ﴾ وە بێگومان ئێمەش پەیرەوی ڕێبازی ئەوانین. ٢٢)

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴿٢٣﴾
۞ قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ
إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ
إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ
﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلۡ
مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ وَرَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿٢٩﴾
وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُواْ
لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمۡ
يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم
بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوۡلَآ
أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ
لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ﴿٣٣﴾

-ڕەواكانمان خۆ
خۆیشمان لەگەڵدا
بكەن نازی ئەم و
ئەو بدەن بەسەر
ئێمـــــــــەدا،
وەپەیمانمان پێدا
كەكێشەو ئاژاوە
لەگـــــەڵ كـــــار
بەدەســــــــتە
موسڵمانەكانماندا
نەكـــەین مەگـــەر
كوفرو بێ باوەڕی
ئاشـكراو دیاریـان
لێ ببیــــنین كـــە
لەلایـــەن خـــواوە
بەڵگەی بەهێزتان
هەبێت لەسـەری،
هـــــــــەروەها
پەیمانماندا لەسەر
ئەوەی لەبەر خوا
هەق بڵێین لەهـەر
شـــــــوێن و
جێگایەكدا بووین لەتانەو توانجی لۆمەكەران نەترسین).

**ئایەتی (١٧) سورەتی (الفتح)**: **قال رسول الله** (ﷺ): (إذا مرض العبد **أو سافر كتب له** مثل ما كان يعمل مقيماً صحيحاً)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر موسڵمان نەخۆش كەوت یاسەفەری كرد، **خوای گەورە وێنە ئەو كردەوانەی بۆ دەنووسێ كەلەكاتی نیشتەجێیەوە دەیكردن و لەش ساغی دا دەیكردن**).

﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ﴾هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لەشارێکدا﴿إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ﴾ مەگەر خۆشگوزەرانەکان (دەوڵەمەندەکان)ی ووتویانە ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ﴾ بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێك دیووە﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئایینی ئەوان دەڕۆین. ٢٣)﴿قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ﴾ ووتی ئەگەر چی من (ئایینی) ڕاستریشم بۆ هێنابن ﴿مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ﴾ لەوەی کە باووباپیرتان دیووە لەسەری﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ ووتیان بێگومان ئێمە بێ باوەڕین بەو(ئایینەی) بەئێوەدا نێرراوە. ٢٤)﴿فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ بۆیە تۆڵەمان لێ سەندن ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ جا سەیرکە سەرەنجامی درۆزنان چۆن بوو. ٢٥)﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ﴾ وە کاتێ ئیبراهیم بەباوکی و گەلەکەی ووت ﴿إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾ بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن. ٢٦) ﴿إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾ جگە لەو زاتەی کەدروستی کردووم ﴿فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ﴾ چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات. ٢٧)﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ﴾ ئەو (یەکتاپەرستی یە)ی لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تابگەڕێنەوە(سەری). ٢٨)﴿بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ﴾ بەڵکو بەهرەم بە ئەوانە و باوو باپیرانیاندا ﴿حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ هەتا قورئانیان بۆ هات ﴿وَرَسُولٌ مُّبِينٌ﴾ لەگەڵ پێغەمبەری ئاشکرا. ٢٩)﴿وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ جا کاتێ قورئانیان بۆ هات ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ﴾ ووتیان ئەمە جادووە ﴿وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە باوەڕی پێ ناکەین. ٣٠)﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ﴾ وە ووتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێرراوەتە خوارەوە ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ بۆ پیاوێکی گەورەی (ناودارو دارا) لەم دوو شارە(مەککە و طائف).٣١)﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگارت دابەش دەکەن ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم﴾ لەکاتێکدا ئێمە لەنێوانیاندا دابەشمان کردووە﴿مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ هۆی گوزەرانیان لەژیانی ئەم دونیایەدا ﴿وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ﴾ وە هەندێکیانمان چەند پلە بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾ تاهەندێکیان ئیش بەهەندێکی تریان بکەن ﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ وە بەزەیی پەروەردگارت (بۆ تۆ) لەوە چاکترە ئەوان کۆی دەکەنەوە. ٣٢)﴿وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵکی ببن بەئوممەتی بێ باوەڕ﴿لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾ وامان دەکرد هەر کەس بێ باوەڕ بوایە بەخوای میهرەبان ﴿لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ﴾ سەقفی خانووەکانیان لەزیوو بوایە ﴿وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ﴾ هەروەها پلەکان کەپێی دادەسەر دەکەون (بۆمان دەکردن بەزیوو). ٣٣)

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾

**ئایەتی ( ٢٩ ) سورەتی ( الفتح ):** قال رسول الله (ﷺ): (لا تباغضوا ولا تحاسدوا ولا تدابروا ولا تقاطعوا، وكونوا عباد الله إخواناً ولا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث)(متفق عليه). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئیمانداران یەکتری مەبوغزێنن و حەسوودی بە یەکتری مەبەن و پشت لەیەکتری هەڵ مەکەن و پەیوەندی نێوانتان مەبچڕن. هەمووتان بەندەی خوا وبرای یەکترین بن هیچ موسڵمانێك دروست نی یە لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە برای موسڵمانی وەرگرێت و قسەی لەگەڵ نەكات).

**ئایەتی ( ١٠ ) سورەتی ( الحجرات ):** قال رسول الله (ﷺ): (إن الشيطان قد يئس أن يعبده المصلون في جزيرة العرب ولكن في التحريش بينهم) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:-

﴿وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا﴾ وەدەرگـای زۆرمـان بـۆ خانووەکانیـان دادەنـا ﴿وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِئُونَ﴾ وە کورسی و قەنەفەی زۆر تالەسەری دانیشن وپاڵ بدەنەوە. ٣٤) ﴿وَزُخْرُفًا﴾ وە زەخرەفەی زۆر (لەئاڵتون و زیو) ﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ جا هەموو ئەوانە بەهرەو خۆشی ژیانی دونیایە ﴿وَالْآخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بەڵام (پاداشتی) ڕۆژی دوایی لای پەروەردگارت بـۆ پارێزکارانــە.٣٥) ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ﴾ وە هەرکـەس پـشت لـە یـادیی خـوا هـەڵکات ﴿نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا﴾ شـەیتانێکی بۆ ئامادە دەکـەن ﴿فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ کـە هەمیشە لەگـەڵی بـێ ولێـی جیـا نەبێتـەوە. ٣٦) ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ﴾ وە بێگومـان ئەوانـە (شەیتانەکان) لەڕێگایی ڕاست بەرگری یان دەکەن ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ واش دەزانـن بەبێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین.٣٧) ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَنَا﴾ هەتا کاتێ کە(دەمرێ و) دێتـەوە لامـان ﴿قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ﴾ دەڵـێ خۆزگـە نێـوانی مـن وتـۆ بەقـەدەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بوایە ﴿فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾ ئای چ هاوڕێ یـەکی خـراپ بوویـت. ٣٨) ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ﴾ (ئەم خۆزگە)هیچ سـوودێکتان پـێ ناگەیـەنێ چونکە ستەمتان کرد ﴿أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ بێگومان ئێوە لە سزایی سەخت دا هاوبەشـن.٣٩) ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ﴾ دەی ئایا تۆ(ئەی موحەممـەد (ﷺ)) دەتـوانی بەکـەڕ بشنەوێنی ﴿أَوْ تَهْدِي الْعُمْيَ﴾ یــان کــوێر ڕێنمــوونی بکــەیت ﴿وَمَن كَانَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ وە ئــەو کەســەی کەلەگومڕایی یەکی ئاشکرادا بێت. ٤٠) ﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ﴾ جا ئەگـەر تـۆ بمرێنین ﴿فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ﴾ ئەوە بێگومان ئێمە هەر تۆڵە لەوان دەسێنین. ٤١) ﴿أَوْ نُرِيَنَّكَ الَّذِي وَعَدْنَاهُمْ﴾ یان ئەو هەڕەشەی لێمان کردوون پیشانت دەدەین ﴿فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ﴾ چونکە بەڕاستی ئێمە بەدەسـەڵاتین بەسـەریاندا ٤٢) ﴿فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ﴾ کەواتـە دەسـت بگـرە بـەو قورئانەوەی بۆت نێرراوە ﴿إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بەراستی تۆ لەسەر ڕێبازێکی ڕاستیت. ٤٣) ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ﴾ وەبێگومان ئەم قورئانە هۆی نـاوداری یـە بـۆ خـۆت و بـۆ گەلەکەت ﴿وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾ لە داهاتووشدا پرسیارتان لێ دەکرێت. ٤٤) ﴿وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا﴾ تۆ پرسیار بکەو لەو پێغەمبەرانەی پـێش تـۆ ناردوومـانن ﴿أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَٰنِ﴾ ئایـا بێجگـە لـە خـوای میهرەبـان بڕیارمـان داوە ﴿آلِهَةً يُعْبَدُونَ﴾ پەرسـتراوانێك کـە بپەرسترێن. ٤٥) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی مووسامان بەبەڵگەکانمانـەوە نارد ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ﴾ بۆ سەر فیرعەون و دەسـت و پێوەنەکـەی ﴿فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ووتی بەڕاسـتی مـن پێغەمبـەری پـەروەردگاری جیهانیـانم. ٤٦) ﴿فَلَمَّا جَاءَهُم بِآيَاتِنَا﴾ جـا کاتـێ بەڵگەکانی ئێمەی بۆ هێنان ﴿إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ﴾ کەچی ئەوان بەبەڵگەکان پێ دەکەنین. ٤٧)

﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ﴾ کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە (لەقیامەت) ﴿كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً﴾ پەرستراوەکان دەبنە دوژمنیان ﴿وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾ وە(پەرستراوەکان) بەپەرستنەکەیان باوەڕ ناکەن. ٦) ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ﴾ کاتێکیش ئایەتە ڕوونەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە ﴿قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی بێ باوەڕبوون دەڵێن ﴿لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ﴾ بەو قورئانەی بۆیان دێ ﴿هَٰذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ ئەمە جادوویەکی ئاشکرا و دیارە . ٧) ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ یان دەڵێن (موحەممەد (ﷺ)) خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە ﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ ئەگەر خۆم هەڵم بەستبێ (خوا سزای بەتینم دەدات) ﴿فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ ئەوسا ئێوەش لەبەرانبەر خوادا بۆ من هیچتان لە دەست نایە ﴿هُوَ أَعْلَمُ﴾ خوا چاك دەزانێ ﴿بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ بەو توانجانەی دەیدەن لەقورئان ﴿كَفَىٰ بِهِ شَهِيدًا﴾ ئەو خوا بەسە کەشایەت بێت ﴿بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ لە نێوان من و ئێوەدا ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ هەر ئەوە لێبوردەی میهرەبان. ٨) ﴿قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنَ الرُّسُلِ﴾ بڵێ من یەکەم پێغەمبەر نیم (نێررابم) ﴿وَمَا أَدْرِي﴾ ناشزانم ﴿مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ﴾ چی بەسەر من و ئێوەش دەهێنرێ ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ﴾ تەنها پەیڕەوی ئەوە دەکەم سرووش دەکرێ بۆم ﴿وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ وەمن تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام و بەس. ٩) ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ پێم بڵێن ﴿إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ﴾ ئەگەر (ئەم قورئانە) لەلایەن خواوە بێ ﴿وَكَفَرْتُمْ بِهِ﴾ ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنابێ ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ وە کەسێك لە نەوەی ئیسرائیل شایەتی دابێ ﴿عَلَىٰ مِثْلِهِ﴾ لەسەر وێنەی (ئەوەی وا لە) قورئاندا ﴿فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ﴾ جا ئیمان هێنابێ کەچی ئێوە خۆتان بە گەورەزانی ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکاران ناکات. ١٠) ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی بێ باوەڕن دەڵێن ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەربارەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿لَوْ كَانَ خَيْرًا﴾ ئەگەر (ئیسلام و باوەڕ هێنان) چاك بوایە ﴿مَا سَبَقُونَا إِلَيْهِ﴾ ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن بۆ ئەو (باوەڕ هێنانە) ﴿وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ﴾ چونکە خۆیان بەو (قورئانە) ڕێنموون نەبوون ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ جا دواتر دەڵێن ﴿هَٰذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ﴾ ئەمە دەس هەڵبەستێکی کۆنە. ١١) ﴿وَمِنْ قَبْلِهِ﴾ وە لەپێش ئەم (قورئانە)دا ﴿كِتَابُ مُوسَىٰ إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾ تەوراتی مووسا پێشەوا و ڕەحمەت بوو ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ مُصَدِّقٌ﴾ ئەم قورئانەش (کتێبەکانی پێش خۆی) بەڕاست دادەنێ ﴿لِسَانًا عَرَبِيًّا﴾ کە بەزمانی عەرەبی یە ﴿لِيُنْذِرَ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ تاستەمکاران بترسێنێ ﴿وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ﴾ وە بۆ چاکەکاران مژدە بێ. ١٢) ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان ئەڵڵایە ﴿ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ پاشان بەردەوام بوون (لەسەر باوەڕەکەیان) ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئەوە نەترسیان لەسەرە نەخەفەت دەخۆن. ١٣) ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ﴾ ئەوانە بەهەشتین ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ لەپاداشتی ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد (لەدنیادا). ١٤)

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ
كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ
أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ
عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى
ذُرِّيَّتِىٓ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ
ٱلْجَنَّةِ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ
لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن
قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ
مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ
ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا۟
خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ
فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ
بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾

**- جوولەکەیەک کە لەژێر چەتری ئاسماندا بێت) جاجوولەکەکان بێ دەنگ بوون کەسیان وەڵامی پێغەمبەریان نەدایەوە پاشان** دووبارەی کردەوە لێیان، کەسیان وەڵامی پێغەمبەریان نەدایەوە پاشان سێ بارەی کردەوە لێیان هەر کەس وەڵامی **نەدایەوە جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە ئێوەم ویست نەتان کرد،** دەی سوێند بەخوا بێگومان هەر من کۆکەرەوەم کە هەموو خەڵك لەبەر پێم دا حەشر دەکرێن وە من کۆتا پێغەمبەرم، منیشم پێغەمبەری هەڵبژاردە لای خوا، باوەڕم پێ بێنن یان باوەڕم پێ نەهێنن) پاشان گەڕایەوە و منیش لەگەڵیدا بووم، خەریك بوو دەرۆشتینە دەرەوە لە کەنیسەکە پیاوێك کەلە دوامانەوە بوو بانگی کردو ووتی لەشوێنی خۆت ڕاوەستە ئەی موحەممەد ئەنجا هاتەپێشەوە-

﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ﴾ وە ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیی مان کرد ﴿بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا﴾ بە چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکی دا ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا﴾ دایکی بە ناڕەحەتی و ئازارەوە هەڵی گرتووە ﴿وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا﴾ وە بەئازار و ناڕەحەتیش بوویەتی ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾ ماوەی دووگیان بوون (ی دایك) پێ یەوە و لە شیر بڕینەوەی سی مانگە ﴿حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ﴾ تا دەگاتە تافی لاوی (پێ گەیشتوی لاشەیی و ژیری) ﴿وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً﴾ و دەگاتە چل ساڵی ﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي﴾ دەڵێ ئەی پەروەردگار ڕام بێنە ﴿أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي﴾ تا شوکرانە بژێری ئەو بەهرە و چاکەت بکەم ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ﴾ کە ڕشتوتە بەسەر من و دایك و باوکم دا ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ﴾ وە (ڕام بێنە) کردەوەی چاك بکەم کە تۆ پێ ی ڕازی بی ﴿وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي﴾ نەوەکانیشم چاك و صالح بکە ﴿إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ﴾ بێگومان بۆلای تۆ گەڕاومەتەوە ﴿وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ وە بەڕاستی من لەموسوڵمانی گەردن کەچم. ١٥) ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾ کە ئێمە کردەوە چاکەکانیان لێ وەردەگرین ﴿وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّئَاتِهِمْ﴾ وە چاوپۆشی دەکەین لە خراپەکانیان ﴿فِي أَصْحَابِ الْجَنَّةِ﴾ لە ڕیزی بەهەشتیاندان ﴿وَعْدَ الصِّدْقِ الَّذِي﴾ ئەمە ئەو بەڵێنە ڕاستەیە ﴿كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ کە بەڵێنیان پێ درابوو لەدنیادا . ١٦) ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ﴾ ئەو کەسەش کە بەباوك و دایکی بڵێت ﴿أُفٍّ لَّكُمَا﴾ ئۆف لە دەس ئێوە ﴿أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ﴾ ئایا هەڕەشەم لێ دەکەن کە (زیندوو دەکرێمەوە و لە گۆڕ) دێمە دەرەوە ﴿وَقَدْ خَلَتِ الْقُرُونُ مِن قَبْلِي﴾ لەکاتێکدا چەند چین خەڵك پێش من ڕۆشتوون (و زیندوو نەبوونەتەوە) ﴿وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ﴾ وە (دایکی و باوکی) هەردوویان هانا بۆ خوا دەبەن ﴿وَيْلَكَ آمِنْ﴾ (دەڵێن) هاوار بۆ تۆ باوەڕ بێنە ﴿إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ﴿فَيَقُولُ﴾ کەچی ئەو دەڵێ ﴿مَا هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە بەس ئەفسانەی پێشینانە و هیچی تر. ١٧) ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەو کەسانەن ﴿حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ﴾ بڕیار(ی خوا)یان بەسەر چەسپا ﴿فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم﴾ لە ڕیزی ئەو ئوممەتانەدا کە پێش ئەمان ڕابوردوون ﴿مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾ لە جنۆکەو ئادەمیی ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ بێگومان ئەوانە خۆیانن زەرەرمەند. ١٨) ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا﴾ وە بۆ هەریەك لەوانە پلە و پایە هەیە بە گوێرەی کردەوەکانیان ﴿وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ﴾ تا خوا پاداشت و سزای کردەوەکانیان بە تەواوی بداتەوە ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ وە ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێت. ١٩) ﴿وَيَوْمَ﴾ وە (بیریان بخەرەوە) ئەو ڕۆژەی ﴿يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕن بەرانبەر دۆزەخ ڕادەگیرێن ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ﴾ (پێیان دەووترێت) هەرچی خۆشیتان بوو بەسەرتان برد ﴿فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا﴾ لە ژیانی دونیاتان دا ﴿وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾ و بەهرە و لەزەتتان لێ برد ﴿فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ﴾ بۆیە ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ دەسەنرێ ﴿عَذَابَ الْهُونِ﴾ بەسزایەکی ڕیسواکەر ﴿بِمَا كُنتُمْ﴾ لەبەر ئەوەی کە ئێوە ﴿تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ بە ناهەق خۆتان بە زل دەزانی لە زەوی دا ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾ وە لەبەر ئەوەی لە فەرمانی خوا دەردەچوون. ٢٠)

۞ وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً ۖ بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ ۚ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾

– ووتی ئەی خێڵی جوولەکە من بەپیاوێکی چۆن دەناسن ، ئەوانیش ووتیان سوێند بەخوا لەناو ئێمەدا کەس نی یە لە تۆ شارەزاترو تێگەیشتوتر بێت بەکتێبی خوا، بەهەمان شێوە باوکیشت پێش تۆ وە باپیریشت پێش باوکت لەهەمووبان شارەزاتر بوون بەکتێبی خوا ، دەی من شایەتی دەدەم کەبێگومان ئەم موحەممەدە ئەو پێغەمبەرەیە کەلە تەورات دا ناوی هاتووەو دەیخوێننەوە جوولەکەکان ووتیان درۆ دەکەیت و راست نی یە، و بەرپەرچیان دایەوە و قسەی ناشرین و خراپیان پێ ووت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئێوە درۆ دەکەن هیچ قسەیەکیشتان لێ وەرناگیرێت ، چونکە کەمێک لەمەو پێش ئێوەتان ووت دەربارەی چاکی ئەو کەووتتان بەڵام کەباوەری هێناو موسڵمان بوو بەدرۆزنتان لەقەڵەم دا ، ئەو قسە –

﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ) هوودی) برای گەلی عاد باس بکە ﴿إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ﴾ کاتێ گەلەکەی ترساند لە (وولاتی) ئەحقاف ﴿وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ﴾ بێگومان پێغەمبەرانی زۆر ڕابوردوون ﴿مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ﴾ لە پێش و دوا ئەویشەوە ﴿أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ﴾ (ووتوویانە) جگە لەخوا هیچی تر نەپەرستن ﴿إِنِّي أَخَافُ﴾ بێگومان من دەترسم ﴿عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لەسزای ڕۆژێکی گەورە بۆ ئێوە (پێش بێ). ٢١) ﴿قَالُوا﴾ (گەلەکەی) ووتیان ﴿أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا﴾ ئایا تۆ (هوود) هاتوویت تا لامان بدەیت ﴿عَنْ آلِهَتِنَا﴾ لە(پەرستنی) پەرستراوەکانمان ﴿فَأْتِنَا﴾ دەی بۆمان بێنە ﴿بِمَا تَعِدُنَا﴾ ئەو (سزا)ی بەڵێنت پێ داووین ﴿إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەگەر لە ڕاست گۆیانی. ٢٢) ﴿قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ﴾ (هوود) ووتی بێگومان زانیاری (ئەو سزا) لای خوایەوە بەس ﴿وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ﴾ وەمن تەنها ئەوەی پێ ی نێردراوم پێتان ڕادەگەیەنم ﴿وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ﴾ بەڵام من دەبینم ئێوە ﴿قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ گەلێکی نەزان و نەفامن. ٢٣) ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا﴾ جا کاتێ ئەو (سزایە)یان بینی پەڵە هەورێکە ﴿مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾ بەرەو شیوەکانیان دێ (دڵخۆش بوون) ﴿قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾ ووتیان ئەمە هەورێکە بارانی پێ یە بۆمان ﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ﴾ (هوود ووتی نەخێر) بەڵکو ئەو (سزایە)یە بە پەلە داواتان دەکرد ﴿رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بایەکی بەهێزە سزای سەختی پێ یە. ٢٤) ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾ بەفەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێك دەڕوخێنێ ﴿فَأَصْبَحُوا﴾ ئیتر وایان بەسەرهات ﴿لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ﴾ تەنیا شوێنی خانووەکانیان دەبینرا ﴿كَذَٰلِكَ﴾ هەر بەو جۆرە ﴿نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ﴾ سزای هۆزی تاوانباران دەدەین. ٢٥) ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ﴾ سوێند بەخوا ئەوەی بەوان (گەلی عاد)مان دابوو (لەسامان و دەسەڵات) بە ئێوەمان نەدابوو ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً﴾ وە گوێ و چاوو دڵمان پێدابوون ﴿فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ﴾ بەڵام سوود و کەڵکی پێ نەگەیاندن ﴿سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم﴾ نە گوێ و نە چاوو نە دڵیان ﴿مِّن شَيْءٍ﴾ هیچێك ﴿إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ چونکە ئەوان باوەڕیان بەنیشانەکانی خوا نەبوو ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ وە دەوری دان ﴿مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەو سزای گاڵتەیان پێ دەکرد. ٢٦) ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا﴾ وە بێگومان لەناومان برد ﴿مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ﴾ (دانیشتووانی) ئەو شار و دێهاتانەی کە بەدەورو بەرتان دابوون ﴿وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ﴾ وە بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆرمان نیشان دان ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تا (لەبێ باوەڕی) بگەڕێنەوە. ٢٧) ﴿فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ﴾ دەی بۆچی یارمەتی نەدان ﴿الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً﴾ ئەوانەی جگە لەخوا بۆ نزیك بوونەوە لەخوا کردبوونیانە پەرستراو ﴿بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ﴾ (نەك یارمەتیان نەدان) بەڵکو گومیش بوون لێیان. ﴿وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ ئەوە بوو (بەرهەمی پەرستراوە) درۆکەیان و ئەو درۆیانەی هەڵیان دەبەستن. ٢٨)

وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾

سُورَةُ مُحَمَّدٍ

- ئایەجێیانەتان پێ ووت کەپێتان ووت بۆیە قسەی ئێوە دەربارەی ئەو وەرناگیرێ؟) جا هەرسێکمان - پێغەمبەری خوا (ﷺ) و من و عەبدوللای کوڕی سەلام - چووینە دەرەوە، بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە دەرەوە ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِ فَآمَنَ ....﴾.

**هۆی هاتنە**

خوارەوەی ئایەتی (٢٩-٣٢) سورەتی (الأحقاف): ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ .... فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ حاکیم لە عەبدوللاوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە دەڵێ: کۆمەڵێک جنۆکە دابەزین و هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ لە (بطن نخلة) دا بوو قورئانی دەخوێند، جا کە گوێیان لە قورئانەکە بوو بێ دەنگ بوون و گوێیان بیستی قورئانەکە بوون لەناو خۆیاندا ووتیان بێ دەنگ بن =

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ وە (بیریان خەرەوە) کاتێ چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆ لات ﴿يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ تا گوێ لەقورئان بگرن ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ﴾ جاکاتێ ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون ﴿قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟﴾ وتیان (بەیەکتری) بێ دەنگ بن (و گوێ بگرن) ﴿فَلَمَّا قُضِىَ﴾ جا کە (قورئان خوێندنەکە) تەواو بوو ﴿وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ هەموو گەڕانەوە بۆلای قەوم و هۆزەکەیان بەترسێنەر. ٢٩)﴿قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ﴾ وتیان ئەی هۆزو قەومەکەمان ﴿إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا﴾ بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین ﴿أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ﴾ کە لەپاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ ﴿يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق بۆ ڕێبازی ڕاست. ٣٠)﴿يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ﴾ ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوا بدەنەوە ﴿وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ﴾ و باوەڕی پێ بێنن ﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ (خوا) لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ و دەیسڕێتەوە ﴿وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ وە لەسزای سەخت دەتان پارێزێ. ٣١) ﴿وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ﴾ هەرکەسیش وەڵامی بانگخوازی خوا (کە موحەممەدە (ﷺ)) نەداتەوە ﴿فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەو بە هیچ جۆرێ ناتوانێ لە زەوی دا لە دەست خوا دەرچێ و خۆی قوتار کات ﴿وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ﴾ وە جگە لەخوا یارمەتی دەرو پشتیوانێکی نی یە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ ئائەوانە لە گومڕایی یەکی ئاشکرادان. ٣٢) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟﴾ ئایا ئەوانە نەیان زانیوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ بەڕاستی ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ﴾ وە لەدروست کردنیان دا ناتوانا و دەستە پاچە نەبووە ﴿بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بەتوانایە مردووانیش زیندوو بکاتەوە ﴿بَلَىٰٓ﴾ بەڵێ ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. ٣٣)﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ وە ڕۆژێ بێ باوەڕان بەرانبەر دۆزەخ ڕادەگیرێن ﴿أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ﴾ (پێیان دەڵێن) ئایا ئەمە ڕاست نی یە ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ دەڵێن: بەڵێ سوێند بەپەروەردگارمان ڕاستە ﴿قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ (خوا) دەفەرموێ: دەی ئەو سزایە بچەژن ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ چونکە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد. ٣٤) ﴿فَٱصْبِرْ﴾ کەواتە خۆگربە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ﴿كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ هەروەکو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆداگرت ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾ وە پەلە مەکە بۆ (سزادان)یان ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ﴾ ئەو ڕۆژەی کە (سزای) بەڵێن پێدراو یان دەبینن وا دەزانن ﴿لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ﴾ تەنها ساتێك لەڕۆژ لە دنیادا ماونەتەوە ﴿بَلَٰغٌ﴾ (ئەم قورئانە) ئاگاداری یە ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ﴾ جا ئایا کەس لەناو دەچێت ﴿إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ جگە لە سنوور دەرچووان. ٣٥)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ (١) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ (٢) ذَٰلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ (٣) فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ (٤) سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ (٥) وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ (٦) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ (٧) وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ (٨) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ (٩) ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا (١٠) ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ (١١)

- ژمارەشیان نۆ جنۆکە بوو، یەکێکیان ناوی زەویعە بوو، بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا .... فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾. -بەدواوە ئیتر بەئێگجاری نەپەرستر بێت - بەلێنەکەت بەدی مەهێنە-) ئینجا ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستی گرت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیتر بەسە زۆر پاڕایتەوە لەپەروەردگارت، جا ڕۆشتە دەرەوە لە کوخەکە و لەزرێیەندەکەیدا هەڵدەبەزییەوەو دەیفەرموو: (سیهزم الجمع ویولون الدبر. بل الساعه موعدهم والساعه أدهی وامر).

**ئایەتی (٥٣) سورەتی (القمر)**: عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: إن رسول الله (ﷺ) كان يقول: (يا عائشة، إياك ومحقرات الذنوب فإن لها من الله طالباً)(رواه أحمد وابن ماجه). عائیشە-

## سورەتی ﴿ محمد ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەو کەسانەی بێ باوەڕ بوون ﴿وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾وە بەرگری (خەڵك)یان کرد لەڕێبازی خوا ﴿أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ (خوا) کردەوەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە. ١)﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەش باوەڕیان هێناوەو ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کردەوە چاکەکانیان کردو ﴿وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾ باوەڕیشیان هێنا بەو (قورئانە)ی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) ﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ تەنها ئەویش ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە ﴿كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾ خوا لە گوناهەکانیان خۆش بووە ﴿وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾ دڵ و هۆشیانی ڕێك و چاك کردوە. ٢)﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَٰطِلَ﴾ شوێن بەتاڵ و پڕو پووچ کەوتن ﴿وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ و بێگومان ئەوانەش ئیمانیان هێنا بوو ﴿ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ شوێن ئەو هەقە کەوتبوون کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ ئابەو شێوە ﴿يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ﴾ خوا نموونەی (کردەوەی) خۆیانیان بۆ دێنێتەوە. ٣)﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەنجا ئەگەر (لە جەنگدا) گەشتن بەوانەی بێ باوەڕن ﴿فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ﴾ ئەوە بدەن لە گەردنیان و بیانکوژن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ﴾ هەتا کاتێ کوشتاری زۆریان لێ دەکەن ﴿فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ﴾ ئەنجا (دیلەکانیان) قایم ببەستنەوە ﴿فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ﴾ جا دواتر یا بەمنەت و چاکە (بەرەڵایان کەن) ﴿وَإِمَّا فِدَآءً﴾ یان بە فیدیە و بریتی ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ هەتا جەنگ چەکەکان (بە بێ باوەڕان) دادەنێ (یا تا جەنگ کۆتایی دێ بە نەمانی بت پەرستان) ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ﴾ فەرمان ئەوەیە ئەگەر خوا بیویستایە ﴿لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ﴾ خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ بەڵام (فەرمانی پێدان بە جەنگ) تا بەیەکتری تاقی تان بکاتەوە ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسانەش لە پێناو ڕێبازی خوادا کوژران ﴿فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ ئەوە خوا هەرگیز (پاداشتی) کردەوەکانیان وون ناکات. ٤)﴿سَيَهْدِيهِمْ﴾ بێگومان ڕێنموونیان دەکات و ﴿وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ﴾ دڵ و بیریان ساف و خۆش دەکات. ٥)﴿وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾ وە دەیانخاتە ئەوبەهەشتەی بۆی باس کردون. ٦)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ﴿إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ ئەگەر ئێوە یارمەتی (ئایینی) خوا بدەن ﴿يَنصُرْكُمْ﴾ خواش ئێوە زاڵ و سەرکەوتوو دەکات (بەسەر کافران دا) ﴿وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ وە پێیەکانتان جێگیر دەکات (لە جەنگدا خۆڕاگرتان دەکات). ٧)﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون ﴿فَتَعْسًا لَّهُمْ﴾ ئەوە نەگبەتی و سەرشۆڕی بەشیانە ﴿وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ وە (خوا) کردەوەکانیان بێ مایە دەکات ٨)﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾ ئەو تۆڵەیان لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە ﴿كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ڕقیان لەو قورئانە بوو کە خوا ناردوویەتی ﴿فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ بۆیە خواش کردەوەکانیانی پووچ کردەوە. ٩)﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئاخۆ ئەوانە بە زەوی دا نەگەڕاون ﴿فَيَنظُرُوا۟﴾ تا ببینن ﴿كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەوانەی پێش خۆیان سەرەنجامیان چۆن بووە ﴿دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ خوا لە ناوی بردن ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا﴾ بۆ بێ باوەڕانیش سەرئەنجامی ئاوا هەیە. ١٠)﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ﴾ چونکە بێگومان خوا ﴿مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ پشتیوانی ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە ﴿وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بێگومان کافرانیش ﴿لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ﴾ هیچ پشتیوانێکیان نی یە. ١١)

إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ ﴿١٥﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ ﴿١٨﴾ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴿١٩﴾

-(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە دەیفەرموو: (عائیشە ووریایی خۆت بەڵەو گوناهانەی بەبچووك دادەنرێن چونكە بەبێ گومان ئەوانە لای خوا خاوەنی داوای دەكات).

**ئایەتی (١٥) سورەتی (الرحمن)**: عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): (خلقت الملائكة من نور وخلق الجان من مارج من النار وخلق آدم مما وصف لكم) (رواه أحمد ومسلم). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فریشتە لە نوور و ڕووناكی دروست كراوە، جنۆكەش لە بڵێسەی ئاگر دروست كراوە، ئادەمیش لەوە دروست كراوە كە باسكراوە بۆتان).

**ئایەتی (٥٨) سورەتی (الرحمن)**: عن أبي هريرة (ﷺ) قال: قال النبي (ﷺ): (لكل امرئ منهم-

﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ بێگومان خــوا ﴿يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی باشیان کردوە دەیانخاتە باخاتی بەهەشــتەوە ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانـەش بێ باوەڕ بوون ﴿يَتَمَتَّعُونَ﴾ (لـە دنیادا) رادەبوێرن و ﴿وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ﴾ وەك ئاژەڵ دەخۆن و دەلەوەڕێن ﴿وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾ وە دۆزەخ شوێنی مانەوەیانە. ١٢)﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ﴾ وە(خەڵكی) زۆر شار بوون ﴿هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً﴾ کە بەهێزتر بوون ﴿مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ﴾ لـەو(خەڵكی) مەككەیە کە تۆیان دەرکرد ﴿أَهْلَكْنَٰهُمْ﴾ لە ناومان بردن ﴿فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾ و هیچ پشتیوانێکیان نەبوو. ١٣)﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ئا خۆ ئەو کەسەی بەڵگەی ڕوونی لە پەروەردگاریەوە بۆ هـاتبێ (کە قورئانە) ﴿كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ﴾ وەك ئەو کەس وایە کە کرداری خراپی بۆ جوان کرابێ و ڕازێنرابێتەوە ﴿وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم﴾ شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبن. ١٤)﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى﴾ شێوەی نایابی ئـەو بەهەشــتە وایـە ﴿وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ کـە بـەڵێن دراوە بـەپارێزکاران و خواناسـان ﴿فِيهَآ أَنْهَٰرٌ﴾ چەندەها ڕووباری تێدایە ﴿مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ﴾ لە ئاوی سازگاری تام و بۆن نەگۆڕاو ﴿وَأَنْهَٰرٌ﴾ وە چەندەها ڕوویـار ﴿مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ﴾ لەشیر کە تامی نەگۆڕاوە ﴿وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ﴾ وە چەندەها ڕوویار لەشەرابی نایـابی ﴿لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ بەلـەزەت و خـۆش بـۆ بنۆشانی ﴿وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى﴾ وە چەند ڕووباریشی تێدایە لـەهەنگوینی پاڵفتە ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وە لەوێ هەموو جۆرە میوەهاتێکیان بۆ ئامادەیە ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەگەڵ لێبوردن لـە پەروەردگاریانـەوە ﴿كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ﴾ (ئایا ئـەو بەهەشــتیانە) وەکـو کەسانێك وان کە لـە ئاگری دۆزەخ دابن بەهەمیشەیی ﴿وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا﴾ ئاوی کوڵاو کوڵیان دەرخوارد بدرێ ﴿فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾ کە ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە بکات. ١٥)﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) هەندێ لـەوانە گوێت لێ دەگرێ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ﴾ بەڵام کاتێ لای تۆ دەردەچن ﴿قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ دەڵێن بـەوانەی زانیاریان پـێ دراوە (لە هاوەڵان) ﴿مَاذَا قَالَ ءَانِفًا﴾ ئەوە ئێسـتە موحەممەد (ﷺ) ووتـی چـی؟ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەو کەســانەن ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ کە خــوا مۆری ناوە بەســەر دڵیانـدا ﴿وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ﴾ وە شـوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوون. ١٦)﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟﴾ ئەو کەسانەی هیدایەتیان وەرگرتووە ﴿زَادَهُمْ هُدًى﴾ (خوا) شارەزای یان زیاد دەکات و ﴿وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ﴾ تـەقوا و پارێزکاریـان پـێ دەبەخشــێ. ١٧)﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ﴾ دەی ئایا ئـەو (ناپـاك)انـە چاوەڕوانی چی دەکـەین ﴿إِلَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ جگـە لـە قیامـەت ﴿أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً﴾ کە کوت و پڕ یەخەیان بگرێت ﴿فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا﴾ دەی بێگومان هەندێ لەنیشانەکانی هاتۆتە دی ﴿فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ﴾ کاتێ (ڕۆژی دوایی) یەخەیان بگرێت ئیتر کەی بیردەکەنەوە. ١٨)﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ کەواتە دڵنیابە و بزانە بێجگە لە ئەڵلا هیچ پەرســتراوێکی ڕاست نـی یە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ﴾ وە داوای لێبوردن بکە (لـە خوا) بۆ گوناهی خۆت ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە بـۆ (گونـاهی) پیـاوان و ئافــرەتانی ئیمانــدار ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ﴾ و بێگـومان خــوا دەزانـێ ﴿مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ﴾ بە جم و جوڵتان (لە ڕۆژدا) و ئارام گرتنتان (لە شەودا). ١٩)

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ
مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ
﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ
لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ
فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ
أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم
مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ
لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ
ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ
﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ
وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ
وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ
ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾

- من أهل الجنة نوجتان، كل واحدة منهما يُرى مخ ساقها من وراء لحمها من الحسن)(رواه البخاري ومسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بۆ هەر پیاوێك -لەبەهەشتیەكان- دوو هاوسەری حۆری هەیە هەر یەكەیان مۆخی ناو ئێسقانی قاچی لەپشت گۆشتی قاچی یەوە دەبینرێت لەجوانیدا -واتە سەیری قاچی بكرێت ئێسقان و مۆخی ناوەش دەبینێت ئەوەندە ناسك و سپی و جوانە-).

ئایەتی (٧٢) سورەتی (الرحمن): عن عبد الله بن قيس (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: (إن للمؤمن في الجنة لخيمة من لؤلؤة واحدة مجوفة طولها ستون ميلاً للمؤمن فيها أهلون يطوف عليهم المؤمن فلا يرى بعضهم بعضاً)(رواه مسلم). عەبدوڵڵای كوڕی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتی یەوە-

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە دەڵـێن ﴿لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٌ﴾ بۆچـی سورەتێك (لەقورئان) نانێردرێتە خوارەوە؟ (دەربارەی جەنگ و جیهاد) ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ مُّحۡكَمَةٌ﴾ کەچی کاتێ سورەتێکی روون و دامەزراو نێرابێتە خوارەوە و ﴿وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ﴾ تیایا باسی جـەنگ کـرا بـێ ﴿رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ﴾ دەبینـی ئـەو کەسانەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ کە لەدڵیاندا نەخۆشی (دوو روویی) هەیە ﴿يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ﴾ تەماشای تۆ دەکەن ﴿نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ وەك تەماشا کردنی کەسێك کە لە ترسی مردن لە هۆشی خۆی چووبێت ﴿فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ بۆ ئەوان وا چاکتر بوو. ٢٠)﴿طَاعَةٌ وَقَوۡلٌ مَّعۡرُوفٌ﴾ فـەرمان بەردار بوونایە و قسەی جوان و چاکیان بکردایە ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ هـەر کـاتێکیش فەرمانی (جەنگ) درا (جێ بەجێ ی ناکەن) ﴿فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆ ئەگەر لەگـەڵ خـوا راستیان بکردایە ﴿لَكَانَ خَيۡرًا لَّهُمۡ﴾ ئەوە باشتر بوو بۆیان. ٢١) ﴿فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ﴾ جا ئایا ئێوە بەتـەمان (ئـەی ناپاکـان) ﴿إِن تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ ئەگـەر پـشت هەڵکـەن (لـە ئیـسلام و جیهاد) ﴿أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لـە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپابکەن ﴿وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ﴾ وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتی یە بیبـچڕێنن. ٢٢)﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئـا ئەوانـە ئـەو کەسانەن ﴿لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾ کە خوا نەفرینی لێ کردوون ﴿فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ وە کەڕی کـردوون و چـاویانی کـوێر کـردووە. ٢٣)﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئـاخۆ ئەوانـە وورد نابنەوە لە قورئان (و تێی ناگەن)؟! ﴿أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ﴾ (وا نی یـە) بـەڵکو دڵیـان قفلـی لـێ دراوە. ٢٤)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بێگومـان ئــەو کەسـانەی ﴿ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم﴾ پاشە و پاش گەڕانەوە (لـە ئایینەکەیان) ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى﴾ لە پـاش ئـەوەی هەقیان بۆ روون بوویـەوە ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ﴾ شــەیتان خراپــەکانیانی بـۆ جـوان و ڕازاوە کـردبوون ﴿وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ وە بەهیوا و ئومێد فریـوی دابـوون. ٢٥)﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ﴾ چونکە ئەوان دەیان ووت ﴿لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ﴾ بەو کەسـانەی کـەرقیان بـوو لـەو قورئانـەی خـوا نـارد بـووی ﴿سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِ﴾ ئێمـە لـە مـەولا لـەهەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ﴾ وە خوا بە نهێنی یەکانیان دەزانێ. ٢٦)﴿فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئاخۆ چۆن بـێ (حـاڵی ئـەو ناپاکانـە) کاتـێ فریشتەکان گیانیان دەکێشن و ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾ لـە ڕوخسـار و پاشـیان دەدەن. ٢٧)﴿ذَٰلِكَ﴾ ئـەو (جـۆرە گیـان کێشانە) ﴿بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ﴾ لەبـەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانـە شـوێن شـتانێ کـەوتبوون کـە خـوای تـوڕە کـرد بـوو ﴿وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ ڕەزامەنـدی خواشـیان پـێ نـاخۆش بـوو ﴿فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ بۆیـە خــواش کردەوەکانیــانی پووچــەڵ کــردەوە. ٢٨)﴿أَمۡ حَسِبَ﴾ ئایــا وا دەزانــن ﴿ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوانەی کە نەخۆشی (ناپاکی) لە دڵیان دایـە ﴿أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ﴾ کـە خوا هـەرگیز ڕق و کینەیان دەرناخات و ئاشکرای ناکات. ٢٩)

وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾

**- لەپێغەمبەرەوە (ﷺ)فەرموویەتی: (بێگومان لەبەهەشتدا ئیماندار خێوەتێکی هەیە کەیەك پارچە مرواری ناوبۆشە، درێژییەکەی شەست میلە ، لەو خێوەتەدا ئیماندار چەندین حۆری و هاوسەری هەیە کەئەو ئیماندارە بەسەریاندا دەگەڕێت - ئەوەندە لەیەکتر دوورن- یەکتری نابینن).**

**ئایەتی (٢١) سورەتی (الواقعة)**: قال رسول الله (ﷺ): (إن طير الجنة كأمثال البخت يرعى في شجر الجنة) فقال أبو بكر: يا رسول الله، إن هذه لطير ناعمة فقال:(أكلتها أنعم منها -قالها ثلاثاً- وإني لأرجو أن تكون ممن يأكل منها)(رواه أحمد). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان باڵندەی بەهەشت وەك حوشتری بوخت وایە - جۆرێکە لەحوشتر ملی زۆر درێژە- لەدرەختی بەهەشت دەخۆن) ئەبو بەکریش ووتی: بەڕاستی-

﴿وَلَوْ نَشَآءُ﴾ ئەگـەر بمانویـستایە ﴿لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ﴾ ئەوانـەمان نیـشان دەدایـت (کـە دووڕوون)﴿فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ﴾ ئەوسا هەر بەشێوە و دیمەنیاندا دەتناسین ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ﴾ وە بێگومان بە شێوازی قسەشیاندا دەیانناسییت ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ وە دڵنیابن خوا بە هەموو کردەوەکانتـان دەزانـێ. ٣٠)﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ﴾ سوێند بەخوا تـاقی تـان دەکەینـەوە ﴿حَتَّىٰ نَعْلَمَ﴾ تـا دەری بخـەین و دیـاری ﴿ٱلْمُجَـٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ موجاهیدان و خۆڕاگرانتان ﴿وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ﴾ وە تا هەواڵتان چی یە ئاشکرای کەین . ٣١)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بێگومـان کەسـانێ کـە بـێ بـاوەڕبوون ﴿وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە بـەرگری (خـەڵک) یـان دەکـرد لـە ڕێـبازی خـوا ﴿وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ﴾ دژایـەتی پێغەمبەریشیان دەکرد ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ﴾ پاش ئەوەی هـەق و ڕاستیان بۆ ڕوون بۆتەوە ﴿لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ هیچ زیانێك بەخوا ناگەیـەنن ﴿وَسَيُحْبِطُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ وە بە زوویی (خوا پیلانـەکانیان) کردەوەکانیـان پووچـەڵ دەکاتـەوە. ٣٢)﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ﴾ فـەرمان بـەرداری خـواو پێغەمبـەربن ﴿وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ وە کـردەوە (چـاکە)کانتـان هەڵمەوەشێننەوە. ٣٣)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون ﴿وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە بەرگری (خەڵک)یان دەکرد لە ڕێبازی خوا ﴿ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ﴾ پاشان بەبێ باوەڕی مردن ﴿فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ ئەوە قەت خوا لێیان خۆش نابێت. ٣٤)﴿فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ﴾ جا (بـاوەڕداران) لاوازو سـست مـەبن و داوای ئاشـتی (و شـەڕ وەسـتان) مەکـەن ﴿وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ﴾ چـونکە هـەر ئێـوە زاڵ و بـەهێزترن ﴿وَٱللَّهُ مَعَكُمْ﴾ (یارمەتی) خواش لەگەڵ ئێوەدایە ﴿وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ وە (پاداشتی) کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە. ٣٥)﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ بێگومان ژیانی دنیا تەنها ﴿لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ کاڵتە و گەپێکە ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟﴾ خـۆ ئەگـەر بـاوەڕ بێـنن و پارێزکـاربن ﴿يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ﴾ (خوا) پاداشتی خۆتان پێ دەدات ﴿وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾ وە داوای بەخشینی هـەموو داراییی و ماڵتان لێ ناکات. ٣٦)﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا﴾ ئەگەر (خوا) داوای بەخشینی هەموو سامانتان لێ بکات﴿فَيُحْفِكُمْ﴾زۆریش داکۆکی بکات لێتان ﴿تَبْخَلُوا۟﴾ ئێوە چرووکی و ڕەزیلی دەکەن ﴿وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ﴾ و ڕق و کینەی دەروونتان دەردەخـات. ٣٧)﴿هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ﴾ بێداربن ئێوە ئەو کەسـانەن ﴿تُدْعَوْنَ﴾ کـە بـانگ دەکرێن ﴿لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تا لـە پێنـاوی خـوا مـاڵ بـەخت کـەن ﴿فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ﴾ کەچی هەندێکتان ڕژدەی دەکەن ﴿وَمَن يَبْخَلْ﴾ هەر کەسیش ڕژدەیی و ڕەزیلی بکـات ﴿فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ ئەوە بێگومان تەنها ڕژدەیی لـە (دژی) خـۆی دەکـات ﴿وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ﴾ چونکە خوا (دەوڵەمەندە) بێ نیازە ﴿وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ﴾ هـەر ئێـوەن هـەژار و بـێ نـەوا ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟﴾ جـا ئەگـەر ئێـوە پـشت هەڵکـەن ﴿يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ ئێـوە دەگـۆڕێ بەکەسانێکی تر(ی زۆر چاک) ﴿ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَـٰلَكُم﴾ پاشان وەکو ئێوە نابن. ٣٨)




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ الَّذِىٓ أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ الْمُنَٰفِقِينَ وَالْمُنَٰفِقَٰتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَٰتِ الظَّآنِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی (الفتح):** بوخاری لە حەبیبی کوڕی ثابتەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: هاتم بۆ لای ئەبو وائیل پرسیاری لێ بکەم، ئەویش وتی: ئێمە لە (صفین) بووین پیاوێک هەستاو وتی: ئایا سەرنجی ئەوانەت داوە کە بانگەواز دەکەن بۆ لای قورئانەکەی خوای گەورە، ئیمامی عەلیش پێی وت: بەڵێ، ئەمجا سەهلی کوڕی حونەیف وتی گومانی باش بە خۆتان مەبەن، سوێند بەخوا ئێمە خۆمانمان دی لە ڕۆژی پەیمانی حودەیبیە دا، ئەگەر جەنگمان بویستایە دەمان کرد، لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەططاب هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئایا ئێمە لەسەر هەق نین و ئەوانیش لەسەر ناهەق نین، ئایا کوژراوەکانی ئێمە ناچێتە بەهەشت و کوژراوەکان ئەوان ناچێتە دۆزەخەوە، فەرمووی: (بەڵێ وایە) عومەر وتی: ئیتر بۆچی ئێمە سەرشۆڕی و

## سورەتی ﴿ الفتح ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت (کەڕێکەوتنی حودەیبیەیە). ١) ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ﴾ تا خوا خۆش ببێت ﴿مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ لە گوناهەکانی رابوردوو داهاتووت ﴿وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ﴾ وە نیعمەتی خۆی بەتەواوی بڕژێت بەسەرت دا ﴿وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ وەرێگای راستت نیشان بدات (بەردەوامت کات). ٢) ﴿وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ﴾ وەخوا سەرت بخات ﴿نَصْرًا عَزِيزًا﴾ بەسەرکەوتنێکی بالادەستانە. ٣) ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ﴾ ئەو خوا زاتێکە ﴿أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ﴾ ئارامی دابەزاندۆتە ﴿فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ناو دڵی ئیمانداران ﴿لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا﴾ تا ئیمانیان زیاد بکات ﴿مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ﴾ تەنها هی خوایە سەربازانی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ وە هەمیشە خوا زانای کاردروستە. ٤) ﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ تا پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار بباتە ﴿جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بەهەشتانێك کە روبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە ﴿وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾ وەتا لەگوناهەکانیان خۆش ببێت ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ﴾ وە ئەم (بەڵێنە) لای خوا ﴿فَوْزًا عَظِيمًا﴾ سەرکەوتنێکی گەورەیە. ٥) ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ﴾ و تا سزای بدات پیاوان و ئافرەتانی ناپاك و ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾ پیاوان و ئافرەتانی هاوبەش پەیداکەری ﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ﴾ گومان بەرانی خراپ دەربارەی خوا ﴿عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ﴾ ئەوخراپە (لەناو چوونەی چاوەڕوانی دەکەن بۆ ئیمانداران) هەر بەسەر خۆیاندا دێت ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ وەخوا خەشمی لێ گرتوون و ﴿وَلَعَنَهُمْ﴾ نەفرینی لێ کردوون و ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ﴾ دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون ﴿وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ ئای چ سەرئەنجامێکی خراپە. ٦) ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ﴾ تەنها هی خوایە سەربازانی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ وەخوا هەمیشە بالادەستی **کاربەجێ** یە. ٧) ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ﴾ **بەراستی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) تۆمان ناردووە** ﴿شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ **بەشایەت و مژدەدەر و ترسێنەر.** ٨) ﴿لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ **بۆ ئەوەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن** ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾ وە پشتیوانی لێ بکەن و ڕێزی لێ بگرن ﴿وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ وە تەسبیحاتی خوا بکەن بە بەیانیان و ئێواران دا. ٩)

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ
فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ
ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ
مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا يَقُولُونَ
بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ
أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ
وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ
أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ
مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟
كَلَٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ
فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾

- زەلیلی بنوێنین دەرهەق بە ئایینەکەمان و بگەڕێینەوە کە هێشتا خوای گەورە بڕیاری نەداوە لە نێوانمان دا. پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ئەی کوڕی خەططاب دڵنیابە من پێغەمبەری خوام و هەرگیز پشت گوێم ناخات، ئەوجا عومەری کوڕی خەططاب گەڕایەوە لە ڕقا خۆی دەخواردەوە، خۆی پێ نەگیرا هەتا چوو بۆ لای ئەبوبەکر و **ووتی بەوی ئەبوبەکر: ئایا** ئێمە لەسەر هەق نین و ئەوان لەسەر ناهەق نین؟ ئەبوبەکر ووتی: ئەی کوڕی خەططاب ئەو پێغەمبەری خوایە و هەرگیز خوای گەورە لە بیری ناکات و دەست بەرداری نابێت بەو هۆیەوە سوڕەتی (الفتح) هاتەخوارەوە. موسلیمیش گێڕاویەتیەوە لەگەڵ ئەم زیادەیەدا کە دەڵێ: کاتێک سوڕتی فەتح هاتەخوارەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بە شوێن عومەردا و سوڕەتەکەی بۆ خوێندەوە؛-

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ﴾ بەڕاستی ئەوکەسانەی پەیمان دەدە بەتۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ))
﴿إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ﴾ بێگومان ئەوانە پەیمان بەخوا دەدەن ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ دەستی خوا
لەسەر دەستی ئەوانەوەیە ﴿فَمَن نَّكَثَ﴾ جا هەرکەس پەیمانەکەی شکاند ﴿فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ
نَفْسِهِ﴾ ئەوە بێگومان ئەو پەیمان شکاندنە تەنها (زیانی) بۆ خۆیەتی ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ﴾ هەر
کەسیش وەفا بکات ﴿بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ﴾ بەو پەیمانەی کەداویەتی بەخوا ﴿فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا
عَظِيمًا﴾ ئەوە بەڕاستی خوا پاداشتی گەورەیی دەداتێ. ١٠) ﴿سَيَقُولُ لَكَ﴾ بێگومان پێت
دەڵێن ﴿الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ﴾ ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی کەلە غەزا جێ مابوون
﴿شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا﴾ سامان و خاوخێزانمان مەشغولیان کردین (نەیان هێشت بێین بۆ غەزا)
﴿فَاسْتَغْفِرْ لَنَا﴾ لەبەر ئەوە داوا لێبوردنمان بۆ بکە ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا﴾ ئەوەی بەزمانیان
دەیڵێن ﴿لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ لەدڵیاندا نی یە ﴿قُلْ فَمَن﴾ بڵێ جا کێ ﴿يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾
لەبەرانبەر خوادا هیچی بەدەستە بۆتان ﴿إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا﴾ ئەگەر خوا زیانێکی بۆتان بوێ
﴿أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا﴾ یان سوودو قازانجێکی بۆتان بوێ ﴿بَلْ كَانَ اللَّهُ﴾ (وانی یەکەدەیڵێن) بەڵکو
خوا ﴿بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ ئاگادارە بەهەرچی کەدەیکەن. ١١) ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن﴾ بەڵکو وا گومانتان
دەبرد کە ﴿لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ پێغەمبەر و ئیمانداران ناگەڕێنەوە ﴿إِلَىٰ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾ بۆ
ناو کەس و کاری خۆیان بەئێجگاری (و شەهید دەبن) ﴿وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ ئەو گومانە
لەدڵتاندا رازێنرابوویەوە ﴿وَظَنَنتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ﴾ وە گومانی خراپتان دەبرد ﴿وَكُنتُمْ قَوْمًا بُورًا﴾
و بەڕاستی ئێوە کەلێکن لەناو دەچن. ١٢) ﴿وَمَن لَّمْ يُؤْمِن﴾ و هەر کەس باوەڕی نەهێنا بێ
﴿بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﴿فَإِنَّا أَعْتَدْنَا﴾ ئەوە بەڕاستی ئێمە ئامادەمان
کردووە ﴿لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا﴾ بۆ ئەو بێ باوەڕانە ئاگرێکی هەڵگیرساو. ١٣) ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەوی تەنها مولکی خوایە ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ﴾ لەهەر کەس کەبیەوێ
خۆش دەبێت ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ﴾ سزای هەرکەسیش دەدات کەبیەوێ (لەتاوانباران)
﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وەخوا لێبوردەی میهرەبانە. ١٤) ﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ﴾ بێگومان
بەجێ ماوان لەغەزا دەڵێن ﴿إِذَا انطَلَقْتُمْ﴾ هەرکاتێ (لەمەدینە) دەرچوون ﴿إِلَىٰ مَغَانِمَ
لِتَأْخُذُوهَا﴾ بۆ گرتنی دەسکەوتەکان (غەنیمەت) ﴿ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ﴾ لێمان گەڕێن باشوێنتان
کەوین ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ﴾ دەیانەوێ ووتەی خوا (کە دەسکەوتەکانی خەیبەر بۆ
بەشدارانی حودەیبیەیە) بگۆڕن ﴿قُل لَّن تَتَّبِعُونَا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ هەرگیز نابێ
شوێنمان کەون ﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ﴾ چونکە پێشتر خوا ئەم بڕیارەتان هەروای
فەرمووە ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ ئنجا دواتر دەڵێن ﴿بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ (وا نی یە) بەڵکو حەسوودی بە
ئێمە دەبەن ﴿بَلْ كَانُوا﴾ (وا نی یە) بەڵکو ئەوان ﴿لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ زۆر کەم تێدەگەن. ١٥)

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾

- عومەریش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەو صولحە سەرکەوتن و فەتحە؟ فەرمووی (بەڵێ) ئیتر عومەر دڵی ئیسراحەتی کرد و ئاسایی بوویەوە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥) سورەتی (الفتح): ﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ....﴾ ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە حودەیبیە گەڕایەوە بۆ مەدینە و هاوەڵانیش خەفەت بار و بێ تاقەت بوون لەوەی کە ڕێگەیان پێ نەدرا بڕۆنە مەککە و بچنە ناو ماڵ و منداڵیان ، هەر لە حودەیبیەشدا قوربانیەکانیان سەربڕی ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ هەتاکو ﴿صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئێستا دوو ئایەتم بۆ هاتووە کەپێم خۆشترە لەدونیا و ئەوەی تێیدایە) ئەنەس ووتی کەپێغەمبەری خوا دوو-

﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەت زانیوە﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ کە خوا دەزانێ چی لەئاسمانەکان ﴿وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە چی لەزەویی دایە. ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ﴾ چپەی هیچ سێ کەسێك نی یە ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾ کە خوا چوارەمیان نەبێ ﴿وَلَا خَمْسَةٍ﴾ وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نی یە ﴿إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ کە ئەو شەشەمیان نەبێت ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ﴾ وە نەکەمتر لەو ژمارە نە زۆرتر نی یە ﴿إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾ مەگەر خوایان لەگەڵدایە(بە زانیاریو ئاگاداری) ﴿أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ لەهەر جێگایەکدا بن ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ پاشان لەڕۆژی دوایی دا ئاگاداریان دەکاتەوە بەوەی کە کردوویانە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك ئاگادار و زانایە. ٧)﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا سەرنجت نەداوە ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ بە لای ئەوانەی کە قەدەغە کران لە چپە ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ﴾ پاشان دەگەڕێنەوە ﴿لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ﴾ بۆ ئەوەی لێیان قەدەغە کرا بوو ﴿وَيَتَنَٰجَوْنَ﴾ وە لەگەڵ یەکتریدا بە چپە ئەدوێن ﴿بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ دەربارەی گوناهو دەست درێژی و ﴿وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ بێ فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ﴾ وە کاتێ بێن بۆ لات سەلامت لێ دەکەن ﴿بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾ بە شێوەیەك کە خوا بەو جۆرە سەلامی لێ نەکردوویت ﴿وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ وە لەدڵی خۆیاندا دەڵێن: (ئەگەر پێغەمبەرە) ﴿لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ بۆچی خوا سزامان نادات بە هۆی ئەو قسانەی کە پێ ی دەڵێن ﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ دۆزەخیان بەسە کە دەچنە ناویەوە کە جێگایەکی زۆر خراپە ٨)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ﴾ کە چپە تان کرد ﴿فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ بە چپە باسی گوناهو دەست درێژی ﴿وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ و سەرپێچی پێغەمبەر مەکەن ﴿وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾ وە باسی چاکە و پارێزکاری و لەخواترسان بکەن ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ﴾ وە خۆتان بپارێزن لە (سزای) ئەو خوایەی ﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ کە هەر لای ئەو کۆدەکرێنەوە ٩)﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ بێگومان چپە لە شەیتانەوەیە و بەس ﴿لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ تا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دڵتەنگ بکات ﴿وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا﴾ لەکاتێکدا کە هەرچی زیانیان پێ ناگەیەنێت ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە فەرمانی خوا ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ ئیماندارانیش بە تەنها پشت بەخوا ببەستن. ١٠)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمْ﴾ کاتێك پێیان ووترا. ﴿تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ﴾ لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا جێگە بکەنەوە (فراوانی بکەن) ﴿فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئێوەش فراوانی بکەن خواش گوشادی بە ئێوە دەدات ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟﴾ وە کاتێك پێتان ووترا هەستن ، ئێوەش هەستن ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ﴾ خواش پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لەئێوە کە بڕوایان هێناوە ﴿وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾ وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك (پلەیان بەرز دەکاتەوە) ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن. ١١)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا۟ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾

**هـۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٨) سورەتی (المجادلة):** **﴿فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ...﴾** ئیمام **ئەحمەد** گێڕاویەتیەوە لەعەبدوڵلای **کوڕی** عەبباسەوە **(ڕەزای** خوایان **لێ بێ)** ووتی: **پێغەمبەر** (ﷺ) و چەند موسڵمانێکی هاوەڵی لە سێبەری ماڵێك لە ماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوون کە سێبەرەکە هەر ئەوەندە بوو تیایا جێیان بوو بوویەوە ، فەرمووی: (تۆزێکی تر کەسێك دێتە ناوتان چاوەکانی کە پێیان دەبینێ دەڵێی چاوی شەیتانە ، جا کە هات کەستان قسەی لەگەڵدا نەکەن) پاشان پیاوێکی چاوشین هات ، پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کرد و قسەی لەگەڵدا کرد فەرمووی: (لەبەرچی تۆو فلان کەس و فلان کەس (چەند کەسێکی ناو) هێنا جنێوم پێ دەدەن) ئەو پیاوەش ڕۆشت و ئەو کەسانەی بانگ کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی هێنان– جا دەستیان کرد بە سوێند خواردن –

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ﴾ هەر کاتێ (ویستان) قسەی پەنهانی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بکەن ﴿فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ﴾ ئەوە پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ﴾ ئەمە بۆ خۆتان چاکتر و پاکترە ﴿فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ﴾ ئینجا ئەگەر هیچتان نەبوو ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا لێخۆش بوو میهرەبانە. ١٢)﴿ءَأَشۡفَقۡتُمۡ﴾ ئایا دەترسان (لە هەژاری) ﴿أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ﴾ پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ﴿فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ ئینجا ئەگەر خێرەکەتان نەکرد ﴿وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ﴾ و خواش تەوبەی لێ گیرا کردن ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوسا نوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ﴾ وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن. ١٣)﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا بۆ سەرنجێك نادەی بەلای ئەوانەی ﴿تَوَلَّوۡاْ﴾ کە دۆستایەتی ئەکەن ﴿قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾ لەگەڵ هۆزێك(ی جوولەکە) کەخوا غەزەبی لێگرتوون ﴿مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ﴾ ئەوان نە لەئێوەن و نەلە ئەوانن ﴿وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ﴾ وە سوێند دەخۆن بەدرۆ ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا خۆیان دەزانن (درۆ دەکەن). ١٤) ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدًاۖ﴾ خوا سزای دژواری بۆ ئامادە کردوون ﴿إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی ناپەسەند بوو. ١٥)﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ﴾ سوێندەکانیان کردبووە قەڵغان و ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەرگری (خەڵك)یان کرد لەڕێبازی خوا ﴿فَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ئینجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر. ١٦)﴿لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ﴾ ماڵ و منداڵیان هیچ سوودێکی نی یە بۆیان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تیادەمێننەوە بەهەمیشەیی. ١٧)﴿يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا﴾ لەڕۆژێکدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە ﴿فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ﴾ ئەوسا سوێندی بۆ دەخۆن ﴿كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ﴾ هەر چۆنێ سوێندیان دەخوارد بۆ ئێوە (لە دنیاندا)﴿وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ﴾ وە وادەزانن شتێکیان بە دەستەوەیە ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ﴾ با بزانن بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزن. ١٨)﴿ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە (بەجۆرێك) ﴿فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾ کە یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ ئەوانە کۆمەڵەو حیزبی شەیتانن ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ با بزانن کە بەڕاستی هەر حیزبی شەیتان زەرەرمەندە. ١٩)﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ﴾ ئەوانە لە ڕیسوا ترینی خەڵکن. ٢٠)﴿كَتَبَ ٱللَّهُ﴾ خوا نووسیویەتی ﴿لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ﴾ کە بێگومان من و پێغەمبەرانم سەردەکەوین ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾ بەڕاستی خوا توانای باڵادەستە. ٢١)

لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾

- و پاکانه کردن بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)ئیتر خوای گه‌وره‌ش ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند ﴿فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَ...﴾.

هۆی هاتنه خواره‌وه‌ی ئایه‌تی (١،٢) سوره‌تی (الحشر): ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ .... يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ حاکیم و به‌یهه‌قی گێڕاویانه‌ته‌وه له عائیشه‌وه (ڕه‌زای خوای لێ بێ) ده‌ڵێ: غه‌زای به‌نو نه‌ضیر که هۆزێك بوون له جووله‌که پاش غه‌زای به‌در بوویه شه‌ش مانگ ، شوێن و خانوو باخه خورماکانیان له په‌ناو و نزیك مه‌دینه‌دا بوو پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)گه‌ماڕۆی دان تا وایان لێ هات ڕازی بوون شوێنه‌که‌یان چۆڵ بکه‌ن و بڕۆن به مه‌رجێ هه‌ر شتێك به باری وشتر هه‌ڵبگیرێت ببه‌ن له شت و مه‌ك جگه له چه‌ك و سیلاح به‌و هۆیه‌وه خوای گه‌وره‌ش ئه‌م ئایه‌تانه‌ی دابه‌زاند ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ تا ده‌گاته ﴿لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا...﴾ .

﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ﴾ کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت ﴿بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿يُوَادُّونَ﴾ کە دۆستایەتی بکەن ﴿مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوا دەکەن ﴿وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ﴾ هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن ﴿أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ یا کوڕ و براو خزمیان بن ﴿أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ﴾ ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە ﴿وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ﴾ بەهێزی کردوون‌و سەری خستون بە قورئان‌و ئیمان لەلایەن خۆیەوە ﴿وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ﴾ وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ خوا لێ یان ڕازی بووە ﴿وَرَضُوا عَنْهُ﴾ ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون ﴿أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ﴾ ئەوانە حیزبوڵلان ﴿أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئاگادار بن کە تەنها حیزبوڵلا ڕزگار و سەرفرازن. ٢٢)

## سورەتی ﴿ الحشر ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بە پاکی یادی خوا دەکات ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە تەنها ئەو زاڵی کاربەجێیە. ١) ﴿هُوَ الَّذِي﴾ خوا زاتێکە ﴿أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ بێ باوەڕانی خاوەن کتێبی دەرکرد ﴿مِنْ دِيَارِهِمْ﴾ لە ماڵ و شوێنی خۆیان ﴿لِأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾ بۆ یەکەم کۆبوونەوە ﴿مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا﴾ بە تەمانەبوون (ئەی موسوڵمانینە) کە (لە قەڵاکانیان) دەربچن ﴿وَظَنُّوا أَنَّهُمْ﴾ خۆشیان وایان دەزانی ﴿مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ﴾ کە قەڵاکانیان دەیانپارێزێ لە (سزای) خوا ﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ﴾ بۆیە (سزای) خوایان بۆ هات ﴿مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا﴾ لە شوێنێکەوە کە گومانیان بۆی نەدەچوو ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ﴾ وە خوا ترسێکی خستە ناو دڵیانەوە ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ﴾ کە خانوەکانی خۆیانیان وێران دەکرد ﴿بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ بە دەستی خۆیان و بە دەستی ئیمانداران ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ ئینجا پەند وەرگرن ئەی خاوەنانی بیرو هۆش. ٢) ﴿وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ﴾ ئەگەر خوا دەربەدەری لەسەر بڕیار نەدانایە ﴿لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا﴾ بێگومان لە دنیادا سزای دەدان ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی دواییشدا بۆ ئەوان هەیە ﴿عَذَابُ النَّارِ﴾ سزای ئاگری دۆزەخ. ٣)

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

**هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتی (٥) سورەتی (الحشر): ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ....﴾** بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (هەندێ لە) دارخورماى جوولەکەکانی بەنو نەضیر سوتاند و بڕی لەو شوێنەدا کە ناوی بووەیرە بوو جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ ....﴾.

**هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایـەتی (٩) سورەتی (الحشر): ﴿يُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ ...﴾** بوخاری دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش کەسێکی نارد بۆ لای خێزانەکانی –تا بزانێ هیچیان هەیە لەماڵەوە– خێزانەکانیشی ووتیان: –

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾ ئـەم سـزایە بـە هـۆی ئـەوەوە بـوو ﴿شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ دژایـەتی خـوا و پێغـەمبەریان کرد ﴿وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ﴾ وە هـەر کەسـێك دژایـەتی خـوا بکـات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ ئەوە بەڕاسـتی خوا تۆڵە سێنی بەتینە. ٤)﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾ ئەوی بڕیتان لـە دارخورما ﴿أَوْ تَرَكْتُمُوهَا﴾ یا لێی گەڕان ﴿قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا﴾ بە وێستاوی لەسەر بنەکانیـان ﴿فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئـەوە بـە فـەرمانی خـوا بـووە ﴿وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ وە بـۆ سـەر شـۆڕکردنی لەسنوور دەرچووان بوو. ٥) ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەو (دەستکەوتانە) کـەخوا سـەندیەوە (بـێ جەنگ کردن) ﴿عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ﴾ بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەضیر) ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و حوشترێکیان تاو نەداوە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ﴾ بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکـات ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ بەسـەر هەرکـەس دا کەبیەوێت﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە دەسـەڵاتە. ٦)﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست (بەبێ جەنگ) ﴿مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ﴾ لە (سەروەت و سامانی) دێهاتی یەکان ﴿فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) ﴿وَلِذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ وە بۆ خزمان و هەتیوان ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە بـۆ هـەژاران و ڕێبوارانی کەم دەست ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ﴾ تا دەست بە دەستی پێ نـەکرێ (ئەوسامانە) ﴿بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾ لەناو دەوڵەمەندەکانتاندا و بەس ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ وە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی دان وەریبگرن ﴿وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾ وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە لە خوا بترسـن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ بێگومـان خوای گەورە سزای سەختە. ٧) ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ﴾ (ئەو دەسکەوتەی لە بەنی نضیر گیرا) بۆ نەدارانی کۆچکەرانە ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ﴾ ئەوانەی کە دەرکران ﴿مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ﴾ لەماڵ و سـامانیان ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾ هـەوڵی بـەهرەی خـوا و ڕەزامەنـدی ئـەو دەدەن ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ وە یارمەتی (ئایینی) خوا و پێغـەمـبەری خـوا دەدەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ هەر ئەوانن ڕاستگۆیان. ٨)﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە بـۆ ئـەو هەژارانـەی کـە لەپێش کۆچکەراندا نیشـتەجێ بوون لە مـەدینە و کـردیان بـە بارەگای باوەڕ ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾ ئەوی کۆچ بکات بۆ لایان خۆشـیان دەوێ ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ﴾ وە شـك نابـەن لە دڵی خۆیانـدا ﴿حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ﴾ هیچ جۆرە حەسـوودی و بەخیلیـەك لەبـەر ئـەوەی بـە کۆچکەران درا ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ وە باوی ئەوان ئـەدەن بەسـەر خۆیانـدا ﴿وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ با خۆشیان زۆر پێویست بن پێ ی ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ﴾ وە ئەو کەسەی خۆی لە ڕژدی دەروونی بپارێزێت﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (بەڕاستی) هەر ئەوانن سەرفەرازان. ٩)

وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا
وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا
غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ
أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ
﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ
وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾
لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ
لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى
مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ
جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴿١٤﴾
كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ
قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾

**- هیچمان نیە جگە لەئاو ، جا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (کێ میوانداری ئەم پیاوە دەکات؟) پیاوێکی ئەنصاری ووتی: من ، ئینجا بردیەوە بۆماڵەوەو بە خێزانی ووت ، ڕێزی بگرە چونکە میوانی پێغەمبەرە(ﷺ) خێزانەکەی ووتی: جگە لەخواردنی منداڵەکانمان هیچمان نیە، مێردەکەی ووتی: خواردنەکە بێنە و چراکەش داگیرسێنە و منداڵەکان** بخەوێنە ئەگەر داوای خواردنیان کرد، ئەویش خواردنەکەی هێنا و چراکەی **داگیرساند** و منداڵەکانیشی خەواند ، ئینجا دەستی دا لەچراکە بە ناوی چاککردنەوە کوژاندیەوە –لەو **تاریکی یەدا**– ژن و پیاوەکە وایان نیشانی میوانەکە دەدا ئەوانیش لەخواردنەکە دەخۆن، **بەڵام** هیچیان نەخوارد بەسکی برسی مانەوە، جا کەڕۆژ بوویەوە پیاوە ئەنصاریەکە ڕۆشت –

﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ﴾ ئەوانەش لەپاش ئەمانەوە هاتوون ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان خۆش ببە لەئێمە ﴿وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ﴾وە لەو برایانەشمان (خۆشببە) ﴿سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ کە پێشمان کەوتوون لەئیمان هێناندا ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ وە هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرتۆی دڵسۆزی میهرەبانی ١٠)﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا سەرنجێکت نەداوە﴿إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا﴾ بەلای ئەوانەی کە دووڕوو بوون ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ﴾ ئەڵێن بەو برادەرانەیان ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ کە بێ باوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان ﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ﴾ ئەگەر دەریکرێن ﴿لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ﴾ ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین ﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾ وە هەرگیز فەرمانبەریی کەس ناکەین لەدژی ئێوە ﴿وَإِنْ قُوتِلْتُمْ﴾ وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵ دا بکرێ ﴿لَنَنْصُرَنَّكُمْ﴾ بێگومان ئێمە یارمەتی ئێوە ئەدەین ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بێگومان خوا شایەتی ئەدات کە ئەوان درۆزنن. ١١)﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا﴾ ئەگەر دەر بکرێن ﴿لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ﴾ ئەوان لەگەڵیاندا دەرناچن ﴿وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ﴾ وە ئەگەر جەنگیان لە دژ کرا یارمەتیان نادەن ﴿وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ﴾ وە ئەگەر یارمەتیان بدەن ﴿لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ﴾ بێگومان (ئەشکێن و) پشت هەڵئەکەن ﴿ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ﴾ پاشان سەرناخرێن. ١٢)﴿لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ﴾ بەڕاستی (ئەی باوەڕداران) ئێوە ترستان زیاترە لەدڵی ئەواندا تاخوا ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾ ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بێگومان ئەوانە ﴿قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ﴾ کەسانێکن تێ ناگەن. ١٣)﴿لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا﴾ (جوولەکە) جەنگتان لەگەڵ ناکەن هەموو پێکەوە ﴿إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ﴾ مەگەر لەناو دێهاتی قایم کراودا ﴿أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ﴾ یا لەپشتی دیوارەوە ﴿بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ﴾ دژایەتی نێوانیان زۆر سەختە ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا﴾ تۆ وا دەزانی کە ئەوان کۆو پێکەوەن ﴿وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى﴾ لەکاتێکدا دڵیان جیایە ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ﴾ ئەوە بەهۆی ئەوەیە کە ئەوان گەلێکی نەفامن. ١٤)﴿كَمَثَلِ الَّذِينَ﴾ نموونەی (ئەم جوولەکانە) وەك نموونەی ئەوانەن ﴿مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيبًا﴾ کە لە پێش ئەمانەدا بوون بە ماوەیەکی کەم ﴿ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾ سەرئەنجامی کاری خۆیان چەشت ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆ ئەوان هەیە سزای سەخت. ١٥)﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ﴾ (نموونەی ئەم ناپاکانە) وەك شەیتان وایە ﴿إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ﴾ کە بەمرۆڤی ووت: بێ بڕوابە ﴿فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ﴾ جاکە بێ بڕوا بوو (شەیتان) ووتی: ﴿إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ﴾ بەڕاستی من بەریم لە تۆ ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ بێگومان من لە خوای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم. ١٦)

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾




- بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: (خوا ئەمشەو بەو کارەی خۆت و خێزانت پێکەنی یا پێی چاک بوو) ئیتر خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ويؤثرون على...﴾.

- يقول: أنا خير من يونس بن متى) (رواه البخاري). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (نابێ هیچ کەس بڵێ من لە یونسی کوڕی مەتتا چاکترم).

ئایەتی (٥١) سورەتی (القلم): عن ابن عباس (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قال: (العين حق ولو كان شيء سابق القدر سبقته العين)(رواه مسلم). عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چاو پیسی ڕاستەو هەیە وەئەگەر شتێك پێش قەدەر بکەوتایە ئەوە چاوی پیس پێشی دەکەوت).

﴿فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ﴾ جا سەرئەنجامی هەردووکیان ئەوەیە ﴿أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا﴾ کە بێگومان هەردووکیان لە دۆزەخ دا ئەبن بەهەمیشەیی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە ئەمەیە سزای ستەمکاران. ١٧) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن ﴿وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ﴾ وە هەموو کەسێك با سەرنج بدات ﴿مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾ (بزانێ) چی پێش خۆی ناردوە بۆ پاشەڕۆژی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بەڕاستی خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن. ١٨) ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ﴾ وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیرخۆیان بردەوە ﴿فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ﴾ جا خواش ئەوانی لەبیر خۆیان بردۆتەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ هەر ئەوانن دەرچوان لە فەرمانی خوا. ١٩) ﴿لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ دۆزەخیان و بەهەشتیان وەك یەك نین ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ بەهەشتیان ڕزگارو سەرکەتوون. ٢٠) ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾ ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە ﴿عَلَىٰ جَبَلٍ﴾ بۆ سەر کێوێ ﴿لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا﴾ (وە تێگەیشتنمان پێ بدایە) دەتبینی بەملکەچی ولەت لەت بوو ﴿مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ لەترسی خوا ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ﴾ ئەم جۆرە نموونانە ﴿نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾ دەیان هێنینەوە بۆ خەڵکی ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە. ٢١) ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ خوا هەر ئەو زاتەیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە بێجگە ئەو ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ زانای هەموو نهێنی و ئاشکراکانە ﴿هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەر ئەوە بەخشندەی میهرەبانە. ٢٢) ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي﴾ ئەوە ئەو خوایە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کە بێجگە لەو پەرستراوێکی ڕاست نی یە ﴿ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ﴾ پاشا و پاك و بێگەرد و ﴿ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ﴾ ئاشتی دەر وە دڵنیا کەرەو ﴿ٱلْمُهَيْمِنُ﴾ چاودێر و پارێزگار و ﴿ٱلْعَزِيزُ﴾ زاڵ و ﴿ٱلْجَبَّارُ﴾ خاوەن شکۆ و ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ شایستەی هەموو گەورەیی یەکە ﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ﴾ پاکی و بێگەردی بۆ خوایە ﴿عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ لەو هاوبەشانەی کە بۆی دائەنێن. ٢٣) ﴿هُوَ ٱللَّهُ﴾ هەر ئەوە خوای ﴿ٱلْخَٰلِقُ﴾ بەدیهێنەر و ﴿ٱلْبَارِئُ﴾ دامێنەرو ﴿ٱلْمُصَوِّرُ﴾ و وێنە کێشە ﴿لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ هەر بۆ ئەوە هەموو ناوێکی هەرە جوان وپاك ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ستایشی ئەو دەکەن ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە هەر ئەوە بالادەستی کار بەجێیە. ٢٤)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٣﴾ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٥﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی** ئایەتی (١) سورەتی (الممتحنة): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ ....﴾ موسلیم دەگێڕێتەوە لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) من و زوبەیر و میقدادی نارد فەرمووی: (بڕۆن تا دەگەنە – ڕوضە خاخ– (شوێنێکە نزیک مەدینە) ئا لەوێ دا ئافرەتێکی تیایە نامەیەکی پێ یە لێی سەنن) ئێمەش ولاغەکانمان غارداو دەرچووین ، یەکسەر گەشتین بە ئافرەتەکە، ووتمان نامەکە دەربێنە، ووتی نامەم پێ نیە، ووتمان: سوێند بەخوا ئەو نامە دەردێنی یا جل و پۆشاکەکەت دادەکەنین لەبەرت دا ، ئەنجا لەناو پەلەکەکانیدا دەری هێنا ، ئێمەش نامەکەمان هێنایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تێیدا نوسرا بوو: لە حاطەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ کۆمەڵێ لە بێ باوەڕانی مەککە، جا هەواڵی هەندێ –

## سورەتی ﴿ الممتحنة ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن ﴿وَقَدْ كَفَرُوا﴾ لەکاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن ﴿بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ﴾ بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ پێغەمبەر (ﷺ) و ئێوەش دەردەکەن ﴿أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ (لەبەرئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بەخوای پەروەردگارتان ﴿إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ﴾ جا ئەگەر دەرچوون لەووڵاتی خۆتان ﴿جِهَادًا فِي سَبِيلِي﴾ بۆ جەنگ کردن لە ڕێ ی منا ﴿وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي﴾ وە بۆ بەدەستهێنانی خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن) ﴿تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ ڕازو نهێنی یان پێ دەڵێن بە دۆستایەتی ﴿وَأَنَا أَعْلَمُ﴾ لە کاتێکدا من پێ ی ئەزانم ﴿بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ﴾ بەوەی شاردتانەوەو بەوەی ئاشکراتان کرد ﴿وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ﴾ وە هەرکەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ ئەوە بێگومان ڕێ ی ڕاستی وون کردووە. ١) ﴿إِنْ يَثْقَفُوكُمْ﴾ ئەگەر تووشتان ببن ﴿يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً﴾ ئەبن بەدوژمنی ئێوە ﴿وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ﴾ وە درێژ ئەکەن بۆتان ﴿أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ﴾ دەستیان و زمانیان بەخراپی ﴿وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ ئاواتە خوازن کە ئێوە بێ باوەڕ بوونایە. ٢) ﴿لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ﴾ نە خزمانتان و نەمناڵانتان سوودتان پێ ناگەیەنن ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾ لەڕۆژی دوایی دا (خوا ئێوە و خزمەکانتان) لە یەك جیادەکاتەوە ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خوا بینایە بەوەی کەدەیکەن. ٣) ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ﴾ بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ﴿أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ سەرمەشقێکی جوان و چاك ﴿فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ﴿إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ﴾ کە بەگەلەکەی خۆیانیان ووت ﴿إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لەئێوە ﴿وَمِمَّا تَعْبُدُونَ﴾ وە لەو شتانەش کەدەیان پەرستن ﴿مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ لەجیاتی خوا ﴿كَفَرْنَا بِكُمْ﴾ ئێمە باوەڕمان نی یە بە(ئایینی) ئێوە ﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾ وە پەیدابوو لەنێوان ئێمەو ئێوەدا ﴿الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا﴾ دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە ﴿حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ تا کاتێك کەبڕوا بەخوای تەنیا دەهێنن ﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بەباوکی ووت ﴿لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾ بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم ﴿وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ وە من هیچم بەدەست نی یە لەبەرانبەر خوادا بۆ تۆ ﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان بەتۆ بەستووە ﴿وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا﴾ وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە ﴿وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ سەر ئەنجامیش هەر بۆلای تۆیە. ٤) ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا﴾ ئەی پەروەردگار نەمان کەیت ﴿فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بە مایەی گومڕایی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ﴿وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا﴾ وەلێمان خۆشبە ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر تۆیت زاڵی کاربەجێ. ٥)

لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَاللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

**- کاروباری پێغەمبەری (ﷺ) پێدابوون ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (حاطەب ئەمە چی یە؟) حاطەب ووتی: ئەی پێغەمبەر پەلەم لێ مەکە! من کەسێك بووم خەڵکم خستبووە پاڵ قورەیش و لەوان نەبووم ، بەڵام ئەو کۆچەریانەی کە لەگەڵتان هەموویان خزم و کەسیان هەیە ماڵ و منداڵەکانیان دەپارێزن، بەڵام من کەس و کارم نیە پارێزگاری ماڵ و منداڵەکانم بکات، پێم خۆش بوو چاکە و منەتێکم بەسەریانەوە هەبێت کە بەهۆیەوە خزمەکانم بپارێزن وە من کە ئەم کارەم کردووە وە نەبێ بێ باوەڕبوویم یان پاشگەز بووبێتمەوە لەئایینەکەم یان ڕازی بوویم بە بێ باوەڕی پاش موسڵمان بوونم، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ڕاست دەکات)، عومەر ووتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی ئەمە ناپاکە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئەم حاطەبە بەشداری-**

﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ﴾ سوێند بەخوا بێ گومان بۆ ئێوە هەیە لەئیبراهیم و بڕوادارەکاندا ﴿أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ سەر مەشقێکی جوان ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا﴾ بۆ کەسێك کە ئومێد و هیوای ببێ ﴿اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ﴾ بە خوا و بەڕۆژی دوای ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ وەهەر کەسێك پشت هەڵکات ﴿فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ﴾ ئەوە بەڕاستی هەر خوایە بێ نیازو دەوڵەمەندو ﴿الْحَمِيدُ﴾ شایستەی ستایش. ٦) ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ﴾ دڵنیا بن خوا دروست دەکات ﴿بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ﴾ لەنێوان ئێوەو ئەوانەی ﴿عَادَيْتُم مِّنْهُم﴾ دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردوون لەوان ﴿مَّوَدَّةً﴾ دۆستایەتی و خۆشەویستی (بەئیمان هێنانی زۆریەیان) ﴿وَاللَّهُ قَدِيرٌ﴾ وە خوا بەتوانایە ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وەخوا لێ خۆشبوی میهرەبانە. ٧)﴿لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ﴾ خوا ڕێتان لێ ناگرێت ﴿عَنِ الَّذِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی ﴿لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ﴾ کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون ﴿فِي الدِّينِ﴾ لەسەر ئەم دینە ﴿وَلَمْ يُخْرِجُوكُم﴾ وە دەریان نەکردوون ﴿مِّن دِيَارِكُمْ﴾ لەجێگەو شوێنەکانتان ﴿أَن تَبَرُّوهُمْ﴾ کەچاکەیان لەگەڵ بکەن ﴿وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ﴾ وەدادیان لەگەڵ بنوێنن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کەدادگەرن. ٨)﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ﴾ بێگومان خوا ڕێ گریتان لێ دەکات تەنها ﴿عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ﴾ لەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ کردوون ﴿فِي الدِّينِ﴾ لەسەر دین ﴿وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ﴾ وەدەریان کردوون لەجێگەو شوێنەوارتاندا ﴿وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ﴾ وەیارمەتی یان داوە لەسەر دەرکردنتان ﴿أَن تَوَلَّوْهُمْ﴾ (بەرگریتان دەکات) لەوەی کەدۆستایەتی یان لەگەڵ بکەن و بەدۆستیان دابنێن ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُمْ﴾ وە هەر کەسێك دۆستایەتیان بکات ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئا ئەوانە خۆیان ستەمکارن. ٩)﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ﴿إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ﴾ ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆلاتان ﴿مُهَاجِرَاتٍ﴾ بە کۆچ کەری ﴿فَامْتَحِنُوهُنَّ﴾ تاقی یان بکەنەوە ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ﴾ خوا بەباوەڕی ئەوان زاناترە ﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ﴾ ئینجا ئەگەر زانیتان ئەو (ئافرەتانە) ﴿مُؤْمِنَاتٍ﴾ باوەڕدارن ﴿فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ﴾ ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆلای (مێردە) بێ بڕواکانیان ﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ﴾ نەئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ ئەو مێردە بێ باوەڕانە ﴿وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ وە نە ئەو مێردانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن ﴿وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا﴾ وە ئەوەی (مێردەکانیان) خەرجیان کردووە، بیپاندەنەوە ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە ﴿أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ کە ئەم ئافرەتانە مارە بکەن ﴿إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر مارەییەکانیان بدەنێ ﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ ژنە کافرە (بێ نامە)کان لای خۆتان ڕامەگرن ﴿وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ﴾ ئێوە داوای ئەوە بکەنەوە کەخەرجتان کردووە (بۆ ژنە کافرەکانتان کە ئێستە چوونەتە لای کافران) ﴿وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا﴾ ئەوانیش با داوای ئەوە بکەن کە خەرجیان کردووە (بۆ ژنە موسوڵمان بوەکانیان کە هاتونەتە لای ئێوە) ﴿ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ﴾ ئەمە فەرمانی خوایە ﴿يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ بڕیار ئەدا لەنێوانیاندا ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زانای کاربەجێ یە. ١٠)﴿وَإِن فَاتَكُمْ﴾ ئەگەر لە دەستتان چوو ﴿شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ یەکێك لە خێزانەکانتان (بەچوونیان) ﴿إِلَى الْكُفَّارِ﴾ بۆ لای بێ باوەڕان ﴿فَعَاقَبْتُمْ﴾ ئێوەش تۆڵەتان لێ سەندن(و غەنیمەتتان گرت) ﴿فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم﴾ ئینجا (لەو غەنیمەتە)بدەن بەوانەی کە ژنەکانیان ڕۆشتووە ﴿مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا﴾ بە ئەندازەی ئەوەی کە خەرجیان کردووە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە بترسن لەو خوایەی ﴿الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە. ١١)

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَـٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ ۙ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾

## سُورَةُ الصَّفِّ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٥﴾

- غەزای بەدری کردووە تۆ چووزانیت لەوانەیە خوا ئاگاداری بەشداربووانی غەزای بەدر بێت چی دەکەن فەرموو بێتی چی ئەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم) ئەوجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ ...﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٠) سورەتی (الممتحنة): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ...﴾ بوخاری دەگێڕێتەوە لە میسوەر و مەروانی کوڕی حەکەمەوە ، دەڵێن: کە پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانی حودەیبیەی لەگەڵ کافرانی قورەیشدا بەست چەند ئافرەتێکی ئیماندار هاتن – لە مەککەوە بۆ مەدینە– بەو بۆنەیەوە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ﴾ تا ﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ وە عومەری کوڕی خەططاب لەو ڕۆژەدا دوو خێزانی طەلاق دا یەکێکیان مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان مارەی کرد ئەوی تریشیان صەفوانی کوڕی ئومەییە مارەی کرد).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ﴾ هەر کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆلات ﴿يُبَايِعْنَكَ﴾ کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن ﴿عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ﴾ لەسەر ئەوەی کەدانەنێن بە هاوبەشی خوا ﴿شَيْـًٔا﴾ هیچ شتێك و ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ﴾ دزی و داوێن پیسی نەکەن و ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾ منداڵانی خۆیان نەکوژن ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ﴾ هیچ جۆرە بوختانێك هەڵنەبەستن ﴿بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ لەنێوان دەست و پێ یاندا ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ وە بێ فەرمانیت نەکەن لەهیچ کارێکی چاکەدا ﴿فَبَايِعْهُنَّ﴾ تۆش پەیمانیان لەگەڵ ببەستە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾ وە لەخوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆبکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە. ١٢)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ کەسانێك کەخوا غەزەبی لێ گرتوون مەیکەن بە دۆستی (گیانی)تان ﴿قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ بەڕاستی ئەوان بێ هیوا بوون لە (پاداشتی) ڕۆژی دوایی ﴿كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ﴾ هەر چۆن بێ بڕوایان بێ هیوان ﴿مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ﴾ لە مردووی ناو گۆڕستان. ١٣)

## سورەتی ﴿الصف﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ بە پاکی و بێگەردی یادی خوا دەکات هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە ئەو زاڵی کاربەجێ یە. ١)﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ بۆچی ئەوەی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن. ٢)﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ﴾ زۆر مایەی ڕق و تووڕەیی یە لای خوا ﴿أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ کە قسەیەك بڵێن کردەوەی پێ نەکەن. ٣)﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی خوا کەسانێکی خۆش دەوێ ﴿يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا﴾ کە بەیەك ڕیز دەجەنگن لەڕێی خوادا ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ ئەڵێیت کۆشکێکی قایمی چەسپیوون. ٤)﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ (بیهێنەرەوە یادت) کاتێك کە مووسا بەگەلەکەی ووت ﴿يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى﴾ ئەی گەلەکەم بۆچی ئازارم دەدەن ﴿وَقَد تَّعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا بەدڵنیاییەوە دەزانن ﴿أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾ کە من نێردراوی خوام بۆلای ئێوە ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟﴾ جا کاتێك لایان دا لەحەق ﴿أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾ خوا دڵی وەرگێڕان ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی گەلی لەڕێ دەرچوو ناکات. ٥)

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا
جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾
يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟
أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّۦنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ
قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾

**هـــۆی هاتنـــە خـوارەوەی ئـایـەتـی (١-١٤) ســـورەتـی (الـصف): ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ ... فَأَصْـبَحُوا ظَـاهِرِينَ﴾** ئیمـامی ئەحمەد و تورمزی و حـاكیم دەگێڕنـەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی ســەلامەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: چـەند كەسێك لـە هاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) پێكـــەوە دانیـــشتبووین قـسەمان دەكـرد، ووتمـــان خۆزگـــە بمانزانیایـــە كــام كردەوەیـــــە خۆشەویـستره لای خوا بمانكردایە، جا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ **عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سورەتەكەی خوێندەوە بۆمان تا كۆتایی هات.**

**ئایەتی (٧) سورەتی (الحاقة):** قال النبي(ﷺ): (نصرت بالصبا وأهلكت عاد بالدبور) (رواه البخاري ومسلم). پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من بەشنەی شەماڵ سەر خرام وە گەلی عادیش بەڕەشە بالەناو چوون).

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ (بیربکەرەوە) کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم ووتی ﴿يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي﴾ ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾ نێردراوی خوام بۆلای ئێوە ﴿مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بەڕاستی دائەنێم ﴿وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ﴾ وە مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك ﴿يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي﴾ کە لەدوای من دێ و ﴿ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾ ناوی ئەحمەدە ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم﴾ ئینجا کاتێك کە ئەو (پێغەمبەرە) یان بۆ هات ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟﴾ بە چەند نیشانەی ڕوون و ئاشکرا وە ووتیان ﴿هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە. ٦) ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ﴾ جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە ﴿ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ کە درۆ هەڵببەستێت بەدەم خواوە ﴿وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ﴾ لە کاتێکدا کە بۆ ئیسلام بانگ دەکرێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەم کار ناکات. ٧) ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ﴾ دەیانەوێ ڕووناکی دینی خوا بکوژێننەوە ﴿بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾ بە(فوی) دەمیان ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾ وە خوا ڕووناکی خۆی تەواو دەکات ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ با بێ باوەڕانیش پێ یان ناخۆش بێ. ٨) ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە ﴿بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ﴾ بە ڕێنموونیی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾ تا بەسەر هەموو ئایینێکدا سەری بخات ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴾ هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرانیش پێ یان ناخۆش بێ. ٩) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ﴾ ئایا بازرگانیەکتان نیشان بدەم ﴿تُنجِيكُم﴾ کە ڕزگارتان بکات ﴿مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ لە سزایەکی پڕ لە ئازار. ١٠) ﴿تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (بازرگانیەکەش ئەمەیە) باوەڕ بێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﴿وَتُجَٰهِدُونَ﴾ وە تێبکۆشن ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێ ی خوادا ﴿بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ بە سامان و گیانی خۆتان ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن. ١١) ﴿يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ (ئەوسا خوا) لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ ﴿وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ﴾ وە (لە ڕۆژی دواییدا) دەتان خاتە باخاتێکەوە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە جۆگەی ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً﴾ (وە دەتانخاتە) خانوو کۆشکی زۆری پاك و خۆشەوە ﴿فِي جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾ لە بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمیشەیی دان ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە. ١٢) ﴿وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا﴾ وە شتێکی تر کە حەزی لێ دەکەن ﴿نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ (کە بریتی لە)یارمەتی دانە لە خواوە ﴿وَفَتْحٌ قَرِيبٌ﴾ وە ڕزگارکردنێکی نزیك (ئازادکردنی شاری مەککە) ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە (بەمە) مژدە بدە بەئیمانداران. ١٣) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ﴾ ببن بە یارمەتی دەرانی (ئایینی) خوا ﴿كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ هەروەك عیسای کوڕی مەریەم ووتی ﴿لِلْحَوَارِيِّـۧنَ﴾ بە هاوڕێ تایبەتیەکانی خۆی ﴿مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ کێ یارمەتی دەری منە بۆ لای خوا ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ﴾ هاوڕێکانی ووتیان ﴿نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ ئێمە یارمەتی دەرانی (دینی) خواین ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئینجا دەستەیەك لە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان هێنا ﴿وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ﴾ وە دەستەیەکیشیان بێ باوەڕ بوون ﴿فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئێمەش پشتیوانی ئەوانەمان کرد کە باوەڕیان هێنا ﴿عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ﴾ لە بەرانبەر دوژمنەکانیاندا ﴿فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ﴾ بۆیە سەرکەوتن و زاڵ بوون. ١٤)

# سُورَةُ الجُمُعَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾

**ئایەتی (٢٢) سورەتی (الحاقة): قال رسول الله (ﷺ): (إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله، ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض...) (رواه البخاري).** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (بێگومان لەبەهەشتدا سەد پلە هەیە، خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی لە پێناوی (سەرخستنی ئایینی) خوادا تێدەکۆشن، نێوان و ماوەی هەر پلەیەکی تاپلەیەکی تر ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەوی دەبێت).

**ئایەتی (١٨) سورەتی (المعارج):** عن أسماء بنت أبي بكر (رضي الله عنها) قالت: قال لي النبي (ﷺ): **(لا توكي فيوكى عليك)(متفق عليه).** ئەسماءی کچی ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێم: (ببەخشە و کۆی مەکەرەوە (لە کیسە و شتی تردا دەمەکەی مەبەستی) ئەگینا خواش بەخشینی خۆی لە تۆ دەگرێتەوە).

## سورەتی ﴿ الجمعة ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ﴾ تەسبیحاتی خوای دەکات ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەکان ﴿وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ وە ئەوەی لە زەوی دایە ﴿الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ﴾ (ئەو خوایەی) کە پاشایەکی پاك و بێگەردی ﴿الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ زاڵی کار بەجێ یە. ١)﴿هُوَ الَّذِي﴾ خوا ئەو زاتەیە ﴿بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ﴾ کە ناردوویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا (عەرەبەکاندا) ﴿رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ پێغەمبەرێك لە خۆیان ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ دەخوێنێتەوە بەسەریاندا نیشانەکانی خوا ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاکیان دەکاتە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ وە قورئان و فەرموودەی (پڕ سوود)یان فێردەکات ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ﴾ هەر چەند ئەوان لەپێشدا﴿لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون. ٢)﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ﴾ وە (ڕەوانەشی کردووە بۆ) گەلانی کەی جگە لەوان ﴿لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ کە هێشتا پێ یان نەگەیشتوون (و موسوڵمان نەبوون) ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە خوا زاڵی کار دروستە. ٣)﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ﴾ ئەوە بەهرەیەکی خواییە ﴿يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ ئەیدا بە هەر کەسێك کە(خۆی) بیەوێ ﴿وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەنی بەهرە و بەخششی گەورەیە. ٤)﴿مَثَلُ الَّذِينَ﴾ نموونەی بەسەرهاتی ئەوانەی ﴿حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ﴾ کە تەوراتیان درا بەسەردا ﴿ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا﴾ لە پاشان هەڵیان نەگرت (ڕەفتاریان پێ نەکرد) ﴿كَمَثَلِ الْحِمَارِ﴾ وەك گوێ درێژێکە ﴿يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ کە کتێبێکی زۆری هەڵگرتبێ (سوودی لێ نابینێ)﴿بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ﴾ ئای چەند خراپە نموونەی ئەو گەلەی ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ کە نیشانەکانی خوایان بە درۆزانی ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ وە خوا ڕێ نموونیی گەلی ستەمکاران ناکات. ٥)﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: ئەی ئەوانەی کە لەسەر دینی جوولەکەن ﴿إِن زَعَمْتُمْ﴾ ئەگەر پێتان وایە ﴿أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ﴾ کە بەڕاستی ئێوە دۆستی خوان ﴿مِن دُونِ النَّاسِ﴾ بێجگە لە خەڵکی تر ﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ﴾ کەوا بوو داوای مردن بکەن ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. ٦)﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا﴾ وە ئەوانە هەرگیز داوای مردن ناکەن ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ لەبەر ئەو (گوناهانە)ی کە بەدەستی خۆیان پێشیان خستووە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە خوا ئاگادارە بەستەم کاران. ٧)﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي﴾ بڵێ بەڕاستی ئەو مردنەی کە ﴿تَفِرُّونَ مِنْهُ﴾ لێ ی ڕادەکەن ﴿فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ﴾ بێ گومان پێتان دەگات و تووشتان دەبێ ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ﴾ لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە ﴿إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ بۆ لای خوای زانا بەئاشکراو نهێنی ﴿فَيُنَبِّئُكُم﴾ ئینجا هەواڵتان پێ دەدات ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەوەی کەدەتانکرد. ٨)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾

## سُورَةُ المُنَافِقُون

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٤﴾

هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتی (١١) سـورەتی (الجمعة): ﴿وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً .....﴾ موسـلیم دەگێڕێتـەوە لـە جـابیری کـوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایـان لێ بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لـە ڕۆژی هەینی دا ڕاوەستا بـوو وتـاری دەدا کاروانێـك لـە شامەوە هاتەوە – کـە خواردەمـەنی پێ بوو– یەکسەر ئەوخەڵکەی لەناو مزگـەوتا بـوون ڕۆشـتن بـەدەم کاروانەکـەوە، بـە جۆرێکی وا تـەنها دوازدە کـەس مانـەوە –لـە مزگەوتـدا– جـا ئـەم ئایەتـەی سـورەتی جومعـە هاتەخوارەوە ﴿وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗا﴾.

هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (١-٧) سورەتی (المنافقون): ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ .....﴾ بوخـاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لە غەزایەکدا کەوتم لێ بوو –

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ﴾ کاتێك کە بانگدرا بۆ نوێژ ﴿مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ﴾ لە ڕۆژی هەینی دا ﴿فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ بەپەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (و نوێژە هەینی) و ﴿وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ﴾ واز لەکڕین و فرۆشتن بهێنن ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئائەوە بۆ ئێوە چاکترە ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بزانن و تێ بگەن. ٩) ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ﴾ جا کاتێك کە نوێژی هەینی تەواوبوو ﴿فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئیتر بڵاوببنەوە بەسەر زەویی دا ﴿وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾ وە دوای ڕسق و ڕۆزیی خوا بکەن ﴿وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ زۆر یادی خوا بکەن ﴿لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفەرازبن. ١٠) ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا﴾ هەر کارێکی بازرگانی یا کارێکی بێهودە ببینن ﴿ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا﴾ بڵاوەی لێ ئەکەن بۆلای ئەو بازرگانی یە ﴿وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا﴾ وە تۆ بەجێ دێڵن بە ڕاوەستاوی (لەسەر دوانگە) ﴿قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ ئەوەی لای خوایە چاکترە ﴿مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ﴾ لەشتی بێ هودەو بازرگانی ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ وەخوا باشترینی ڕۆزیی دەرانە. ١١)

## سورەتی ﴿المنافقون﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾ کاتێك کە دووڕوان بێنە لات ﴿قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ﴾ دەڵێن شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ﴾ وە دیارە خوایش دەزانێ کە تۆ ڕەوانەکراوی ئەوی ﴿وَٱللَّهُ يَشْهَدُ﴾ وەخوا شایەتی دەدات ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾ کە بێگومان دووڕوان درۆزنن. ١) ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً﴾ سوێندە (درۆ)کانی خۆیان کرد بەقەڵغان (بۆ خۆیان) ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئینجا ڕێ گری (خەڵك)یان دەکرد لەڕێ ی خوا ﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بەڕاستی ئەوان کارێکی خراپیان دەکرد. ٢) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ﴾ ئەوە(ی کەوتن) لەبەر ئەوە بوو کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناو ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ لەپاشان بێ باوەڕبوون ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ ئینجا مۆر نرا بەسەر دڵیاندا ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ ئیتر ئەوان هیچ تێ ناگەن. ٣) ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ﴾ هەر کاتێك دەیان بینیت ﴿تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾ لەش و قەڵافەتیان سەرسامت دەکات ﴿وَإِن يَقُولُواْ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ وە ئەگەر قسە بکەن گوێ لە قسەکەیان دەگریت ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ (دوو ڕووان) هەروەك داری هەڵسپێردراون ﴿يَحْسَبُونَ﴾ وا گومان دەبەن ﴿كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾ هەموو هاوار و قیڕەیەك بۆسەر ئەوانە ﴿هُمُ ٱلْعَدُوُّ﴾ هەر ئەوانن دوژمن ﴿فَٱحْذَرْهُمْ﴾ کەواتە خۆتیان لێ بپارێزە ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا بیانکوژێ (یان خوا لەناویان بەرێ) ﴿أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ چۆن وەردەگێڕدرێن (لەحەق). ٤)

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾




- عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ووتی: ماڵ و داراییتان مەبەخشن بەو کەسانەی لە دەوری پێغەمبەران تا بڵاوەی لێ بکەن، وە سوێند بێ ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بەهێزو دەسەڵاتدارەکان لاوازو ریسواکانی لێ دەردەکەن ، زەید دەڵێ: منیش ئەم قسەی عەبدوڵڵام بۆ مامم یا عومەر گێڕایەوە ئەویش ووتبوی بە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش منی بانگ کرد منیش قسەکەم بۆ گێڕایەوە ، ئەنجا ناردی بە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوەڵەکانیدا ئەوانیش دەستیان کرد بە سوێند خواردن کە نەیان ووتووە ، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) باوەڕی بە قسەکەی من نەکرد، قسەی عەبدوڵڵای بەڕاست زانی ، ئەوسا تووشی داخ و خەفەتێک بووم کە هەرگیز تووشم نەبوو بوو ئیتر بۆ خۆم لە ماڵدا دانیشتم ، مامەم پێ ی ووتم :چی وای لێ کردی ئەو قسەیە بکەیت ، کە پێغەمبەر (ﷺ) بە درۆزنی دانایت و بوغزاندیتی -

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ **کاتێك پێ یان بووترێ** ﴿تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ﴾ **وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بکات** ﴿لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ **(سەرپێچی دەکەن)** سەریان با دەدەن ﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ﴾ **وە دەیان بینیت زوو وەرئەگێڕن** ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوان **خۆیان بەگەورە دەزانن. ٥)** ﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ﴾ **بۆ ئەوان یەکسانە** ﴿أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ﴾ **داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت** ﴿أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ **یا داوای لێبوردنیان بۆ نەکەیت** ﴿لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾ **هەرگیز خوا لێ یان خۆش نابێ** ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ بەڕاستی خوا ڕێنموونی **گەلی لەڕێ لادەران ناکات. ٦)** ﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ **ئەوان ئەو کەسانەن کە** دەڵێن: ﴿لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ﴾ **دارایی مەبەخشن بە ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەران** ﴿حَتَّىٰ يَنفَضُّوا﴾ **تا بڵاوەی لێ بکەن** ﴿وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ **لەکاتێکدا** هەرچی گەنجینەکانی **ئاسمانەکان و زەویی هەیە هەمووی هی خوایە** ﴿وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾ **بەڵام دوو ڕووەکان نازانن. ٧)** ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ﴾ **(دووڕووەکان) دەڵێن** سوێندبێ ئەگەر **گەڕاینەوە بۆ مەدینە** ﴿لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾ **بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێ ڕێزەکان لە مەدینە دەردەکەن** ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ﴾ **ڕێز و گەورەیی تەنها بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری خوا و** ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ **بۆ باوەڕدارانە** ﴿وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ **بەڵام دووڕووان نازانن. ٨)** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ **ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە** ﴿لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ﴾ **ماڵ و منداڵەکانتان بێ ئاگاتان نەکەن لەیادی خوا** ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ **هەر کەسێك وابکات** ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ **ئا ئەوانە** خۆیان خەسارۆمەندن. **٩)** ﴿وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم﴾ **بیبەخشن هێندێ لەو ڕۆزییانەی پێمان داوون** ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ **پێش ئەوەی مردن یەخە بە** یەکێکتان بگرێ ﴿فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي﴾ **ئەوسا بڵێت : خوایە خۆزگە مردنی منت دوابخستایە** ﴿إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ **بۆ ماوەیەکی نزیك** ﴿فَأَصَّدَّقَ﴾ **جا ماڵم ببەخشیایە و** ﴿وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ **لە چاکان بوومایە. ١٠)** ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا﴾ **هەرگیز خوا هیچ کەسێك دوا ناخات (لەمردن)** ﴿إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا﴾ **کاتێك کەوەختی (مردنی) هات** ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ **وەخوا** شارەزایە بەوەی کە دەیکەن. ١١)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا فَكَفَرُواْ وَتَوَلَّواْۚ وَّٱسۡتَغۡنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٞ ﴿٦﴾ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَاۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٨﴾ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾

- ئەنجا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ... هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا...﴾ ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بەشوێنمدا و ئایەتەکانی خوێندەوە کە دابەزیبوون و فەرمووی: (بێگومان ئەی زەید خوای گەورە ڕاستی قسەکانی تۆی دەرخست).

**ئایەتی (٣٢) سورەتی (المعارج)**: قال رسول الله (ﷺ): (آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر) (رواه مسلم و بخاري). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نیشانەی دووڕوو سیانن، هەرکات قسە بکات درۆ دەکات، هەر پەیمان بەڵێنی بدات دەیشکێنی، هەر کات دەمە قاڵێی لەگەڵ لەسێکدا ببێت جنێو دەدات.

## سورەتی ﴿ التغابن ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ﴾ ستایشی خوا دەکات ﴿مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ﴿لَهُ الْمُلْكُ﴾ دەسەڵاتی تەواو بۆ ئەوە ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ﴾ وە هەرچی ستایش هەیە هەمووی بۆ ئەوە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە ئەوە بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتە. ١) ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە ﴿فَمِنكُمْ كَافِرٌ﴾ ئینجا هەندێکتان بێ باوەڕو ﴿وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾ هەندێکی تریشتان باوەڕدارن ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خوا بینایە بەهەر شتێك کە ئەنجامی دەدەن. ٢) ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بەحەق و ڕاستی ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ لەجوانترین شێوەشدا وێنەی کێشاون ﴿وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ وە سەرئەنجام هەر بۆلای ئەوە. ٣) ﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوا دەیزانێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾ وە شارەزایە بەوەی دەیشارنەوە وە بەوەی ئاشکرای دەکەن ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ وە خوا زانایە بەوەی لەناو دڵ و دەروندایە. ٤) ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ﴾ ئایا پێتان نەگەیشتووە هەواڵی ئەوانەی ﴿كَفَرُوا مِن قَبْلُ﴾ کە بێ باوەڕ بوون لەمەو پێش ﴿فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾ بۆیە چەشتیان تۆڵەی کاری خۆیان ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆ ئەوان هەیە سزای سەخت. ٥) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ﴾ ئەو(سزایە) بێگومان بەهۆی ئەوە وەبوو ﴿كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ کەپێغەمبەرەکانیان بۆهات بەبەڵگەی ئاشکراوە ﴿فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾ کە چی دەیان ووت چۆن ئەبێ ئادەمی یەك لە خۆمان ڕێ نموونیمان بکات ﴿فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا﴾ ئینجا بێ بڕوا بوون و ڕوویان وەرگێڕا ﴿وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ﴾ وە خواش بێ نیازیی نواند (لە باوەڕهێنانیان) ﴿وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ وەخوا دەوڵەمەندەو شایستەی ستایشە. ٦) ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێ باوەڕان وایان دەزانی ﴿أَن لَّن يُبْعَثُوا﴾ کە (لە ڕۆژی دوایی دا) زیندوو ناکرێنەوە ﴿قُلْ بَلَىٰ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) پێ یان بڵێ بەرێ وەڵلا ﴿وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ﴾ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان زیندوو دەکرێنەوە ﴿ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ﴾ دڵنیابن پاشان هەواڵتان پێ دەدرێت بەوەی کە کردووتانە ﴿وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ وە ئەمە بۆ خوا ئاسانە. ٧) ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کەواتە باوەڕ بێنن بەخواو پێغەمبەرەکەی و ﴿وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا﴾ بەو ڕووناکی یەی دامان بەزاندووە(کە قورئانە) ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وەخوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن. ٨) ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ﴾ (پاداشتان دەداتەوە) لەڕۆژێکدا کە کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە **﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾ ئەوڕۆژە ڕۆژی زیانباری یە** ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ **وە هەرکەسێك بڕوا بێنێ بەخوا** ﴿وَيَعْمَلْ صَالِحًا﴾ **وە کردەوەی چاك بکات** ﴿يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ﴾ **خوا چاوپۆشی دەکات لەگوناهەکانی** ﴿وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ﴾ **وەدەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە** ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ **کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات** ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ **تیا دەمێننەوە بەهەمیشەیی** ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ **ئەوەیە بردنەوە و سەرکەوتنی گەورە. ٩)**

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَآ أَصَابَ مِن
مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ
شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن
تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا
لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ
فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ
فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ
وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن
يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقۡرِضُواْ
ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ
حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾

## سُورَةُ الطَّلَاقِ

ترتيبها ٦٥ — آياتها ١٢

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٤) سورەتی (التغابن): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ ...﴾ تورمزی و حاکیم گێڕاویانەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە وتی: ئەم ئایەتە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ...﴾ دەربارەی کەسانێك دابەزی خەڵکی مەککە بوون موسڵمان بوو بوون و بە نیاز بوون بێن بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) –لە مەدینە– بەڵام خێزان و منداڵەکانیان لێیان نەگەڕان بڕۆن بۆ خزمەتی پێغەمبەر جا کە بینیان هاوڕێکانیان لەئاییندا شارەزا بوون ویستیان تۆڵە لەخێزان و منداڵەکانیان بکەنەوە ئەدجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ...﴾.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون و نیشانە و بەڵگەکانی ئێمەیان بە درۆزانی ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئەوانە هاوەڵی ئاگرن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ تیا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ وە سەر ئەنجامێکی زۆر خراپە. ١٠) ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ﴾ هیچ ناڕەحەتی یەك تووشی (خەڵك) نابێت ﴿إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ مەگەر بەفەرمانی خوا ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ هەر کەسێك باوەڕ بێنێ بەخوا ﴿يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ خوا ڕێ نموونی دڵی دەکات ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بەهەموو شت ئاگادارە. ١١) ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ فەرمانبەریی خواو فەرمانبەری پێغەمبەر بکەن ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەوسا ئەگەر پشتان تێ کرد ﴿فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا﴾ جا ئەوەی لەسەر پێغەمبەری ئێمەیە ﴿الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ هەر گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای ئایینە. ١٢) ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا زاتێکە کە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ با باوەڕداران تەنها پشت بەخوا ببەستن. ١٣) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ﴾ بەڕاستی هەندێ لەژنان و منداڵانتان ﴿عَدُوًّا لَّكُمْ﴾ دوژمنی ئێوەن ﴿فَاحْذَرُوهُمْ﴾ جا خۆتانیان لێ بپارێزن ﴿وَإِن تَعْفُوا﴾ وە ئەگەر (لێیان) ببورن ﴿وَتَصْفَحُوا﴾ وە واز بێنن (لێیان) ﴿وَتَغْفِرُوا﴾ وە (لێیان) خۆش بین ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خواش لێ خۆش بووی میهرەبانە. ١٤) ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ بێ گومان دارایی و منداڵتان هەرهۆی تاقی کردنەوەتانن ﴿وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ لەکاتێکدا خوا پاداشتی زۆر گەورەی لەلایە. ١٥) ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ کەوابوو لەخوا بترسن ئەوەندەی کە دەتوانن ﴿وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا﴾ وە گوێڕایەڵ و ملکەچی بن ﴿وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ﴾ وە ماڵ ببەخشن کە بۆ خۆتان چاکترە ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ﴾ وە ئەوەی پارێزراو بێ لەچرووکی نەفسی خۆی ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ هەر ئەوانن سەرکەوتوو رزگار. ١٦) ﴿إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ئەگەر قەرز بدەن بەخوا بە قەرزێکی چاك ﴿يُضَاعِفْهُ لَكُمْ﴾ چەند بەرانبەری دەکات بۆتان ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ وە لێتان خۆش دەبێ ﴿وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ وە خوا سوپاسگوزاری لەسەرخۆیە. ١٧) ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ زانای پەنهان و ئاشکراو ﴿الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ زاڵی کاریەجێ یە. ١٨)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُو۟لَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾

**ئایەتی (٣٧) سورەتی (المعارج):** عن جابر بن سمرة قال: دخل رسول الله (ﷺ) المسجد ونحن حلق متفرقون فقال: (مالي أراكم عزين) (رواه مسلم و أبو داود). جابری کوڕی سەموره – ڕەزای خوای لێ بێ – لەمزگەوتدا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناومان ئێمەش بەچەند ئەڵقەیەك دانیشتبووین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە چییە بە پەرش بڵاو – پەرتەوازە – دەتانبینم.

**ئایەتی (١٠) سورەتی (نوح):** قال النبي (ﷺ): (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون، فيستغفرون الله تعالى، فيغفر لهم)(رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر گوناه نەکەن دڵنیابن خوا لاتان دەبات و کەسانێکی تر دێنێ کە گوناه بکەن ئەنجا داوای لێ خۆشبوون لە خوای گەورە بکەن ئیتر ئەویش لێیان خۆش دەبێت).

## سورەتی ﴿ الطلاق ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ **بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.** ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ **ئەی پێغەمبەر (ﷺ) (بەئوممەتەکەت بڵێ)** ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ **هەر کاتێ ویستان ژنانتان تەڵاق بدەن** ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ **با تەڵاقیان بدەن لەکاتی عیدەیاندا (ئەو کاتەی لەحەیز پاك بوونەتەوەو لەگەڵیان دروست نەبوون)** ﴿وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ **وە عیدەی (ژنەکانتان) بەوردی بژمێرن** ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ﴾ **وە لەخوا بترسن کەپەروەردگارتانە** ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ﴾ **ئەو ژنانە دەرمەکەن** ﴿مِنْ بُيُوتِهِنَّ﴾ **لەماڵەکانی خۆیان (تاعیدەیان تەواو دەبێ)** ﴿وَلَا يَخْرُجْنَ﴾ **ئافرەتانیش با دەرنەچن (لە ماڵەکانیان)** ﴿إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ **مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن** ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ **وە ئەوانە سنوورانێکی خوایین** ﴿وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ﴾ **هەر کەسێك لەسنوورانی خوا دەربچێ** ﴿فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ **ئەوە بێگومان ستەمی لەخۆی کردووە** ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ﴾ **تۆ چووزانی لەوانەیە خوا پێشـی بێنێ** ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ **دوا ئەوە کارێکی تر. ١)** ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ **ئینجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان** ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ **ئەوسا یان بیانهێڵنەوە بەباشی (بیان بەنەوە بۆ لای خۆتان پیاوانە)** ﴿أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ **یان لێیان جیا ببنەوە بەباشی** ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ **وە دوو شاهیدی دادپەروەر بگرن لەخۆتان** ﴿وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ **کە لەبەر خوا ئەو شاهیدیە بدەن** ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ **ئەوانە (باسکران پەندێکن)** ﴿يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ﴾ **کە ئامۆژگاری ئەوانەی پێ دەکرێ کە باوەڕیان هەبێ** ﴿بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ **بە خوا و ڕۆژی دوایی** ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ﴾ **وە هەرکەسێ خواناس بێ** ﴿يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا﴾ **خوا دەروی لێ دەکاتەوە. ٢)** ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ **وە رزق و ڕۆزی دەدات لەلایەکەوەکە بەخەیاڵیدا نەهاتووە** ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ **وە هەکەسێ پشت بەخوا ببەستێ** ﴿فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ **ئەوە خوای بەسە** ﴿إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ﴾ **بەڕاستی خوا کار و فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیەنێ** ﴿قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ **بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە. ٣)** ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ﴾ **ئەوانەی کە بێ هیوا دەبن لەکەوتنە حەیزەوە** ﴿مِنْ نِسَائِكُمْ﴾ **لە ژنانتان** ﴿إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ﴾ **ئەگەر (دەربارەی زانینی عیدەیان) دوو دڵ بوون ئەوا عیدەیان سێ مانگە** ﴿وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ **وە (هەروا) ئەوانەش کە (لەبەر منداڵی) هێشتا حەیزیان پیا نەهاتووە** ﴿وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ﴾ **وە ژنانی سك پڕ (دوو گیان)** ﴿أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ **عیدەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن** ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ﴾ **هەر کەسێك لە خوا بترسێت** ﴿يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا﴾ **خوا کاری بۆ ئاسان دەکات. ٤)** ﴿ذَٰلِكَ أَمْرُ اللَّهِ﴾ **ئەوەی (کەباسکرا) فەرمانی خوایە** ﴿أَنْزَلَهُ إِلَيْكُمْ﴾ **کە بۆی ناردونەتە خوارەوە** ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ﴾ **وە هەر کەسێك خواناس بێت** ﴿يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ﴾ **گوناهەکانی بۆ دادەپۆشێ و** ﴿وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا﴾ **پاداشتی گەورەی دەداتێ. ٥)**

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟
عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ
فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن
تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ
وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا
إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا
عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾
أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ
قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ
لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ
وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ
سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ
ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾

**ئایـــەتی (٢٨) سورەتی (نوح):** عن أبي سعيد الخدري (رضـــى الله عنـــه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (لا تـصحب إلا مؤمنـاً، ولا يأكل طعامـك إلا تقـــي) (رواه أبـــو داودو الترمـــذي). ئەبو سەعید خودری – ڕەزای خـوای لێ بـــێ– دەڵـــێ: لەپێغەمبەری خـوام (ﷺ) بیـــست فـــەرمووی: (تـــەنها هاوڕێیەتی ئیماندار بکـــە، وە تـــەنها ئیمانـــــداری پاستەقینەو خواناس نانت بخوات).

**ئایـــەتی (١) سورەتی (المزمل):** عن سعيد بن هاشم (رضى الله عنه) قال: قال عائيشه (رضى الله عنه) خبرنا عن قيـام رسول الله (ﷺ) قالت: ألست تقرأ (يا أيها المزمـل)؟ قلـت: بلـى، قالـت فانهـا كانـت قيـام رسـول (ﷺ) وأصحابه حتى إنتفخت أقدامهم، وحسب لخرها في السماء ستة عشر شهراً ثم نـزل. (رواه ابـن أبـي حـاتم واسناده صحيح). سەعدی کوڕی هاشم دەڵێ: پرسیارم لەعائیشە – ڕەزای خوای لێ بێ– کرد ووتم –

﴿أَسْكِنُوهُنَّ﴾ (ژنانی تەڵاق دراو)دایان بنێن ﴿مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم﴾ لەو شوێنەی کە (خۆتان) دادەنیشن ﴿مِّن وُجْدِكُمْ﴾ بە پێ ی تواناتان ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ﴾ وە زیانیان پێ مەگەیەنن ﴿لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ﴾ تا تەنگیان پێ هەڵچنن ﴿وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ﴾ وە ئەگەر دووگیان بوون ﴿فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ﴾ ئەوە خەرجیان بکێشن ﴿حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ تا سکەکەیان دائەنێن ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ﴾ ئەوسا ئەگەر شیریان دا بە منداڵەکەتان ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەوا ئێوەش کرێ یان بدەنێ ﴿وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾ وە لەناو خۆتاندا ڕاوێژ بکەن بەچاکی (دەربارەی منداڵەکە) ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ﴾ وە ئەگەر تەنگیتان کرد(نەسازان لە کرێکەدا) ﴿فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾ ئەوە با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ. ٦)﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ﴾ بادەوڵەمەند بەپێ ی دەوڵەمەندیی نەفەقە بدات ﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ﴾ وە هەر کەسێك کەم دەستوەژار بوو ﴿فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ﴾ بابەپێ ی ئەوەی کەخوا داویتێ نەفەقەبدات ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا﴾ خوا داوا لەکەس ناکات ﴿إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا﴾ مەگەر بە پێ ی ئەوەی کەپێی داوە ﴿سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت.) ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ﴾ زۆر لەدێهاتی (و شاری)یەکان سەرپێچی یان کرد ﴿عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ﴾ لە فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەکانی ﴿فَحَاسَبْنَٰهَا﴾ ئێمەش پرسینەوەمان لەگەڵ کردن ﴿حِسَابًا شَدِيدًا﴾ بە پرسینەوەیەکی سەخت ﴿وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا﴾ وە سزامان دان بەسزایەکی دژوار. ٨)﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا﴾ ئیتر ئاکامی کردەوەی خۆیانیان چەشت ﴿وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا﴾ وە سەرئەنجامی کاریان بوو بەزیانباریی و خەسارۆمەندی. ٩)﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی سەخت ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ کەواتە لەخوا بترسن ﴿يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئەی خاوەنانی ژیری ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناو ﴿قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾ بێگومان خوا قورئانی بۆ دابەزاندوون. ١٠) ﴿رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ﴾ (هەروەك بۆی ناردون) پێغەمبەرێك کەدەخوێنێتەوە بۆتان ﴿ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ﴾ ئایەتەکانی خوا کە ڕوون کەرەوەن﴿لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ تا دەربێنێ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوەی چاکیان کردووە ﴿مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لەتاریکستانی (بێ دینی) بۆ ڕووناکی (دینداری) ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ﴾ وە هەر کەسێك باوەڕ بێنێ بەخوا ﴿وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ وە کاری چاك بکات ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ﴾ دەیخاتە ناو بەهەشتانێکەو ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە بە ژێر درەختەکانیدا جۆگە ئاوی زۆر دەڕوا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ تیادەمێننەوەبەهەمیشەیی ﴿قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا﴾ بێ گومان خوا (لەوێ) ڕزقی چاکی بۆ ئامادەکردووە. ١١)﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى﴾ خوا زاتێکە ﴿خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە ﴿وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ وە بەوێنەی ئەوان زەویشی دروست کردووە ﴿يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ﴾ فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت ﴿لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ تا چاك بزانن کە خوا ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ﴾ وە بێگومان خوا ﴿قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا﴾ بەزانین دەوری هەموو شتێکی داوە. ١٢)



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ تَبْتَغِى مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ وَٱللَّهُ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١﴾ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ
وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِىُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا
فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ
فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِىَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ
﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْهِ
فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا
خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ
ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ
نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ
لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١-٤) سورەتی (التحریم): ﴿یَا أَیُّهَا النَّبِیُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ .... وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِیرٌ﴾ بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە لای زەینەبی کچی جەحش دەمایەوە هەنگوینی دەخوارد بۆیە من و حەفصە لە نێو خۆمانا ڕێککەوتین کە پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای هەرکاممان پێی بڵێین: مەغافیرت خواردوە؟ بەڕاستی بۆنی مەغافیرت لێ دێ -مەغافیر شیلەیەکی شیرینی بۆن ناخۆشە- پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر بەڵکو من لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردوە، دڵنیابە جارێکی تر نایخۆم سوێندیشم خواردوە -کە ئیتر نایخۆم- ئەم قسەو باسە لای کەسی تر باس مەکە) جا ئەم ئایەتانە دابەزی ﴿یَا أَیُّهَا النَّبِیُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ... وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِیرٌ﴾. -

## سورەتی ﴿ التحريم ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردویت ﴿تَبْتَغِى مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ﴾ تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لەکاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. ١) ﴿قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ بێگومان خوا دایناوە بۆتان ﴿تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان ﴿وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ﴾ خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾ وە ئەو زانای کاردروستە. ٢) ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ﴾ کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) بەنهێنی ﴿إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا﴾ لای هەندێ لەژنەکانی قسەیەکی درکاند ﴿فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ﴾ ئینجا کەئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) ﴿وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾ خواش پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد ﴿عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ﴾ (پێغەمبەر (ﷺ)) هەندێك (لەقسەکان)ی باسکرد و بێ دەنگ بوو لە ﴿بَعْضٍ﴾ هەندێکی تری ﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ﴾ ئینجا کە پێ ی ووت (ژنەکەی) ووتی: ﴿مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا﴾ کێ ئەمەی پێ گەیاندی ﴿قَالَ نَبَّأَنِىَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێ ی گەیاندم. ٣) ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ (ئەی حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خودا (جێ ی خۆیەتی) ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) ﴿وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْهِ﴾ وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لەدژی پێغەمبەر (ﷺ) (سەرکەوتوو نابن) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ﴾ چونکە بێگومان پشگیری ئەوە خوایە ﴿وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ جوبرەئیل و ئیماندارە چاکەکانیش ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون. ٤) ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ﴾ دڵنیابن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات پەروەردگاری ﴿أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾ لەباتی ئێوە ژنانێکی باشتر لەئێوەی دەداتێ ﴿مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ﴾ موسڵمانانی، بڕوادارانی ﴿قَٰنِتَٰتٍ﴾ ملکەچانی ﴿تَٰٓئِبَٰتٍ﴾ تەوبەکارانی ﴿عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ﴾ خواپەرستانی، ڕۆژووگران ﴿ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا﴾ لە بێوەژنان و کیژان. ٥) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ﴿قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لەئاگرێك ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ کە سووتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾ سەرپەرشتی ئەو (ئاگری دۆزەخەن) چەند فریشتەیەکی دڵ ڕەقی توندو تیژی وا ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ﴾ کە نافەرمانی خوا ناکەن لەوەی کەفەرمانیان پێ بدات ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ وە ج فەرمانێکیان پێ بدرێ دەیکەن. ٦) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ﴿لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ﴾ ئەمڕۆ (کەڕۆژی دوایی دا) عوزر مەهێننەوە ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ چونکە بێگومان پاداشت دەدرێنەوە لەسەر ئەوەی کە دەتانکرد. ٧)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾

- نەسائی دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا کەنیزەکێکی هەبوو -ماریەی قیبطی- سەرجێی لەگەڵدا دەکرد عائیشە و حەفصە ئەوەندە بەرۆکی پێغەمبەریان (ﷺ) گرت تا پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆی حەرام کرد کە جارێکی تر لەگەڵی دروست بێ ئەدجا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ ....﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی ( ٥ ) سورەتی ( التحریم )**: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِّنكُنَّ ....﴾ ئیبن ئەبی حاتیم گێڕاویەتیەوە لە عومەری کوڕی خەططابەوە کە دەڵێ: هەواڵم پێ گەیشت کە لە نێوان پێغەمبەرو (ﷺ) خێزانەکانیدا کێشەیەک هەیە ، منیش ڕۆشتم بۆ لای یەک بە یەکی خێزانەکانی ، پێم دەووتن ، سوێند بەخوا لە داواکانی پێغەمبەر (ﷺ) وازدێنن یا خوا -

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿تُوبُوا إِلَى اللَّهِ﴾ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﴿تَوْبَةً نَصُوحًا﴾ بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاریی ﴿عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ تا پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش ببێ ﴿وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ﴾ وە بتان خاتە ناو باخاتێکەوە ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە دەڕوا بەژێریاندا جۆگە ئاوی زۆر ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ﴾ لەڕۆژێکدا کە خوا پێغەمبەر (ﷺ) و کەسانێ کەباوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا سەرشۆڕیان ناکات ﴿نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ ڕووناکی (ئیمان)یان دەڕوات لەپێشیانەوەو ﴿وَبِأَيْمَانِهِمْ﴾ لەلای ڕاستیانەوە ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾ دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ڕووناکی یەکەمان بۆ زیادو تەواوبکە ﴿وَاغْفِرْ لَنَا﴾ وەلێمان خۆش بە ﴿إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی هەر تۆیت بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتداری. ٨) ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ بجەنگە لەگەڵ بێ باوەڕانو دوو ڕووانـدا ﴿وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ وەتوندو تیژ بەلەگەڵیاندا ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ وەجێیان دۆزەخە ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ کە سەرئەنجامێکی زۆر خراپە. ٩) ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ﴾ خوا بۆ بێ باوەڕان ژنی نووحو ژنی لووطی بەنموونە هێنایەوە ﴿كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ﴾ کە لەژێر (نیکاحی) دوو بەندەدا بوون ﴿مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ﴾ لەبەندە چاکەکانی ئێمە ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ ئینجا خیانەتیان لەگەڵ کردن ﴿فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ کەچی (مێردەکانیان) نەیانتوانی شتێك لەسزای خوایان لێ دووربخەنەوە ﴿وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ﴾ وەپێیان وترا کەبڕۆنە ناو ئاگرەوە ﴿مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی کەدەڕۆنە ناویەوە. ١٠) ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا﴾ (هەروا) خوا نموونەیەکی تری هێنایەوە ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ﴾ (بە) ژنی فیرعەون ﴿إِذْ قَالَتْ﴾ کاتێك کەوتی ﴿رَبِّ ابْنِ لِي﴾ پەروەردگارم بۆم دروست بکە ﴿عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ﴾ لای خۆت ماڵێك لە بەهەشتدا ﴿وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ﴾ وە ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکانی ﴿وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ وەڕزگارم بکە لە گەل ستەمکاران. ١١) ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ﴾ وە(بە) مەریەمی کچی عیمران ﴿الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾ ئەوەی کە داوێنی خۆی پاك ڕاگرت ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ﴾ ئەوسا ئێمە فوومان پیاکرد ﴿مِنْ رُوحِنَا﴾ لەڕۆحێك کە خۆمان دروستمان کردووە ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ﴾ وە باوەڕی هێنا بوو بە ووتەکانی پەروەردگاری خۆی و کتێبەکانی ﴿وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾ وە لەڕیزی فەرمانبەرداراندا بوو. ١٢)

## سُورَةُ المُلْكِ

آیاتها ٣٠ — ترتیبها ٦٧

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ۖ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ ۖ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾

- هاوسەری چاکتر لە ئێوەی دەداتێ لە جیاتی ئێوە ، تا گەڕشتمە کۆتاەمین یان ، ووتی: ئەی عومەر مەگەر پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئامۆژگاری خێزانەکانی پێ ناکرێ ؟! ئیتر منیش بێ دەنگ بووم ، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿عَسَىٰ رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ....﴾.

- دەربارەی ئەو نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵمان بدرێ، ئەویش ووتی: (یا أیها المزمل)ت نەخوێندۆتەوە؟ ووتم با خوێندومەتەوە، ووتی بەوە ئێوە بوو- کە لە سەرەتای سورەتەکەدا هاتووە- ئەو نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی -ئەوەندە ئەو نوێژیان کرد- هەتا قاچیان ئاوسا، کۆتایی سورەتەکە شانزدە مانگ پاش سەرەتاکەی دابەزی.

ئایەتی (٤) سورەتی (المزمل): عن أنس أنه سئل عن قراءة رسول الله (ﷺ) فقال: -

## سورەتی ﴿ الملك ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ گەورەو پیروزە ئەو زاتەی کەهەرچی دەسەلات و پاشایی هەیە بەدەست ئەوە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وەئەو دەسەلاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا. ١) ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ ئەو زاتەی کەمردن و ژیانی داهێناوە﴿لِيَبْلُوَكُمْ﴾ تا تاقیتان بکاتەوە ﴿أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ کەکردەوەی کامتان چاکترە ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ وەهەر ئەوە بالادەست و لێ خۆشبوو. ٢)﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا﴾ ئەو زاتەی کەحەوت ئاسمانی دروست کردووە یەک لەسەر یەک ﴿مَا تَرَىٰ﴾ تۆ نابینیت (ئەی تەماشاکەر) ﴿فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ﴾ لەدروست کراوەکانی خوای میهرەباندا ﴿مِنْ تَفَاوُتٍ﴾ هیچ نارێکی یەک ﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ﴾ چاوبگێرەو وورد بەرەوە (بزانە) ﴿هَلْ تَرَىٰ مِنْ فُطُورٍ﴾ ئایا هیچ نا تەواوی یەک دەبینیت. ٣)﴿ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ﴾ دووبارە چاو بگێرە ﴿كَرَّتَيْنِ﴾ یەک لەدوای یەک ﴿يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا﴾ چاووت بەریسوایی و نائومێدیی دەگەڕێتەوە بۆلای خۆت ﴿وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ وە ئەو (چاوەت) ماندووە تاقەتی چووە. ٤)﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾ سوێندبێ بێ گومان ئاسمانی دنیامان رازاندۆتەوە بە چرای زۆر (ی ئەستێرە) ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ﴾ وەگێڕاومانن بەرەجمی شەیتانەکان ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾ وەئامادەمان کردووە بۆ ئەوان (لەقیامەتدا) سزای ئاگری هەلگیرساو. ٥)﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ﴾ وە بۆ ئەوانەی کەبێ بڕوان بە پەروەردگاریان ﴿عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ سزای دۆزەخ ئامادەیە، کە مەنزلگایەکی زۆر خراپە. ٦) ﴿إِذَا أُلْقُوا فِيهَا﴾ کاتێک کە فڕێ درانە ناوی یەوە ﴿سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا﴾ لەدۆزەخەوە لوورەو نرکەیەک دەبیستن ﴿وَهِيَ تَفُورُ﴾ وەئەو ئەکوڵێ و جۆش دەخوات. ٧)﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ﴾ نزیکە (دۆزەخ) لەڕقانا پارە پارە ببێ ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ﴾ هەرکاتێ دەستەیەک فڕێ بدرێنە ناوییەوە ﴿سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا﴾ دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکەن ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ﴾ ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆنەهاتووە (لەدنیادا). ٨)﴿قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ﴾ دەڵێن بەڵێ بۆمان هاتووە ﴿فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا﴾ بەلام بەدرۆمان دەزانی، و دەمان ووت (پێی) ﴿مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾ خوا هیچی نەناردۆتە خوارەوە ﴿إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾ ئێوە بەس لەگومراییەکی گەورەدان. ٩)﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ﴾ وە دەڵێن ئەگەر قسەی (پێغەمبەران) مان ببیستایە ﴿أَوْ نَعْقِلُ﴾ یاتێ بگەیشتینایە ﴿مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ئەمڕۆ لەهاوڕێ یانی دۆزەخ نەدەبووین. ١٠)﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ﴾ ئیتر پێ یان نا لەگوناهەکەیان ﴿فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ کەوابوو دووریی لەمیهرەبانی خوا بۆ هاوڕێ یانی دۆزەخ. ١١)﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ﴾ ئەوانەی لەپەنهانیا لەخوای خۆیان دەترسن ﴿لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ لێ خۆش بوون و پاداشتی گەورەیان بۆهەیە. ١٢)

وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ بَل لَّجُّواْ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾

**- (كانت مداً، ثم قرأ (بسم الله الرحمان الرحيم) يمد (بسم الله) ويمد (الرحمان) ويمد (الرحيم)) (رواه البخاري). پرسیار کرا لە ئەنەس دەربارەی شێوەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر** (ﷺ) **ئەنەسیش ووتی: (قورئان خوێندنەکەی درێژ دەکردەوە، ئەنجا:** بسم الله **الرحمان الرحيم ی خوێندەوە، (بسم الله)ی درێژ دەکردەوە، (الرحمن)ی** درێژ دەکردەوە (الرحیم)ی درێژ دەکردەوە).

**ئایەتی (٥) سورەتی (المزمل):** عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: سأل حارث بن هشام رسول الله (ﷺ)، **كيف يأتيك الوحي؟ فقال: (أحيانا** يأتيني مثل صلصلة الجرس. وهو أشده علي، فيفصم عني وقد وعيت **عنه ما قال،** وأحيانا يمثل لي الملك رجلاً فيكلمني فأعي ما يقول) (رواه البخاري و مسلم). عائیشە -

﴿وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ﴾ ئێوە قسە بەپەنهانی بکەن یان بەئاشکرا (بۆ خوا یەکسانە چونکە) ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئەو (خوای گەورە) ئاگادارە بەخودی (نهێنی) دڵان. ١٣) ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾ ئایا ئەو خوایەی کەمەردوومی دروست کردووە ئاگای لەنهێنی یان نی یە ﴿وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ لەکاتێکدا کە ئەو ووردبین و ئاگادارە. ١٤) ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا﴾ خوا ئەو زاتەیە کەزەوی بۆ رام کردوون ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا﴾ دەی بگەڕێن بەقەراغ و لاشانیدا ﴿وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ﴾ وە لەڕۆزی خوا بخۆن ﴿وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ وە هەر بۆلای ئەوە گەڕانەوە. ١٥) ﴿ءَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾ ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لەئاسمانە ﴿أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ﴾ کە بتانباتە خوارەوە بەناخی زەویی دا ﴿فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ لە کاتێکدا کەزەوی (وەکە دەریا) گێژ بخوات (بێتە لەرزین)؟ ١٦) ﴿أَمْ أَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾ ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لە ئاسمانە ﴿أَنْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا﴾ کە بای توندتان بینێرێتە سەر بەوورده زیخەوە ﴿فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ ئەو دەمە تێ دەگەن کە هەڕەشەی ئێمە چۆنە؟. ١٧) ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئەو (گەلانەی) کەلە پێش ئەماندا بوون (پێغەمبەرانی ئێمەیان) بەدرۆزن دانا ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ جا چۆن بوو بەگژدا چوونەوەی ئێمە (لەوان). ١٨) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ﴾ ئایا سەیری باڵندەکان ناکەن بەژوور سەریانەوە ﴿صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ﴾ بەباڵ کراوەیی و هێنانەوەیەک ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ﴾ رای نەگرتوون (بەو ئاسمانەوە) خوا نەبێ ﴿إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ کەئەو بەهەموو شتێک بینایە. ١٩) ﴿أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ جُنْدٌ لَكُمْ﴾ ئایا ئەوە کێ یە ئەو کەسەی کە لەشکری ئێوەیە ﴿يَنْصُرُكُمْ مِنْ دُونِ الرَّحْمَٰنِ﴾ یارمەتتیان دەدات لە جیاتی خوای میهرەبان؟! ﴿إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ بێ بڕوایان هەر لە فریو خواردنان. ٢٠) ﴿أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ﴾ ئایا ئەوە کێ یە ئەو کەسەی کە ڕۆزیتان دەدات ﴿إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ﴾ ئەگەر خوا ڕۆزی خۆیتان لێ بگرێتەوە؟ ﴿بَلْ لَجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾ بەڵکو (بەئارەزوو) درێژەیان دا بەسەرکەشی و دوور کەوتنەوە (لەڕێ ی ڕاست). ٢١) ﴿أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ﴾ ئایا ئەو کەسەی بڕواو بەدەما بکەوێ باشتر ڕێ دەردەکات؟ ﴿أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ یا یەکێک کە قنج و قیت بڕوا بەسەر ڕێگایەکی راست و ڕەواندا؟ ٢٢) ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: هەر خوایە کە دروستی کردوون ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾ وە گوێ و چاوو دڵی پێ داوون ﴿قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر بە دەگمەن سوپاسی (ئەم بەهرانە) دەکەن. ٢٣) ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ بڵێ: هەر خوایە کە ئێوەی بڵاوکردۆتەوە لە زەوی دا ﴿وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ وەهەر لای خواش کۆدەکرێنەوە (لەڕۆژی دواییدا). ٢٤) ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ﴾ (بێ بڕواکان بەگاڵتەوە) دەڵێن: ئەم بەڵێنە (بەهاتنی ڕۆژی دوایی) کەی دەبێ ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر راست دەکەن. ٢٥) ﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللَّهِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: زانینی ئەو ڕۆژە هەر لای خوایە ﴿وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ وەمن تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام. ٢٦)

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾

- (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: حارثی کوڕی هیشام پرسیاری کرد لەپێغەمبەر (ﷺ): کەچۆن نیگات بۆ دێت؟ فەرمووی: (هەندێ جار کە نیگام بۆ دێت وەك زرنگانەوەی زەنگ وایە ئەمە قورسترین جۆری نیگایە کەبۆم دێت جاکە ئەو زرنگانەوە لێم جوێ دەبێتەوە بێگومان (جیبرییل) هەرچی پێ ووتووم وەرم گرتووە لێی، وە هەندێ جار جیبرییل خۆی دەباتە سەر شێوەی پیاوێك و سروشەکەم پێ ڕادەگەیەنێ منیش هەرچی دەڵێ لێی تێدەگەم و وەری دەگرم).

**ئایەتی (٨) سورەتی (المدثر):** قال رسول الله (ﷺ): (كيف أنعم وصاحب القرن قد التقم القرن وحنى جبهته ينظر متى يؤمر لينفخ؟) فقال أصحاب رسول الله (ﷺ): فما تأمرنا يا رسول الله؟! قال: (قولوا حسبنا الله ونعم الوكيل على الله توكلنا)(رواه أحمد). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (چۆن لەزەت لە-

﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً﴾ کاتێک بێ بڕوایان ئەو سزایەیان بەدی کرد لەنزیک خۆیانەوە﴿سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ تاڵ دەبێ روخساری ئەوانەی کەبێ بڕوابوون ﴿وَقِيلَ هَـٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ﴾ وە(پێ یان) دەووترێ: ئەمەیە ئەو(رۆژە)ی کەداواتان دەکرد ٢٧) ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ بڵێ: پێیم بڵێن ﴿إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ﴾ ئەگەر خوا من و ئەو(موسڵمانانە)ی کەلەگەڵمان لەناومان ببات ﴿أَوْ رَحِمَنَا﴾ یا میهرەبانییمان لەگەڵ بکات ﴿فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَـٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ دەی کێ پەنای بێ بڕوایان دەدات لەسزای سەخت ٢٨) ﴿قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ بڵێ: هەرئەوە خوای بەخشندە کەبڕوامان پێ هێناوە ﴿وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا﴾ وەهەر بەو پشتمان بەستووە ﴿فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ جا لە مەولا دەزانن کەکێ لە گومڕایی یەکی ئاشکرا دایە. ٢٩) ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾ بڵێ: پێیم بڵێن ﴿إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا﴾ ئەگەر ئاو (ی خواردنەوە)تان رۆبچێ بە ناخی زەوی دا ﴿فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ﴾ دەی کێ (بێجگە لە خوا) ئاوی زوڵاڵتان بۆ دەهێنێ.٣٠)

## سورەتی ﴿القلم﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿نٓ﴾ بە(نوون) دەخوێنرێتەوە، خوا بەماناکەی زاناترە بۆ زیاتر زانیاری سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) بکە ﴿وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ سوێند بە پێنووس و بەو دێرانەی دەینوسن. ١)﴿مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ تۆ لە سایەیی بەخششی خواوە شێت نیت. ٢)﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ وە بێ گومان پاداشتی نەبڕانەوە هەیە بۆ تۆ. ٣)﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ وە بەڕاستی تۆ لەسەر رەوشت و خویەکی ئێجگار بەرز و گەورەیت. ٤)﴿فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ﴾ جا بەم زووانە تۆش و ئەوانیش دەبینن. ٥)﴿بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ﴾ کەکامتان شێتن. ٦)﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بێ گومان پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس زاناترە بەو کەسەی کەرێ ی راستی خوای وون کردبێ ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ﴾ وە ئەو زاناترە بەو کەسانەی کەرێ ی راستیان گرتبێ. ٧)﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ فەرمان بەری ئەوانە مەکە کە قسەکانت بە درۆ دەزانن. ٨) ﴿وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ﴾ حەزیان دەکرد کەتۆ نەرمی نیشان بدەیت ﴿فَيُدْهِنُونَ﴾ ئەوسا ئەوانیش نەرمیی (بەرانبەرت) دەنوێنن. ٩) ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ﴾ فەرمانبەریی مەکە بۆ هیچ سوێندخۆرێکی ﴿مَّهِينٍ﴾ پەست و ریسوا(ی درۆزن). ١٠)﴿هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ﴾ پیتکە گری ئاشوکەر بۆ قسە هێنان و بردن. ١١)﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ﴾ زۆر بەرگری کەر لەچاکە ﴿مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ ستەمکاری گوناهکار. ١٢)﴿عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ دڵ رەقی کەللەشەق دوای ئەوە زۆڵ. ١٣)﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾ لەبەر ئەوەی کە خاوەنی دارایی و کوڕی زۆرە. ١٤) ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ﴾ کەئایەتانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە دەڵێ: ﴿أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ (ئەمان) ئەفسانەی پێشینانن. ١٥)

سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾

-ژیان دەبەم کە ئیسرافیل دەمی وا بەسەر کەڕناکەوە سەری نزم کردۆتەوە چاوەڕوان دەکات کەی فەرمانی پێ بکرێت یەکسەر فووی پیا کات) ئەنجا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان: کەواتە فەرمانت چی یە بۆمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بڵێن خوامان بەسە و خوا باشترین پشتیوانە ، تەنها پشت بە خوا دەبەستین).

**ئایەتی (٣١) سورەتی (المدثر):** عن أبي ذر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (أطت السماء وحق لها **أن تئط، ما فيها موضع** أربع أصابع الا وملك واضع جبهته لله ساجداً)(رواه أحمد). ئەبو زەڕ (ڕەزای **خوای لێ بێ)** لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ئاسمان (لەبەر قەرەباڵغی) **نەوییەتەوەو نقەی دێ،** هەقیشیەتی کە بنەوێتەوە و نقەی بێت چونکە جێگای هەر چوار پەنجەیەک -

﴿سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ﴾ بەم زووانە سەری لووتی داخ دەکەین. ١٦ )﴿إِنَّا بَلَوۡنَٰهُمۡ﴾ ئێمە تاقیمان کردنەوە ﴿كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ هەروەک لەمەوپێش خاوەنانی ئەو باخەمان تاقی کردەوە ﴿إِذۡ أَقۡسَمُواْ﴾ کە (لەشەوا) سوێندیان خوارد ﴿لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ﴾ کەلەدەمی بەرەبەیانا (بەرەکەی ) بڕنن (تا هەژاران نەزانن). ١٧ )﴿وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ﴾ هیچی (بۆ هەژاران) لێ دەرنەکەن . ١٨ )﴿فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ﴾ ئینجا بەڵایەک لەلایەن پەروەردگاتەوە سوڕایەوە بەسەرباخەکەدا ﴿وَهُمۡ نَآئِمُونَ﴾ لەکاتێکدا کەئەوان خەوتبوون. ١٩ )﴿فَأَصۡبَحَتۡ كَٱلصَّرِيمِ﴾ ئەوساوەک باخێکی ڕنراوی لێ هات. ٢٠ )﴿فَتَنَادَوۡاْ مُصۡبِحِينَ﴾ لە شەبەقدا بانگی یەکتری یان کرد. ٢١ )﴿أَنِ ٱغۡدُواْ عَلَىٰ حَرۡثِكُمۡ﴾ کەهەستن بچن بۆسەر باخەکەتان ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰرِمِينَ﴾ ئەگەر ئەتانەوێ بیبڕن. ٢٢ )﴿فَٱنطَلَقُواْ﴾ ئینجا کەوتنە ڕێ ﴿وَهُمۡ يَتَخَٰفَتُونَ﴾ وە ئەوان بەچرپە بەیەکتریان ئەووت. ٢٣ )﴿أَن لَّا يَدۡخُلَنَّهَا ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكُم مِّسۡكِينٞ﴾ ئەمڕۆ هیچ هەژارێک نەیێ بەسەرتاندا لەناو باخەکەدا. ٢٤ )﴿وَغَدَوۡاْ عَلَىٰ حَرۡدٖ قَٰدِرِينَ﴾ دەمەو بەیان ڕۆیین لایان وابوو کەدەتوانن بێ بەشیان بکەن. ٢٥ )﴿فَلَمَّا رَأَوۡهَا قَالُوٓاْ﴾ کە باخەکەیان دیی (بەسوتاوی) ووتیان ﴿إِنَّا لَضَآلُّونَ﴾ ئێمە ڕێ مان وون کردووە (ئەمە باخەکەی ئێمە نی یە ). ٢٦ )﴿بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ﴾ نەء بەڵکو بەش بڕاو کراووین ٢٧ )﴿قَالَ أَوۡسَطُهُمۡ﴾ برا ناوەنجی یەکەیان (لەژێریدا ) ووتی ﴿أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ﴾ مەگەر پێم نەووتن؟. ﴿لَوۡلَا تُسَبِّحُونَ﴾ بۆچ یادو سوپاسی خواناکەن. ٢٨ )﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا﴾ هەموو ووتیان: پاک و بێ گەردی بۆ پەروەردگارمانە (ستەم لەکەس ناکات ) بێگومان ئێمە خۆمان ﴿ظَٰلِمِينَ﴾ ستەم کارین.٢٩ )﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾ ئینجا روویان کردە یەکتریی ﴿يَتَلَٰوَمُونَ﴾ بە سەرزەنشت کردن. ٣٠ )﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ﴾ ووتیان: ئەی وای بۆخۆمان بەڕاستی لەخوا یاخی بووین. ٣١ )﴿عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبۡدِلَنَا خَيۡرٗا مِّنۡهَآ﴾ ئومێدەوارین کە خوا لەجیاتی ئەو باخە باشترمان بداتێ ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ﴾ بە ڕاستی ئێمە هیوامان هەر بە پەروەردگاری خۆمانە. ٣٢ ) ﴿كَذَٰلِكَ ٱلۡعَذَابُ﴾ ئاوا یە سزا(ی خوا لەجیهاندا )﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُ﴾ وە سزای ڕۆژی دوایی گەلێ گەورەترە ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ خۆزگە بیانزانیایە. ٣٣ )﴿إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ بێگومان بۆ پارێزکاران هەیە ﴿عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لای پەروەردگاریان باخاتی پڕ لەنازو نیعمەت. ٣٤ )﴿أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ چۆن ئێمە موسڵمان و بەدکاران وەک یەک لێ دەکەین؟. ٣٥ )﴿مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ﴾ ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێک دەدەن. ٣٦ )﴿أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ﴾ نەخێر ئایا کتێبێکی (ئاسمانی )تان هەیە ئەمەی تیا دەخوێننەوە. ٣٧ )﴿إِنَّ لَكُمۡ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ وە لەو کتێبەدا ڕێتان پێ دراوە چیتان بوێ ئەوە هەڵبژێرن بۆ خۆتان؟ ٣٨ )﴿أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ﴾ یا پەیمانی بەهێزتان هەیە لەگەڵمان ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ تا ڕۆژی دوایی ﴿إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ﴾ کەهەرچی ئێوە بڕیار بدەن بتانەدرێتێ. ٣٩ )﴿سَلۡهُمۡ﴾ بپرسە لێ یان (بزانە ) ﴿أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾ کامیان زامنی ئەم کارەن. ٤٠ )﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ﴾ ئاخۆ هاوبیریان هەیە (لەم قسەیەدا ) ﴿فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ﴾ دەبا هاوبیرەکانیان بێنن ﴿إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر راست دەکەن. ٤١ )﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ﴾ لەڕۆژێکدا خوای گەورە لاقی پیرۆزی دەردەخات (باوەڕمان پێیەتی و چۆنێتیەکەی نازانین) ﴿وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ﴾ وە (بە تەوسەوە ) بانگ دەکرێن بۆ نوێژکردن و سوژدە بردن و ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ﴾ ناتوانن (بی بەن ). ٤٢ )

خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ﴿٤٩﴾ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾




بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾

- تێیدا فریشتەیەك ناوچاوانی لەسەر دڵناوە و سوژدە بۆ خوا دەبات).

**ئایەتی (٢٣) سوورەتی (القیامة)**: عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: إن ناساً قالوا: يا رسول الله هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال: (هل تُضارون في رؤية الشمس والقمر ليس دونهما سحاب؟) قالوا: لا، قال: (إنكم ترون ربكم كذلك) (رواه البخاري ومسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: کەسانێك ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا لەڕۆژی دوایی دا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: (ئایا گومان و جیاوازیتان دەبێت لەبینینی خۆرو مانگ کەر هەور پێشیان نەگرێت؟) ووتیان: نەخێر، فەرمووی: (بێگومان ئێوەش هەر بەجۆرە پەروەردگارتان دەبینن).

**ئایەتی (٤٠) سوورەتی (القیامة)**: عن عائشة (رضي الله عنها) عن رجل: إنه كان فوق سطح يقرأ ويرفع صوته بالقرآن-

﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ چاویان شۆڕو﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞ﴾ ڕیسوایی دایان دەگرێ ﴿وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى﴾ بەڕاستی جاران کە بانگ دەکران بۆ ﴿ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ﴾ سوژدەو (نەیان دەبرد) کەساغیش بوون. ٤٣) ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ﴾ وازم لێ بێنە بۆ ئەوانەی کەئەم قورئانە بەدرۆ دەزانن ﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەرەبەرە کێشیان دەکەم بە ڕەنگێک کەپێ نەزانن. ٤٤)﴿وَأُمۡلِي لَهُمۡ﴾ وە مۆڵەتیان دەدەم ﴿إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ﴾ بەڕاستی پیلانی من تۆکمە و بەهێزە (لەبەرانبەر پیلانی ئەواندا). ٤٥)﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا﴾ ئاخۆ تۆ لە بێ بڕوایان داوای کرێ (ی کۆششی پێغەمبەریتی)یان لێ دەکەیت ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ﴾ ئەوانیش لەبژاردنی قەرزداری گران بارن. ٤٦)﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ﴾ یا ڕووپەڕەی غەیبیان لەلایە ﴿فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ﴾ وە ئەوان لەبەری دەنووسنەوە. ٤٧)﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ﴾ (ئەی موحەممەد(ﷺ))دان بەخۆتا بگرەو چاوەڕوانیی فەرمانی خوات بکە ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ﴾ وەک هاوڕێ ی نەهەنگەکە مەبە (کە یونس پێغەمبەره(عليه السلام)) ﴿إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴾ کاتێک کە بانگی (خوای) کرد وە ئەو پیشی خواردبۆوە (لە بێ بڕوایی گەلەکەی). ٤٨)﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ئەگەر میهرەبانی یەک لەلایەن پەروەردگاریەوە فریای نەکەوتایە ﴿لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ﴾ فڕێ دەدرایە دەشتێکی ڕووتەن، وە ئەو بەدناو دەبوو. ٤٩)﴿فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ ئینجا پەروەردگاری هەڵی بژاردەوە ﴿فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە کردی (بەیەکێک) لەچاکان. ٥٠) ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی نزیک بوو بێ بڕواکان ﴿لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ هەڵت خلیسکێنن بە چاو (ی پیس)یان ﴿لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ﴾ لەکاتێکدا کە قورئان دەبیستن ﴿وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ﴾ وە دەیان ووت: بە ڕاستی ئەم (پێغەمبەرە) شێتە. ٥١)﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ لەکاتێکدا کەئەم قورئانە هەر ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان. ٥٢)

## سورەتی ﴿الحاقة﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ ڕۆژی دوایی. ١) ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ چی یێ ئەو ڕۆژە. ٢)﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ تۆ چووزانیت ئەو ڕۆژە چی یە. ٣)﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ﴾ گەلی عادو سەموود، ئەو ڕۆژەیان بەدرۆ زانی (کە دڵەکان دادەخورپێنێ). ٤)﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ﴾ ئینجا (گەلی) سەموود لە ناوبران بە نەعرەتەیەکی زۆر گەورە. ٥)﴿وَأَمَّا عَادٞ﴾ وە (گەلی) عادیش ﴿فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ﴾ لە ناوبران بەبایەکی سەختی ساردی بەتینی بەگرمە. ٦)﴿سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ﴾ (خوا) زاڵی کرد بەسەریاندا ﴿سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗا﴾ حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەبێ وچان (لەناوی بردن) ﴿فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ﴾ ئەو گەلەت دەبینی لەو ماوەیەدا بێ گیان کەوتبوون ﴿كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ﴾ وەک قەدی داری خورمای گەندەڵ (ناوڕزاو). ٧)﴿فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ﴾ ئایا کەس دەبینیت لەوان کەمابێتەوە؟. ٨)

وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾

فإذا قـرأ: (ألـيس ذلـك بقادر على أن يحيي المـوتى) قـال: سـبحانك اللـهم فبلى. فسُئل عن ذلك فقال: سمعت رسـول الله يقـول ذلك) (رواه ابن أبي حـاتم). عائـشه (ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەگێڕێتـەوە کـەپیاوێك لـەماوەڵاتی پێغەمبـەر (ﷺ) لەسـەر بانێـك قورئانی دەخوێند، دەنگیـشی بـەرز دەکـردەوە بـەقورئان خوێندنەکـەی جا هـەر کاتێ ئەم ئایەتەی بخوێندایە (أليس ذلك بقادر على أن يحيي الموتى) دەیووت: (سبحانك اللهم فبلى) واتە پاك و بێ گەرد بۆ تۆ خوایە گیان بەڵێ دەتوانی زیندوویان کەیتەوە ئەنجا پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ئەو دوعایە، ئەویش ووتی: لەپێغەمبەرم (ﷺ) بیست ئەو دوعایەی دەخوێند).

سورەتی (الإنسان): عن ابن عباس (رضي الله عنهما): (أن رسول الله (ﷺ) كان يقرأ في صلاة الصبح يوم -

﴿وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ﴾ (هەر بەو ڕەنگە) فیرعەون و گەلانی پێش ئەوو ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ﴾ (دانیشتووان ئەو دێهاتە) سەرەو ژێربووەکان هاتن ﴿بِٱلْخَاطِئَةِ﴾ بە گوناهو خراپەوە ٩) ﴿فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ﴾ وە بێ فەرمانیی پێغەمبەری پەروەردگاریان کرد ﴿فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾ ئەوسا گرتنی بە گرتنێکی زۆر سەخت. ١٠) ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ﴾ بەڕاستی ئێمە: کاتێک کەئاو(ی تۆفان) سەرکەوت (باپیرەکانی) ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا (ئەی بێ بڕوایانی مەککە). ١١) ﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً﴾ تا ئەم کردەوەیە بکەینە بیرهێنەرەوە بۆ ئێوە ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾ وە لەگوێ ی گرێ گوێگرێکی تێگەشتوو. ١٢) ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ ئینجا کاتێک فوو کرا بە کەڕەنادا بەتاقە فوو کردنێک. ١٣) ﴿وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ﴾ وە زەوی و شاخەکان هەڵگیران ﴿فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً﴾ بەجارێک دران بەیەکدا (و تەخت کران). ١٤) ﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ﴾ ئەو ڕۆژە ڕووداوی گەورە ڕوودەدات ١٥) ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ﴾ وە ئاسمان لەت دەبێ ﴿فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ وە ئەو لەو ڕۆژەدا سست و (بێ کەڵکە). ١٦) ﴿وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا﴾ وە فریشتەکان لەکەنارێ ئاسماندان ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ﴾ وەلەو ڕۆژەدا هەشت (فریشتە) تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵ دەگرێ لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە. ١٧) ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ﴾ لەو ڕۆژەدا (لەبەردەمی خوادا) هەمووتان نیشان دەدرێن﴿لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ هیچ (کردەوەیەکی) پەنهانیتان بەنهێنی نامێنێتەوە. ١٨) ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ ئەوسا ئەو کەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی ﴿فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ﴾ دەڵێ: ها نامەکەم بگرن و بیخوێننەوە. ١٩) ﴿إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ﴾ بێگومان من خۆم دەمزانی کە تووشی ئەم لێپرسینەوەیە دەبم. ٢٠) ﴿فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ ئەو کەسە لەژیانێکی پەسەندا دەبێ. ٢١) ﴿فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ لە بەهەشتێکی بەرزدا. ٢٢) ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ کەمیوەی نزیکە دەستە. ٢٣) ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا﴾ (پێ یان دەوترێت) بخۆن و بخۆنەوە، نۆشتان بێ ﴿بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾ بەهۆی ئەو چاکانەوە کەلە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانە ٢٤) ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ﴾ بەڵام ئەو کەسەی کە نامە درایە دەستی چەپی دەڵێ: ﴿يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ﴾ خۆزگە هەر نامەم نەدرایەتێ. ٢٥) ﴿وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ﴾ وە نەم زانیایە چی یە (سەرئەنجامی) لێپرسینەوەم. ٢٦) ﴿يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ﴾ خۆزگە مردنەکەم یەکجاری بووایە. ٢٧) ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ﴾ سامانەکەم هیچ قازانجێکی پێ نەگەیاندم. ٢٨) ﴿هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ﴾ لەدەستم چوو دەسەڵاتەکەم. ٢٩) ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ﴾ (ئینجا بەچاودێرانی دۆزەخ دەوترێت) بیگرن زنجیر بکەنە دەست و گەردنی. ٣٠) ﴿ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾ لەپاشان بیبەن بۆ دۆزەخ (بیسوتێنن لە دۆزەخدا). ٣١) ﴿ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ﴾ ئینجا بەزنجیرێکی حەفتا گەزیی پی بەستنەوە. ٣٢) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ﴾ (چونکە ) بێگومان ئەو بڕوای بەخوای گەورە نەدەکرد. ٣٣) ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ وەهانە هانەی کەسی نەدەدا بۆ خۆراک دان بەهەژاران. ٣٤)

فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾



## سُورَةُ المَعَارِج

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ﴿١﴾ لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ﴿٢﴾ مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾

هـۆی هاتنـه خوارەوەی ئایەتی (١) سـورەتی (المعارج): ﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ نەسائی و حاکیم لـه عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خـوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کە دەڵێت: دەربارەی نـەضـری کـوڕی حارث ئـەم ئایەتـە دابەزی کە وتـی: (خوایە ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستە لـه لایەن تۆوە هاتووە ئەوە لە ئاسمانەوە بەردمان بەسـەردا ببارێنـه) ئـەوجا ئەوەی داوای کرد لـه ڕۆژی بـەدردا بەسەریدا هات و کوژرا وە ئەم ئایەتەش دەربارەی دابەزی ﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾.

- الجمعة (الٓمٓ تنزيل السجدة وهل أتى على الإنسان) (رواه مسلم). عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژی بەیانیان ڕۆژانی هەینی دا سورەتی (السجدة) و سورەتی (الإنسان)ی دەخوێند -پاش سورەتی (الفاتحة)-).

﴿فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ﴾ ئەمرۆ ئەویش لێرە نەدڵسۆزێکی هەیە (یارمەتی بدات). ٣٥ )﴿وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ﴾ وەنەخۆراکیک مەگەر لە کێم و زووخاوی جەستەی دۆزەخی یان. ٣٦ )﴿لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ﴾ کە(کەس) نایخوات گوناهباران نەبێت. ٣٧ )﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ﴾ جا سوێند بەوشتانەی کەدەیان بینن. ٣٨ )﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾ وە بەوەش کەنایان بینن. ٣٩ )﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ بێگومان ئەم قورئانە فەرموودەی رەوانە کراوێکی بەرێزو گەورەیە (لە خواوە بۆتان دێنێ). ٤٠ )﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ﴾ وە ئەم (قورئانە) قسەی شاعیر نی یە ﴿قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ﴾ زۆرکەم بڕوا دەهێنن (بەقورئان). ٤١ )﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ﴾ وە قسەی فاڵچی و جووکی نی یە ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆرکەم بیر دەکەنەوە. ٤٢ )﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (ئەم قورئانە) نێرراوەتە خوارەوە لەپەروەردگاری جیهانیانەوە. ٤٣ ) ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ﴾ ئەگەر (موحەممەد(ﷺ)) بەدەم ئێمەوە هێندێ (ووتەی) هەڵببەستایە. ٤٤ )﴿لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ﴾ بێگومان ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند. ٤٥ ) ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾ لەپاشان رەگی دڵیمان دەبڕی. ٤٦ )﴿فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ﴾ وە کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێبکات. ٤٧ )﴿وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وە بێ گومان ئەم قورئانە ئامۆژگاری و پەندە بۆ پارێزکاران. ٤٨ )﴿وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ﴾ وە بێگومان ئێمە دەزانین کەهێندێکتان قورئان بەدرۆ دەزانن. ٤٩ )﴿وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە بێ گومان ئەم قورئانە هۆی پەشیمانی بێ بڕوایانە. ٥٠ )﴿وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ﴾ وە بەراستی قورئان راستو درووستە.دڵنیا بەخشە. ٥١ )﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾ کەواتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) تۆش هەمیشە یادی پەروەردگاری گەورەی خۆت بکە. ٥٢ )

## سورەتی ﴿ المعارج ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ داواکارێک داوای سزایەکی (خوایی) کرد کە(ئەو سزایە) هەر روو دەدات. ١ )﴿لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ﴾ بۆ بێ بڕوایان نی یە هیچ پاڵ پێوەنەرێک (کەبیان پارێزێت). ٢ )﴿مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ﴾ لە (سزای) خوای خاوەن پلەو پایەی زۆر بەرز. ٣ )﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ﴾ فریشتەو جبرییل سەردەکەون بۆ لای خوا ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ لە رۆژێکدا کەئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە. ٤ )﴿فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾ کەوابوو خۆت رابگرە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەخۆراگرتنێکی چاک و جوان. ٥ )﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا﴾ بەراستی ئەوبێ بڕوایانە ئەو رۆژە بەدوور دەبینن. ٦ ) ﴿وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا﴾ ئێمەش زۆر بەنزیکی دەبینین. ٧ )﴿يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ﴾ ئەو رۆژەی کە ئاسمان وەک مسی تواوە(یان خلتەی زەیتی) لێ دێ. ٨ )﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ﴾ کەژەکانیش وەک خوری شی کراوەیان لێ دێ. ٩ )﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا﴾ وە هیچ کەسێک ناپرسێتەوە لە هیچ کەسێکی خۆشەویستی خۆی. ١٠ )

يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾ ۞ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّآ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾

**ئایەتی (٧) سوورەتی (الانسان)**: قال رسول الله (ﷺ): (من نذر أن يطيع الله فليطعه، ومن نذر أن يعصي الله فلا يعصه) (رواه البخاري). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەس فەرمانبەرداری خوای لەسەر خۆی نەزر کرد بافەرمانبەری بێت، بەڵام هەر کەس لەسەر خۆی نەزر کرد کە سەرپێچی خوا بکات ئەوە باسەر پێچی خوا نەکات).

**سوورەتی (المرسلات)**: عن ابن عباس (رضي الله عنهما) عن أمه: (أنها سمعت النبي (ﷺ) يقرأ في المغرب بالمرسلات عرفاً) (رواه أحمد). عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە دایکی یەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) لە نوێژی مەغریبدا سوورەتی (والمرسلات عرفا)ی دەخوێند).

**ئایەتی (٣٩) سوورەتی (المرسلات)**: قال النبي (ﷺ): (قال الله تعالى يا عبادي إنكم لن تبلغوا نفعي-

﴿يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ کەنیشانی یەکتری دەدرێن ﴿يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ﴾ تاوانبار ئاوات دەخوازێ ﴿لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ﴾ کە بیدایە لەباتی رزگار بوونی خۆی لەسزای ئەو رۆژە ﴿بِبَنِيهِ﴾ بەکورانیەوە. ١١)﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ﴾ بەژنی یەوە بە برایەوە. ١٢)﴿وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ﴾ بەهۆزەکەشیەوە کەپەنایان دەدا. ١٣)﴿وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ وە بەهەرچی کەس لەسەر زەوی یە (هەمووی بدایە و) لەپاشان هەر خۆی رزگاری ببێ. ١٤)﴿كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ﴾ نەخێر (وا نی یە) بەراستی ئاگری دۆزەخ بەبلیسەیە. ١٥)﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾ داماڵینەری پێستی سەرە. ١٦)﴿تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بانگی کەسێک دەکات کەپشتی هەڵکردبێ لەخواو ڕووی وەرگێڕابێ. ١٧)﴿وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ﴾ وە سامانی کۆکردبێتەوە و هەڵی گرتبێ. ١٨)﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾ بێگومان ئادەمی دروست کراوە بەچاو چنۆکێکی تەنگەتیلکە. ١٩)﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا﴾ کەناخۆشی یەکی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەکات. ٢٠)﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ کە سامانیش ڕووی تێ بکات ئەی گرێتەوە (لەخەڵکی). ٢١)﴿إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ﴾ مەگەر نوێژکەران. ٢٢) ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ﴾ ئەوانە کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان. ٢٣)﴿وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ﴾ ئەوانەی کەبەشێکی دیاری کراو لەدارایی یاندا هەیە. ٢٤)﴿لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ﴾ بۆ هەژاری داواکەرو بێ نەوای داوانەکەر. ٢٥) ﴿وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ وە ئەوانەی کە باوەڕیان بەڕۆژی پاداشت هەیە. ٢٦)﴿وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ وەئەوانەیکەلەسزایپەروەردگاری خۆیان دەترسن. ٢٧)﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ چونکە بەراستی سزای پەروەردگاری ئەوان کەس لێ ی دڵنیا نیە. ٢٨) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ﴾ وە ئەوانەی کە ئاگاداری داوێنی خۆیان دەکەن. ٢٩)﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ﴾ مەگەر لەگەڵ ژنانی خۆیان ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ یا کە نیزەکێک کەبوو بن بەخاوەنیان ﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ بێگومان ئەوانە لۆمە کراو نیین. ٣٠) ﴿فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەر کەسێک دوای شتی تر بکەوێ ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ﴾ ئەو کەسانە ئەوانەن کەدەست درێژکەرن. ٣١) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾ وە ئەوانەی کەچاودێری سپاردەو پەیمانی خۆیان دەکەن. ٣٢)﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ﴾ وە ئەوانەی کە شایەتی خۆیان بەتەواوی دەدەن. ٣٣) ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ وە ئەوانەی کە ئاگاداری نوێژیان دەکەن. ٣٤)﴿أُو۟لَٰٓئِكَ فِى جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ ئەوانە(کەباس کران) ڕێز دەگیرێن لە باخاتی بەهەشتدا. ٣٥) ﴿فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ﴾ دەی چی یانە ئەو بێ بڕوایانە (کە تۆ دەرنەکەویت ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەپەلە دێن بۆ لات ٣٦)﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ﴾ لەلای ڕاست و چەپتەوە دەستە دەستە دەبن. ٣٧)﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ﴾ ئایا هەموو یەکێک لەوان بەتەمایە ﴿أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ﴾ کە بخرێتە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتەوە. ٣٨)﴿كَلَّآ ۖ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ﴾ وا نی یە: (وەک بەتەمان) بەراستی ئێمە دروستمان کردوون لەوەی کە دەیزانن. ٣٩)

فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ
وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى
يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ
﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ
إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا
فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّى كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ
فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا
﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّى دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّىٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ
لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾

- فتنتفعوني، ولن تبلغوا ضري فتضروني)(رواه مسلم). پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (خوای بەرزو بڵند فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم دڵنیابن ئێوە هەرگیز ناتوانن سوودتان بۆم هەبێت تا سوودم پێ بگەیەنن، وە دڵنیاش بن کە هەرگیز نا توانن زیانتان بۆم هەبێت تازیانم پێ بگەیەنن).

**سوورەتی (النبأ)**: عن أبو صالح عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (ما بين النفختين أربعون) قالوا: يا أبا هريرة أربعون يوماً؟ قال: أبيت قالوا: أربعون شهراً؟ قال: أبيت، قالوا: أربعون سنة؟ قال: أبيتُ قال: (ثم يُنزل الله من السماء ماء فينبتون كما ينبتُ البقل، ليس من الإنسان شيء إلا يبلى إلا عظماً واحداً وهو عجب الذنب ومنه يُركبُ الخلق يوم القيامة) (رواه البخاري ومسلم). ئەبو صالح لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)-

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ﴾ جا سوێند بەپەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاواکان ﴿إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾ بێگومان ئێمە بەدەسەڵاتین. ٤٠) ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ لەسەرئەوەی کە بیانگۆڕین و باشتر لەوان بهێنین ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ﴾ وە کەس لە دەستمان دەرناچێ. ٤١) ﴿فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ﴾ ئینجا وازیان لێ بێنە، با قسەی هیچ و پووچ و گاڵتەی خۆیان بکەن ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ﴾ تا دووچاری ئەو ڕۆژەی خۆیان دەبن کە بەڵێنیان پێ دراوە. ٤٢) ﴿يَوۡمَ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا﴾ ئەو ڕۆژەی کەبەپەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ﴿كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ﴾ دەڵێی بۆ لای بتەکانیان ڕادەکەن. ٤٣) ﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ چاویان شۆڕو (سەر بەرەو ژێر) ﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ﴾ ریسوایی و شەرمەزاری دایان دەگرێ ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە لەوەو پێش بەڵێنیان پێ درابوو. ٤٤)

## سورەتی ﴿نوح﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ﴾ بێگومان ئێمە نووحمان نارد بۆ لای هۆزەکەی ﴿أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ﴾ (وەپێمان ووت) کە هۆزەکەت بێدار بکەرەوە ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ پێش ئەوەی کە سزای سەختیان تووش ببێ. ١) ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ (نووح) ووتی: ئەی گەلی خۆم بەڕاستی من (پێغەمبەرو) ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە. ٢) ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ کە هەر خوا بپەرستن ﴿وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ و لێ ی بترسن وەفەرمان بەری من بکەن. ٣) ﴿يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ تا خوا لە گوناهەکانتان خۆش ببێ ﴿وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ﴾ وە (بە زیندوویی) دەتان هێڵێتەوە تا کاتی دیاری کراوی مردنتان ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ﴾ بێگومان کاتێ سزای خوا کەهات دوا ناکەوێ ﴿لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر بتانزانیایە. ٤) ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا﴾ ووتی: ئەی پەروەردگارم من گەلەکەی خۆمم (بەپەنهانی) بانگ کرد بە شەو و بە ڕۆژ. ٥) ﴿فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا﴾ وە تا بانگم دەکردن ئەوان زۆرتر دوور ئەکەوتنەوە لێم و هەڵئەهاتن. ٦) ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ﴾ وە بێگومان من هەر کات بانگم دەکردن (بۆ باوەڕهێنان) تا لێیان خۆش ببیت ﴿جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ﴾ ئەوان پەنجەیان دەکرد بە گوێچکەیاندا ﴿وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ﴾ وە پۆشاکەکانیان دەدا بەسەرو چاویاندا ﴿وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا﴾ وە بەردەوام دەبوون لە بێ باوەڕی دا، وە سەرکێشیان دەکرد، چۆن سەرکێشی یەک. ٧) ﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا﴾ لەپاشان بەئاشکرا بانگم کردن. ٨) ﴿ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ﴾ ئینجا (دەمێک) بۆم ئاشکرا دەکردن ﴿وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا﴾ (دەمێک) بۆم پ.نهان دەکردن بە پەنهان کردنێکی تەواو. ٩) ﴿فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾ ئەوسا پێیم ووتن: داوای لێ خۆش بوون بکەن لەپەروەردگارتان ﴿إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا﴾ بە ڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێ خۆشبووە. ١٠)

يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل
لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾
وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ
طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾
وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ
إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا
سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟
لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَـٰلًا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ
مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾

-دەیگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (ماوەی نێوان دوو فووەکە(ی دەکرێت بەصووردا) چلە) ووتیان: چل ڕۆژە ئەبو هورەیرە؟ دەڵێ: وەڵامی نەدایەوە، ووتیان چل مانگە؟ دەڵێ: وەڵامی نەدایەوە، ووتیان چل ساڵە؟ دەڵێ: وەڵامی نەدایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پاشان خوای گەورە لەئاسمانەوە بارانێك دەبارێنێ، ئەوسا وەك گیا سەوز دەبنەوە (دروست دەبنەوە) هەرچی لەشی ئادەمیزادە دەرزێت تەنها ئێسكێك نەبێ كە (عجب الذنب)ە – ئێسكێكی بچوكە لە كۆتایی بربڕە پشت دایە– مرۆڤ لەڕۆژی دواییدا لەو پارچە ئێسكەوە دروست دەكرێتەوە).

**ئایەتی (٣٨) سوورەتی (النبا):** قال رسول الله (ﷺ): (ولا يتكلم يومئذ إلا الرسل) (رواه البخاري ومسلم). **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) فەرموویەتی: (لەو ڕۆژدا –ڕۆژی موحاسەبە– هیچ کەس–

﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا﴾ (ئینجا گەر وابكەن) بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ. ١١)﴿وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ﴾ وە سامان و كوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ ﴿وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ﴾ وە باخ و باخاتی زۆرتان پێ دەدات ﴿وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا﴾ وە جۆگە ئاوی زۆرتـان دەداتـێ. ١٢) ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ ئەوە چیتانە ناترسن لە شكۆو گەورەیی خوا؟. ١٣)﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ لەكاتێكدا كە دروستی كردوون بەچەند قۆناغێك. ١٤)﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا﴾ ئایا نابینن كەخوا چۆن حەوت ئاسمانی دروست كردووە نهۆم لەسەر نهۆم. ١٥)﴿وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا﴾ وە مانگی گێڕاوە لەناویاندا بەڕووناك و ﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ ڕۆژیشی گێڕاوە بەچرا. ١٦)﴿وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ وە خوا ئێوەی ڕواندووە لەزەوی بەڕواندن. ١٧)﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا﴾ لەپاشان دەتان باتەوە ناوی ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ وە دەرتان دەهێنێتەوە (لێ ی) بەدەرهێنان. ١٨)﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا﴾ خوا زەوی بۆ ڕاخستوون. ١٩)﴿لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ تاهاتوچۆ بكەن بەڕێگە كراوەكانیدا. ٢٠)﴿قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي﴾ نووح ووتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەكەم بێ فەرمانیان كردم ﴿وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ﴾ وە شوێن كەسانێ كەوتن كەماڵ و منداڵی قازانجی پێ نەگەیاندوە ﴿إِلَّا خَسَارًا﴾ زیان نەبێ. ٢١)﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا﴾ وە پیلان و فڕو فێڵی زۆر گەورەیان كرد. ٢٢) ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ﴾ وە ووتیان: دەست هەڵ نەگرن لە بت و خواكانتـان ﴿وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ وە دەسـت هـەڵ نـەگرن لـە (پەرستنی) وود و سواع و یەغووث و یەعوق و نەسر. ٢٣)﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا﴾ وە بەڕاستی ئەوانە زۆر(خەڵكە)یان گومڕا كرد ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا﴾ (خوایە) ئەم ستەم كارانە لەگومڕایی زیاتر هیچی تریان بۆ زۆر مەكە. ٢٤)﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا﴾ بەهۆی گوناهەكانیانەوە بەزریان خنكێنران. ﴿فَأُدْخِلُوا نَارًا﴾ ئینجا خرانە ئاگرەوە ﴿فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَارًا﴾ ئیتر بێجگە لە خوا هیچ یارمەتی دەرێكیان دەست نەكەوت. ٢٥)﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ﴾ نووح فەرمووی: ئەی پەروەردگار مەهێڵە لەسەر زەوی ﴿مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ هیچ كەسێك لە بێ بڕوایان. ٢٦)﴿إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ﴾ (چونكە) بێگومان ئەگەر تۆ وازیان لێ بێنیت: بەندەكانی تۆ گومڕا دەكەن ﴿وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ وە هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەكەر دەخەنەوە. ٢٧)﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ﴾ ئەی پەروەردگارم خۆش ببە لە خۆم و باوكم و دایكم ﴿وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا﴾ وە لەو كەسە كە دێتە ماڵم بە بڕواداریی یەوە ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ وە لەهەموو پیاوان و ژنانی ئیماندار ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾ وە بەشی ستەم كاران زیاد مەكە تیاچوون و لەناوچوون نەبێ. ٢٨)



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَىٰ آمَنَّا بِهِ ۖ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١) سورەتی (الجن): ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ﴾ بوخاری و موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) گێڕاویانەتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵانیدا ڕۆیشت بەرەو بازاڕی (عُکاظ) شەیتانەکانیش (جنۆکەکان) لە وەرگرتنی هەواڵی ئاسمان بەرگری کرابوون، تیر ئەستێرەیان بۆ ئەهاوێژرا، بۆیە گەڕانەوە جا (هۆزەکەیان) وتیان: ئەوە چیتانە - بۆ گەڕانەوە-؟ ئەوانیش وتیان، ڕێگای هەواڵ وەرگرتنی ئاسمانمان لێ گیراوە، وە تیر ئەستێرەمان بۆ ئەهاوێژرێ، وتیان: ئیللا شتێک ڕووی داوە کە بۆتە بەربەست لە ڕێ ی ئێوەدا کە هەواڵی ئاسمان بزانن، کەواتە بڕۆن گشت خۆرهەڵات و خۆرئاوا لە زەوی دا بگەڕێن و سەرنجی بدەن بزانن چ شتێک ڕووی داوە، ئەوانیش-

## سورەتی ﴿ الجن ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ﴾(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بلێ: نیگام بۆ کرا ﴿أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ کەبێگومان چەند کەسێک لەجنۆکە گوێیان گرت (لەقورئان خوێندنەوەم) ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا﴾ ئینجا وتیان: بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەر سوڕهێنەرمان بیست. ١)﴿يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ﴾ ڕێ نموونیی دەکات بۆ ڕێی ڕاست ﴿فَـَٔامَنَّا بِهِۦ﴾ ئێمەش باوەڕمان پێ کرد﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا﴾ وە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەشی پەروەردگارمان. ٢)﴿وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا﴾ وە بەڕاستی -بڵندە گەورەیی پەوەردگارمان لەشتی ناشایستە- ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ هیچ هاوسەرو منداڵێکی بۆ خۆی دانەناوە. ٣)﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا﴾ بێگومان بێ ئاوەزەکەمان درۆی نالەباری هەڵدەبەست دەربارەی خوا. ٤)﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ وە ئێمە پێمان وابوو کەئادەمیی و جنۆکە هەرگیز درۆ ناکەن دەربارەی خوا. ٥)﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ﴾ بەڕاستی پیاوانێک لەئادەمیی ﴿يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ پەنایان دەبردە بەرپیاوانێک لەجنۆکە (کە بیان پارێزن) ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ کەچی زۆرتر ماندوویان دەکردن. ٦)﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّواْ﴾ وە ئادەمیی گومانیان بردووە ﴿كَمَا ظَنَنتُمْ﴾ هەروەک ئێوە -ئەی جنۆکە- گومانتان بردووە ﴿أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا﴾ کە ئیتر خوا هیچ پێغەمبەرێک نانێرێ. ٧)﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ﴾ وە ئێمە دەگەڕاین بەشوێن دەنگ و باسی ئاسماندا ﴿فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ کەچی دیتمان پڕکراوە لە پاسەوانی بەهێزو تیری ئەستێرەکان. ٨)﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ﴾ وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێک لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن ﴿فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ﴾ بەڵام هەرکەسێک ئێستا کە بەدواوە گوێ بگرێ ﴿يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ تیرێکی ئەستێرە دەبینێ لەبۆسەی دایە. ٩) ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە بەڕاستی نازانیین ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی کەلەسەر زەوین ﴿أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ یا پەروەردگاریان ڕێ نموونیی و یستووە بۆیان. ١٠)﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە هێندێکمان چاکیین ﴿وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ وەهێندێکمان لەوەنزمترین ﴿كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾ ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین. ١١) ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە ئێمە دڵنیا بووین کە هەرگیز ناتوانین لەدەستی خوا دەرچین لەزەویدا ﴿وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا﴾ وەبە هەڵهاتنیش لەدەستی خوا ڕزگار نابین. ١٢) ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ بەڕاستی ئێمە کاتێ ڕێ نموونیی (قورئان)مان بیست ئیمانمان پێ هێنا ﴿فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ﴾ ئینجا هەرکەسێک بڕوای هێنا بەپەروەردگاری خۆی ئیتر ناترسێ ﴿بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ نەلە کەمیی (پاداشت) و نەلە زۆریی (تۆڵە). ١٣)

وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَٰئِكَ
تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾
وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِنَفْتِنَهُمْ
فِيهِ ۚ وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ
الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ
يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ
بِهِ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي
لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَاغًا
مِنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ ۚ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ
خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ
مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ
مَا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا
يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ
يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا
رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾

- ڕۆشتن بە هەموو خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەوی دا گەڕان، سەرنجیان دەدا تا بزانن چ شتێك بەربەستە لە بەردەمیاندا کە ناتوانن هەواڵی ئاسمان بزانن. (عەبدوڵلا) دەڵێ: ئەنجا ئەوانەیان کە ڕوو بە تیهامە ڕۆشتن، لە نەخلەدا چوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیویست بڕوات بۆ بازاڕی (عُکاظ) لەو کاتەدا پێش نوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵانی دەکرد، جنۆکەکان کاتێ گوێیان لە قورئان بوو گوێ بیستی بوون، ئەوسا وتیان: ئائەمەیە بۆتە بەربەست لە نێوان ئێوەو هەواڵی ئاسماندا، ئنجا لەو شوێنەوە گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان وتیان: ئەی هۆزەکەمان ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَداً﴾ وە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ﴾ دابەزاند بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَۖ﴾ وە بێگومـــان ئێمـــە هێنـــدێکمان موســـڵمانیین و هێندێکمان ستەمکار ﴿فَمَنۡ أَسۡلَمَ﴾ ئێنجا ئەوانەی موسڵمان بوون ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوۡاْ رَشَدٗا﴾ ئەوە ئەوانە ڕێ ی ڕاستیان دۆزیوەتەوە. ١٤)﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ﴾ بەڵام لەڕێ ی ڕاست لادەران -ستەم کارەکان- ﴿فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗا﴾ دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ. ١٥)﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ﴾ وە ئەگەر ئەوان (مرۆڤ و جنۆکە) بەردەوام بوونایە لەسەر ڕێ ی ڕاست ﴿لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا﴾ ئـاوی زۆرمـان پـێ ئەنۆشین (نیعمـەتی زۆرمـان دەدانـێ).١٦) ﴿لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ﴾ تاتاقییـــان کەینـــەوە تیایـــدا ﴿وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ﴾ وە هـــەر کەسێک ڕووەرگێـڕێ لـەیادی پـەروەردگاری خـۆی ﴿يَسۡلُكۡهُ عَذَابٗا صَعَدٗا﴾ دەیخاتـە نـاو سـزای دژوارەوە. ١٧) ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ﴾ بێگومـان مزگـەوتان تایبـەتی خـوان ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ کەواتە لەگەڵ خوادا هاوار لە کەسیتر مەکەن. ١٨)﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ﴾ وە بەندەی خوا (موحەممەد (ﷺ)) کەهەستا لەخوا بپاڕێتەوە (و بی پەرستێ) ﴿كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا﴾ (بێ بڕواکانی مەککە) نزیک بوو دابارن بەسـەریدا. ١٩)﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي﴾ بڵێ: دڵنیابن من هەر خوای خۆم دەپەرستم ﴿وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ وەکـەس ناکـەم بەهاوبەشی. ٢٠)﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا﴾ بڵێ: بەڕاستی من نەزیان نـەڕێنموونی ئێوەم بەدەست نی یە. ٢١)﴿قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ﴾ بڵێ : بێ گومان کەسێک نی یە کەمن بپارێزێ لە (سزای ) خوا ﴿وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا﴾ وەبێجگە لەو پەناگایەک شک نابـەم. ٢٢) ﴿إِلَّا بَلَٰغٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ﴾ (وەهیـچم بەدەسـت نـی یـە ) ڕاگەیانـدن نـەبێ لـەخواوە و گەیانـدنی پـەیامانی ئـەو نـەبێ ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ وە هـەر کەسـێ بـێ فەرمانی خواو پێغەمبەری بکات ﴿فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە بێ گومـان ئـاگری دۆزەخ بـۆ ئەوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ تیـا دەمێنێتـەوە بەهەمیشەیی. ٢٣)﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ﴾ تـا بەچاوی خۆیان دەبینن ئەو سزایانەی کە بەڵێنیان پێ دراوە ﴿فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا﴾ ئینجا ئەو کاتە دەزانن، کـەکێ یارمـەتی دەری کـەمترە و ژمـارەی کەمـە. ٢٤) ﴿قُلۡ إِنۡ أَدۡرِيٓ﴾ بلێ من نازانم ﴿أَقَرِيبٞ مَّا تُوعَدُونَ﴾ ئاخۆ نزیکە ئەو ڕۆژی دوایی یـەی کە بەڵێنتان پێ دراوە ﴿أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا﴾ یان پەروەردگارم ماوەیەکی دووری بۆداناوە. ٢٥)﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ﴾ هەر خوایە زانا بەنهێنییەکان ﴿فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ وەکەس ئاگاردار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا. ٢٧)﴿إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾ مەگەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ ﴿فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾ جا بێ گومان خوا دەنێرێ لەبـەردەمی و پـشتی یـەوە پاسـەوان (لـە فریـشتە). ٢٨)﴿لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ تـا بزانـێ کەسرووشـی خـوای خۆیـان گەیانـدووە ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ﴾ وەخـوا ئاگـادارە بـەوەی کەلایانە ﴿وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا﴾ وە هەموو شتێکی هەڵژماردووە بەهەڵژماردن. ٢٩)

# سُورَةُ المُزَّمِّلِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا ﴿١٧﴾ السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ ۚ كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا ﴿١٩﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی سەرەتا و کۆتایی سورەتی (المزمل): ئەبوداوود لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: کاتێ سەرەتای سورەتی (المزمل) هاتە خوارەوە (پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان) بەقەدەر نوێژی تەراویحی مانگی ڕەمەزان، شەو نوێژیان دەکرد، تا کۆتایی سورەتی (المزمل) هاتە خوارەوە، وە ماوەی نێوان دابەزینی سەرەتای سورەتەکە و کۆتایی یەکەی ساڵێك بوو.

= قسە ناکات جگە لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)).

ئایەتی (٦) سورەتی (النازعات): عن أبي بن كعب عن أبيه قال: (كان رسول الله (ﷺ): إذا ذهب ثلثا الليل قام فقال: يا أيها الناس اذكروا الله اذكروا الله جاءت الراجفة تتبعها الرادفة، جاء الموت بما فيه جاء =

## سورەتی ﴿ المزمل ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾ ئەی ئەو کەسەی کەخۆت داپۆشیووە. ١)﴿قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ شەوهەستە (شەو نوێژ بکە )مەکەر کەمێکی نەبێت. ٢)﴿نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا﴾ نیوەی یا کەمێ لەنیوەی کەم بکەرەوە. ٣)﴿أَوْ زِدْ عَلَيْهِ﴾ یا کەمێ لێی زیادبکە ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ وەدەوری قورئان بکەرەوە بەلەسەر خۆی (بەرێک و پێکی). ٤)﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ بێگومانم ئێمە لەمەولا بۆت دەنێرینە خوارەوە گوفتاری (قورئان)ی قورس و گران. ٥)﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ﴾ بەڕاستی هەستانی شەو دوای خەو (بۆ خوا پەرستی) ﴿هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا﴾ قورسترەو گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لەهی ڕۆژ بەهێزترە بۆ دڵ) ﴿وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ دروسترە لەڕووی ووتنەوە. ٦)﴿إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا﴾ بەڕاستی تۆ لە ڕۆژادا لە هاتوو چۆکردنێکی زۆردایت. ٧)﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ﴾ هەمیشە یادی پەروەردگارت بکە ﴿وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا﴾ وەخۆت یەکلاکەرەوە بە یەکلایی کردنەوەیەکی تەواو. ٨)﴿رَّبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ﴾ ئەوخوای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایە ﴿لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە تەنیا ئەو نەبێ ﴿فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾ کەوابوو بیکە بە بریکاری خۆت. ٩) ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ دان بەخۆتدا بگرە لەسەر ئەوقسانەی کە دەیلێن ﴿وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾ وە وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ بە وازلێهێنانێکی جوان. ١٠)﴿وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ﴾ وازبێنە لەمن و ئەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کەئاینی من بەدرۆ دەزانن ﴿وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا﴾ وە کەمێک مۆڵەتیان بدە. ١١)﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا﴾ بێ گومان لای ئێمە هەیە کۆت و زنجیری قورس و گران ﴿وَجَحِيمًا﴾ وەئاگری هەڵ گیرساو.١٢) ﴿وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ﴾ وەخواردنی گەرو گیر ﴿وَعَذَابًا أَلِيمًا﴾ هەروەها سزای پڕ لەداخ و دەرد. ١٣) ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ﴾ لە ڕۆژێکدا کەزەوی وچیاکان دێنە لەرزە ﴿وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾ وە کێوەکان دەبن بە گردۆلکە لە لمی هەڵرژاو. ١٤)﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ﴾ بێگومان ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە شایەتە لە سەرتان ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولًا﴾ هەروەک پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون. ١٥)﴿فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ﴾ ئینجا فیرعەون سەرپێچی ئەو پێغەمبەرەی کرد ﴿فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾ ئێمەش تۆڵەمان لێ سەند بە تۆڵە سەندنێکی سەخت. ١٦)﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ﴾ جا ئەگەر بێ بڕوایی بکەن چۆن خۆتان دەپارێزن ﴿يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا﴾ لە ڕۆژێکدا کە (بەترس و سامی خۆی) منداڵان پیر دەکات. ١٧) ﴿السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ﴾ ئاسمان لەت دەبێ بەهۆی (سەختیی) ئەو ڕۆژەوە ﴿كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا﴾ بەڵێنی خوا دێتەدی. ١٨)﴿إِنَّ هَذِهِ تَذْكِرَةٌ﴾ بەڕاستی ئەم ئایەتانەی پێشوو پەند و ئامۆژگارین ﴿فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلًا﴾ ئینجا هەرکەسێک کە بیەوێ ڕێگایەک دەگرێ بۆلای پەروەردگاری. ١٩)

۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١-٥) سورەتی (المدثر): ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ .... وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾:** بوخاری و موسلیم لە ئەبوسەلەمەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆی گێڕامەوە، ووتی لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست: باسی دواکەوتنی وەحی دەکرد – پاش دابەزینی سەرەتای سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ – پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لە کاتێکدا کە بەڕێگادا دەڕۆشتم لە پڕ گوێم لە دەنگێ بوو لە ئاسمانەوە، منیش سەرم بەرزکردەوە و سەیری ئاسمانم کرد، یەکسەر ئەو فریشتەیەم بینی کە لەئەشکەوتی حیراء هات بۆ لام، لەسەر کورسی یەك لە نێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتووە، منیش زۆر ترسام، پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە ووتم: داپۆشن، داپۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیم، –

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ دەزانێ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) کەتۆ هەڵ دەسیت (بۆشە و نوێژ) نەختێک کەمتر ﴿مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ﴾ لەدووبەش لەسێ بەشی شەوو نیوەی یاسێ یەکی ﴿وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ﴾ وە دەستەیەک لەوانەی کەلەگەڵتان ﴿وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ وەخوا ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەکات ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ﴾ (خوا) زانی کەئێوە ناتوانن ئەندازەی شەو نوێژ ڕابگرن ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ لەبەرئەوە لێتان خۆش بوو ﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾ دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لەقورئان دەوری بکەنەوە ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ﴾ (خوا) دەزانی کەلەمەولا کەسانێکتان نەخۆش دەبێت ﴿وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ﴾ وە کەسانیکی ترتان کە دەڕۆن بەزەویدا ﴿يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾ بەشوێن ڕۆزیی خوادا دەگەڕێن ﴿وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ وەهی تری واتان دەبن کە دەجەنگن لەرێ ی خوادا ﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾ ئینجا بخوێننەوە لەقورئان ئەوەندەی کەبۆتان ئاسانە ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ وەنوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ وەقەرز بدەن بەخوا بەقەرزێکی چاک ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ هەر چاکەیەک پێش بخەن بۆ خۆتان ﴿تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ﴾ لای خوا دەستان دەکەوێت ﴿هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾ ئەوەی لای خوا چاکتر و گەورەترە لەرووی پاداشەوە ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ﴾ وەداوای لێخۆش بوون بکەن لەخوا ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەراستی خوا لێخۆشبوویەکی میهرەبانە. ٢٠)

## سورەتی ﴿المدثر﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ ئەی ئەوکەسەی کەخۆت پێچاوەتەوە. ١) ﴿قُمْ فَأَنذِرْ﴾ هەستە (خەڵکی) بێدار کەرەوە. ٢) ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ وە پەروەردگارت بەگەورە بگرە. ٣) ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ وە پۆشاکت بە پاک ڕابگرە. ٤) ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ بەردەوام بە لەوازهێنان لە بت پەرستی و گوناه ٥) ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾ وە شت مەبەخشە و بە زۆری بزانیت. ٦) ﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ وە لەبەر پەروەردگارت خۆت ڕابگرە. ٧) ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾ هەر کاتێک کە فوکرا بەکەڕەنادا. ٨) ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت و گرانە. ٩) ﴿عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ لەسەر کافران سووک و ئاسان نی یە. ١٠) ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ واز لە من و ئەو کەسە بێنە کە دروستم کردووە بەتەنها. ١١) ﴿وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا﴾ وەدارایی زۆر و زەبەندەم پێ داوە. ١٢) ﴿وَبَنِينَ شُهُودًا﴾ وە کوڕانی ئامادەو بەردەست. ١٣) ﴿وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا﴾ وە هۆی ژیانم بۆ ڕاخستووە بەچۆن ڕاخستنێک. ١٤) ﴿ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ﴾ دوای ئەمانەش هێشتا بەتەمایە زیاتری بدەمێ. ١٥) ﴿كَلَّا ۖ إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا﴾ نەء، (چاوەڕوان نەبێ) بەراستی ئەو دەربارەی ئایەتانی ئێمە بێ باوەڕێکی کەلە ڕەقە. ١٦) ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ بەم زووانە سزای سەختی پێ دەچەژم. ١٧)

إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾

= بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ ناردە خوارەوە دوا ئەوە ئیگا بەردەوام بوو پەیتا پەیتا دادەبەزی.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١١-٣٠) سورەتی (المدثر):** ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً .... عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ حاکیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: وەلیدی کوڕی موغیرە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش قورئانی بۆ خوێندەوە پێدەچوو وەلید دڵی نەرم بووبێ، ئەم هەواڵە گەشت بە ئەبوجەهل یەکسەر هات بۆ لای وەلید و وتی: ئەی مامە هۆزەکەت دەیانەوێ سامان و ماڵێکی زۆر کۆبکەنەوە ئەویش وتی بۆچی؟ وتی: بۆ ئەوەی بیدەمن بە تۆ، لەبەرئەوەی تۆ رۆشتوویت بۆ لای موحەممەد (ﷺ) ویستوویتە خواردن و شتی وات بداتێ، وەلید وتی: =

﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾ (چونکە )بیری کردەوەو هەڵی سەنگاند( قسەکەی خۆی). ١٨ )﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ دەك بەكوشت چێ چۆنی هەڵسەنگاند. ١٩ )﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ دووبارە بەكوشت چێ چۆنی لێکداوەتەوە. ٢٠ )﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾ لەپاشان تەماشایەکی کرد.٢١ )﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾ ئەوسا ناوچەوانی گرژ و ڕووی ترش کرد. ٢٢ )﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ﴾ ئینجا بە فیزێکەوە پشتی هەڵکرد. ٢٣ )﴿فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾ جا ووتی ئەم قورئانە هیچی تر نی یە جادوویەك نەبی کەوەرگیراوە ٢٤ )﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ﴾ئەم قورئانە هەر گوفتاری مرۆڤە. ٢٥ )﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ (ئەو کەسە) زوو دەیخەمە دۆزەخەوە. ٢٦ )﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾ تۆ چووزانیت کە دۆزەخ چی یە؟. ٢٧ ) ﴿لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ﴾ (ئاگرێکە ) هیچ ناهێڵێتەوەو واز ناهێنێ. ٢٨ )﴿لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ﴾ (بەیەکەم هاڵاو) پێست ڕەشدەکاتەوە دەیبرژێنێ. ٢٩ ) ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ نۆزدە فریشتە ئەوەتان بەسەریەوە. ٣٠ )﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً﴾هەر فریشتەمان کردووە بە کاریەدەستی دۆزەخ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وە ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بۆ تاقی کردنەوەی ئەوانەی بێ باوەڕن﴿لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ تا ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیابن ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا﴾ وە بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات ﴿وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە هیچیان دوو دڵ نەبن ئەوانەی کتێبیان پێدراوە﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ ئیماندارانیش ﴿وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ وە تا بڵێن ئەوانەی کە نەخۆشی (ناپاکیی )یان لە دڵایە﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وەبێ بڕواکان﴿مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾خوا چی مەبەستە بەم ژمارەیە کە لەغەریبیدا وەك مەسەل وایە﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ﴾ئا بەوجۆرە خوا ئەو کەسەی کەبیەوێ گومڕای دەکات﴿وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ وە ئەو کەسەی کەبیەوێ ڕێ نموونیی دەکات ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ وە کەس ژمارەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانی مەگەر هەرخۆی﴿وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾وە ئەم ئایەتانە هەر ئامۆژگاری و پەندن بۆ ئادەمی.٣١ )﴿كَلَّا وَٱلْقَمَرِ﴾ نەء (وانی یە ) سوێند بە مانگ. ٣٢ )﴿وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ﴾ وە سوێند بەشەو کەپشت هەڵ دەکات و دەڕوا. ٣٣ ) ﴿وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ﴾ وەسوێند بەبەرەبەیان کەڕوون دەبێتەوە ٣٤ )﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ﴾ بێ گومان سەقەر (دۆزەخ) یەکێکە لەشتە سامناکە گەورەکان. ٣٥ )﴿نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ﴾ ترسێنەرە بۆ هەموو خەڵکی. ٣٦ )﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ﴾ بۆ ئەو کەسەتان کە دەیەوێ ﴿أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾ پێشبکەوێت (لەچاکەدا ) یادواکەوێ. ٣٧ )﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەی خۆیەتی. ٣٨ )﴿إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾ مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست (چاکەکاران). ٣٩ )﴿فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ کەلەباخاتی بەهەشتدا پرسیار لەیەکتری دەکەن. ٤٠ )﴿عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ لە(حاڵی ) تاوان باران. ٤١ )﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ﴾ **(هەرلە بەهەشتی یەکان وەڵام ئەداتەوە کەدیوومانن و پەیمان ووتوون ) چی ئێوەی خستووەتە** دۆزەخەوە. ٤٢ )﴿قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾ (ئەوانیش ) **ووتیان: ئێمە لەنوێژ کەران نەبووین. ٤٣ )**﴿وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ﴾ وەخۆراکمان **نەدەدا بەهەژاران. ٤٤ )**﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ﴾ وەڕۆ دەچووین لەگەڵ ئەوانەی **کەڕۆ دەچوو(لە قسەی خراپەو بێ** شەرعی دا ). ٤٥ )﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ **وەباوەڕمان بەڕۆژی دوایی نەبوو. ٤٦ )**﴿حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ﴾ **تامردن یەخەی پێگرتین. ٤٧ )**

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾

- بێگومان قورەیش دەزانێت کە من سەروەت و سامانم لە هەموویان زیاترە، ئەبوجەهل وتی، دەی قسەیەک دەربارەی موحەممەد بکە تا قورەیش پێی بکاتەوە کە تۆ ناحەزو دژی ئەوی وەلید وتی: چی بڵێم ، دەسا سوێند بەخوا کەستان تێدا نیە لەمن شارەزاتر بێت لە شیعرو وەزن قافیەی شیعر و ناسینی وتەی جنۆکەدا، سوێند بەخوا ئەوەی موحەممەد(ﷺ) دەیڵێ لە هیچ کام لەمانە ناچێت و وە سوێند بەخوا ئەو وتەی کەدەیڵێت زۆر شیرین و جوان و پرشنگدارە سەرو خواری هاوسەنگ و ئاوازەیە ، بێگومان زاڵ دەبێت و زۆر ئاڵکەوێت، دڵنیابن هەرچی لەژێریدا بێت تێکی دەشکێنێ ، ئەبوجەهل وتی کەلەکەت لێت ڕازی نابن هەتا دەربارەی وتەیەک نەڵێیت ، وەلید وتی:لێم بوەستە تا دەربارەی بیربکەمەوە ئەنجا بیری=

﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ ئیتر تکای تکاکاران هیچ قازانجیکیان پێ ناگەیەنێت. ٤٨ )﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ﴾ ئەوە چیانە روو وەردەگێڕن لەئامۆژگاری (قورئان). ٤٩ ) ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ﴾ ئەڵێی کەرەکێوی سڵ کەرن. ٥٠ ) ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ لەشێر، (یان لەدەست کۆمەڵی تیر هاوێژ) هەڵهاتوون. ٥١) ﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾ بەڵکو هەموو یەکێک لەوان ئەیەوێ چەندەها نامەی کراوەی بۆ بنێردرێ (لە خواوە کەبڕوا بە موحەممەد (ﷺ) بێنێ). ٥٢ ) ﴿كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ با چاوەڕوانی ئەوەنەبن بەڵکو هەر ناترسن لەڕۆژی دوایی. ٥٣ ) ﴿كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ﴾ با پەشیمان بنەوە بەراستی قورئان پەندوئامۆژگاریە. ٥٤ ) ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ ئینجا هەرکەسێک بیەوێ باپەندی لێ وەرگرێ. ٥٥ )﴿وَمَا يَذْكُرُونَ﴾ ئامۆژگاری قورئان وەرناگرن. ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر خوا بیەوێت ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ خوا شیاوی لێ ترسانە ﴿وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ وەشیاوی لێ خۆشبوونە. ٥٦ )

## سورەتی ﴿ القيامة ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ سوێند دەخۆم بەڕۆژی قیامەت. ١ )﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ وەسوێند دەخۆم بەنەفسی لۆمەکەر (لەسەر خراپە). ٢ )﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ﴾ ئایا مرۆڤ وادەزانێ کە ئێسقانە (رزیوەکانی) کۆناکەینەوە. ٣ )﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ بەڵێ: بەتواناین لەسەر رێک خستنەوەی (نەقشی) سەرپەنجەکانی. ٤ )﴿بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ﴾ بەڵکو ئینسان دەیەوێ تا لە ژیان دایە هەر تاوان و خراپە بکات. ٥ )﴿يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ دەپرسێ : کەی رۆژی دوایی دێ؟. ٦ )﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ﴾ کاتێ: کەچاو ئەبلەق بوو؟ ٧ )﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ﴾ وە مانگ گیراو تاریک بوو. ٨ )﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ وە رۆژ و مانگ کۆکرانەوە.٩ )﴿يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ﴾ ئەوکاتە مرۆڤ دەڵێ: دەربازگە لە کوێ وەیە. ١٠ )﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾ نەخێر هیچ پەناگایەک نی یە. ١١ )﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾ لەو رۆژەدا ئارامگا هەر لای پەروەردگاری تۆیە. ١٢ )﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ لەورۆژەدا ئادەمیی هەواڵی پێدەدرێت لەوەی کە پێشی خستوە و دوای خستووە (لەچاکەو خراپە). ١٣ )﴿بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ﴾ بەڵکو ئادەمی ئاگادارە بەحاڵی خۆی. ١٤ ) ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ با بڕوبیانووی زۆریش بێنێتەوە. ١٥ )﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ﴾ زمانت مەجوڵێنە بەخوێندنەوەی سرووش ﴿لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ تا پەلەی تیا بکەیت. ١٦ )﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ بەراستی (وەک بەڵێنمان داوە) بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لەسنگتدا و خوێندنەوەی. ١٧ )﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ﴾ ئینجا کاتێ کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بەهۆی جبریلەوە) ﴿فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە. ١٨ )﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ لە پاشان دڵنیابە روون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە. ١٩ )

كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْأٓخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾
إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾
كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلْتَفَّتِ
ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ
﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ
فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾
أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ
ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾

## سُورَةُ الإِنسَانِ

ترتيبها ٧٦ | آياتها ٣١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾
إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا
بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾
إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ
ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾

**- کردەوەو ووتی:ئەم قورئانە جادووەو لەپێشینانەوە وەری گرتووەو دەیگێڕێتەوە، ئەدجا ئەم ئایەتانە ﴿ذَرْنِي وَمَنْ ...﴾ دابەزین**

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٦،١٧) سورەتی (القیامة): ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ﴾** بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) **کە ووتویەتی: سەبارەت بەم** ئایەتە ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ﴾ پێغەمبەر (ﷺ) بە هاتنەخوارەوەی قورئان زۆر ناڕەحەت دەبوو، بەو هۆیەوە لێوەکانی زۆر دەجوڵاند، جا عەبدوڵڵای کوڕی **عەبباس ووتی:** منیش لێوەکانم دەجوڵێنم بەو شێوەی پێغەمبەر (ﷺ) لێوەکانی دەجوڵاند **ئەدجا** خوای گەورە ئەم دوو ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ، =

﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾ (زیندوو کردنەوە هەر دەبێت) بەڵکو ئێوە هەر دنیاتان خۆش دەوێت. ٢٠ )﴿وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ﴾ گوێ بەڕۆژی دوایی نادەن! ٢١ )﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ زۆر ڕووخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن. ٢٢ )﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ تەماشای پەروەردگاریان دەکەن. ٢٣ )﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ﴾ وە زۆر ڕووخساریش لەو ڕۆژەدا گرژ و تاڵن. ٢٤ )﴿تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ دەزانن کە سزای پشت شکین دەدرێن. ٢٥ )﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ﴾ پەشیمان ببنەوە! کاتێک کە گیان گەیشتە گەرو. ٢٦ )﴿وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ﴾ جا دەووترێت: کێ یە چارەکەر. ٢٧ )﴿وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾ وە (نەخۆشەکە) دڵنیایە ئەوە (ی تووشی بووە مردن و) جیابوونەوەیە. ٢٨ )﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ﴾ وە قاچ و لوولاق بەیەکدا ئاڵا. ٢٩ )﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ﴾ ڕاپێچ کردن لەو ڕۆژەدا بۆلای پەروەردگارتە. ٣٠ )﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ﴾ جا(کافر) نەبڕوای هێناو نە نوێژی کرد. ٣١ ) ﴿وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بەڵکو ئایینی بەدرۆ دەزانی و پشتی تێ دەکرد. ٣٢ )﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ﴾ لەپاشان بە کەشخە و فیزەوە گەڕایەوە بۆ لای ماڵ و منداڵی. ٣٣ )﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ وای بۆ تۆ، وای بۆ تۆ، (ئادەمی بێ بڕوا)ئینجا وای بۆ تۆ. ٣٤ )﴿ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ دووبارە وای بۆ تۆ، ئینجا وای بۆ تۆ. ٣٥ )﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ ئایا مرۆڤ وادادەنێ کەهەروا بەرەڵا دەکرێ (و پشت گوێ دەخرێ). ٣٦ )﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ ئایا نوتفەیەک نەبوو لە تۆوکە دەڕژێنرا (یە منداڵدانەوە). ٣٧ )﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ لە پاشان بوو بە خوێن پارەیەک ئینجا دروستی کردو ڕێکی خست. ٣٨ )﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ﴾ ئینجا لەو تۆوە دوو جۆری دروست کرد﴿الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾ نێر ومێ. ٣٩ )﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ﴾ ئایا ئەو زاتە توانای نی یە بەسەر ئەوەدا کەمردووان زیندوو بکاتەوە. ٤٠ )

## سورەتی ﴿ الأنسان ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ﴾ بێ گومان بەسەر ئادەمی دا تێپەری ﴿حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ﴾ ماوەیەکی زۆر لەڕۆژگار ﴿لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾ کەشتێکی وانەبوو ناوببرێ. ١ )﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ﴾ بەراستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست کرد ﴿مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ لەدڵۆپێک ئاوی تێکەڵ لەگەڵێ توخم ﴿نَّبْتَلِيهِ﴾ تاتاقیی بکەینەوە ﴿فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ ئینجا گێرامان بە بیسەری بینەر. ٢ )﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ﴾ بێ گومان ئێمە ڕێ نموونیمان کرد بۆ ڕاستەڕێ ﴿إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ سایا سوپاس گوزارە وەیا ناسوپاس و سپڵە. ٣ ) ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ﴾ بەراستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕوایان ﴿سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا﴾ زنجیر و تەوقی زۆر (کەدەکرێتە گەردنیان) و ئاگری هەڵگیرساو. ٤ ) ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ بێگومان چاکان لە پەرداخێکدا (شەراب) دەخۆنەوە کە ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافورەوەیە. ٥ )

عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ
يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا
وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا
﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ
ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا
﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾
وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ
مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾
وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا
﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا
﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ
خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ ۖ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا
طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَـٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا
نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ
مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾

- ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ﴾ قورئانت پێ لەبەردەکەین و دەیخوێنیتەوە لە بیرت ناچێت ﴿فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ﴾ گوێ ی لێ بگرەو بێ دەنگ بە ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ ئەدجا دڵنیابە لەسەر ئێمەیە قورئان خوێندنەوەی تۆ (بە ئاسانی). دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) کە جوبرەئیل دەهات بۆ لای گوێ ی لێ دەگرت دوای ڕۆشتنی بەو شێوەی جوبرەئیل قورئانەکەی دەخوێند پێغەمبەریش (ﷺ) دەیخوێندەوە.

هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی ( ٣٤،٣٥ ) سورەتی ( القيامة ): ﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى﴾ نەسائی و حاکیم گێڕاویانەتەوە کە سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى﴾ ئەم وتەیە پێغەمبەر (ﷺ) لە-

﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ﴾ کە کانی یەکە (لەبەهەشتدا) بەندەکانی خوا لێ ی دەخۆنەوە ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ (لەهەر شوێنێکدا بیانەوێ) بەری دەدەنەوە چۆن بەردانەوەیەک. ٦ )﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ﴾ وەفا بە نەزر دەکەن ﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا﴾ وەلە ڕۆژێکیش دەترسن کەبەدی و سەختی یەکەی هەمووان دەگرێتەوە. ٧ )﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ وە خواردەمەنی بە هەژاران و هەتیوان و دیلان دەدەن با حەزیشیان لێ ی بێت. ٨ ) ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ﴾ (دەڵێن) بەڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ هەر لەبەر خوا ﴿لَا نُرِيدُ مِنكُمْ﴾ چاوەڕوانی ناکەین لەئێوە ﴿جَزَآءً وَلَا شُكُورًا﴾ نە پاداشت و نە سوپاس. ٩ )﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ بەڕاستی ئێمە لەسزای پەروەردگارمان دەترسین لەڕۆژێکی ترش و تاڵ و دژوارا. ١٠ )﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ﴾ جا خوا پاراستنی لە بەدی ئەو ڕۆژە ﴿وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾ وە پێیدان پاراوی و خۆشی. ١١ )﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ وە پاداشتی دانەوە بەهۆی خۆراگرتنیان (لەسەر چاکە و دوورکەوتنەوە لەخراپە) بەبەهەشت و (پۆشاکی) ئاوریشم. ١٢ ) ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ پاڵی تیادەدەنەوە لەسەر تەخت و قەنەفەی زۆر ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا﴾ نابینن تێیدا نەگەرمی زۆر ﴿وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ وە نە سەرما (واتە هەوایەکی زۆر خۆشی هەیە). ١٣ )﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا﴾ وە سێبەری درەختانی بەهەشت بەسەر سەریانەوەیە ﴿وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ وەمێشووی میوەکانی نزیکە دەست و ئاسان کراوە. ١٤ )﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ﴾ دەگەڕێن بەسەریاندا بەقاپی زیوین و ﴿وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠﴾ و پەرداخی شووشە. ١٥ )﴿قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ﴾ شووشە لەزیو ﴿قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ بە ئەندازەی پێویست ئامادەکراون. ١٦ )﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ لە بەهەشتدا شەرابیان لە پەرداخێکدا پێ دەنۆشرێ کە زەنجەفیلی تێکەڵاوە. ١٧ )﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا﴾ (کە ئەویش) کانی یەکە لەبەهەشت دا ناو دەبرێ بەسەلسەبیل. ١٨ ) ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ﴾ دەگەڕێن بەسەریاندا نەوجەوانانی هەمیشەیی ﴿إِذَا رَأَيْتَهُمْ﴾ کاتێک بیان بینیت ﴿حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ وادەزانیت دانەی مرواری پڕژو بڵاوون ١٩ )﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ﴾ وەکاتێک بڕوانیت لەوێدا ﴿رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ ناز و نیعمەت و دەسەڵاتێکی گەورە دەبینیت. ٢٠ )﴿عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾ لەبەریانایە بەرگی نەرم و ناوڵی سەوزکار و پۆشاکی ئاوریشمین ﴿وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾ وە ڕازێنراونەتەوە بەبازنی زیوو ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ وە پەروەردگاریان شەرابی پاک و تەمیزی پێ نۆشین. ٢١ ) ﴿إِنَّ هَـٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً﴾ ئەم بەهەشتە پاداشتی ئێوەیە ﴿وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ وە هەموو کۆششێکتان سوپاس کراوە. ٢٢ )﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا﴾ بێ گومان ئێمە قورئانمان بۆ ناردیتە خوارێ بەناردن (بەش بەش). ٢٣ )﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ﴾ کەواتە چاوەڕوانی فەرمانی خوا بکە ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ وە فەرمانبەرداری هیچ گوناهبارو بێ باوەڕێک مەکە. ٢٤ ) ﴿وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ﴾ وە ناوی پەروەردگارت بێنە ﴿بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ بەیانیان و ئێواران. ٢٥)

وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٣٠﴾ يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾




بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴿١﴾ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

- لایەن خۆیەوە وەتی بە ئەبو جەهل ، یان خوای گەورە فەرمانی پێدابوو پێ ی بڵێت ؟ عەبدوڵڵا وەتی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی وەتی پاشان خوای گەورەش بەئایەت دایبەزاند.

- الموت بما فيه جاء الموت بما فيه)(رواه الترمذي). ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) لەباوکیەوە گێڕاویەتیەوە کەوەتی: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە کەشەو دوو سێ یەکی بڕاشتایە لە خەو هەڵدەستا و دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە یادی خوا بکەن ، ئەی خەڵکینە یادی خوا بکەن بومەلەرزە(ی ڕووداوی قیامەت) دێت، بومەلەرزەی دووەمیشی بەدوادا دێت (بەفوو کردن بەصوردا) مردن و ئەوەی لەگەڵیدایە دێت مردن و ئەوەی لەگەڵیدایە دێت).

ئایەتی (١٦) سورەتی (عبس)؛ عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): (الذي يقرأ القرآن وهو-

﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ﴾ وە لە شەوا سوژدەی بۆ بەرە (نوێژ بکە) ﴿وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا﴾ وە ستایشی خوا بکە لەبەشێکی زۆر لەشەودا. ٢٦ )﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ﴾ بێگومان ئەم بێ بڕوایانە دنیای بێ بەقایان خۆش دەوێ ﴿وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا﴾ وە پشت گوێ ی دەخەن ڕۆژێکی قورس و گران. ٢٧ ) ﴿نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ﴾ ئێمە ئەوانمان دروست کردو جومگەکانیانمان قایم پێکەوە بەستووە﴿وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا﴾ وە کاتێک بمانەوێت دەیان گۆڕین بەکەسانی تری وەک خۆیان چۆن گۆڕینێک. ٢٨ )﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ﴾ ئەم سورەتە ئامۆژگاری و پەندە ﴿فَمَن شَآءَ﴾ ئینجا هەر کەسێک بیەوێت ﴿ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ ڕێگایەک دەگرێتە بەر بۆ لای پەروەردگاری. ٢٩ )﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ وە ئێوە حەز ناکەن (لەگرتنی ئەو ڕێ یە) مەگەر کاتێک کەخوا بیەوێ (وە بەزۆر ناچارتان بکات) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بێ گومان خوا دانای دروست کردارە. ٣٠ )﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ﴾ ئەوی (خوا) بیەوێ دەیخاتە ناو میهرەبانی خۆیەوە ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ وە ئامادەی کردووە بۆ ستەمکاران سزای سەخت.٣١ )

## سورەتی ﴿ المرسلات ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ سوێند بەبای ڕەوانە کراوی، یەک لە دوای یەک. ١ )﴿فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا﴾ وە بەو با توندانەش هەڵ دەکەن بەهەڵکردنێکی قایم. ٢ )﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا﴾ وە بەو بایانەی کەهەور دەبەن و بڵاوی دەکەنەوە. ٣ )﴿فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا﴾ سوێندیش بەو (فریشتانە)ی بەچاکی حەق لەناحەق جیادەکەنەوە. ٤ )﴿فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا﴾ ئەنجا سوێند بەو (فریشتانە)ش پەیامی (خوا بە پێغەمبەران) دەگەیەنن. ٥ ) ﴿عُذْرًا أَوْ نُذْرًا﴾ بۆ (نەهێڵانی) بەهانە (لێخۆشبوونیان) یا بۆ ترساندن. ٦ )﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ﴾ بەڕاستی ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دراوە (لە هاتنی ڕۆژی دوایی) دێتە دی. ٧ )﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ﴾ ئینجا کاتێک کە ئەستێرەکان تاریک بوون. ٨ ) ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ﴾ وە دەمێک کەئاسمان کەلێنی تێ بوو. ٩ )﴿وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ﴾ وە کاتێک کێوەکان لە بێخ هێنران و تەخت کران. ١٠ )﴿وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ﴾ وەساتێک کەکاتی وادە دانرا بۆ پێغەمبەران (لەگەڵ ئوممەتەکانیاندا). ١١ )﴿لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ﴾ بۆچ ڕۆژێ دواخراوە؟ ١٢ )﴿لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ﴾ بۆ ڕۆژی جیاکردنەوە. ١٣ ) ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ﴾ تۆ چووزانییت ڕۆژی جیاکردنەوە چییە؟ ١٤ )﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ١٥ )﴿أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ئایا گەلانی پێشیینانمان لە ناو نەبرد ١٦ )﴿ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْءَاخِرِينَ﴾ لە پاشان گەلانی دوای ئەوانمان وەک ئەوان لێ نەکرد. ١٧ )﴿كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ﴾ هەر بەو جۆرەش دەکەین بە گوناهباران. ١٨ )﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾وا بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ١٩ )

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

- ماهر به مع السفرة الكرام البررة والذي يقرؤه وهو عليه شاق له أجران)(رواه البخاري ومسلم). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووییەتی: (ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوەو شارەزایە تێیدا ئەو (لە قیامەتدا) لەگەڵ فریشتە بەڕێزو چاکەکان دایە، وە ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوەو بەلایەوە قورس و گرانە دوو پاداشتی بۆ هەیە).

**ئایەتی (٣٧) سورەتی (عبس):** عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ):(يُحشر الناس يوم القيامة حفاةً عراةً غرلاً) **قالت: يا رسول الله الرجال والنساء** جميعاً ينظر بعضهم إلى بعض؟ قال (ﷺ) **(يا عائشة الأمر أشد من أن** ينظر بعضهم إلى **بعض)(رواه** البخاري ومسلم). عائیشە **(ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە** دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی لەڕۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە -

﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ **ئایا ئێوەمان دروست نەکردووە** لەئاوێکی بێ نرخ؟. ٢٠ ) ﴿فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ **ئینجا خستمانە** جێگایەکی بتەوەوە. ٢١ ) ﴿إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ تا ماوەیەکی دیاری کراو. ٢٢ ) ﴿فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ﴾ **ئینجا** ماوەمان بۆ دانا، چاک ئەندازە گرێکیین. ٢٣ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای بۆ بێ بڕواتان** لەو ڕۆژەدا. ٢٤ ) ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا﴾ **ئایا ئێمە زەوییمان نەکردۆتە کۆکەرەوە.** ٢٥ ) ﴿أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا﴾ بۆ زیندووان و مردووان. ٢٦ ) ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ﴾ وە لەناویدا شاخانی بەرزی لەنگەر داکوتاومان داناوە ﴿وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا﴾ وە ئاوی شیرینیمان پێ نۆشیین. ٢٧ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **( بەم بێ بڕوایانە دەوترێت ) وای بۆ** بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ٢٨ ) ﴿ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ **بڕۆن بۆ لای ئەو** دۆزەخەی کە بەدرۆتان دەزانی. ٢٩ ) ﴿ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ﴾ **بڕۆن بۆ** لای سێبەری دوکەڵێکی سێ بەش. ٣٠ ) ﴿لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ﴾ **نە سێبەرێکی** فێنکەو نەشتێک لە گڕەی ( دۆزەخ ) بەرگری دەکات. ٣١ ) ﴿إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾ **بە** ڕاستیی دۆزەخ پزیسکی وەک کۆشک دەهاوێژێ. ٣٢ ) ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ **( بەرودوا دەڕۆن )** ئەڵێی کاروانی حوشتری زەردن. ٣٣ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای بۆ بێ بڕوایان** لەو ڕۆژەدا. ٣٤ ) ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ **ئەمڕۆ ڕۆژێکە ( بێ باوەڕان ) ناتوانن قسەی** تێدا بکەن. ٣٥ ) ﴿وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾ **وە مۆڵەت نادرێن کە** بڕوبیانوو بهێننەوە. ٣٦ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا.** ٣٧ ) ﴿هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ﴾ **ئەمڕۆ ڕۆژی بڕیاردانە ( جیاکردنەوەیە )** ﴿جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئێوەو پێشینانمان کۆکردۆتەوە. ٣٨ ) ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ﴾ **سا ئەگەر فێڵ و پیلانێکتان هەیە** ئەنجامی بدەن. ٣٩ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا.** ٤٠ ) ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ﴾ **بێ گومان پارێزکاران لەسێبەرو ( قەراغی )** کانیاوی ڕۆران. ٤١ ) ﴿وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ **وە لەناو میوەهاتێکدان کە حەزی** لێ دەکەن. ٤٢ ) ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ **( پێیان دەڵێن ) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێ** بەهۆی ئەوەی کە دەتان کرد. ٤٣ ) ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ **بێگومان ئێمە ئاوا** پاداشتی چاکان دەدەینەوە. ٤٤ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای بۆ بێ** بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ٤٥ ) ﴿كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا﴾ ( ئەی کافران ) بخۆن و بەهرەمەند ببن ماوەیەکی کەم ( لەدنیادا ) ﴿إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ﴾ **بەڕاستی ئێوەن تاوانباران.** ٤٦ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای** بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ٤٧ ) ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟﴾ **وە کاتێک پێ یان** بوترێ ( لەخوا بترسن و ) کڕنوش بەرن ﴿لَا يَرْكَعُونَ﴾ **کڕنوش نابەن.** ٤٨ ) ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ **وای** بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. ٤٩ ) ﴿فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾ ( ئەگەر ئەوان باوەڕ بەقورئان نەکەن ) **ئیتر بە چ فەرموودەیەکی تر بڕوا دەهێنن جگە لە قورئان؟.** ٥٠ )

# سُورَةُ النَّبَإِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾

- لەمەحشەردا- بەپێ ی پەتی و بەڕووتی و بەخەتەنەنەکراوی) ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان ئافرەتان هەموویان -پێکەوەن و- سەیری -عەورەتی- یەکتری دەکەن؟ فەرمووی: (عائیشە کارەکە لەوە سەختترە کەسەیری -عەورەتی- یەکتری بکەن).

سورەتی (التکویر): قال رسول الله (ﷺ): (من سره أن ينظر إلى يوم القيامة كأنه رأي عين فليقرأ: (إذا الشمس كورت) و (إذا السماء انفطرت) و (إذا السماء انشقت) (رواه أحمد والترمذي). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەس پێ ی خۆشە تەماشایی ڕۆژی قیامەت بکات وەك ئەوەی بەچاوی خۆی بیبینێ با سورەتی: (إذا الشمس كورت) و (إذا السماء انفطرت) و (إذا السماء انشقت) بخوێنێتەوە).

## سورەتی ﴿ النبأ ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾ ئەوە لەچی
پرسیار لەیەکتری دەکەن؟! (ئەو بێ بڕوایانە). ١)﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ﴾ لەو دەنگ و باسە
گەورەیە پرسیار دەکەن. ٢)﴿ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾ کە ئەوان تێیدا جیاوازن. ٣)﴿كَلَّا
سَيَعْلَمُونَ﴾ نەء با پەشیمان بنەوە، لەمەولاتێ دەگەن. ٤)﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ دووبارە
(دەڵێم) نەء لەمەولاتێ دەگەن. ٥) ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا﴾ ئاخۆ زەویمان بۆ
ڕانەخستوون؟. ٦)﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ وە کێوەکانمان نەگێڕاوە بەمێخ؟! ٧)﴿وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا﴾
وە ئێوەمان دروست نەکردوە بەجووت. ٨)﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾ وە نوستنمان نەکردووە
بەهۆی حەسانەوەتان. ٩)﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا﴾ وەشەومان نەگێڕاوە بەکاڵا (داپۆشەر).
١٠)﴿وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا﴾ وەڕۆژمان نەگێڕاوە بەکاتی ژیان (و هەڵسوڕان و پەیداکردنی
ژیوار). ١١)﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾ وە حەوت ئاسمانی بەهێزمان دروست نەکردوە لە
سەرتانەوە؟ ١٢) ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ وە دروستمان نەکردوە چرایەکی درەوشاوە (کە
ڕۆژە). ١٣)﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا﴾ وەئاوی لێزمە و بەخوڕمان نەناردۆتە خوارەوە
لەهەورانی گوشراو. ١٤)﴿لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾تا پێ ی بڕوێنین دانەوێڵە گژو گیاو. ١٥)
﴿وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا﴾ باخاتی پڕوچڕ. ١٦) ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا﴾ بەڕاستی ڕۆژی
جیاکردنەوە(ی چاکە و خراپ) کاتێکی بۆ دیاری کراوە. ١٧)﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ
أَفْوَاجًا﴾ ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ بەکەرەنادا ئینجا پۆل پۆل دێن. ١٨)﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ
فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا﴾وە ئاسمان (لەهەموو لایەکەوە) کرایەوەو بوو بەدەرگا. ١٩)﴿وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ
فَكَانَتْ سَرَابًا﴾ وە کێوەکان خرانە ڕێ و بوون بە (تراویلکە) ڕیێکی ڕەوان (سراب). ٢٠)
﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾ بەڕاستی دۆزەخ پەرێزگای بێ بڕوایانە. ٢١)﴿لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا﴾ وەجێ
گەڕانەوەی یاخی یانە. ٢٢)﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾ تێیدا دەمێننەوە هەزاران ساڵ (ماوەیەکی
زۆر). ٢٣)﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا﴾ تێیدا ناچەژن نەساردی و فێنکی و نەخواردنەوە.
٢٤) ﴿إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا﴾ مەگەر ئاوی لەکوڵ وکێم وزوخاو. ٢٥) ﴿جَزَآءً وِفَاقًا﴾
پاداش دەدرێنەوە بەپێ ی کردەوەیان. ٢٦) ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا﴾
چونکە بێگومان ئەوان بەتەمای لێ پرسینەوە نەبوون. ٢٧)﴿وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا﴾ وە
ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی چۆن بەدرۆ زانینێک. ٢٨)﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا﴾
لەکاتێکدا هەموو شتێکمان ژماردووە (لەسەریان) بەنوسین. ٢٩) ﴿فَذُوقُوا۟﴾ ئینجا
بچەژن (سزای خۆتان) ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾ هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێت. ٣٠)

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾

ئایەتی (١) سورەتی (التكوير): عن أبي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): (الشمس والقمر يكوران يوم القيامة)(رواه البخاري). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەرمووی: (خۆرو مانگ لەڕۆژی دوایی دا دەپێچرێنەوە).

ئایەتی (٨) سورەتی (الانفطار): عن أبي هريرة (ﷺ) قال: إن رجلاً قال: يا رسول الله، إن امرأتي ولدت غلاماً أسود! قال: (هل لك من إبل) قال: نعم قال: (فما ألوانها؟) قال: حمر، قال: (فيها أورق؟) قال: نعم قال (فأنى أتاها ذلك) قال: عسى أن يكون نزعه عرق، قال: (وهذا عسى أن يكون نزعه عرق) (رواه البخاري و مسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) وەتی: پیاوێك وەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خێزانەكەم كوڕێكی -

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾ بێ گومان جێ ی پیرۆز و بەهرەمەندی هەیە بۆ پارێز کاران. ٣١ ) ﴿حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا﴾ باخات و هەموو جۆرە تریّ یەک. ٣٢ )﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾ وە کچانی تازە مەمک کردووی هاوتەمەن. ٣٣ ) ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾وەپەرداخی پڕ(لە شەراب). ٣٤ )﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا﴾ قسەی بێهووده ودرۆی تێدا نابیستن. ٣٥ )﴿جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا﴾( پاداش دەدرێنەوە بە ) پاداشتیکی تەواو لەلایەن پەروەدگاری تۆوە. ٣٦ )﴿رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ پەروەدگاری ئاسمانەکانَ و زەوی ونێوانی ئەوانە خوایەکی بەخشندەو میهربانەو﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا﴾ کەس توانای تکا کردنی(قسە کردنی ) نی یە. ٣٧ )﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا﴾لەرۆژێکدا کە جیبرییل و فریشتە بەرییز دەوەستن﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ کەسیان قسە ناکەن مەگەر ئەوەی کەخوا ڕێ ی بدات و قسەی بەڕێ و جێ بکات. ٣٨ ) ﴿ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ﴾ ئەو ڕۆژە راست و بێ گومانە ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا﴾ ئینجا هەرکەسێک ویستی ڕێگای گەڕانەوە دەگرێ بۆ لای پەروەردگاری خۆی. ٣٩ )﴿إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا﴾ بێگومان ئێمە ئێوەمان ئاگدار کرد لەسزایەکی نزیک ﴿يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ لە ڕۆژێکی وا دا کە مرۆڤ دەبینێ (پاداشی ) ئەو کردەوانەی کەپێشەکی بەدەستی خۆی ناردوونی ﴿وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾ وە بێ برِوا (لەو ڕۆژەدا ) دەڵێ: کاشکای گڵ بوومایە (نەک مرۆڤ). ٤٠ )

## سورەتی ﴿ النازعات ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا﴾ سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی کافران (لە لەشیان) بە سەختی دەردەهێنن. ١ ) ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا﴾ وە بەو فریشتانەی کە گیانی باوەڕداران بە ئاسانی دەردێنن. ٢ )﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا﴾ وە سوێند بەو فریشتانەی کە خێرا فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکەن. ٣ )﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا﴾ وەسوێند بەو فریشتانەی کە پێش برکێ دەکەن(لە بەجێ هێنانی فەرماندا ) ٤ )﴿فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا﴾ وە سوێند بەو فریشتانەی کە تەگبیری کاروبار دەکەن (واتە سوێند بەمانە ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە دێتە دی). ٥ )﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾ لەرۆژێکدا (فوو دەکرێ بە شەیپوردا) بومەلەرزە زەوی دەلەرزێنێ. ٦ )﴿تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾ (دووبارە فووی پیادەکرێتەوە ) بومەلەرزەیەکی تریشی بەدوادا دێت (مردووان زیندوو دەبنەوە ).٧ )﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ﴾ زۆر دڵ لەو ڕۆژەدا دەلەرزێ. ٨ )﴿أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ﴾ چاویان سەر بەرەو ژێر دەبێ. ٩ )﴿ يَقُولُونَ﴾ (ئەمرۆ بە گاڵتەوە ) دەڵێن. ﴿أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ﴾ ئاخۆ ئێمە (لەپاش مردن) دەگەڕێنرێینەوە بۆ ژیانی پێشوو؟. ١٠ ) ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً﴾ ئایا کە بووین بەئێسقانی ڕزیوچۆن (زیندوو دەبیینەوە ). ١١ )﴿ قَالُوا۟﴾ ووتیان ﴿تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾ ئا ئەوە ئەگەر وابێ گەڕانەوەیەکی بەزیانە. ١٢ )﴿فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ بێگومان ئەو زیندوو بوونەوەیە هەر یەک نەعرەتەیە. ١٣ )﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ ئیتر کوت و پڕ وان لەدەشتێکی سپی کاکی بەکاکیدا. ١٤ ) ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ ئایا داستانی مووسات پێ گەیشتووە.١٥ )

إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾




هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٤٢-٤٥) سورەتی النازعات: ﴿يسألونك عن الساعة أيان مرساها .... من يخشاها﴾ ئیبن جەریر و حاکیم گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام پرسیاری لێ دەکرا دەربارەی ڕۆژی دوایی تا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿فيم أنت من ذكراها ، إلى ربك منتهاها﴾

- ڕەش پێستی بووە -پێم وایە لەنوێنەکەی من نیە- فەرمووی: (ووشترت هەیە) ووتی: بەڵێ، فەرمووی (ڕەنگیان چۆنە؟) ووتی: سوورن، فەرمووی: (تێیاندایە ڕەنگی بۆر بێت؟ ووتی: بەڵێ، فەرمووی (ئا ئەو -حوشترە ڕەنگ جیاوازە- لە کوێوە پەیدا بووە ووچەی هاتووەتە؟) ووتی:-

﴿إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ کاتێک کە پەروەردگاری بانگی کرد لە شیێووی پیرۆزی طووا وە. ١٦ )﴿ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ ( پێ ی ووت ) برۆ بۆ سەر فیرعەون ( چونکە ) بەراستی یاخیی بووە. ١٧ )﴿فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ﴾ وە پێ ی بلێ: ئایا دەتەوێ پاک ببیتەوە ( لە گوناه ). ١٨ )﴿وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ﴾ وە رێت نیشاندەم بۆ ( ناسیینی ) پەروەردگارت تا لێ ی بترسییت. ١٩ )﴿فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ﴾ ئینجا نیشانە هەرە گەورەکەی نیشان دا. ٢٠ )﴿فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ﴾ کەچی بە درۆی زانی و سەرپیچی کرد. ٢١ )﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ﴾ لە پاشان پشتی هەلکرد و رۆی بە پەلە. ٢٢ )﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ﴾ ئینجا ( جادووگەرانی ) کۆکردەوە و بانگی کردن و. ٢٣ )﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ ووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم. ٢٤ )﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ﴾ ئینجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان. ٢٥ )﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً﴾ بە راستی لەم داستانەدا پەند هەیە ﴿لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾ بۆ کەسێک کە لە خوا بترسێ. ٢٦ )﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا﴾ ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە یا ئاسمان؟ دروستی کرد. ٢٧ )﴿رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا﴾ بالای بەرز کردەوە و رێکی خست. ٢٨ )﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا﴾ وە شەوی ئەوی تارییک کردو ﴿وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا﴾ دەری خست ( رووناکیی ) رۆژی. ٢٩ ) ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ لە پاشان زەوی راخست. ٣٠ ) ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا﴾ لێ ی دەرهێنا ئاویی و لەوەرِی. ٣١ )﴿وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾ وە شاخەکانی بتەو دامەزراند. ٣٢ )﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾ بۆ بەهرەمەندی خۆتان و ئاژەلتان. ٣٣ ) ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ﴾ ئینجا کاتێک کە رووداوی گەورە هات ( کە رۆژی دوایی یە ). ٣٤ )﴿يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾ ئەو رۆژەی کە مرۆڤ کردەوەی خۆی تیدا بیر دەکەوێتەوە. ٣٥ )﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ وە دۆزەخ پیشان درا بۆ هەر کەسێک کە بڕوانێ. ٣٦ )﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾( لەو رۆژەدا چاکە و خراپە بەپێ ی کردەوە دابەش دەکرێ ) ئینجا ئەو کەسەی سەکەش بوویێ. ٣٧ )﴿وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾ وە ژیانی دنیای هەلبژاردبێ. ٣٨ )﴿فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ ئەوە بێ گومان دۆزەخ جیگایەتی. ٣٩ )﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ﴾ وە ئەو کەسەی کە ترسا بێ لە هەلویستگەی بەردەم پەروەردگاری و ﴿وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ﴾ بەرگری نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزووی خراپە. ٤٠ )﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ ئەوە بێ گومان بەهەشت جیگایەتی. ٤١ )﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی رۆژی دوایی ﴿أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾ کەی دەبێ. ٤٢ )﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾ تۆ چیت داوە لە بیر لێ کردنەوەی ( تۆ چۆن لەم بارەوە دەدوێی )؟. ٤٣ )﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾ زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە. ٤٤ ) ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا﴾ بێگومان تۆ هەر ترسێنەری کەسێکیت کە لەو رۆژە بترسێ. ٤٥ )﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا﴾ بێ بڕواکان کە ئەو رۆژە دەبینن وا دەزانن ﴿لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾ کە نەماونەتەوە ئێوارەیەک یا چیشتەنگاوێک نەبێ لە دونیادا. ٤٦ )

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ (١) أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ (٢) وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّىٰ (٣) أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَىٰ (٤) أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَىٰ (٥) فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّىٰ (٦) وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ (٧) وَأَمَّا مَن جَاءَكَ يَسْعَىٰ (٨) وَهُوَ يَخْشَىٰ (٩) فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ (١٠) كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ (١١) فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ (١٢) فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ (١٣) مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ (١٤) بِأَيْدِي سَفَرَةٍ (١٥) كِرَامٍ بَرَرَةٍ (١٦) قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ (١٨) مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ (١٩) ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ (٢٠) ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ (٢١) ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ (٢٢) كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ (٢٣) فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢) فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ (٣٣) يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ (٣٤) وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ (٣٦) لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ (٣٧) وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ (٣٨) ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ (٣٩) وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ (٤٠) تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ (٤١) أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ (٤٢)

**هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایەتی (١-١٠) سورەتی (عبس): ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى ....﴾**
ترمونی و حاکیم گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى ، أن جَاءهُ الأعْمَى...﴾ دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم هاتەخوارەوە ، کە پیاوێکی کوێر بوو ، کە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و چەند جار ووتی: شارەزام بکە لە ئیسلام ، لەو کاتەشدا چەند پیاوێك لە سەرانی قورەیش لای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) ڕووی لێ وەرچەرخاند و گوێی پێ نەدا ، ڕووی کردە ئەوانی تر (سەرانی قورەیش) عەبدوڵلا ووتی: ئەم ووتەیەی من هیچی تێدایە؟ فەرمووی : نەخێر ، جا ئەم ئایەتانە لەوبارەوە هاتنەخوارەوە ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى ، أن جَاءهُ الأعْمَى...﴾.

## سورەتی ﴿ عبس ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (پێغەمبەر (ﷺ)) ڕووی گرژ کرد و پشتی هەلکرد. ١) ﴿أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ﴾ کە کوێرێک هاتە لای. ٢) ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّىٰ﴾ تۆ چوو زانیت؟ بەڵکو ئەو( کوێرە ) بیەوێ پاک ببێتەوە. ٣) ﴿أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَىٰ﴾ یا بیری بکەوێتەوە( ئەوەی کە لە بیری چۆتەوە ) ئەنجا ئەو بیر کردنەوەیە سوودی پێ بگەیەنێت. ٤) ﴿أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَىٰ﴾ کەچی ئەوی کە خۆی بێ نیاز دەزانێ. ٥) ﴿فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّىٰ﴾ تۆ ڕووی تێ دەکەیت. ٦) ﴿وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾ وەهیچ لەسەر تۆنی یە کەئەو بێ بڕوایە خۆی پاک نەکاتەوە. ٧) ﴿وَأَمَّا مَن جَاءَكَ يَسْعَىٰ﴾ بەڵام ئەو کەسەی کە بەپەلە دێ بۆ لات. ٨) ﴿وَهُوَ يَخْشَىٰ﴾ وەلە خوا دەترسێ. ٩) ﴿فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ﴾ تۆ خۆتی لێ هەڵە دەکەیت. ١٠) ﴿كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾ وامە کە ! بێ گومان ئەو ڕێ نموونی یانە( ی کەبۆت هاتووە ) بێدارکەرەوە( ی ئادەمی )یە. ١١) ﴿فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ ئینجا ئەو کەسەی بیەوێ یادی خوا دەکات. ١٢) ﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ﴾ (کە ئەوڕێ نموونی یانەش نوسراونەتەوە ) لە چەند پەڕەیەکی هێژای. ١٣) ﴿مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ﴾ پایە بلندی پاک. ١٤) ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ﴾ کەبەدەست نوینەرانی. ١٥) ﴿كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ بەڕێزی خێر خواوەن. ١٦) ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾ بەکوشت چێ ( خراپترین نەفرینی لێ بێ ) ئادەمی، چەند پێ نەزانە. ١٧) ﴿مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (بیرناکاتەوە بزانێ کە ) خوا لە چی دروستی کردووە. ١٨) ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ لەدڵۆپێک ئاو دروستی کردوە وڕێکی خستووە. ١٩) ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ لەپاشان ڕێگای (چاک و خراپی ) بۆ ئاسان کردوە. ٢٠) ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ﴾ ئینجا دەیمرێنێ و دەیخاتە گۆڕەوە. ٢١) ﴿ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ﴾ لە پاشان کاتێ کەویستی زیندووی دەکاتەوە. ٢٢) ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ﴾ بەڕاستی ئەوی کەخوا فەرمانی پێ داوە هێشتا (ئادەمیی ) بەجێ ی نەهێناوە. ٢٣) ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ﴾ دەبا مرۆڤ سەیری خواردەمەنیەکەی بکات. ٢٤) ﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا﴾ بەڕاستی ئێمە لە هەورەوە بارانمان داڕژاند چۆن داڕژاندنێک. ٢٥) ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا﴾ لە پاشان زەوییمان لەت لەت کرد ( بەگیا ) چۆن لەت کردنێک. ٢٦) ﴿فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾ ئینجا ڕوواندمان لەناوییا دانەوێڵە ٢٧) ﴿وَعِنَبًا وَقَضْبًا﴾ و ترێ و سەوزە. ٢٨) ﴿وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا﴾ و زیتون و دار خورما ٢٩) ﴿وَحَدَائِقَ غُلْبًا﴾ و باخاتی چڕو پڕو. ٣٠) ﴿وَفَاكِهَةً وَأَبًّا﴾ میوە و لەوەڕ. ٣١) ﴿مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾ بۆ ژیانی خۆتان و ئاژاڵتان. ٣٢) ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ﴾ کاتێک کە شاخە و شریخە ( ی ڕۆژی دوایی ) هات. ٣٣) ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ﴾ ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ رادەکات لە برای. ٣٤) ﴿وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ﴾ و دایکی و باوکی. ٣٥) ﴿وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ﴾ و ژنی و کوڕانی. ٣٦) ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ هەموو یەکێک لەوان لەو ڕۆژەدا کارێکی وای هەیە کە سەر کەسی تری نەپەرژێ. ٣٧) ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ﴾ زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەش و جوانن. ٣٨) ﴿ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ﴾ دەم بە پێکەنین و شادمانن. ٣٩) ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ﴾ وە زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا، تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە. ٤٠) ﴿تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ لە داماویدا ڕەش داگیرساون. ٤١) ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾ ئەوانە ئەوانەن کە بێ باوەڕ و گوناهکار و تاوانبارن. ٤٢)

## سُورَةُ التَّكوِير

مكية ٨١ | آیاتها ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ (١) وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ (٢) وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ (٣) وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ (٤) وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ (٥) وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ (٦) وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ (٧) وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ (٨) بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ (٩) وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ (١٠) وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ (١١) وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ (١٢) وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ (١٣) عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ (١٤) فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ (١٥) ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ (١٦) وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ (١٧) وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ (١٨) إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ (١٩) ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ (٢٠) مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ (٢١) وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ (٢٢) وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ (٢٣) وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ (٢٤) وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٖ (٢٥) فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ (٢٦) إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ (٢٧) لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ (٢٨) وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٢٩)

## سُورَةُ الانفِطَار

آیاتها ١٩

- لەوانەیە لەوێشترێکی پێشتر بچێتو ڕەنگەکەی لەو بکات، فەرمووی: (ئەم کوڕەش لەوانەیە لەیەکێك لەباوو باپیرانی پێش تۆ - بچێت- ئەو پێست ڕەشییەی لەو بکات).

**ئایەتی (٦) سورەتی (المطففین)**: عن المقداد قال: قال رسول الله (ﷺ): (إذا كان يوم القيامة أدنيت الشمس من العباد حتى تكون قيد ميل أو اثنين ، فتصهرهم الشمس فيكونون في العرق بقدر أعمالهم، فمنهم من يأخذه إلى عقبيه ، ومنهم من يأخذه إلى ركبتيه ، ومنهم من يأخذه إلى حقويه، ومنهم من يلجمه إلجاماً) (رواه الترمذي). میقداد دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا خۆر نزیم دەکرێتەوە لەئادەمی بەئەندازەی میلێك یادوان، جا خۆر (گۆشت و چەوری) لاشەیان دەتوێنێتەوە ئەوسا-

## سورەتی ﴿ التكوير ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ کاتێک کە رۆژ پێچرایەوەو (ڕووناکی نەما). ١) ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾ وە دەمێک کەئەستێرەکان هەڵ وەرین و کەوتنە خوارەوە (تارییک بوون). ٢) ﴿وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ﴾ وە کاتێک کە کێوەکان خرانەڕێ (لەشوێن خۆیان خزێندران). ٣) ﴿وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾ وە کاتێک کە وشترە ئاوسەکان وازیان لێ هێنرا. ٤) ﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ وە کاتێک کەجانەوەران کۆکرانەوە. ٥) ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ وە دەمێک کە دەریاکان هەڵگیرسێنران (تێکەڵ کران). ٦) ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ وە ساتێک کە هەموو گیانێک جووتکرایەوە (لەگەڵ لاشەدا). ٧) ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ﴾ وەکاتێک پرسیارکرا لە کچانی زیندە بەچاڵ. ٨) ﴿بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ﴾ کەبەچ گوناهێک کوژران. ٩) ﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾ وەکاتێک کەنامە (ی کردەوە) بڵاوکرایەوە (و دابەشکرا). ١٠) ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ﴾ وە دەمێک کەئاسمان داماڵێنراو پێچرایەوە. ١١) ﴿وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ وە کاتێک کەدۆزەخ هەڵگیرسێنرا. ١٢) ﴿وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾ وەساتێک کە بەهەشت نزیک خرایەوە. ١٣) ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ﴾ ئەوکاتە هەموو کەسێک دەزانێ کەچی ئامادە کردوە (بۆخۆی لەچاکەو خراپە). ١٤) ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ﴾ سوێند بەو (ئەستێرە گەڕۆکا) نەی دەگەڕێنەوە. ١٥) ﴿ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ﴾ سووڕاوەکانی خۆشارەوەکان. ١٦) ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ﴾ وە بەشەو کەتاریک دەبێت. ١٧) ﴿وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ وە بە بەیانی کە هەناسە دەدات. ١٨) ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ بێ گومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە (کەفریشتەی سرووشە). ١٩) ﴿ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ﴾ بەهێزە، لای خاوەنی عەرش (خوای گەورە)، خاوەن پایەیە. ٢٠) ﴿مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ﴾ قسە ڕەوایە لەناو فریشتەدا، دەست پاکە. ٢١) ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ هاوڕێکەتان (کە موحەممەدە ((ﷺ)) شێت نی یە (وەک ئێوە دەڵێن). ٢٢) ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾ سوێند بەخوا بێ گومان (فریشتەی سرووشی) دیبوە لە ئاسۆی ڕووندا. ٢٣) ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ وە ئەو ڕژدەو چرووک نی یە لەگەیاندنی سرووشدا. ٢٤) ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾ وە ئەو (قورئانە) قسەی شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا نی یە (وەک ئێوە دەڵێن). ٢٥) ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾ ئەوە بۆکوێ دەڕۆن. ٢٦) ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەو قورئانە تەنها ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان. ٢٧) ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ بۆ ئەو کەسانەی کەبیانەوێ بەڕێ ی ڕاست دا بڕۆن لە ئێوە. ٢٨) ﴿وَمَا تَشَآءُونَ﴾ ئێوە ئارەزوو(ی ڕێ ی ڕاست) ناکەن ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ مەگەر کاتێک کە پەروەردگاری هەمووان بیەوێت (وەنا چارتان بکات پێ ی). ٢٩)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١) سورەتی (المطففين): ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ نەسائی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ مەدینە و هیجرەتی کرد، خەڵکی مەدینە لە پێوانە و کێشانەدا لە هەموو کەس خراپ و ناڵەبارتر بوون بۆیە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ...﴾ جا پاش دابەزینی ئەم ئایەتە لە کێشانە و پێوانەدا زۆر چاک بوون.

-بەئەندازەی کردەوە خراپەکانیان لەعەرەقی خۆیاندا نوقم دەبن، هەیانە تا پاژنەکانی عەرەق هاتووە، وە هەیانە تا ئەژنۆکانی عەرەق هاتووە، وە هەیانە تا ناوقەدی هاتووە. وە هەیانە عەرەق دەگاتە دەمی وەک لەغاو کرابێت ناتوانێ قسە بکات).

## سورەتی ﴿ الانفطار ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾ کاتێک کە ئاسمان لەت بوو. ١ )﴿وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ وە دەمێک کە ئەستێرەکان (کەوتنە خوارەوە ) بە پەرش و بڵاوی. ٢ )﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ وە ساتێک کە دەریاکان تێکەڵ کران. ٣ )﴿وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ﴾ وە ساتێک کە گۆڕەکان ژێرەو ژوور کران (مردووەکان هاتنەدەرەوە ). ٤ )﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ ئەو کاتە هەموو کەسێک دەزانێت کەچی لە پێشەوە ناردوەو (چیشی ) دواخستوە. ٥ )﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ﴾ ئەی ئینسان ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ﴾ چی تۆی خەڵەتاندووە بە پەروەدگاری گەورەت (بەخشندەت ).٦ )﴿الَّذِي خَلَقَكَ﴾ ئەو (پەروەدگار)ەی کە دروستی کردوویت و ﴿فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ ڕێکی خستوویت و جیای کردویتەوە (لە گیان لەبەرانی تر). ٧ )﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ لە هەر وێنەیەکدا کەخۆی ویستبێتی یەکی خستوویت. ٨ )﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾ وانی یە (کەتێ ی گەیشتوویت ) بەڵکو (ڕۆژی ) پاداش بە درۆ دەزانن. ٩ )﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ﴾ بێ گومان چەند چاودێرێکتان بە سەرەوەیە. ١٠ )﴿كِرَامًا كَاتِبِينَ﴾ کە بەڕێز و نووسەرن. ١١ )﴿يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ هەرچی بکەن دەیزانن. ١٢ )﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ بەڕاستی چاکان لە ناو ناز و نیعمەت دان. ١٣ )﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ بێگومان بەدکاران لەدۆزەخان. ١٤ )﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ﴾ لە ڕۆژی پاداشدا دەچنە ناویەوە. ١٥ ) ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ﴾ وە ئەوان لێ ی دەرناچن. ١٦ )﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ تۆ چووزانیت کە ڕۆژی پاداش چی یە. ١٧ )﴿ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ دووبارە چووزانیت ڕۆژی پاداش چی یە. ١٨ ) ﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا﴾ ڕۆژێک کە هیچ کەس هیچی بە دەست نی یە بۆ هیچ کەس ﴿وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ وە فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە. ١٩ )

## سورەتی ﴿ المطففین ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ هاوار بۆ ترازوو بازان. ١ )﴿الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا﴾ ئەوانەی کە پێوانە بکەن (بۆ خۆیان ) ﴿عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ﴾ لەسەر (ماڵی ) خەڵک بەتەواوی وەری دەگرن. ٢ )﴿وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ بەڵام کاتێک بۆیان پێوانە یاکێشانە بکەن کەمیان دەدەنێ. ٣ ) ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ﴾ ئایا ئەوانە نازانن کەبێگومان زیندوو دەکرێنەوە. ٤ ) ﴿لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لە ڕۆژێکی گەورەدا. ٥ )﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ڕۆژێک کە خەڵک لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان دا دەوەستن. ٦ )

كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾

**ئایەتی (١٠) سورەتی (المطففين):** قال رسول الله (ﷺ): (ويل للذي **يحدث** فيكذب، ليضحك الناس، ويل **له**، ويل **له**) **(رواه أبو** داود). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: **(وای** –دۆزەخ– **بۆ ئەو** کەسەی **قسەی** درۆ **–گاڵتە–** دەکات **بۆ ئەوەی** خەڵك **بیهێنێتە** پێکەنین **وای بۆ** ئەو وای **بۆ ئەو**– دۆزەخ **هەڵبێت**).

**ئایەتی (٨) سورەتی (الانشقاق):** عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): (ليس أحد يحاسبُ إلاّ هلك) فقلت: أليس يقول الله: (فأما من أوتي كتابه بيمينه، فسوف يحاسب حساباً يسيراً) قال: (ليس ذلك بالحساب، ولكن ذلك العرض ومن نوقش الحساب هلك) (رواه البخاري ومسلم). عائيشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس –لە ڕۆژی دوایی دا– لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت –

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ﴾ با پەشیمان بنەوە، چونکە بەراستی نامەی تاوانباران لەناودەفتەرێکی پەستی رەشدایە. ٧ )﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ﴾ تۆ چوزانییت ئەو دەفتەرە چی یە. ٨ ) ﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ دەفتەرێکی نوسراوە. ٩ )﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ هاوار لەو رۆژەدا بۆ بێ بڕوایان. ١٠ )﴿ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بەرۆژی پاداشت دانەوە. ١١ )﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ کەس ئەو رۆژە بەدرۆ نازانێت مەگەر هەموو ستەم کارێکی گوناهبار. ١٢ )﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا﴾ هەر کاتێک کە ئایەتەکانی ئێمەی بۆ بخوێنرێتەوە ﴿قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ دەڵێ (ئەمانە ) ئەفسانەی پێشینانن. ١٣ )﴿كَلَّا﴾ نەخێر وانی یە ﴿ بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ بەلکو ژەنکی ئەو (خراپانەی ) کە دەیانکرد پەردەی هیناوە بەسەر دڵیاندا. ١٤ ) ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ نەخێر بە ڕاستی ئەوان لەو رۆژەدا، بێ بەشن لە بینینی پەروەردگاریان. ١٥ )﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ﴾ لە پاشان بێگومان ئەوان دەچنە دۆزەخەوە. ١٦ )﴿ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ ئینجا پێ یان دەووترێت ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ نەدەکرد. ١٧ )﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ﴾ بەراستی نامەی (کرداری) چاکان لەناو دەفتەرێکی بەرزدایە. ١٨ )﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾ تۆ چوزانییت ئەو دەفتەرە چی یە؟ ١٩ )﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ دەفتەرێکی نوسراو(ی ئەمەندە بەفەڕ)ە. ٢٠ )﴿يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ نزیکانی خودا دەیبینن. ٢١ )﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ﴾ بێ گومان چاکان لەنازو نیعمەت دان. ٢٢ )﴿عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ لەسەر تەخت و بارەگاوە سەیر دەکەن. ٢٣ )﴿تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ﴾ دەبینیت لە روخساریاندا جوانی و گەشاوەیی خۆشگوزەرانیی. ٢٤ )﴿يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ﴾ شەرابی پاکی سەر بەمۆریان پێ دەرێ بیخۆنەوە. ٢٥ )﴿ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ﴾ کەدوا قومی بۆنی میسکە.﴿وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ﴾ بۆ ئەوە با پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێ کەران. ٢٦ )﴿وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ﴾ تێکەڵ کراوی ، لەئاوی تەسنیمە. ٢٧ )﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ کانی یەکە کەنزیککراوەکان لێ ی دەخۆنەوە. ٢٨ )﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟﴾ بێ گومان ئەوانەی کە بەدکار بوون ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ﴾ پێ دەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هینا بوو. ٢٩ )﴿وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ﴾ وەکاتێک کەبەلایاندا بڕۆشتنایە چاویان لێ دادەگرتن. ٣٠ )﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ﴾ وەکاتێکیش بگەڕانایەتەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان، بە پێکەنین و گاڵتە کردن (بە موسڵمانان)ەوە دەگەڕانەوە. ٣١ )﴿وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾ وە کاتێکیش بیاندینایە ئەیان ووت: ئەمانە گومڕان ٣٢ )﴿وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ﴾ لەکاتێکدا کە(ئەوان ) بەچاودێر نەنێرراون بۆسەر موسڵمانەکان (تا ئەم قسەیە بکەن). ٣٣ )﴿فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ﴾ ئەمڕۆ (کە رۆژی دوایی یە ) ئەوانەی کە بڕوادار بوون بەبێ بڕواکان پێ دەکەنن. ٣٤ )

عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٢٥﴾

- داماودەبێت - دەچێتە دۆزەخەوە-) منیش دەڵێم ئەی خوا ئافەرەموویت: (بەڵام ئەوەی نامەی کردەوەکانی بەدەستی ڕاستیەوە بدرێت ئەو بێگومان لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت) فەرمووی: (ئەوە لێپرسینەوە نیە بەڵکو ئەوە تەنها تەماشا کردنە، چونکە هەر کەس لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت تیا دەچێ -سزا دەدرێت-).

**سورەتی (البروج)**: عن جابر بن سمرة: قال:(إن النبي (ﷺ) كان يقرأ في الظهر والعصر (والسماء والطارق) و(والسماء ذات البروج) (رواه أحمد و أبو داود و الترمذي). جابیری کوڕی سەمورە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە: دەڵێ (پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی نیوەڕۆو عەسردا سورەتی (والسماء والطارق) و (والسماء ذات البروج)ی دەخوێند -لەدوو ڕکاتی یەکەمدا پاش فاتیحە-).

﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ لەسەر قەنەفە و کورسی وە سەیر دەکەن. ٣٥ ) ﴿هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ (تا بزانن) تۆڵەی ئەو بێ بڕوایانە دراوەتەوە، لەسەر ئەو کردەوانەی کە دەیان کرد (لەدنیادا)؟ ٣٦ )

## سورەتی ﴿الانشقاق﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ کاتێک کەئاسمان لەت بوو. ١ )﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾ وە مل کەچی کرد بۆ پەروەردگاری و دەبێ واش بێ. ٢ )﴿وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ﴾ و ساتێک کە زەوی ڕاکێشراو پانکرایەوە (ڕاخرا). ٣ )﴿وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ﴾ وە ئەوەی تیابوو فڕێ ی داو هیچی لەناودانەما. ٤ )﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾ وە مل کەچی کرد بۆ پەروەردگاری و دەبێ واش بێ. ٥ )﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئەی ئینسان ﴿إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ﴾ تۆ بێ گومان تێکۆشەر ییت بەرەو پەروەردگارت بەتێکۆشان! ئەوسا پێ ی دەگەیت. ٦ )﴿فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ ئینجا ئەوکەسەی کەنامەی (کردەوەی) درا بەدەستی ڕاستی. ٧ )﴿فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا﴾ ئەوسا پرسینەوەیەکی سووک و ئاسانی لەگەڵ دەکرێ. ٨ )﴿وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا﴾ وە بەدڵخۆشی دەگەڕێتەوە بۆلای کەس و کاری. ٩ )﴿وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ﴾ وە ئەو کەسەی نامەی لەپشتەوە درایە دەستی. ١٠ )﴿فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا﴾ ئەوە بەزووی داوای مردنی خۆی دەکات. ١١ ) ﴿وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا﴾ وە دەچێتە دۆزەخەوە. ١٢ )﴿إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا﴾ (چونکە) بێگومان ئەو لە لەناو کەس وکاریدا دڵخۆش بووە. ١٣ )﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾ وەئەو وای گومان دەبرد، کە هەرگیز ناگەڕێتەوە (لای خوا). ١٤ )﴿بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا﴾ نەخێر وانی یە! چونکە بەڕاستی پەروەردگاری ئەو ئاگادار بووە بەو. ١٥ )﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ﴾ سوێند بەسووریی کەناری ئاسمان. ١٦ )﴿وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ﴾ وە بەشەوو ئەوشتانەی کە کۆیان دەکاتەوە. ١٧ )﴿وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ﴾ وە بە مانگ کاتێک کە پڕ دەبێتەوە. ١٨ ) ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾ (ئێوە) تێ ئەپەڕن لەحاڵێکە بۆ حاڵێکی تر. ١٩ ) ﴿فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئیتر بۆچی بڕوا ناهێنن؟ ٢٠ )﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ﴾ وە کاتێک کە قورئانیان بۆ بخوێنرێتەوە سوژدە نابەن (مل کەچی ناکەن). ٢١ )﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ﴾ بەڵام ئەوانەی کە بێ بڕوان بەدرۆی ئەزانن. ٢٢ ) ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ وە خوا چاک ئاگادارو زانایە بەوەی کەلەدڵی دەگرن. ٢٣ )﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ کەواتە مژدەیان بدەرێ بەسزای سەخت. ٢٤ ) ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڵام ئەوانەی کەبڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە ﴿لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ﴾ بۆ ئەوان هەیە پاداشتی بێ بڕانەوە. ٢٥ )

سُورَةُ البُرُوجِ — ترتيبها ٨٥ — آياتها ٢٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الطَّارِقِ — ترتيبها ٨٦ — آياتها ١٧

سوورەتی (الطارق): عن جابر (رضي الله عنه) قال: صلى معاذ المغرب فقرأ البقرة و النساء، فقال النبي (ﷺ): أفتان أنت يا معاذ؟ ما كان يكفيك أن تقرأ بالسماء والطارق والشمس وضحاها ونحوهما) (رواه النسائي). جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: موعاز نوێژی مەغریبی کرد – پێش نوێژ بوو– سوورەتی (البقرة) و (النساء)ی خوێند – لە دوو ڕکاتی یەکەمدا– پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی پێی: (موعاز تۆ خەڵکی لە ئایین دوور دەخەیتەوە؟ بەکەسی دەزانی کە (و السماء و الطارق) و (و الشمس و ضحاها) وێنەی ئەو سوورەتانە بخوێنی).

ئایەتی (٢) سوورەتی (الأعلى): عن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن الله قدر مقادير الخلائق قبل أن يخلق السماوات والأرض بخمسين ألف سنة، وكان عرشه

## سورەتی ﴿ البروج ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾ سوێند بەئاسمانی خاوەن برجەکان. ١ )﴿وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ﴾ وە بەو ڕۆژەی کە بەڵێنی پێدراوە. ٢ ) ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾ وە بە هەموو بینەر و بینراوێک (یا شایەت و شایەتی لەسەر دراو یا ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە ). ٣ )﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ﴾ بەکوشت چن خاوەن چاڵەکان (لەغەمەکان). ٤ )﴿النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ﴾ ئەو ئاگرەی خاوەن سووتەمەنی (و بڵێسەیە). ٥ )﴿إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ﴾ کاتێک کە ئەوان دانیشتبوون بەدەوری (ئاگرەکە)دا. ٦ )﴿وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ﴾ وە ئەوان سەیری ئەوەیان دەکرد کە دەیان کرد بەبڕوادارەکان. ٧ )﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا﴾ وە ئەم سزایەشیان هەر لەبەر ئەوە دەدران ﴿أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ کە بڕوایان هێنا بوو بەخوای بە دەسەڵاتی سوپاسکراو. ٨ )﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەوەی کە خاوەنێتی ئاسمانان و زەویی بۆ ئەوە ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ وە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا. ٩ ) ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاو و ژنە بڕوادارەکانیان داو ﴿ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا﴾ لە پاشان پەشیمان نەبوونەوە ﴿فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ﴾ ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ ، وە سزای (ئاگری) سووتێنەر. ١٠ )﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێک کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بە ژێریاندا ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ﴾ ئا ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە. ١١ )﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بەڕاستی دەست وە شاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە. ١٢ )﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بێگومان هەر ئەوە کە لە سەرەتاوە (مرۆڤ) دروست دەکات و (دوایی مردن) زیندووی دەکاتەوە. ١٣ )﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾ وە هەر ئەوە لێخۆشبووی میهرەبان. ١٤ ) ﴿ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ﴾ خاوەنی عەرش و بەرز و پایەدار. ١٥ )﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ هەرچی بوێ دەیکات. ١٦ )﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ﴾ ئایا پێت گەیشتووە باس و بەسەرهاتی لەشکرەکانی. ١٧ )﴿فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ﴾ فیرعەون و سەموود. ١٨ )﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ﴾ بەڵکو ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون هەمیشە لە بە درۆ زانینی (قورئان)دان. ١٩ ) ﴿وَاللَّهُ مِنْ وَرَائِهِمْ مُحِيطٌ﴾ وە خواش (بە دەسەڵات و زانینی) لەپشتیانەوە دەوری داون. ٢٠ )﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ﴾ بەڵکو ئەوە(ی کە بەدرۆی دەزانن) قورئانێکی گەورەو بەڕێزە. ٢١ )﴿فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ﴾ لە لەوحێکی پارێزراو دایە. ٢٢ )

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ﴿٢﴾ النَّجْمُ الثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى ﴿١١﴾ الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾

- على الماء) (رواه مسلم). عەبدوللای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێگومان خوای گەورە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمان و زەوی دروست بکات هەرچی دەربارەی دروستکراوەکان بێت دیاری کردووەو نوسیویەتی وە عەرشەکەشی لەسەر ئاو بووە).

سورەتی (الغاشیة): عن النعمان بن البشیر: (أن رسول الله (ﷺ) كان يقرأ في العيدين ويوم الجمعة بـ(سبح اسم ربك الأعلى) و (هل أتاك حديث الغاشية) وربما اجتمعا في يوم واحد فقرأهما) (رواه مسلم وأصحاب السنن). نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە لە نوێژی جەژنەکان و نوێژی هەینی دا سورەتی (سبح اسم ربك الأعلى) و (هل أتاك حديث -

## سورەتی ﴿ الطارق ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ سوێند بەئاسمان و ئەوەی کە لە شەوا دەردەکەوێ. ١ )﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ﴾ تۆ چوزانیت دەرکەوتووی شەو چی یە؟ ٢ ) ﴿ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ﴾ ئەستێرەی درەخشانی تاریکی کون کەرە. ٣ )﴿إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ (سوێند بەمانە ) کەس نی یە کە چاودێرێکی بەسەرەوە نەبێ. ٤ )﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ﴾ دەی با مرۆڤ سەرنج بدات کە لەچی دروست کراوە. ٥ )﴿خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ﴾ دروست کراوە لەئاوێکی فڕێدراو (هەڵقولاو) ٦ )﴿يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾ کەدەردەچێ لەناوەندی پشت (ی پیاو) دانەی (پەراسووی) سنگی (ژن)ەوە. ٧ )﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ﴾ بەراستی خوا بە دەسەڵاتە لەسەر زیندوو کردنەوەی. ٨ ) ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾ لە ڕۆژێکدا کە هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا دەکرێ. ٩ ) ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾ ئەو نەهێزێکە شکە دەبات و نەپشتیوانێکە. ١٠ ) ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ﴾ سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران. ١١ )﴿وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ﴾ وە بەزەوی خاوەن درزو قلیش. ١٢ )﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ﴾ ئەم (قورئانە ) ووتەی ڕاست و جیاکەرەوەیە. ١٣ )﴿وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ﴾ وە گاڵتە نی یە. ١٤ )﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا﴾ بێگومان بێ بڕواکان فێل دەکەن چۆن فێل کردنێک. ١٥ ) ﴿وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ وە منیش نەخشە دەکێشم بۆ هەڵوەشاندنەوەی فێڵەکانیان چۆن نەخشە کێشانێک (بەتۆڵە لێ سەندنیان) ١٦ )﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ئینجا مۆڵەتی بێ بڕواکان بدە. ﴿أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا﴾ منیش کەمێک لێیان دەوەستم. ١٧ )

## سورەتی ﴿ الأعلى ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ بەپاکی یادی پەروەردگاری هەرەبڵندت بکە. ١ )﴿ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ ئەوەی (هەمووشتێکی ) دروست کردووە و ڕێک و پێکی کردووە. ٢ )﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾ وە ئەوەی کە نەخشەی کێشاوە (بۆ هەموو شتێک) ئینجا شارەزای کردووە. ٣ )﴿وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ﴾ وە ئەوەی کە لەوەڕی دەرهێناوە. ٤ )﴿فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ﴾ ئینجا دەیکات بەپوشی ڕەش داگەڕاو. ٥ )﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ) قورئانت) بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە. ٦ )﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر ئەوەی کەخوا بیەوێت.﴿إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ﴾ بێگومان ئەو بەهەموو شتێکی ئاشکراو پەنهان ئاگادارە. ٧ )﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ﴾ وە یارمەتیت دەدەین بۆ ڕێ ی ئاسان. ٨ )﴿فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ ئینجا تۆش هەر دەم ئامۆژگاری بکە ئەگەر سوودی گەیاند. ٩ )﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ﴾ بێگومان ئەوی لەخوا بترسێ پەندی لێ وەردەگرێ. ١٠ )﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى﴾ وە ئەوەی زۆر خراپیش بێ خۆی لێ دوور ئەخاتەوە. ١١ )﴿ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ﴾ ئەوەی دەچێتە نار ئاگری هەرە گەورەوە. ١٢ )﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ لەپاشان نەدەمرێ تیایدا (تا ڕزگاری بێت) وە نە دەژی (تێیدا بەئاسایی). ١٣ ) ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾ بەراستی سەرفراز بوو ئەوی کەخۆی پاک ڕاگرت. ١٤ ) ﴿وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾ وە ناوی پەروەردگاری خۆی دەبات و کەوتە نوێژ کردن (پاڕایەوە ). ١٥ )

بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ الْغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى السَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ ﴿٢٦﴾

-الغاشیة)ی دەخوێند جاری واش بووە جەژن و هەینی لەهەمان ڕۆژدا بوون ئەوسوو سورەتەی خوێندووە تێیاندا).

**ئایەتی (٢٣) سورەتی (الفجر)**: قال رسول الله (ﷺ): (یؤتی بجهنم یومئذ لها سبعون ألف زمام مع کل زمام سبعون ألف ملك یجرونها) (رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا دۆزەخ، دەهێنن حەفتا هەزار هەوسار -ڕەشمەی- هەیە، هەر هەوسارێکی حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدایە ڕای دەکێشن).

**ئایەتی (١٥) سورەتی (البلد)**: عن سلمان بن عامر (رضي الله عنه) قال: یقول رسول الله (ﷺ): (الصدقة علی المسکین صدقة، وعلی ذي الرحم اثنتان صدقة وصلة) (رواه أحمد و الترمذي و-

﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾ بەڵکو ئێوە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن. ١٦) ﴿وَٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ کەچی (ژیانی) دوا ڕۆژ باشترو پایەدارترە. ١٧) ﴿إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾ بێ گومان ئەمە(ی کە باسکرا) لەنامەی پێشوەکاندایە. ١٨) ﴿صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾ نامەکانی ئیبراهیم و مووسا. ١٩)

## سورەتی ﴿ الغاشية ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ﴾ ئایا پێت گەیشتووە باسی ڕۆژی دوایی (داپۆشەر). ١) ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ﴾ زۆر دەم و چاو لەو ڕۆژەدا ترسناکە و ڕیسواو شەرمەزارن. ٢) ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾ هەولدەرێکی ڕەنجەڕۆن. ٣) ﴿تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً﴾ دەچنە ناو ئاگری هەرە گەرمەوە. ٤) ﴿تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ﴾ ئاو دەدرێن لەسەر چاوەی لەکوڵ و هەرە گەرم. ٥) ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾ خۆراکیان هەرڕێکی حوشتر خوار(ی ئاگریین)ە. ٦) ﴿لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ﴾ نە قەڵەوی دەدات نەبرسێتی لا دەبات. ٧) ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾ زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پاراوە (جوان گەشن). ٨) ﴿لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾ ڕازیین لە کۆششی خۆیان. ٩) ﴿فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ وان لەبەهەشتی بەرزو بلندا. ١٠) ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً﴾ قسەی هیچ و پوچی تێدا نابیستن. ١١) ﴿فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ تێیدایەتی سەرچاوەی ڕەوان. ١٢) ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ﴾ تێیدایەتی زۆر قەنەفەو تەختی بەرز. ١٣) ﴿وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ﴾ وەپەرداخی دانراو. ١٤) ﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ﴾ وە پشتی ڕیز کراو. ١٥) ﴿وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ﴾ وە قاڵی ڕاخراو لەهەموولایەکەوە. ١٦) ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾ دەی بۆ ووردنابنەوە لەحوشتر کەچۆن دروست کراوە. ١٧) ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ﴾ وە لەئاسمان کەچۆن بەرزکراوەتەوە. ١٨) ﴿وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ﴾ وە لە شاخەکان کەچۆن داکوتراون و دامەزرێنراون؟ ١٩) ﴿وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ وە لەزەوی کەچۆن ڕاخراوە ٢٠) ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾ کەوا بوو ئامۆژگاری بکە، تۆ هەر ئامۆژگارییت. ٢١) ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ تۆ دەسەڵات دار نیت بەسەریاندا. ٢٢) ﴿إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ﴾ بەڵام ئەو کەسەی کەپشت هەڵکاو بێ بروا بێت. ٢٣) ﴿فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ﴾ ئەوە خوا سزای دەدات بەسزای زۆر گەورە ٢٤) ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ﴾ بێگومان هەر بۆلای ئێمە یە گەڕانەوەیان. ٢٥) ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾ لەپاشان بەڕاستی لەسەر ئێمەیە لێ پرسینەوەیان. ٢٦)

سُورَةُ الفَجْرِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّىٰ لَهُ الذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾

- النسائي).
سەلمانی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ماڵ بەخشین و زەکات دان بە هەژار خێرە و یەک چاکەیە بەڵام بەخشینی بەخزم و خوێش دوو چاکەیە: خێرە و بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتیشە).

ئایەتی (١٧) سورەتی (البلد): عن جرير بن عبد الله (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا يرحم الله من لا يرحم الناس) (رواه البخاري و مسلم). جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی بەزەیی بەخەڵکدا نەیەتەوە خوایش بەزەیی بەو کەسەدا نایەتەوە).

ئایەتی (٧) سورەتی (الشمس): قال رسول الله (ﷺ): (يقول الله عز وجل: إني خلقت -

## سورەتی ﴿ الفجر ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَالْفَجْرِ﴾ سوێند بە بەرەبەیان. ١ )﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ وە بە دە شەوەی ئەوەڵی مانگ (ی قوربان ). ٢ )﴿وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾ وە بەتاک و جووت. ٣ )﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾ وە بەشەوگار کاتێک کە تێ دەپەڕێت. ٤ )﴿هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ﴾ ئایا ئەمانەی کە سوێندیان پێ خورا شایستەی سوێند پێ خواردن نیین لای تێگەیشتوو. ٥ )﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ﴾ ئایا نابینیت کە پەروەردگاری تۆ چی کرد بەگەلی عاد. ٦ )﴿إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾ ئیرەم؟ خاوەنی پایە (و دەسەڵات ). ٧ ) ﴿الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ کە وێنەیان دروست نەکرابوو لەهەموو وولاتدا. ٨ )﴿وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ وە (چی کرد ) بەگەلی سەموود ئەوانەی کە(شاخی ) بەردیان دەتاشی لەشیوو دۆڵەکاندا. ٩ )﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾ وەفیرعەونی خاوەن سنگی زۆر (وەک ئەهرامەکان بن کەوەک سنگ چوون بەزەویدا ). ١٠ ) ﴿الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ﴾ ئەوانەی کەیاخی بوون لەوولاتدا. ١١ )﴿فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾ وەزۆریان خراپە تیاکرد. ١٢ ) ﴿فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ ئینجا پەروەردگاری تۆ دایگرتن بەقامچی سزا. ١٣ ) ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە کەمینی ستەم کاراندایە. ١٤ ) ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ﴾ جا کاتێک کە خوا ئادەمی تاقی کردەوە ﴿فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ﴾ و ڕێزی گرت و نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشت ﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ﴾ ئەوە دەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتوم. ١٥ ) ﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ﴾ وە ئەگەر تاقی کردەوەو ڕۆزی کەم پێدا. ﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ﴾ ئەوسا دەڵێ پەروەردگارم ڕیسوای کردووم. ١٦ )﴿كَلَّا﴾ نەء وا نی یە (کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە ) ﴿بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ﴾ بەڵکو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن. ١٧ ) ﴿وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ وە هانی یەکتری نادەن لەسەر خواردەمەنی دان (و بەخێوکردنی ) هەژاران. ١٨ )﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا﴾ (بەڵکو سەرەڕای ئەمەش بەشە ) کەلەپور(ی بەشداران ) هەمووی (بەهەڵپە ) دەخۆن. ١٩ )﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ وە ماڵ و سامانتان خۆش دەوێ بەخۆش ویستنێکی زۆر. ٢٠ )﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ نابێ وابکەن! کاتێک کەزەوی بەتوندی درا بەیەکداو پارە پارە کرا. ٢١ ) ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیش پۆل پۆل (دێن ). ٢٢ ) ﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾ وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت (بۆ ساحەی مەحشەر ) ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ﴾ لەو ڕۆژەدا ئینسان (کردەوەی خۆی ) بیر دەکەوێتەوە ﴿وَأَنَّىٰ لَهُ الذِّكْرَىٰ﴾ بەڵام ئەو بیرکەوتنەوەیە چ سوودێک بەو دەگەیەنێت؟ ٢٣ )

يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ ﴿٢٠﴾




- عبادي حنفاء فجاءتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم)(رواه مسلم).
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمووێ: بێگومان من بەندەکانم بەئیماندار دروست کرد جاشەیتانەکان هاتن لەئایینەکەیان لایان دان).

**ئایەتی (١٤) سورەتی (الليل):**
عن النعمان بن بشير (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن أهون أهل النار عذاباً يوم القيامة رجل يوضع في أخمص قدميه جمرتان يغلي منهما دماغه)(رواه البخاري).
نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان لەهاسانیی دا ئەوەی لەهەموو دۆزەخیان سزای سوکترە پیاوێکە دوو پشکۆی ئاگر دادەنێن لەژێر چاڵایی هەر دوو ژێر پێی دا جا لەبەر تینی ئەو دوو پشکۆ، مێشکی دەکوڵێ -وەک چاوی سەر ئاگر-).

﴿يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي﴾ (ئینجا بەداخەوە) دەڵێ خۆزگە لە دنیادا کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانەم. ٢٤)﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ ئنجا لەو ڕۆژەدا کەس سزای کەس نادات وەکو سزای خوا. ٢٥)﴿وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ وە کەس کەلەپچەی کەس ناکات وەکو کەلەپچە کردنی خوا (بۆ بێ باوەڕان). ٢٦) ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ﴾ (لەو ڕۆژەدا بە خوا پەرست دەووترێت) ئەی نەفسی بە ئارام. ٢٧)﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ﴾ بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت بە ڕەزامەندی و لێ ڕازی بوو. ٢٨) ﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾ ئینجا بچۆرە ناو بەندە چاکەکانی من. ٢٩)﴿وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾ و بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە. ٣٠)

## سورەتی ﴿ البلد ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ﴾ سوێند بەم شارە (کەمەککەیە). ١)﴿وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ﴾ وە تۆ لەو شارەدا نیشتەجێی (کە ئازاردانی تۆی تێدا ڕەوا دراوە). ٢)﴿وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ﴾ وە سوێند بە باوک و ئەوەی کەلێ ی کەوتۆتەوە. ٣)﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئادەمیمان دروست کردوە لەرەنج و کێشە و نارەحەتیدایە. ٤)﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ﴾ ئایا وادەزانێ کەکەس دەسەلاتی بەسەریدا نی یە. ٥)﴿يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا﴾ (بەفیزەوە) دەڵێ ماڵی زۆرم لە ناو داوەو بەخشیووە. ٦)﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ ئایا وا دەزانێ کەکەس نەیدیوە. ٧)﴿ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ﴾ ئایا دوو چاومان نەداوەتێ. ٨)﴿وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ﴾ وەزمانێک و دوو لێومان پێ نەداوە؟ ٩)﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾ وەرێ ی چاک و خراپمان نیشان نەداوە. ١٠)﴿فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ﴾ کەچی هێشتا (زۆرێک لەخەڵکی) پەلاماری پلەی سەختی نەداوە. ١١)﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ﴾ تۆ چوزانیت پلەی سەخت کامەیە. ١٢)﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ ئازاد کردنی کۆیلەیە. ١٣)﴿أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾ و ناندانە لەڕۆژی گرانی و برسیتی دا. ١٤)﴿يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ﴾ بەهەتیوی خزم. ١٥)﴿أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ﴾ یا بەهەژاری خاکە سەر (کەفتەکار) ١٦)﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ سەرەڕای ئەمانەش لەو کەسانە بێ کە بڕوایان هێنابێ و ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بەئارامگرتن ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ﴾ و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بەبەزەیی و میهرەبانی. ١٧)﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ﴾ ئەوانەهاوەڵانی دەستی ڕاستن. ١٨)﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ﴾ وەئەوانەی کەبێ بڕوا بوون بە موعجیزەو نیشانەکانی ئێمە ئەوانە هاوەڵانی دەستی چەپن. ١٩)﴿عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ﴾ دایگرتوون ئاگری دەرگا داخراو. ٢٠)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا ﴿٤﴾ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥،٦) سورەتی (الليل): ﴿ فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى﴾ حاکیم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە ئەویش لە زوبەیری باوکیەوە، دەڵێ: ئەبو قوحافە وتی: بە ئەبو بەکر: دەتبینم ئەو بەندانەی لاواز و بێ توانان ئازادیان دەکەیت؟ بەڵام کوڕەکەم ئەگەر کەسانی بەتواناو بەهێزت ئازاد بکردایە ئەوە بەرگری و پارێزگاریان لێ دەکردی، ئەبو بەکریش وتی بابە گیان من تەنها مەبەستم پاداشتی لای خوایە ئیتر ئەم ئایەتانە دابەزین ﴿ فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى ، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى ﴾.

ئایەتی (١) سورەتی (الضحى): عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: (أوصاني خليلي (صلى الله عليه وسلم) بصيام –

## سورەتی ﴿ الشمس ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا﴾ سوێند بەخۆر و رووناکی یەکەی. ۱) ﴿وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا﴾ وە سوێند بەمانگ کەدوا بەدوای ئەو هەڵبێ. ۲) ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا﴾ وە سوێند بە رۆژ کاتێ کەخۆر دەردەخات. ۳) ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا﴾ وە سوێند بەشەو کەخۆر دادەپۆشێ. ٤) ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾ وە سوێند بەئاسمان و بەوەی دروستی کردووە. ٥) ﴿وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا﴾ وەسوێند بەزەوی و ئەوەی رای خستووە. ٦) ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾ وەسوێند بە نەفس (ی ئادەمی) و ئەوەی رێک و پێک بەدیهێناوە. ۷) ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾ ئینجا بە سرووشت ئاگاداری کرد بە بەدکاری و پارێزکاریی خۆی. ۸) ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾ (سوێند بەهەموو ئەوانە) بەراستی رزگاری بوو ئەو کەسەی کەنەفسی خۆی پاک کردەوە. ۹) ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی کەنەفسی خۆی (بەگوناە) وون و تاوانبار کرد. ۱۰) ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ﴾ بڕوای نەهێنا هۆزی سەموود بەهۆی سەرکەشی یانەوە. ۱۱) ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا﴾ کاتێک کە خراپترینیان هەستایەوە (بۆ سەربڕینی حوشترەکە). ۱۲) ﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا﴾ ئینجا پێغەمبەری خوا پێ ی ووتن: واز بێنن لەم حوشتری خوایە و نۆرە ئاوەکەی. ۱۳) ﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا﴾ کەچی بڕوایان پێ نەکردو حوشترەکەیان سەربڕی ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا﴾ ئینجا پەروەردگاری ئەوان سزای رشت بەسەریاندا بەهۆی گوناهەکانیانەوەو تەختی کردن. ١٤) ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا﴾ وە (خوا) ناترسێ لەپاشە رۆژی ئەم (تۆڵە لێ سەندنەیان). ١٥)

## سورەتی ﴿ الليل ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ سوێند بەشەو کاتێک کە (زەوی) دادەپۆشێ. ۱) ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾ وەبەرۆژ کاتی کە رووناک دەبێتەوە. ۲) ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ﴾ وەبەو زاتەی کەنێرو مێ ی دروست کردوە. ۳) ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ﴾ بەراستی هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە. ٤) ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ﴾ ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێ و لەخوا بترسێت و پارێزکار بێت. ٥) ﴿وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ﴾ وەبڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە (لا اله إلا الله یا بەهەشت). ٦) ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ﴾ ئەو بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ رێ ی ئاسان. (کەچاکەیە). ۷) ﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ﴾ وە ئەو کەسەی رژدی بکات خۆی بێ نیازبزانێ. ۸) ﴿وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ﴾وە بڕوای نەبێ بەچاکە(کە لا الە إلا الله یە یلبەهەشتە). ۹) ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ﴾ئەوە بێگومان رێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین. ۱۰) ﴿وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾ وە سەروەت و سامانەکەی فریای ناکەوێ کاتێک کەتیادەچێ. ۱۱) ﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ﴾ بەراستی لەسەر ئێمەیە رێ نموونیی. ۱۲) ﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ﴾ وە هەردوو جیهان هی ئێمەیە. ۱۳) ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ من ئێوەم ترساند بەئاگرێکی بڵێسەدار (کەدۆزەخە). ١٤)

لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾

## سُورَةُ الضُّحَىٰ

آياتها ١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾

## سُورَةُ الشَّرْحِ

آياتها ٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١-٣) سورەتی (الضحى): ﴿وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ بوخاری و موسلیم لە جوندوبی کوڕی سوفیانەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ)) دوو یا سێ شەو هەڵنەدەستا شەونوێژ بکات، ئەوسا ئافرەتێک هات و ووتی: ئەی موحەممەد ئومێدەوارم شەیتانەکەت وازی لە هێنابێت دوو یا سێ شەوە نابینم نزیکت بکەوێتەوە، بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾.

- ثلاثة أيام من كل شهر وركعتي الضحى وأن أوتر قبل أن أرقد) (رواه البخاري ومسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (تۆڕ خۆشەویستم (پێغەمبەر (ﷺ)) ئامۆژگاری کردم-

﴿لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى﴾ کەس ناچێتە ناو دۆزەخەوە مەگەر خراپترین کەس. ١٥) ﴿ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ ئەو کەسەی کەبڕوای نەبێ و پشتی هەڵکردبێ (لەئایینی ڕاست). ١٦) ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى﴾ وەلێ ی دوور دەخرێتەوە پارێزکارترین کەس. ١٧) ﴿ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ﴾ ئەوی مالی خۆی دەبەخشێ تا (دڵ و دەروونی) پاک ببێتەوە. ١٨) ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ﴾ لەکاتێکدا کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نی یە کەپاداشت بدرێتەوە. ١٩) ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ تەنها مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرزو بلندە. ٢٠) ﴿وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾ سوێند بەخوا (ئەو کەسەی وابێت) لەمەولا ڕازی دەبێ (بەپاداشتی دوا ڕۆژ). ٢١)

## سورەتی ﴿ الضحى ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾ سوێند بەچێشتەنگاو. ١) ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ وە سوێند بەشەو کاتێک کە ئارام دەگرێ (بزرنگیتەوە). ٢) ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ پەروەدگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دلگیرنەبووە. ٣) ﴿وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ﴾ وە (پاداشتی) دوا ڕۆژ بۆ تۆ چاکترە لەدنیا. ٤) ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾ سوێند بەخوا لەمەولا پەروەدگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی ببیت. ٥) ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ﴾ ئایا تۆی نەدیی بەهەتیوو حەوانی تی یەوە. ٦) ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ﴾ وە تۆی نەدیی بەسەر لێ شێواو ڕێ نموونیی کردبیت. ٧) ﴿وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ وە تۆی نەدیی بە هەژارو ، دەوڵەمەندی کردبیت. ٨) ﴿فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴾ کەواتە (تۆش) هەتیوو مەچەو سێنەرەوە. ٩) ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ وە هەڵمە شاخێ بە پرسیارکەر (هەژارو سوالکەر)دا. ١٠) ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ وە نیعمەت و بەخششی پەروەدگارت دەربخە (بە یامەرتی هەژاران). ١١)

## سورەتی ﴿ الشرح ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئایا سنگمان بۆ ئاسوودەو گوشاد نەکردبیت. ١) ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ﴾ وە دامان گرت لێت ئەو بارەگرانەی. ٢) ﴿ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ کەپشتی زۆر قورس کردبوویت. ٣) ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ وە ناوو ناوبانگتمان بۆ بەرزکردبیتەوە. ٤) ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾ بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت. ٥) ﴿إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾ بێ گومان لەڕاستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت. ٦) ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ﴾ ئینجا کەلە کارێک بوویتەوە، خۆت ماندوو بکە (بەکارێکی ترەوە). ٧) ﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب﴾ وە هەر لە پەروەدگارت بپاڕێرەوە (بۆکارەکانت). ٨)

## سُورَةُ التِّينِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾

## سُورَةُ الْعَلَقِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَىٰ ﴿٦﴾ أَن رَّآهُ اسْتَغْنَىٰ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الرُّجْعَىٰ ﴿٨﴾ أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰ ﴿١٠﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَانَ عَلَى الْهُدَىٰ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَىٰ ﴿١٢﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٦-١٨) سورەتی (العلق): ﴿ كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى..... فَلْيَدْعُ نَادِيَه ، سَنَدْعُ الزَّبَانِيَة﴾ موسلیم و تورمزی لە عەبدوللای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ)) نوێژی دەکرد، ئەبوجەهلیش هات وتی: من پێم نەوتی نابێ نوێژ بکەی؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لای کردەوە و لێ ی توڕە بوو پیا هەڵشاخا ، ئەبوجەهلیش وتی : بێگومان تۆ دەزانیت کە لەشاردا من کۆڕو کۆمەڵم لەهەموو کەس زیاترە: بەم هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردەخوارەوە: ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى ، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى ... فَلْيَدْعُ نَادِيَه ، سَنَدْعُ الزَّبَانِيَة ﴾ عەبدوللای کوڕی عەبباس وتی: وەڵلاهی ئەگەر کۆڕو کۆمەڵەکەی بانگ بکردایە فریشتە زەبر بە دەستەکان ئەوان سزا ئەدا و تۆڵەیان لێ دەسەند.

## سورەتی ﴿ التین ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ سوێند بە هەنجیر و زەیتون. ١) ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ وەسوێند بە طووری سینا. ٢)﴿وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ﴾ وە بەم شاری ئارام و بێ ترسە (کە مەککەیە). ٣)﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد لە جوانترین شێوەدا. ٤)﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ لە پاشان (ئەگەر بێ باوەڕ بێ) دەیکەین بە پەست ترینی هەموو پەستێک. ٥)﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ مەگەر ئەوانەی کەبڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ بۆ ئەوان هەیە پاداشتی نەبڕاوە. ٦)﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ﴾ جا ئیتر چی بێ بڕوات دەکات بە ئایین. ٧)﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ ئایا خوا فەرمان ڕەواتری هەموو فەرمان ڕەوایانێک نی یە؟ ٨)

## سورەتی ﴿ العلق ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ))بخوێنە بەناوی پەروەدگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردوە. ١)﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ مرۆڤی دروست کردوەلەخوێنێکی بەستوو. ٢) ﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ﴾ بخوێنە، پەروەدگاری تۆ(لەهەموو کەس)بەخشندەترە. ٣) ﴿الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ئەوەی کە(مرۆڤی )فێر(ی نووسین) کردووە بەقەلەم.٤)﴿عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ مرۆڤی شارەزا کردووە بەوشتانەی کەنەی دەزانی. ٥)﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَىٰ﴾بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ. ٦)﴿أَن رَّآهُ اسْتَغْنَىٰ﴾ کەخۆی ببینێ وادەوڵەمەند بووە. ٧)﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الرُّجْعَىٰ﴾بێ گومان هەریۆلای پەروەدگاری تۆیە گەڕانەوە. ٨) ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَىٰ﴾ ئایا بینیت ئەو کەسەی کە جڵەو گیریی ئەکات. ٩)﴿عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰ﴾ لە بەندەیەک کەنوێژ بکات؟ ١٠)﴿أَرَأَيْتَ إِن كَانَ عَلَى الْهُدَىٰ﴾ ئایا پێم بڵێ ئەگەر (ئەو کەسە) لەسەر ڕێی ڕاست بووایە. ١١)﴿أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَىٰ﴾ یا فەرمانی بدایە بەپارێزکاریی (باشتر نەدەبوو). ١٢) ﴿أَرَأَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ ئایا بینیت ئەگەر بڕوای (بە ئایینی بەڕاستی) نەبێ و پشتی لێ هەڵکات (ڕزگاری دەبێ). ١٣) ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ﴾ ئایا نەی زانیوە کەخوا دەی بینێ. ١٤)﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾ وانی یە (کە بیری لێ دەکاتەوە) بەڕاستی ئەگەر واز نەهێنێ ڕای دەکێشین(بەقژی) پێشەسەری. ١٥)﴿نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ پێشەسەرێکی درۆزنی بە هەڵەدا چوو. ١٦) ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ﴾ ئینجابانەوبانگی هاوڕێکانی خۆی بکات. ١٧)﴿سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ﴾ ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بەدەست دەکەین. ١٨)﴿كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب﴾ نەخێر، بە گوێ ی (ئەو کەسانە) مەکە، وە کڕنوش بەرەو (لەخوا) نزیک بکەوەرەوە. ١٩)

## سُورَةُ القَدْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾

## سُورَةُ البَيِّنَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾

- کە لەهەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبم وەدوور کاتی نوێژی چێشتەنگا بکەم، وە نوێژی ویتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم).

**ئایەتی (٨) سورەتی (الضحى)**: قال رسول الله (ﷺ): (ليس الغنى عن كثرة العرض، ولكن الغنى غنى النفس) (رواه البخاري ومسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دەوڵەمەندی بەزۆری دارایی و سامان نی یە بەڵکو دەوڵەمەندی بریتی یە لـە بەرچاو تێری و دەروون بەرزی).

**ئایەتی (٧) سورەتی (الشرح)**: قال رسول الله (ﷺ): (نعمتان مغبون فيها كثير من الناس الصحة والفراغ)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دوو بەهرەی گەورە هەن زۆربەی خەڵک بێ ئاگان لێیان –بەرهەمیان نامێنن– یەکەم: تەندروستی و لەش ساغی، دووەم: دەست بەتاڵی و بەرژان).

## سورەتی ﴿ القدر ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ بێگومان ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لەشەوی بە بەفەڕو بەرێزدا. ١ ) ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ﴾ تۆ چوزانییت کەشەوی بەفەڕو ڕێز چی یە. ٢ )﴿لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ شەوی بە فەڕو ڕێز چاکترە لەهەزار مانگ. ٣ )﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا﴾ لەوشەوەدا فریشتە و جیبرییلیش لەناویاندا دێنە خوارەوە ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ بەفەرمانی پەروەردگاریان لەهەموو کاروبارێکدا. ٤ )﴿سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ ئەو شەوە (کاتی) هێمنی و ئاشتیی دەبێ تا هەلاتنی شەبەق. ٥ )

## سورەتی ﴿ البينة ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون ﴿مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ لە خاوەنی نامە و ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بت پەرستان ﴿مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ دەستیان هەلنەگرت (لەو بێ بڕوایی یە) تانیشانە روونەکەیان بۆ هات. ١ )﴿رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً﴾ (کە ئەویش) پێغەمبەرێکە لە خولوە چەند پەڕەیەکی پاکیان (بەسەردا) دەخوێنێتەوە. ٢ )﴿فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ کەتیایانایە چەند نوسراو (سورەت)ێکی بەنرخ. ٣ ) ﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە جیانەبوونەوە ئەوانەی کە پەیامیان بۆ هاتبوو ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ دوای ئەوە نەبێ کەنیشانە روونەکەیان بۆ هات (کە پێغەمبەری ئیسلامە). ٤ )﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ (لەگەل ئەوەشدا) کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن ﴿مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ بەدلسۆزی ملکەچی بۆ بکەن خۆیان بەدوور بگرن لەهەموو بیرو باوەڕێکی خوار و خێچ ﴿وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾ وە ئەمەیە ئاینی ڕاست. ٥ )﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون لەخاوەن پەیام و بت پەرستەکان ﴿فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ لە ئاگری دۆزەخان تێیدا دەمێننەوە بە ئێجگاریی ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ﴾ ئا ئەوانە خراپترینی هەموو دروست کراوێکن. ٦ ) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ﴾ ئا ئەوانە چاکترینی هەموو دروستکراوێکن. ٧ )

جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ الزَّلزَلَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ العَادِيَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾

**ئایەتی (١٩) سورەتی (العلق)**: عن أبي هريرة (ﷺ) قال: قال النبي (ﷺ): (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء) (رواه مسلم). ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتی یەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نزیکترین حاڵەتی بەندە لە پەروەردگاریەوە ئەو کاتەیە لەسوژدە دایە کەواتە -لەو کاتەدا- زۆر بپاڕێنەوە).

**ئایەتی (٣) سورەتی (القدر)**: قال رسول الله (ﷺ): (من قام ليلة القدر إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه) (رواه البخاري و مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەموویەتی: (هەر کەس کەوێ قەدر هەستێ -بەشەونوێژ- بکات- باوەڕی پێی هەبێت بەتەمای پاداشتی لای خوا بێ لەگوناهی ڕابوردووی دەسڕێتەوە).

**سورەتی (البينة)**: عن أنس قال: قال رسول الله (ﷺ) لأبي بن كعب: (إن الله أمرني أن أقرأ-

﴿جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ﴾ پاداشتی ئەوان لای پەروەردگاریان بەهەشتانێکە جێ ی دانیشتن و مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ دەمیننەوە تێیدا بە ئێجگاری ، خوا لێیان ڕازی بوو ﴿وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ وە ئەوان لەخوا ڕازی بوون ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ﴾ ئەمە بۆ کەسێکە کە لەخوا بترسێ. ٨ )

## سورەتی ﴿ الزلزلة ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ کاتێک زەوی هاتە لەرزە بەلەرزینی خۆی. ١ )﴿وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ وەزەوی هەرچی شتی قورس و گرانی (ناوی) هەیە هەمووی فڕێ دایە دەرەوە. ٢ )﴿وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا﴾ وە ئینسان لەو ڕۆژەدا دەڵێ: ئەوە زەوی چی یەتی؟ ٣ )﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ لەو ڕۆژەدا(زەوی) دەنگ و باسی خۆی دەگێڕێتەوە. ٤ ) ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا﴾ کەپەروەردگاری تۆ (وای) سرووش بۆ کردوە. ٥ )﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا﴾ لەو ڕۆژەدا خەڵکی دەردەچن بەپەراگەندە و پەشێوی ﴿لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ تا (پاداشتی ) کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ. ٦ )﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ﴾ ئینجا هەرکەسێک بە ئەندازەی هەرە ووردیلەیەک چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە. ٧ ) ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ وە هەرکەسێک بەئەندازەی هەرە وردیلەیەک خراپەی کردبێ دەی بینێتەوە. ٨ )

## سورەتی ﴿ العادیات ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا﴾ سوێند بە ئەسپانی تاودەر (کەدەپرمێنن) چۆن پرمە یەک. ١ )﴿فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا﴾ وە سوێند بەئاگر هەڵگیرسێنەران لەبەرد بەناڵی سمیان. ٢ )﴿فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا﴾ وە سوێند بە(ئەسپانی ) هێرش بەران لەبەیانیاندا. ٣ )﴿فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا﴾ کە بەوە تەپ و تۆز هەڵدەستێنن. ٤ )﴿فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا﴾ وە بەو تەپ و تۆزەوە، خۆیان دەکەن بە ناوەڕاستی کۆمەڵی دوژمندا. ٥ )﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ﴾ بەڕاستی ئینسان بۆ پەروەردگاری ناسوپاسە، ٦ )﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ وە بێگومان خۆی لەسەر ئەم ناسوپاسی یە شایەتە. ٧ )﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ وە بەڕاستی ئینسان بۆ خۆشەویستی ماڵی دنیا زۆر بەگیرە. ٨ )﴿أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ﴾ دەی ئایا نازانی کاتێک کە مردووی ناوگۆڕەکان زیندوو کرانەوە (هێنرانە دەرەوە). ٩ )

وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ﴿١١﴾

## سُورَةُ ٱلْقَارِعَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾

## سُورَةُ ٱلتَّكَاثُرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾

- عليك (لم يكن الذين كفروا) قال: وسماني لك؟ قال (نعم) فبكى) رواه البخاري و مسلم). ئەنەس گێڕاویەتی بەوەی دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەئوبەی کوڕی کەعب: (خوای گەورە فەرمانی پێداووم کە سورەتی (لم يكن الذين كفروا) بخوێنم بۆت) ئوبەی ووتی: ناویشی هێنام لات؟ فەرمووی (بەڵێ) ئەدجا ئوبەی -لە خۆشیدا- دەستی کرد بەگریان).

ئایەتی (٧) سورەتی (الزلزلة): عن عدي بن حاتم (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): (اتقوا النار ولو بشق تمرة) (متفق عليه). عەدی کوڕی حاتەم گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێوە -ئیمانداران- خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن ئەگەر بە -بەخشینی- لەتە خورمایەکیش بێت).

﴿وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ﴾ وە ئاشکرا بوو هەرچی رازی ناودڵانە. ١٠) ﴿إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ﴾ بێ گومان پەروەردگاریان لەو رۆژەدا ئاگادارە بەکردەوەیان. ١١)

## سورەتی ﴿ القارعة ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿الْقَارِعَةُ﴾ **رۆژی داچڵەکێنەر (ناوە بۆ رۆژی قیامەت).** ١) ﴿مَا الْقَارِعَةُ﴾ ئاخۆ چۆن بێ ئەو رۆژە؟ ٢) ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ **تۆ چوزانییت** ئەو رۆژە چی یە. ٣) ﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ﴾ **رۆژێکە خەڵکی وەک پەپولەی** پەراگەندە بڵاودەبنەوە. ٤) ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾ **وە شاخەکان وەک** خوری شیکراویان لێ دێت. ٥) ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾ **ئینجا ئەوەی کێشی** (چاکەکانی) قورس و گران بێ. ٦) ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ **ئەوە ئەو کەسە لە** گوزەرانێکی پەسەندا ئەبێ. ٧) ﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ﴾ **وە ئەوەی کێشی (چاکەکانی)** سووک بێ. ٨) ﴿فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ﴾ ئەوە جێ ی ئەو(هاویە)یە. ٩) ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ﴾ تۆ چووزانییت (هاویە) چی یە. ١٠)﴿نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ ئاگرێکی هەڵگیرساوە. ١١)

## سورەتی ﴿ التكاثر ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ **ئێوەی بێ ئاگا کردووە شانازیتان بەزۆریی سەروەت و سامانەوە.** ١)﴿حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ **تا** دەمرن و دەچن بۆ **گۆرستان.** ٢)﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ **وامەکەن! لەمەو لا دەزانن.** ٣)﴿ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ **دووبارە وا مەکەن لەمەولا دەزانن.** ٤) ﴿كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ﴾ **وانی یە (وەکو خۆتان دەیزانن) ئەگەر (ئەنجامی خۆتان) بزانیایە بە دڵنیایی یەوە (وا بێ ئاگا نەئەبوون).** ٥) ﴿لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ﴾ **سوێند بەخوا بێ گومان دۆزەخ دەبینن.** ٦) ﴿ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ﴾ **دووبارە سوێند بە خوا دڵنیابن بە چاوی راستەقینە دەی بینن.** ٧)﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ **لە پاشان سوێند بە خوا لەو رۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەکتان لێ دەکرێ.** ٨)

## سُورَةُ العَصۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾

## سُورَةُ الهُمَزَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ﴿٩﴾

## سُورَةُ الفِيلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ﴿٢﴾ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ﴿٥﴾

ئایەتی (١) سورەتی (القارعة): قال رسول الله (ﷺ): (نار بني آدم التي توقدون جزءٌ من سبعين جزءاً من نار جهنم)(رواه البخاري). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ئاگرەی ئادەمی بەکاری دێنێ یەك بەشە لە حەفتا بەش گەرمی لە ئاگری دۆزەخ).

ئایەتی (١) سورەتی (التكاثر): قال رسول الله (ﷺ): (يقول ابن آدم: مالي مالي، وهل لك يا ابن آدم من مالك إلا ما أكلت فأفنيت أو لبست فأبليت أو تصدقت فأمضيت) (رواه مسلم). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئادەمی دەڵێ: ماڵەکەم ماڵەکەم ئەی ئادەمی لەماڵەکەت کامەی هی تۆیە؟! جگەلە ئەوەی کە خواردوتەو تەواوت کردووە، یان پۆشیوتەو کۆنت کردووە یان کردوتە بەخێر پێش خۆت ناردوتە).

## سورەتی ﴿ العصر ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾ سوێند بەکات. ١ )﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ﴾ بێگومان هەموو خەڵکی لەزیاندایە. ٢ ) ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کردەوە چاکەکانیان کردبێ ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ﴾ وە ئامۆژگاریی یەکتریان کردبێ بەئایینی راست ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامگرتن. ٣ )

## سورەتی ﴿ الهمزة ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ﴾ سزاو لەناو چوون بۆ هەموو ئەنگە گرێکی بەدگۆ (عەیب گرێکی تا نەدەر). ١ )﴿ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ﴾ ئەوەی کەهەر ماڵ و سامان کۆدەکاتەوەو دەیژمێرێ. ٢ )﴿يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ﴾ وا دەزانێ کەماڵەکەی هەر دەیهێڵێتەوە. ٣ )﴿كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ﴾ نەخێر وا نی یە، بێگومان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرێکی تێکشکێنەرەوە. ٤ )﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ﴾ تۆ چووزانییت ئەو ئاگرە چی یە. ٥ )﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ﴾ ئاگرێکی تاو دراوی خوایی یە. ٦ )﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ﴾ کەدێ بەسەر دڵاندا (هورووژم دەباتە سەر دڵان). ٧ )﴿إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ﴾ بێگومان ئەو ئاگرە داخراوە لەسەریان (و دەرچوونیان نی یە). ٨ )﴿فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ﴾ (زنجیر کراون) لەناو چەند کۆتێکی راکشاودا (بەسراونەتەوە وە بەچەند ستونێکی بەرزو بڵندەوە). ٩ )

## سورەتی ﴿ الفيل ﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ﴾ ئایا نەتبینی کەپەروەردگارت چی کرد بەخاوەن فیلەکان؟ ١ )﴿أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ﴾ ئایا فرو فێڵەکەیانی پوچەڵ نەکردەوە. ٢ ) ﴿وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ﴾ وە ناردیە سەریان باڵندەی زۆر پۆل پۆل. ٣ )﴿تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ﴾ بەرد بارانیان دەکردن بەووردە زیخی گڵین. ٤ ) ﴿فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ﴾ سەر ئەنجام وەکە کای خوراوی لێ کردن. ٥ )




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣) سورەتی (الكوثر): ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ ئیبن جەریر و بەززار لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە دەڵێ: کەعبی کوڕی ئەشرەف هات بۆ مەککە و قورەیشی یەکان پێیان ووت: تۆ گەورەی گەلەکەتی ئا ئەم دوابڕاوە وەجاخ کوێرە وا دەزانێ لە هەموومان چاکترە، لە کاتێکدا ئێمە خزمەتی حاجیان دەکەین و ئاویان دەرخوارد دەدەین و دەرگاوانی کەعبەین، کەعب ووتی: ئێوە لە موحەممەد چاکترن، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) ناحەزت دوابڕاوە.

سورەتی (الإخلاص): عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله (ﷺ): (والذي نفسي بيده إنها لتعدل ثلث قرآن) يعني ((قل هو الله أحد)) (رواه البخاري وأحمد). ئەبو سەعید خودری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر =

## سورەتی ﴿ قريش ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ﴾ (لەشکری ئەبرەهەی لەناوبرد) لەبەر هۆگری قورەیش. ۱) ﴿إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ﴾ هۆگریان بەهاتوو چۆی زستانان و هاوینانەوە(تا لێیان تێک نەچێ). ۲) ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ﴾ دەبا خاوەنی ئەم خانە(کەعبە)یە بپەرستن. ۳) ﴿ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ﴾ ئەو زاتەی کە لەبرسێتیدا (ڕزگاری کردن و)خواردەمەنی بۆ ناردن ﴿وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ﴾ وە لەترس وبیم (پاراستنی و) دڵنیای کردن. ٤)

## سورەتی ﴿ الماعون ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ﴾ ئاخۆ دیت ئەو کەسەی کە بڕوای بەئایین نی یە؟. ۱) ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ﴾ ئەوە کەسێکە کەپاڵ بە هەتیوەوە دەنێ. ۲) ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ وە هانی خەڵک نادات بۆ خواردەمەنی دان بە هەژاران. ۳) ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ ئینجا وای بۆ نوێژکەران. ٤) ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان. ٥) ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ﴾ ئەوانەی کە ڕووپامایی دەکەن. ٦) ﴿وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ﴾ وە یارمەتی خەڵک نادەن (هەموو چاکەیەک دەگرنەوە لە خەڵکی). ۷)

## سورەتی ﴿ الكوثر ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ﴾ بێگومان ئێمە پێمان بەخشیت شتێکی زۆر گەورە و بەفەڕ (کە پێغەمبەرێتی یە). ۱) ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾ دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەربڕە. ۲) ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ﴾ بێگومان هەر ناحەزت دوا بڕاوە. ۳)

## سُورَةُ الكَافِرُونَ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾

## سُورَةُ النَّصْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ﴿٣﴾

## سُورَةُ المَسَدِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١-٥) سورەتی (المسد): ﴿ تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ ... حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ بوخاری موسلیم لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان چووە سەر کێوی صەفا و هاواری کرد، پاشان قورەیش هەموو لێی کۆبونەوە وتیان ئەوە چیتە، چی بوویداوە؟ فەرمووی پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان بدەمێ دوژمن ئێوارە یا بەیانی دەدات بەسەرتاندا ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (دە من ئاگادار کەرەوەی ئێوەم لە سزای سەختی قیامەت – پێغەمبەرم بۆ سەر ئێوە– ) ئەبو لەهەب وتی: تیاچوون بۆ تۆ، بۆ ئائەمە ئێمەت کۆکردەوە ؟ جا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ....﴾.

## سورەتی ﴿ الكافرون ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بلێ: ئەی بێ بڕواینە. ۱ ) ﴿لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ من ئەو (بتان)ە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن. ۲ )﴿وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ وە ئێوەش ئەو (خوای)ە ناپەرستن کە من دەی پەرستم. ۳ )﴿وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾ وە من ئەو خواپەرستی یە ناکەم کە ئێوە دەیکەن. ٤ )﴿وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ وە ئێوەش ئەو خواپەرستی یە ناکەن کە من دەیکەم. ٥ )﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم. ٥ )

## سورەتی ﴿ النصر ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ﴾ کاتێک کەیارمەتی و کۆمەکی خوا هات ﴿وَالْفَتْحُ﴾ لەگەڵ سەرکەوتن (شاری مەککە ئازاد کرا). ۱ )﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا﴾ وە خەڵکت دیی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە. ۲ )﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾ ئەو سا ئیتر پەروەردگارت بە پاک رابگرە بەهۆی ستایشی یەوە وە داوای لێ بوردنی لێ بکە. ﴿إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ چونکە بێگومان ئەو زۆر گیراکەری پەشیمانی یە. ۳ )

## سورەتی ﴿ المسد ﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبولەهەب وە لەناویش چوو. ۱ )﴿مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ سوودی پێ نەگەیاند دارایی یەکەی و ئەوەی کە کردی (لە دوژمنایەتی پێغەمبەرا (ﷺ)). ۲ )﴿سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾ بێگومان لەمەولا دەچێتە ناو ئاگری بڵێسە دار. ۳ ) ﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ لەگەڵ ژنەکەیدا، کە هەڵگری دارو چاووگە (بۆ نانەوەی ئاژاوە). ٤ )﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ هەمیشە گوریسێکی بادراو (لەپەلی خورمایی ئاگرین) وا لە گەردنیدا. ٥ )

## سُورَةُ الإِخْلَاصِ

ترتيبها ١١٢ — آياتها ٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾

## سُورَةُ الفَلَقِ

ترتيبها ١١٣ — آياتها ٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

## سُورَةُ النَّاسِ

ترتيبها ١١٤ — آياتها ٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

- (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بێگومان سورەتی (قل هو الله أحد) -پاداشتی خوێندنی- بەرامبەر سێ یەکی قورئانە). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئادەمی دەڵێ: ماڵەکەم ماڵەکەم ئەی ئادەمی لەماڵەکەت کامەی هی تۆیە؟! جگەلە ئەوەی کە خواردوتەو تەواوت کردووە، یان پۆشیوتەو کۆنت کردووە یان کردوتە بەخێرو پێش خۆت ناردوتە).

**سورەتی (الإخلاص)**: عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله (ﷺ): (والذي نفسي بيده إنها لتعدل ثلث قرآن) يعني ((قل هو الله أحد)) (رواه البخاري وأحمد). ئەبو سەعید خودری گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بێگومان سورەتی (قل هو الله أحد) -پاداشتی خوێندنی- بەرامبەر سێ یەکی قورئانە).

## سورەتی ﴿ الإخلاص ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بلێ: ئەوە، خوای تاك و تەنیا. ١ )﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێدە. ٢ )﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ کەسی لێ نەبوەو لەکەس نەبووە. ٣ ) ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە. ٤ )

## سورەتی ﴿ الفلق ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بلێ: پەنا دەگرم بە دروست کەری بوونەوەر (بەرەبەیان). ١ ) ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ لە زیانی ئەوەی کە درووستی کردووە. ٢ ) ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ وە لە زیانی تاریکی کاتێك کەدابێ. ٣ )﴿وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ﴾ وە لە زیانی فووکەران (جادووکەران) بە گرێ یاندا. ٤ )﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ وە لە زیانی بەخیل و حەسوود کاتێك کە حەسوودی ببات. ٥ )

## سورەتی ﴿ الناس ﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بلێ: پەنا دەگرم بەپەروەردگاری خەڵکی. ١ )﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾ پادشای خەڵکی. ٢ )﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ﴾ پەرستراوی خەڵکی. ٣ )﴿مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ﴾ لە زیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهان کەر. ٤ )﴿ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ﴾ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دڵی خەڵکی. ٥ )﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ لە جنۆکەو لە ئادەمیزاد. ٦ )

## عَلَامَاتُ الوَقْفِ وَمُصْطَلَحَاتُ الضَّبْطِ :

| | |
|---|---|
| مـ | تُفِيدُ لُزُومَ الوَقْفِ |
| لا | تُفِيدُ النَّهْيَ عَنِ الوَقْفِ |
| صلى | تُفِيدُ بِأَنَّ الوَصْلَ أَوْلَى مَعَ جَوَازِ الوَقْفِ |
| قلى | تُفِيدُ بِأَنَّ الوَقْفَ أَوْلَى |
| ج | تُفِيدُ جَوَازَ الوَقْفِ |
| ∴ ∴ | تُفِيدُ جَوَازَ الوَقْفِ بِأَحَدِ المَوْضِعَيْنِ وَلَيْسَ فِي كِلَيْهِمَا |
| ه | لِلدِّلَالَةِ عَلَى زِيَادَةِ الحَرْفِ وَعَدَمِ النُّطْقِ بِهِ |
| ه | لِلدِّلَالَةِ عَلَى زِيَادَةِ الحَرْفِ حِينَ الوَصْلِ |
| ـ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى سُكُونِ الحَرْفِ |
| م | لِلدِّلَالَةِ عَلَى وُجُودِ الإِقْلَابِ |
| ً | لِلدِّلَالَةِ عَلَى إِظْهَارِ التَّنْوِينِ |
| ٍ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى الإِدْغَامِ وَالإِخْفَاءِ |
| ا | لِلدِّلَالَةِ عَلَى وُجُوبِ النُّطْقِ بِالحُرُوفِ المَتْرُوكَةِ |
| س | لِلدِّلَالَةِ عَلَى وُجُوبِ النُّطْقِ بِالسِّينِ بَدَلَ الصَّادِ<br>وَإِذَا وُضِعَتْ بِالأَسْفَلِ فَالنُّطْقُ بِالصَّادِ أَشْهَرُ |
| ~ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى لُزُومِ المَدِّ الزَّائِدِ |
| ۩ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى مَوْضِعِ السُّجُودِ ، أَمَّا كَلِمَةُ وُجُوبِ السُّجُودِ<br>فَقَدْ وُضِعَ فَوْقَهَا خَطٌّ |
| ۞ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى بِدَايَةِ الأَجْزَاءِ وَالأَحْزَابِ وَأَنْصَافِهَا وَأَرْبَاعِهَا |
| ﴿٤﴾ | لِلدِّلَالَةِ عَلَى نِهَايَةِ الآيَةِ وَرَقْمِهَا . |